رزگار گیان ئەو کاتەت باش.. ئەوە نوسینەکانم بە چاککراوی بۆ رەوان کردییەوە ، هیوادارم بە سوپاسەوە هیمەتی برایانەی خۆت بکەی کە ماندوبونی دیزاینەکەی وەک کتێبی یەکەم بکێشی و دەستەکانت دەگوشم.. ئەو لیستی ناوەکانم سرییەوە و بە پێویستی نازانم.

زنجیرەی دووەم
لە کتێبی
لەهەواری یادەوەرییەکانمدا

# ئەو رۆژ و شەوانەی لە بیرم ناچنەوە

# ئەو رۆژ و شەوانەی لە بیرم ناچنەوە

لە زنجیرەی یەکەمی بە چاپگەیاندنی گێڕانەوەی بیرەوەری سەرجەلەی ئەو رۆژ و شەوانەمدا. هەر پاش و پێشێکم کردبێ، دیارە بۆ زوورەتی ئەوەی هەم خوێنەر لەگەڵ ڕەوتی گێڕانەوەی یادەوەرییەکانم ئاشنا بێتەوە و هەمیش تا رادەیەک سیمای تیکەڵبوونیان بە خۆوە گرتبوو. ئەوەش لەبەر ئەوە بووە، زەمەن لە لای من رانەوەستاوە و تێنوێتی چیرۆکی ئەزمونی تەمەنم جارێ سولاوکەی بەر باران ئاسا، دڵۆپ دڵۆپ تامەزرۆییم دەشکێنن.

لێرەوە ئەوەندەی بۆم کرابێت، خۆم لەوە بە دوور گرتووە و بە فۆڕمتر لە درێژەی پاشماوەی بەشی یەکەمی پرۆژەی نووسینەکەم بەیەکەوەم جلیت کردوون. دەمێنێتەوە سەر ئەوەی هەموو لایەک بەوە ئاگادار بکەمەوە، کە ستیلی نووسینەکەم لە رووی زمانەوە، لە شێوە زاراوەی تێکەڵەی زمانی کوردی، شایی رەنگاوڕەنگی خۆی بەستووە و بە هۆی نەبوونی زمانی ستانداردارتی ئاسایی، بە مافی خۆمم زانیوە لەگەڵ ئەو زبارەی شێوەزمانە ئاوڕەنگەی کوردی سەرەتاتکێ بکەم.

بۆ دەستگرتنی خوێنەریش لە کۆتایی نووسراوەکەمدا، فەرهەنگۆکێکم کردووەتە بەرانپیلی بەرۆکی بەرهەمی ژیانم.

بەر لەوەی خوێنەر دەست بە خوێندنەوەی ئەزموونی مەودایەکی ئەزمونی تەمەنم بکات.

دەمەوێ لە سەرتیلەی ئەو روانگانەی خوارەوە خۆشم بخوێنتەوە..

_ هەنوکە هیچ تەرایەتییەک ئەگەر هەبێت لە چیراوکەی حیزبی ئەو پەنجا ساڵەی دوایی و بەشداریکردنی خۆشم لەو کاروانە سەر بە گۆبەندە بۆ هەمیشە شاگەشکەم ناکات. دیارە منیش لەو پێناوەدا مەودایەک ئاسنی ساردم کوتاوەتەوە، چونکو پێش هەموو شتێک خۆتان دەبینن ئەنجامەکەی بەچجۆرە پاشەگەردانی کەوتووتەوە.

ـ یەک لەو شتانەش پێی سەرفراز و سەربڵندم، ویژدانم بە زیندوێتی سەرەدیقانێم لەگەل دەکات. هەمیشە لەو رۆژەوە لەناو گۆمەزەی حیزبی چاوم کردووتەوە، هەرگیز کۆیلەی حیزب نەبومە و بگرە بەرانبەر گەرەلاوژێ کەم و زۆر بەرخوردی خۆم هەبووە و مەرجیش نییە سەرکەوتوو بوو بم.

ـ وەک تێروانین و تێگەیشتنم، هیچ حیزبێکی کوردی لە باشووری کوردستان کە لەگەڵیان ئەو مەودایە لە شار و لە شاخ تێکەڵ بوومە. ئەگەر ئەو کۆششە بێوچانەی ئارام ـی لێ دەرچێت. خاوەنی سەرکردەیەکی کاریزما و سیمبۆلی رزگاری و سەربەخۆیی و ئازادی خەڵک نەبووە و نییە. بەڵگەی بەرچاویش لەوە دەیبینین و ئەگەر وانەبووایە، لە پاش نەمانی کارێکتێرە سەرەکیەکانی فلان و فیسارە حیزب، دەبوو ئەو سەکردەی حیزیانە ژمارەیەک لە کادیرانی دەورووبەریان، یەک دوو سەرکردەی لێهاتووی بەرهەمی ئەو کەرێکتێرانەیان لە مەیدان بۆ ئەو حیزبە لە پاشۆڵ دابوایە. خەڵک بەخۆی دەبینی چ کەسانێکی چاوچنۆک، کەم مەعریفە، دوور لە ئێش و ئازاری خەڵک لەسەر رەوسەی بەرهەمە کت و پرییەکانی رۆژگار، حیزب لە لەوچەلەوچ زیاتر بۆ وڵات و خەڵک شتێکی دیکەی بە دەستەوە نییە و لە کاروانی سوتان و قوربانی خەڵک قەدری عافیەتیش وەرناگرن و واز لەو خەڵکە ناهێنن دەرمانی دەردی سەری خۆی بکات.

ـ سەرجەمی گێرانەوەی یادەوەرییەکانم لە- دوو گۆشە نیگایسەرتاپای بیرکردنەوەکانم بەسەرپێ کەوتوون کە لەپێشەوە بۆ بەردەوامی تێرکردنی روحی زیندووی خۆمە و دواتر گەرەکمە نەوەی نوێ ئاشنا بکەم کە چی لەو کاروانەی رابردوو گوزەراوە و بە چ دەردەسەرییەک بەو ئەنجامە گۆشەگیرییەی هەنوکە گەیشتووە. تاکو ئەوان بە کاری نەکردەی ئێمە باشتری بکەن و کەم و زۆر خۆ لە ئەزموونی مەرگەساتی رابردوو هەڵنەسون..

حاجی مەمۆ

# نموونەیەکی ڕۆژانی تەمەنی منداڵیم

هەرکە بیرەوەری بینینی یەکەمجاری شاری هەولێر دەکەوێتەوە کەلکەلەی مێشکم. ئەو دەمەی ماڵمان لە گوندی شێخانان نزیکی پردێ _ نزیک ئاڵتون کۆپری بوو. لەوان ڕۆژاندا بە دوای سونەت کردنم. کراسێکی سپی ئاوداماڵیان لەبەر کردبووم. لەگەڵ بە سەرپێ کەوتنەوەم، باب و داپیرەم بۆ دڵخۆشکردنم، یەکەمجارم بوو لەگەڵ خۆیان بۆ شاری هەولێریان بردم. ئەوجا وەرە منداڵێکی کیویلەی گوندی بۆ جاری یەکەم بچێتە شاری و بیبەنە بەر دوکانی شەکرۆکە فرۆش و پێی بڵێن چیت دەوێ لە بۆ خۆت هەڵگرە. منیش نەمکردووتە منەت و دامەنی کراسە شۆڕەکەم لێمشت کردووە. شار بۆ ئەوێ ڕۆژێش لەبەرچاوی من سەیر و لەچاو گوندی عەنتیکە بوو. لەوێ لە گەڕان و سوڕانی ناوشار، لچکی چارۆگەی داپیرەم بەرنەدەدا. وام دەزانی بزر دەبم، یاخود دەمرفێنن. هەموو شتێک بۆ من لایە بوو، کەسم نەدەناسی و بە منداڵەکانی شاری ئاشنا و تێکەڵ نەببووم.

# گەڕەکی سەعدوناوە و گەورەبوونم

لە کۆڵانی پشت ئاشی عوسمانبابشی کۆتایی ساڵانی پەنجاکانی ناو شاری هەولێر، ئێمەی منداڵ کیژ و کوڕەکان هەموو کات بەیەکەوە گەمانمان دەکرد. لە ناو منداڵانی دراوسێیەکانماندا چەندان کیژ هەبوون کە بە بەژنوباڵا کەڵەگەت و تەمەنیان لە کوڕەکان بەسەرەوەتر بوو. هەر کە شەو دادەهات و کەسی لایە بە کۆڵانێدا نەدەهات و نەدەچوو. هەوجا ئەو کیژانە بە دەردەکەوتن و بۆ کۆڵان دەهاتن.

حەمدیە لە هەمووان بەدەستوبردتر بوو. زۆرانێی لەگەڵ هەموو کوڕەکان دەکرد و یەک بە یەکمانی لەعەردی دەدا. لەگەڵ ئەوەشدا دڵی نەدەهات ئازارمان پێ بگەیەنی. بەڵکو پاش کەوتنە سەر زەوی، هەر یەکەمانی بە ئەسپایی لە باوەش دەگرت و تێر تێر ماچی دەکردین. بە دەستەکانی سەر و قاقۆلمانی پاک دەکردەوە و جلوبەرگمانی لە تۆز و خۆڵ دادەوەشاند و شەکرۆکەیەکی لەدەومان دەپەستاند.

ناوی ئەو منداڵانەی کە لە بیرم ماون؛ ڕەسول، ئەیوب، فارس، عەیشێ، عەیشەخان و تەیب، فەریدە و نەوال. ئەوانەش کە باوکیان چاوی دیار نەبووایە، خەلۆ،

حەمدیە، سوعاد، عبدالرزاق، نەجات، سەباح، سەعید، فازیل، کوردستان بە درێژایی کۆڵان بۆ گەمان دەهاتنە دەرەوە و تێکەڵمان دەبوون.

گەمەکانمان بریتی بوون لە چاوشلکانێ، ساپساپانێ، پەلیکانێ و هەندێ جاریش تۆپانێ کە زۆربەمان لە ناو توز و خۆڵێدا تەپەمان دەهات. یاخود کەلاکەلایانێ لەگەڵ لگاوی پەناوپەسیوان. بێگومان جاری دیکەش هەبوو بە یەکەوە لە دەمی قوتابخانەدا، وانەکانمان دەور دەکردەوە و زۆربەی کات کوڕەکان کۆمەکمان بەکچەکان دەکرد.

ئەو زەمان لە گەڕەکەکەی ئێمەدا، زۆربەی خەڵک هەواداری حیزبی شیوعی عیراقی بوون. بە جۆرێک کە کۆڵانەکەمان بە کۆڵانی سوور ناوی دەهێنرا. لە وێدا تەنیا ماڵی ئێمە وەک هەواداربوونی ئەو دەمی پارتی و کوردایەتی دەهاتنەوە. من لەگەڵ منداڵەکانی گەڕەک، هەر لەوێ رۆژەوە رەنگی سوورم خۆشویستووە.

ساڵی ١٩٥٩ لە شانی ئەو کۆمەڵە منداڵانەوە، کاتێک بە بەردەمی بارەگای پارتیدا تێدەپەڕین، کە لە تەنیشت قوتابخانەی — ئیبن خولەکان — بوو، هەموو منداڵەکان هاوارمان دەکرد..

پاترییەکەمان پاتری هیشکە

خاوەنی جوجکە و مریشکە

## ژیانی ئەو دەمی هەولێر

لە زەمانی کۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکانی ساڵانی سەدەی چوو. بەشی زۆری خەڵکی هەولێر هەژار و کەمدەرامەت بوون. ئەوەی لەو رۆژگاریدا بێکار بوو، ژیان بۆی سەخت و دژوار بوو. بێجگە لەو خێزانە هەولێرییانە نەبێت کە پیشەگەر و دووکاندار و خاوەن کاری میری بوون. هەروەها ئەو ئاغا و دەرەبەگانەی کە نیشتەجێی شار بوون و لەسەر داهاتی بەروبومی جوتیارانی گوندی دەژیان. ئەوانەی دیکە ئەگەر بۆ رۆژەکەی قوڕکاری، حەمباڵی، یاخود کارێکی دیکەیان لە دەست نەبوایە، ئەوە بۆ بەیانییەکەی نانی وشکیان نەبوو بیخۆن.

ئێمەی منداڵی ئەو خێزانە دەستکورتانە، هەندێکمان بە پێخاوسی، جلوبەرگی پینەکراو، بەڵام دەمبەپێکەنین ژیانی رۆژانەمان دەگوزەراند. کەم خێزان توانای ئەوەیان

هەبوو مانگێ جارێک گۆشت و پڵاوساوار یاخود برنج بخۆن. زۆربەی ئەو خێزانانە هەتا بەرەبەری شەستەکان، تیشکی ئەلەکتریکیان لە ماڵ نەدەدیت. لە بیرم ناچێتەوە، شەوانە لەبەر ڕۆشنایی چرا، فانووس، لامپا، وانەکانمان دەخوێندەوە. لە زستانانیش بە دەوری سۆبەی قشپڵ _ پشقل بازنەمان دەبەست. ئێمە چەندان خوشک و برا لەگەڵ دایک و باوکمان، بە یەکەوە لەیەک تاقە هۆدە دەخەوتین.

زۆربەی وەخت ماڵەکان، ئاوی پێویستی ئەو ڕۆژەیان لەسەر بیری گەڕەک دەهێنا و تەنیا خوداپێداوەکان بە بەلوعە یاخود سۆندەی لاستێک بۆ ماڵەوە ئاویان ڕاکێشابوو. خۆشوشتن و کورکردن هەفتەی جارێک بوو، ئیدی ئەو ڕۆژە جۆگەلەی ئاو ڕۆیشتنی کۆڵان لەبەر کەفاوی ماڵەکان بەرگی سپی دەپۆشی و دەتگوت ئاوی بەفراوە. ئەو چڵکاوە بەرەو قوڵایی گلکەندی یاخود باخچەی شێخ تەهاکۆر شۆڕدەبوەوە. کە ئەویش باخچەکەی بەو چڵکاوەی بەر ماڵان ئاو دەدا. خەڵک بەردەوام، گیاوگۆری وەک سەوزە، تور و سلق، کەرەوز و تەڕەتولە، کەوەر و تەڕەپیازیان لەو باخچەیە دەکڕی. ئەو باخچەیە ئەوێ ڕۆژێ کەوتبووە پشتەوەی خانووەکانی کۆڵانەکەی ئێمە و ئەو جادەیەی بۆ کەرکوک دەچوو. کە هەنوکە کراوەتە گەراجی ڕاگرتنی ئوتۆمبیل و چەندان ئەپارتمانی لێ دروست کراوە و شوێنەواری کۆنینەی ڕەشکردووتەوە.

ئێمەی منداڵانی گەڕەک بە تایبەت کوڕەکان، لە کچەکان هەڵەشاوی تر بووین. شەڕمان بە داروبەردی دەفرۆشت. بە بیرم دێتەوە لەناو هەر کونە دیوارێکدا، هێلانەی زەنگەسۆرە _ زەردەواڵەمان بدۆزیبایەوە، یەکسەر بە باریکەداری نوکتیژ ئەو کونەمان دەکۆڵی و زەنگەسۆرەکانمان تەنگەتاو دەکرد. یاخود بە قوڕی ناو جۆگەلەی کۆڵانێ، دەرکی ئەو کونانەمان سواخ دەدا. جارێک لەو جارانە عبدالرزاق سەرسۆرم لەتەک بوو (خۆشبەختانە هەنوکەش لە ژیاندایە و هەر برادەرین) یەکێک لەو کونە زەنگەسۆرانەمان دیتەوە و دوای ئەوەی بەدارێکی تیژ کونەکەمان کردەوە. هەر یەکەمان بە لەپە قوڕێکی جۆگەلەی بەرماڵەکان ویستمان ئەو کونە بگرین. هەرکە دەستمان بۆ بەردەم کونەکە درێژ کرد و نەکرد، ئیتر لە ناکاو لەشکری زەنگەسۆران شاڵاویان بۆمان هێنا و بەربوونە سەردەموچاومان. ئەو ڕۆژە کارێکیان پێمان کرد، هەتا ئێستاش لە بیرم نەچووە. بۆ چەندان ڕۆژان بەرچاو و ڕوومەتم ئاوسابوون. لە وێ بەدواوە ببڕای ببڕای تخونی کونە زەنگەسۆران نەکەوتمەوە.

# فێربوونی پایسکل لێخوڕین و لۆری عەسکەری

بە منداڵی زۆرم حەز لە پایسکلسواری بوو. بابم ڕێگای نەدەدام پایسکلم هەبێ. کەچی بە جەریەزەیی خۆمەوە فێری لێخوڕینی بووم. ڕۆژانە لە دووریی چاوی باوکمەوە، بە پەنادزە و قرچەی گەرمای هاوین فرسەتم دەهێنا و دەچوومە لای دووکانەکەی مەغدیدی پایسکلچی، پایسکلێکم بەکرێ لێی وەردەگرت. هێشتا باش فێری لێخوڕین نەببووم. ڕۆژێک سەرچڵانە لەگەڵ یەک لەو منداڵانەی هاوتەمەنم لە گەڕەکی کورەچییەکان. بە پایسکلسواری مەیدانی قۆشمەکردنمان گرت. گرەوەکەمان لەسەر ئەوە بوو، کە هەریەکێکمان زووتر گەیشتەوە لای دوکانی پایسکلچییەکە. ئەوە پارەکەی خۆی وەردەگرێتەوە و دەبێ دۆڕاو لەجیاتی وێر بکات. دیارە مەغدیدی پایسکلچی لەپێشەوە کرێییەکەی خۆی لێمان وەردەگرت.

وا ڕێکەوت من لە بەرایی ئەو برادەرە بووم کە ناوی عبدالخالق بوو. هەتا سەرجادەکەی بەردەم وێستگەی شەمەندەفەری ئەو دەمی هەولێر، ئاگام لێ بوو ئەو لەدوای منەوە بوو. لە پڕێکدا لۆرییەکی سەربازی ڕووبەڕوومان دەرکەوت. زۆر سەربەستانە شکاندییەوە سەرمان و من هەر ئەوەندەم بۆ کرا لەسەر پاسکلەکە خۆم فڕێدەمە ناو ڕولکەکانی لێواری جادەکەوە و بەڕاکردن لەوێ دوور بکەومەوە. کاتێک عبدالخالق ئەو دیمەنەی دیتبوو، لە دوورەوە بۆ خۆی سووکانی سووڕاندبووەوە و بۆی قوچاندبوو. منیش لە دووری ئەو شوێنەوە چاوم لێ بوو، شوفێری لۆرییەکە دابەزی و چەند جارێک پایسکلە پێکراوەکەی منی بۆ سەرسەری خۆی بڵند دەکردەوە و فڕێی دەدایە سەر جادەکەوە. هەتاکو پایسکلەکەی چەماندەوە باریەکتری. ئەوجا سواری ترومبێلەکەی بوەوە و بێمنەتانە ڕێگای خۆی گرت. منیش بە تەنگەتاوی و هەڵەداوان، بە هەرشێوەیەک بوو پایسکلە تێکشکێنراوەکەم گەیاندەوە لای پایسکلچییەکە. بە یارمەتی برادەرەکەم ڕێککەوتین کە هەفتانە و هەرجارەی بەشێکی نرخی پایسکلەکەی بدەینەوە. چونکو ئەو برادەرەم کە ناسیاوی کابرای پایسکلچی بوو، دەستەبەری منی کردبوو بۆ پایسکل پێدانم. ئیتر ئەوە بوو بۆ ماوەی چەند مانگێک بە هەر شێوەیەک بوو، بە هەردووکمان هەموو ئەو پارەیەمان دایەوە کە نزیکی دوو دیناربوو. بەڵام ببرای ببڕای جارێکی دیکە پایسکلی پێمان بەکرێ نەدایەوە.

# یەکەم دەستکردنەوە و ئافەرینکردنم

لە سالآنی قۆناغی سەرەتاییدا بووم. لە قوتابخانەکەمان کوڕە سەرۆک جاشێکی حکومەت هەبوو. کوڕی یەکێک لە بەگەکانی ئەو دەمی خۆشناوەتی بوو بە ناوی واحید بەگ. ئەو لە پۆلی خوێندن لەناو هەموو قوتابییەکان تەمبەڵی ئەوەلباب بوو. رۆژانە لەناو قوتابییەکانی پۆلەکە مایەی گاڵتە پێکردن بوو. بە جۆرێک ببووە گاڵتەجاڕی ناو قوتابخانەکە. بە راستەی سەری هارومارانی لێ وێک هاتبوو. ناچار خۆی بۆ ئەوە دانوساندبوو، کە لە دەرەوەی قوتابخانە فرسەت لە یەکێکمان بهێنێ و شەرمان پێبفرۆشی. بە پشتیوانی پاسەوانەکانی باوکی تۆڵەمان لێ بکاتەوە.

رۆژێکیان لای پاشنیوەڕۆ بوو، باوکم لە سەردووکانەکەی کە لە پشتی مزگەوتی بازاری بەرانبەر دووکانی مەلانیعمەتی سعاتچی بەتەنیا بە جێی هێشتبووم. لە ناکاو وەک ئەوەی چاوم رەشکە و پێشکە بکات. لە دوورەوە تارمایی ئەو کوڕەجاشەم لەتەک باوکییەوە بە دی کرد. کە دوو زرتە زەلامی چەکدار بە دوایانەوە بوون. هەرکە ئەوان گەیشتنە بەرانبەرمان و ناوبراو منی بە تەنیا لەسەر دووکانەکە بینی. پاشی چرپەیەک لەگەڵ باوکی و ئاوڕدانەوەیان بە لای جاشەکانی دوایانەوە کوڕەجاشەکە سەرەتا بە تەنیا بۆلای من پەڕییەوە و پڕ بە دەم لەو گۆڕەوە جوێنبارانی کردم. منیش هەر ئەوەندەم بۆ کرا، لەگەڵ گەیشتنی بۆ بەردەمم، هەتا زللە گرتی لە بناگوێیم سرەواند. بە جۆرێک شریقەی هات، فرمێسکی لە چاو هاتەخوار و لە پرمەی گریانی دا. باوکی و جاشەکان لەو بەرییەوە بە پرتاوی بۆلای من پەڕینەوە. خوداوکردانە دیار بوو تەها مامەری _ کە شایەرێکی فۆلکلۆریستی ناوچەکانی دەشتی هەولێر بوو _ برادەری باوکم لەوبەری جادەکەوە چاوی لەو سەینوبەینە بوو. ئەویش یەکپێ گەیشت و بەدوای ئافەرین لە بەندە کە یەکەمجار دەستم کردووتەوە و بوارم نەداوە ئەو کوڕە دەستم لێ بوەشێنی. مام تەها بە شیعرە گاڵتەجاڕییەکانی رووی لە باوکی منداڵەکە و جاشەکان کرد. کابرای بەگیش لە شەرمان و گاڵتە پێکردنەکانی تەهامامەری. هەر ئەوەندەی بۆ مایەوە دەستی کوڕەکەی بگری و بڕوات. جاشەکانیش بە ملشۆڕی دوایان کەوتن. لە بیرم نەچووتەوە هەردووکیان یادیان بەخێر، تەها مامەر و مام حاجی حمدەئەمین جگارەفرۆشی دراوسێمان بە جاشەکانیان گوت: مادام کورتانەکەتان هەر بەکۆلەوەیە و تاکو بە دەست بەتاڵی نەچنەوە، هەتا ماڵەوە بەگی لێ بار بکەن. ئیتر جارێکی دیکە ئەو کوڕە تخونی من نەکەوتەوە.

# کاری کورەچییایەتی و دەرمەقەت نەهاتنم

هێشتا مووم لێ نەهاتبوو. یەکێک لەو مێردمنداڵانەی کە نەیدەخوێند و برادەرم بوو. لەگەڵ کەسوکارەکەی بەیانیان بۆ ئاقاری گوندی قۆڕیتانی سەر ڕێگای دیبەگە ــ مەخمور دەچوون. لەوێ لە کورەخانەکانی کەرپوچ سازی کرێکاری دەکرد. نێوانمان خۆش بوو، هەر لە ڕێگای ئەویشەوە فێری دۆمینە و گەمەی کاغەزی کۆنکان بووم. عورفان کورەچ ــ ی ناو بوو. هەنوکەش لە ژیاندا ماوە و جاروبارە کە دەچمەوە هەولێر هەر لە گەڕەکی سەعدوناوە دەیبینمەوە. ڕۆژێکیان وەرزی هاوین بوو، ئێواران دوای گەمە و فشقیاتی ناو گەڕەکەکەی خۆمان. لە پشتی ئاشی عوسمانبابش – ئێستا نەماوە و کراوەتە گەراجی ترومبێلان – تێر گەمە نەدەبووم. یەکێ فرکەی سەرجادەی کۆتری سەلامم دەکرد کە برادەرە مێردمنداڵەکانم لە یەکێک لە چایخانەکانی سەر ئەو جادەیە گرد دەبوونەوە. بە دۆمینە و کۆنکانکردن خەریک دەبوون. ئێوارەکیان من قەلۆش بووم، قروشێک لە گیرفانم نەبوو. لە تەنیشت یەک لەو برادەرانە دانیشتم و خۆم بە سەیرکردنی یاری ئەوانەوە سەراسیمە کردبوو. لەگەڵ تەواوبوونی چەند دەستێک گەمانی کۆنکان و دۆڕاندنی بەشێکیان، هەموو بە یەکەوە هەستان کە بەرەو ماڵەوە بچینەوە. لێرەدا عورفان پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم کە سبەینێ دەتوانم لەگەڵ ئەوان بۆ کرێکاری بچمە کورەخانە. تاکو پێکەوە کەرپوچان باربکەین و کرێی ڕۆژانەکەی شەش درهەم بوو. منیش یەکسەر گوتم باشە و سبەینێ سعات پێنجی بەیانی لە خەوی شیرین ڕابووم. لەگەڵ عورفان و باب و براکەی بە سواری ئەو کەچە لۆرییەی مام سەلیم کورەچی بەرەو کورەخانەکانی گوندی قۆڕیتان هەرتەک هەرتەک بە ڕێ کەوتین. بە هۆی شەنگوتاقەتی خۆم و هەبوونی عورفان لە تەکمەوە. ڕۆژەکەی هەتا دەمی عەسرێ دوو لۆری کەرپوچمان بارکرد و هەر یەکەمان بە نۆبەت لە خوارەوە و لەناو لۆرییەکەوە کارەکەمان بە گورجوگۆڵی ڕاپەڕاند. بۆ ئێوارە سەرو شەش درهەمی خۆمان وەرگرت کە زۆر دڵخۆش بووم لەوەی بە ڕەنجی کرێکاری ئەو ڕۆژەم، گیرفانم گەرم بوەتەوە. بەڵام بەدوای حەسانەوە، هەستم کرد قاچ و قۆڵەکانم وەک بەنجبوون بەرەو ڕەقبوون دەچوون. عورفان کە بەم کارە دەقی گرتبوو، زۆری گاڵتە پێ کردم کە هەر بەرگەی یەک ڕۆژم گرتووە. ئێوارە بە قونەخشکە لە لۆرییەکە هاتمە خوارەوە، پێمگوتن کە من چیتر بۆ

کەرپوچ بارکردن نایەمەوە. بەدوای هەفتەیەک ئەو جارە لە رێگای برادەرێکی دیکەمەوە بە ناوی یونس کە ئەو دەمماڵیان لە گەڕەکی گڵکەند بوو. وەک من کوڕە گەورەی خێزانێکی رووتەڵەی هەژار بوو. لە قوتابخانە و خوێندنیش دواکەوتبوو، بە ناچاری ملی لە کرێکاری نابوو. ئەو جارە لە رێگای ئەوەوە نزیکەی مانگێک لە لای مەجید بەلوعەی قۆنتەراتچی کەوتمە کرێکاری کردن. هەموو رۆژێ بە یەکەوە لەگەڵ یونس بە پێ لە گەڕەکی سەعدوناوە و لەگەڵ تاریک و ڕوون بەخەبەریان دەهێنام و خۆمان دەگەیاندە کۆتایی گەڕەکی شۆڕش کە تازە لە تازە، خەریکی بوونە گەڕەک بوو. لەوێ لە سەرجادەی شۆڕش نەخۆشخانەی نەخۆشی سنگ دروست دەکرا. ئێمەی مێردمنداڵ رۆژانەکەمان لە گەورەکان دوو درهەم کەمتر بوو. واتە شەش درهەم بوو. لەگەڵ ئەوەش مەجید بەلوعە — یادی بەخێر لە ژیاندا نەماوە _ بۆ سەری مانگ هەر حەقی بیست رۆژانی پێمان دا و بۆ هەر یەکەمان بە زەقەزەقی چاوان دە رۆژی لێ خواردین. لێرەوە دەبوو لەوە بگەم زەنگینەکان بە زۆری بە مژینی خوێنی خەڵک و غەدرکردن، ئەو سەروەتوسامانە بێشومارەیان بە سەر یەکەوە ناوە. لە بیرمە دواجار بەو مەجید بەلوعەمان گوت: حەقی دە رۆژەی کرێکاری ئێمەت لێ بێتە مەرگەموش و بۆ کفنی دوا رۆژت سەرمایە بێت...!

## باخچەکەی وێستگەی شەمەندەفەری هەولێر

لە هەرەتی تەمەنی هەرزەکاریمدا، زۆربەی رۆژانی هەفتە بە ناوی سەعیکردن و دەرسخوێندنەوە، هاتوچۆی باخچەکانی بەردەم وێستگەی شەمەندەفەری ئەوسای هەولێرم دەکرد. بەشێکی زۆری کاتەکەمان لەگەڵ هاوڕێکانم بە تۆپێن و ئەوجا بە یەکەوە دانیشتن بوو. لەو گازینۆ بچکۆلانەی ئەو باخچە هێلکەییەی پێشی پێشەوەی وێستگەکە خۆمان خەریک دەکرد. بەدوای وەختێکی کەمی دەورکردنەوەی وانەکانمان، دەستمان بە گەمەکردنی دۆمینە و تاولە و کۆنکانێ دەکرد. پاشان بە هۆی هەبوونی چەندان خێزانی کریستیان لە گەڕەکی محەتە. ئەو گەڕەکەی لەوێ رۆژاندا کەوتبووە کەناری غاباتی گەورە _*مەنوکە کوێرکراونەتەوە*_ و گەڕەکی کورانی رۆژئاوای شاری هەولێر. کە بەزۆری خەڵکانی رەشوڕووتی گوندەکانی دەشتی هەولێر لەناو خانووە لە قوڕ دروستکراوەکانیان نیشتەجێ بوون. کە ئێستا بووەتە یەکێک لە گەڕەکە هەرەگەورەکانی ناوەراستی شار.

لەگەڵ منداڵە درشتەکانی ئەو خێزانە دیانانە، بە تایبەت ئەوانەی وەک ئێمە لە هەمان قۆناغی خویندن بوو، چ لە قوتابخانە و چ لەو باخچانەی هێڵی شەمەندەفەر برادەری ڕۆژانەی یەکتربووین. هەنوکەش ناوی سەلاح پترس، فارس، سەلیم و خەلیلم لە بیرم ماون. هەبوونی ئەو خێزانانە بە هۆی ئەوەوە بوو کە باوکەکان کارمەند و کرێکاری هێڵی شەمەندەفەر بوون و لەو گەڕەکەی محتە دەژیان. دیسانەوە ئەوەشم لە بیرە کە چەندان کرێکاری خۆمانەش لەو شوێنە کاریان دەکرد. ئەو کرێکارانە لەگەڵ ئێمەی قوتابی نێوانیان خۆش بوو. ناوەکانی عومەرخۆشناو، مام ڕەشید، زەکی و علی و کەریم. بەتایبەت عومەر خۆشناو نێوانی لەگەڵ بەندە دۆستانە و هاوکاریکردن بوو. بە هۆی هەواداربوونی بۆ کوردایەتی و بزاڤی چەکداری شاخەکان، کە هەفتە نەبوو بە دەنگوباسی چالاکییەکانی پێشمەرگە سەرخۆشمان نەکات.

## بازاڕی بە کۆمەڵ و دەنگی زوڵاڵی حەیدەرە کەچەڵ

لەوێ ڕۆژگاری مێرمنداڵیم، ڕۆژانێک بەیانیان زوو لەگەڵ باوکم بۆ گومرگی میوە فرۆشتن و کڕینی بە کۆمەڵ دەچووم. کە ئەو دەمی گومرگ _ مەیدانی ساغکردنەوەی بەرهەمی ڕۆژانەی جوتیاران بوو. ئەو زەمان مەیدانەکە لە پشتی مزگەوتی شێخەڵڵای ئێستا بوو. بە تایبەت سبەینانی زوو هەڕەتی وەختی فرۆشتنی ئەو بەروبومانە بوو، کە لە ناوچەکانی دەوروبەری شاری هەولێرەوە دەهاتن. کڕین و فرۆشتن بە قۆمەت قۆمەت بوو.

میوەکانی هاوینە، شفتی و گندۆرە_ کالەک، تەرۆزی و ئارو_ خیار، پیاز و تەماتە و بامیە و بیبەر و سەوزەوات هەڕەتیان بوو. یاخود لەگەڵ کۆتایی هاوین، میوەجاتی ناوچە شاخاوییەکان لە ترێ، هەرمێ، هەنار، هەنجیر، سێوی سۆروسپی و کەسک (ئەوانە زۆرتر لەناو قەرتاڵە بوون) بە کۆمەڵ دادەنران. لەسەر هەر قەرتارەیەک مەزادکردنی ڕووبەڕوو دەستی پێ دەکرد. هەبوونی کەسانی وەک حەیدەرەکەچەڵ، کێخواکەریم، تەها مامەر، جەمیل حەمبال یادیان بەخێر بە دەنگە زوڵاڵەکانیان ئەو حەشاماتەیان بۆ ئەنجامدانی مامەڵەکە کۆ دەکردەوە و بە مەزاد ئەو بازاڕەیان بە هەڕمێن دەخست. لە ماوەی کەمتر لە کاتژمێرێک زۆربەی زۆری میوەکان تۆزی لێ دەبڕا. ئەو

دەمی بەو منداڵییەی خۆم دەنگی حەیدەرە کەچەڵ، کە لچکی کەوایە درێژەکەی لەبن نیفۆی دەرپێ سپییەکەی دەناو قۆڵ و باسکی خۆی هەڵدەکرد. وەک چریکەی بەرتەوژمی مۆسیقای رەوە چۆڵەکەیەک، بە نۆرمی ئاوازێکی سەرنجراکێش بجریوێنن، تێکڕای دیدوهۆشی منیان داگیر کردبوو. لە بۆ گوێ بیستنی زیاتر، لەناو حەشاماتی پیاوە گەورەکان، تەکانیان پێ دەدام. دیارە هەریەک لەو زاتە دەنگ خۆشانە بۆ فرۆشتنی زۆرتر و زووتری قۆمەتە میوەکان، یەک بەدوای یەک قۆشمەیان بوو

## نانکڕینی بەیانیان و دزداشە لەبەر

هێشتا قۆناغی خوێندنی سەرەتاییم تەواو نەکردبوو، پێش رۆیشتن بۆ قوتابخانە، دەبوو سبەینان زوو بچم لە سەرجادەی گەڕەکی سەعدوناوە، نان و پێخۆرێک بۆ ماڵەوە بکرم. فرنییەکی نانکردن لەسەرەوەی دووکانەکەی مام شەوکەتەوە بوو، کە بەردەوام ماستم لێ دەکڕی و کوڕەکەشی هاوپۆلم بوو. بەڵام ئەو لە قوتابخانەی ئەربیل ئولا لەسەرەتای گەڕەکی سەیداوە بوو. دیارە هەر کەسێک مەبەستی بوایە لەو فرنییەی سەرجادەکە زوو نانی بەرکەوێت، کە خاوەنەکەی هەواداری شیوعییەکان بوو، دەبوو بەیانی زۆر زوو، لەبەردەم تەختەکەی پێشەوە ریز بگری. دووکاندارەکانی تەنکێشی ئەو جادەیە، بێجگە لە مام شەوکەت بە زۆری هەواداری حیزبی شیوعی عیراقی بوون. بۆ بەختی من هەرچەند زوو دەچووم، هێشتا چەند ژن و منداڵ و پیاو بەر لە من لەوێ وەستا بوون. لەوەش ناخۆشتر سەرباری دووبارەبوونەوەی دیمەنێکی رۆژانە، ئینزباتێکی سەربازی، بەرێککەوت لەو گەڕەکە و نزیک بە فرنییەکە دەژیا و عارەب بوو. هەموو جارێ بەدوای هەمووماناوە، دیزداشەیەکی سپی لەبەر هەتا گەروگونی تێدا دیار بوو، دەهاتە بەردەم فرنییەکە و کابرای نانەوا، هەر کە چاوی پێ دەکەوت، وەک ئەوەی کێچی کەوتبێتە بەدەنی، هەموو جەستەی بەرانبەر بەو عارەبە دەبوو بە جولە و لەگەڵ بەخێرهینانێکی گەرمی، یەکسەر بە ژمارەی پەنجەی هەر دوو دەست بە بەر چاوی ئێمەوە، نانی گەرموگوڕی دەخستە بەردەمی. سەربازەکەش بە دەموچاوێکی ترشاوییەوە، مۆڕەیەکی لێمان دەکرد و بە زمانی عارەبی بە کابرای نانەوای دەگوت.. بۆسەری مانگ پارەکەت دەدەمێ ! ئێمەش بەبێ ئەوەی یەکێک ورتەیەکی لە دەم بێتە دەرەوە، بە تایبەتی ئێمەی منداڵان هەرنەدەوێرایین فزە بکەین، نەوەک کاکی نانەوا لێمان توڕەبێت و

هەر نانمان بۆ ئەو رۆژە پێ نەدات..! کە لەماڵەوەش لەسەر ئاو و ئاگر چاوەڕێن. ئیتر دەتوانم ئەوە بڵێم لەوێ رۆژەوە بە پراکتیک لەگەڵ لاوازی کەسایەتی مرۆڤی کورد هەژاوم. بە هەمان نموونە لە رۆژهەڵات و باکوور و خۆرئاوای کوردستان، ئەو دەم کە تەمەن بەسەرەوەتر چوو، بەو بەرخوردە پرشەرمەزارییەی خەڵک ئازارم چەشتوە و لە رووی روحییەوە پێی تلاومەتەوە کە کەسی کورد بۆ ئەوەندە لاوازە بەرانبەر بە عەرەب و تورک و فارس.!

## ئەحمەد چەلەبی زەنگین و چەند فلوسێک

پۆلی سێی ناوەندی بووم. باوکم لەپاڵ پاسەوانییەکەی شەوی وەک پۆلیس، شرە دووکانێکی نوێی لە گەڕەکی سەعدوناوە دانابوو کە عەتالی و فرۆشتنی میوە بوو. ئەو رۆژە یەک لۆری شفتی کڕیبوو، شووتی لەبەردەم دووکان قۆمەت کرابوو. بە رێکەوت کاتی نیوەڕۆ بوو، هەر بە تەنیا من لەوێ بووم. لە ناکاو (ئەحمەد چەلەبی) کە ئەو دەمی یەکێک لە زەنگینە هەرە دیارەکانی هەولێر بوو. چەندان کارگەی ئارد و بوزـ سەهۆل و شتی دیکەی هەبوو. بە خۆی و قەمەرە سپییەکەی کە مارکەیەکەیم لە بیر نەماوە و لێم پەیدا بوون. شوفێرەکەی هاتە خوارەوە و خۆیشی لە پێشەوە دانیشتبوو، جامی سەیارەکەی هێنایە خوارەوە و گوتی.. کورم چار شفتی باشم بۆ بکێشە و بزانە پارەکەی چەندە. منیش بە دەستوبرد و بە هاوکاری شوفێرەکەوە، ئەو کۆمەڵە شفتییەم هەڵبژارد. یەکە بە یەکەی شوتییەکانم بە تەرازو کێشا، بە دەفتەر و قەڵەم حیسابەکەم بۆ کرد و گوتم.. ئەوەندە دەکات. دوای پێدانی پارەکەی لەگەڵ شوفێرەکەی شفتییەکانمان خستە پشتەوەی ترومبێلەکەیانەوە و یەکسەر رۆیشتن. بەڵام دەتوانم ئەوە بڵێم، تەنیا چەند خولەکێک تێپەڕیبوو، دوبارە ئەحمەد چەلەبی بە سەیارەوە لەو بەری جادەکە پەیدا بوونەوە. من هەر واقم وڕما و لە دڵی خۆمدا گوتم.. دەبێ شوتییەکان سپی دەرچووبوون ! کە هەر لە لای خۆمەوە... کێڕا گەیشتنەوە ماڵ ! لەو خەیاڵەتانە دابووم، چەلەبی گازیکردم.. کورم وەرە وەرە. یەکپێ چوومە بەردەمی و پێی گوتم.. کورم حسێبەکەت دە فلوست زیادە وەرگرتووە ! منیش نەمهێنا و نەمبرد، وەڵامم دایەوە.. قوربان ئەوەندەی بەترومبێلەکەت چووی و هاتییەوە، بای چەند دە فلوسی بەنزینت سەرف کردووە. کەچی ئەو بەبزەیەکەوە گوتی.. کورم حسێب حسێبە !

ئیتر دەبوایە ئەو دەمی تێبگەم دەوڵەمەند بوون بەو جۆرە دەکرێ، نەوەک بە دەستبڵاوی و تەخشان و پەخشانکردن.

## کەلەشی فڕۆکەی جەنگی و سەیرانی مێردمنداڵان

ساڵی ١٩٦٣ بەدوای کودەتا شومەکەی بەعسییە خوێنڕێژەکانەوە، شەڕی لەشکری سوپای عیراق لەگەڵ پێشمەرگەکانی کورد گەرم بوو. هێزەکانی ڕژێم لە هەموو بەرەیەکەوە بە ئاگر و ئاسن پەلاماری باشووری کوردستانیان بەڕێ کردبوو. بەڵام هێزی پێشمەرگە بە بڕوابوونی ئەوێ ڕۆژێ، بەدڵ و بە گیان ڕووبەڕووی ئەو شاڵاوە ببوونەوە و لە زۆربەی شەڕەکان نەبەردییان دەنواند.

ئەو دەمە تازە خوێندنی سەرەتاییم تەواو کردبوو. چووبوومە ناوەندی کۆماری لە لای مەڵبەندی کۆنی قەزای هەولێر و تەک نەخۆشخانەی کۆماری هەولێر. ڕۆژەکە دانی بەیانی بوو، هەواڵی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەیەکی جەنگیی حکومەتی عیراقی، لە ئاقاری نێوان گوندەکانی شاوێس و بێرکۆت وەک برێشکە بەناو خەڵکدا بڵاو ببوەوە. ڕاستە حکومەت بە هێزی سەربازی چەکدار دەوروبەری فڕۆکە جەنگییە کەوتوەکەی گرتبوو. کەچی ئێمەی مێردمنداڵ چ بەپێ یاخود پایسکلسواری خۆمان گەیاندە ئەو دەوروبەری. لە دوورەوە بە تامەزرۆیی سەیرمان دەکرد و پێی شاگەشکە ببووین. بۆ ڕۆژی دواتریش لەگەڵ چەند برادەرێک بە سواری پایسکل بۆ هەمان هەوار چوینەوە و دیتمان کەلەشی فڕۆکەکە گسکی لێدراوە. تەنیا لە شوێنی کەوتنەکەی وردەشوشە و پارچەی بچوک لە ناو زەوییەکە ماوە. دیار بوو هێزی سەربازی شەوەکەی لەو شوێنەیان گواستبوەوە. ئیتر ئێمەی هەرزەکار بە پایسکل لێخورین کردمانە قۆشمە و بەرەو لۆفەکانی بانەمان (مەسیف) پەیدانمان لێدا. لەمسەرەی لای هەولێرەوە بە زیاتر لە دوو کاتژمێران بە هەناسەبڕکێ گەیشتینە ناوەراستی لۆفەکان. بەڵام هەموومان کە دەوری پێنج پایسکلسوار و سەرکردەکەمان مزۆ لەشکری بوو کە ئێستاش بەژیان ماوە. لەسەری لۆفەکانەوە بۆ بەرەبەری کاتژمێر هەشتی شەو گەیشتینەوە هەولێر و ئەوە یەکەم سەرچڵی ژیانی هەرزەکاریم بوو.

# قوتابی لەچاوی ئەوێ ڕۆژێدا

تەمەنی هەرزەکاری من بۆ تێکەڵەیەکی شپرێو قژی سەری خۆی هۆنیوەتەوە. منداڵێک لەو پەڕی ژیانی سادە و ساکاری گوندی ناو ڕەشماڵی هەواری بنەگەی مێگەلی مەڕداری. لە سێبەری خێزانێکی زەنگینی ئەو بارودۆخە کەوتوومەتە گاگۆڵەکردنەوە. ئەوجا بە هۆی بڕیارێکی بە پەڵەپرۆسکێی باوکە تەنیا بارەکەم. لە ناکاو سەرم لەناو زاقوزریقی شاری هەولێری ساڵی ١٩٥٧ دەرهێناوە. بەدوای توانەوەی سەرمایەکەی باوکم، بڕە بڕە سەرمان لە دوو ژیانێکی پڕ لە گێرەوکێشە ناوە. ژیانێک تژی لە گزوری و نەبوونی بە تایبەتی دوای ئەوەی باوک و دایکم ئەو گوژمە پارەیەی لە ناو کوێرەوەری ژیانی گوندی بەسەریەکەوەیان نابوو. لە سێبەری باوکە نەخوێندەوارەکەمان هەژاری و کارکردنی بەردەوامی پاڵ خوێندنی قوتابخانە و لە هەمێز هەولێر گەورە و گەورە بووم. بەبێ ئەوەی ڕێنیشاندەرێکم هەبێت، لاسارانە و بە چاولێکەری و کاریگەری دەوروبەر بەری خۆم لە سیاسەتکردنی کاڵفامانە کەوتومەتە مەلۆکردن بۆ سەر گیشەی خەرمانی سیاسەتچییە جامبازەکان، هەمیشە تەقەی سەرم نەهاتووە.

لە ساڵانی کۆتایی قۆناغی خوێندنی سەرەتایی لە ریزی یەکێتی قوتابیان بەشدار بووم. کۆبوونەوەکانمان ئەو دەمەش تابلێی هاکەزایی بوو. وەک پێشتر گوتومە هەمووی باسکردنی چالاکی پێشمەرگە و بزاقی چەکداری شاخەکان بوو. وێنەی پێشمەرگە بە چەکەوە لە ناو خەڵک سەرتۆپی ئالوگۆڕی ئەدەبیاتی ئەو ڕۆژە بوو. ئەو وێنانەی بە هەر ڕێگایەک بوایە دەستمان دەکەوت و بە هەموو لایەک دەبەخشرایەوە و دەستاودەستی دەکرد و تێرایی تامەزرۆیی خۆمان لێ مشت دەکرد. بەو هەرزەکارییە چالاکیمان دەنواند، لەوەی هەوادار و ئەندامی نوێ لە ناو قوتابیان زیاد بکەین. دەبوو ئەو قوتابییەی قسەمان لێ وەردەگرت لە ئامادەبوونی بۆ هاتنە ریزی ی ق ک، لە پێشەوە بە دەستی خۆی نامەی ئارەزوومەندانەی بۆ ئەو کارە بنووسیبایە. بە ڕاپۆرت بەرز دەکرایەوە و بەردەوام وەڵامی ڕازیبوونی شانەکانی سەرەوەی بۆ دەگەڕایەوە. ئەوجا ئەو قوتابییە لە شانەیەک بەشداری کۆبوونەوەی دەکرد.

یەکەمجار لە ڕێگای غازی خۆشناو بە هۆی چالاکی خۆمەوە کرامە سەرشانە و دەبوایە دوو هەفتە جارێک کۆبوونەوە بکەین و ڕاپۆرتی کۆبوونەوەکەمان بەرزبکەینەوە. ڕاپۆرت بەم جۆرە دەنووسرا.. بۆ نموونە

راپۆرتی کۆبوونەوەی شانەی فلان

بۆ فلانە لیژنە

سڵاو..

شانەکەمان لە شوێن و بەرواری دیاریکراو کۆبوونەوەی کرد

دەبوو ئەوخاڵانە لە خۆ بگرێت

_ خوێندنەوەی وەڵامی راپۆرتی کۆبوونەوەی رابردوو

_ خوێندنەوەی ئەو بەیان و بڵاوکراوە و چالاکییانەی گەیشتوو

_ چالاکی ئەندامانی شانەکە

_ پرسیار و وەڵام

_ پێشنیار

_ رەخنە و رەخنە لەخۆگرتن

_ ئابوونە و پیتاک

زۆرجاریش روویداوە کۆبوونەوەکە بەچرکەیەک وەستان بۆ گیانی شەهیدانی کوردستان، یاخود چڕینی سرودی ئەی رەقیب دەستی پێکردووە، بەتایبەت ئەگەر لە شوێنی گونجاو و دوورەمەترسی دامودەزگاکانی حکومەت بوایە.

## قۆناغی خوێندنی ناوەندی و یونس علی جمعە

لەو ساڵەی لە قۆناغی خوێندنی ناوەندی کۆماری هەولێر لە پۆلی یەک جێگام گرتبوو. قوتابییەک کە لەگەڵ من لە هەمان پۆل دا بە ناوی یونس علی جومعە و دانیشتوی گەرەکی تەیراوە بوو. یەکەم کەسێک بوو هەر زوو لە نزیکەوە وەک هاورێیەکی نوێی سەرراست تێکەڵ بە ژیانم بوو. یونس بەدوای غازی خۆشناوەوە، کە لە دوا ساڵی قۆناغی خوێندنی سەرەتایی برادەری گیانی بە گیانیم بوو. دواتر بە یەکجار لێم بزر بوو، هەنوکەش نەمزانی بەکوێ گەیشت و چی بەسەر هات..! یونس بۆ ماوەیەکی هەتا لە قوتابخانە و شار بوو. جێگای غازی بۆم پڕ کردبووەوە. رۆژێکیان بۆ کۆبوونەوەی لیژنەی قوتابخانەکە پەیوەندی پێوە کردم. عەسرەکەی بە یەکەوە چووینە ماڵێک لە گەرەکی سێتاقان. لەوێ سەیرم کرد چەندان قوتابی هەمان قوتابخانە دانیشتبوون. ئەو برادەرەی کە کوڕی ماڵەکە بوو، لە قوتابخانە پۆلێک لەپێش ئەزەوە بوو، ناوی عەبدولا بوو کە

دوایی بووه مامۆستای سەرەتایی و نازانم بەچیگەیشتووە. لە ناو قوتابییەکانی ئەو کۆبوونەوە، جەمیل رەنجبەر، حسام بەرزنجی، علی جوکل، یونس خۆیم لە بیر ماوە. داخەکەم ماوەیەکی زۆر بە یەکەوە نەماینەوە و کەرتبوونی پارتی ئەو زەمان، ئێمەی قوتابیانیشی گرتەوە. هەر من و جەمیل لەو برادەرانەی سەرەوە جیا بووینەوە و بە ناوی یەکێتی قوتابیانی کوردستان درێژەمان بە کار و چالاکی رێکخراوەیی خۆمان دا و بە رێکەوتی زەمانە و دوور لە هەر جۆرە هەست و نەستێکی بەرجەستەکراو لە سێبەری بەرهەژموونی برادەرایەتی بەگەر رەوتی باڵی م. س _ جەلالی کەوتین.

## سەردانی گوند و بەسەرهاتێک

لەو ساڵەی چووم قۆناغی ناوەندی، خوێندن بە زمانی عارەبی بوو. زۆربەی قوتابییەکان ئاستی زمانی عارەبیمان زۆر نزم بوو. بەڵام بەشێکی مامۆستاکان کە کورد بوون، بە هەموو شێوەیەک هاوکارمان بوون. لە نموونەی مامۆستایان زوبێر بیلال، باکووری، مەجید ئاسنگەر، حسێن رەشوانی... هتد

لەو رۆژاندا، جارێکیان بەرێککەوت بە کاریک لەگەڵ مامەکەم کەماڵیان لە گوندی بوو. بۆ گوندی شێخانان چووین و بۆ رۆژی دوایی یەکێک لە خزمەکانی گوند کۆچی دوایی کرد. پرسەکە لە ماڵی مامەکەم دانرا. دیارە دەبوو مەلای گوندی بێت، بۆ بەرێوەچوونی پرسەکە ناوە ناوە قورئان بخوێنی. مەلاکە بەناوی مەلا عەبدوڵڵای عەوە ناسرابوو. لە یەکەم دەستپێکردنییەوە، سەرتاپای ئایەتەکانی بە هەڵە خوێندەوە و تێکەڵ و پێکەڵی دەکردن. منیش خۆم بۆ نەگیرا و هاوارم کرد.. وەڵڵا غەرەتی کرد و ئەوە ئەوها نییە. مامم کە لە نزیکمەوە بوو، هەتا زللە گرتی لە بناگوێمی دا و دەریکردمە دەرەوە. ئیتر بۆ خۆم لە پەنا سێبەرێک بە کزی دانیشتم. هەتا ئەو دەمەی کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ بوو. بۆ ئەوەی دڵم بدەنەوە، بۆ سەرسفرەکە بانگیان کردم و هەر کەوتمەوە تەک مامم و بەرانبەر مەلای ناوبراو. کەس پارووێکی نەخواردبوو، مەلا ماڵی ئاوەدان بێت، گوتی.. عەزیز ئەوە لەبۆ لە عەباست دا، خۆ قسەکەیەکی خراپی نەکرد. من هەر ئەوەتە سەروگوێی کەلیمەکان دەشکێنم. دڵنیام ئەو لە مەکتەب خوێندوویەتی و خوێندەوارییەکەی لە من باشترە

# ئەوەی ئەمڕۆ بەرهەمی دوێنێیە

هەر کە سەراسیمەی خەیاڵ دەمباتەوە و ئەوێ ڕۆژانم بە بیر دێنێتەوە. دڵم بە خۆم و خورتەکانی ئەوێ ڕۆژێ دەسووتێ، ئەوانەی دەممان لە سیاسەتی کاڵفامانەی بەردەستی وەستای سیاسەتچی کوردی دەدا. لەوەی چەند بێمنەت شامان بە سەپانی خۆمان نەدەزانی. بێپەروا لە هێز و ستەمی دەسەڵاتی ڕژێم، دامودەزگا سەرکوتکەرە هەمەچەشنەکانی عیراق ! بەو دەست و پێ سپییەتیەی باوەشی خەبات و ڕێکخستنی نهێنی. ئەوەندە تامەزرۆی دڵسۆزی خۆڕسکی وڵات و خەڵکی _ کورد. ئەوەندە هۆگری پاکی و ڕەوشتبەرزی هەڵقوڵاوی ڕیزەکانی تێکۆشان لە دڵ و دەروونمان چەکەرەی کردبوو. هیچ هێزێک، هەر چەند دڕندە و ئازاردەر و ئەشکەنجە بەخش بوو. نەیتوانی لەو خەباتە سەرەتاییانە، ورە بەو خەڵکە بەربدات. بگرە لە بەرانبەر موقامەت و خۆڕاگری بەرتاڤگەی شکۆفەی کۆششی ئەو بەشە گورجوگۆڵەی بەناو کوردایەتی. دوژمن تەنگەتاو ببوو. بەوەی لەوێ ڕۆژاندا بۆیان نەدەکرا ئەو خونچانە بەیەکەوە هەڵوەرێنن. سەرباری هەموو تەلاشێکی دەستەمۆکردن لەلایەن ڕژێمە یەک بەدوای یەکەکانی عیراق، خورتەکانی گوند و شارەکانی کوردستان، دەستە دەستە دەستلەملانێی خەباتی شاخ و شار دەبوون. بە تاک و بە کۆ بەبێ سڵەمینەوە قۆشمەی مەدالیای شەهیدبوونیان دەکرد. هەنوکە یادەوەرییەکانم تەتەڵە دەکەم. بە بەژن و باڵای ژیانی ئەمڕۆیان دەگرم. گەنج و لاوی کورد لەوێ ڕۆژاندا، هەموو سەروەت و سامانەکەیان لە خەباتکردن بۆ وڵات و میللەتەکەیان بێجگە لەپاکی و دڵسۆزی دەروێشانەی بێپەروا، ڕووتوڕەجاڵ لە هەر جۆرە خۆ ئامادەکارییەکی بەرنامەئامێز، دوور لە خۆ چەکدارکردنێکی کەلتووری و مەعریفی بەرچاو، کە مایەی لەدایکبوونی نەوەیەکی تێر بە زانست، هۆشیاری سیخناخ بە وڵاتپارێزی لەپێناوی هەڵهێنانی دوارۆژێکی گەشی بەدەمەوە بێت.

# وێردی سەر زمان و مێشکم

راستە ئەز کە لە خێزانێکی نەخوێندەواری تاسەرئێسقان موسلمان گەورە بووم. بەڵام وەک بەهرەیەک لە تەمەنی ژیانی منداڵی گوندیشەوە، سەرم نەهێناوەتە بەرێ و لاساریم نواندوە کە بۆ لای ئایینەوە مەیلم جلیت بکرێت. بۆ چوونە مزگەوت و خوێندنی حوجرەی فەقێتی بە منداڵی خۆم سەرم نەهیناوەتە بەرێ. گوزارشتەکانی ئایین لەناو دڵ و دەروونم چەکەرەیان نەکردووە. لەگەڵ گەورەبوونیشەوە بە زۆرداریش تامەزرۆی نوێژکردن و بە رۆژوبوون سەرخۆشیان نەکردووم. مەگەر ئەو رۆژانەی لێ دەرچێت، کە باوکم بە شەق و زللە ناچاری کردبم. بەڵام کە لە سێبەری خوێندن رووم کردووتە بەغدادی پایتەختی عیراق، لەو کۆت و زۆردارییانەی باوکم دەرباز بوومە و زۆرتر هەستم بە ئازادی مرۆڤبوونی خۆم کردووە. بە خۆم بریاری خۆم داوە کە چۆن بیر دەکەمەوە و باوەڕ بە چی دەکەم و هەتا مردنیش بۆی سەرفرازم.

دیارە لەپێشەوە بەرخوردی بەشێکی زۆری بەناو ئایینداراەکانی کۆمەڵی کوردەواری، بەتایبەت مەلا و سەید و شێخەکان. کە ئەو ئایینەیان کردووەتە گەنجینەی خوداپێداو، بەبێ ئەوەی بەشی زۆریان کارێک بکەن، بۆ بژێو پەیداکردن و دڵۆپە ئارەقەیەک بڕێژن. کەچی زۆریەیان پۆشتە و زگتێرن. لەسەر دەسکەوتی ئارەقەی نیوچەوانی خەڵکانی دیکەوە دەلەوەڕێن. ئەوجا ئەوەی بە خۆیان و بۆ خۆیان رەوایە، بۆ خەڵکی تر کوفر و بێدەستنوێژییە. زۆری لەسەرناڕۆم و بۆ ئەوێ رۆژێی منداڵیم دوو نموونە دەگێرمەوە.

ماڵمان لە شاری هەولێر بوو. دەستەخوشکەکانی دایکم لەو ژنە خزم و ناسیاوانەی لە گوندی دەژیان، ناوناوە کە رێگایان بکەوتایە شاری، سەردانی ماڵی ئێمەیان دەکرد و بە دیداری دایکم شاد دەبوونەوە. ئەوێ رۆژانم لە بیرە و بە هۆی هەراش نەبوونم. ئەو ژنانە بێپەردە هەموو شتە ناخۆش و خۆشەکانی ژیانی گوندییان وەک خۆی بۆ دایکم دەگێرایەوە. من لە پەناوە دەم بیست. بەتایبەت پورە کابان هەبوو، بە هۆی لە ژیان نەمانی مێردەکەی، بە بێوەژنی و بە ناچاری بۆ پەیداکردنی ژەمەخواردن بۆ کورپە ساوایەکانی، ببووە نانکەر و جلشۆری ماڵی شێخی ردێن تەوشولە. ئەو شێخەی بێجگە لە خۆی چەندان کوڕی گەورەی لە ماڵەوە هەبوو. گێڕانەوەکانی پلکە کابان ئێستاکێش کزەم لە جەرگەوە دەهێنێ. کە چۆن هەتا جەنابی شێخ خۆی لە شانی کوڕەکانیشیەوە، لە پەنا هەرزالەی پێخەف هەڵگرتن، لەبەر فەرشەی نان پانکردنەوە، لەتەک تەشتی

هەویرکردن، لە قوژبنەکانی سەرشۆرکی کۆرکردن، بگرە هەرکاتێک ئەو بێوەژنە بەستەزمانە، بۆ کارکردن رێگای کەوتووتە ماڵی شێخ، بە شەو و تاریکەشەوان، وەک زەنگەسۆرە یەک بەدوای یەک تێی وەرهاتوو بەڵام بە پەنادزە و لە یەکتر ئاشکرانەبوون، وەک ئەوەی نۆبەتیان لێ گرتبێت، بەو پەڕی دڕندەیی لاقەیان کردووە و هەموو جارەکانیش گەفییان لێ کردووە کە ئەگەر دووگیان بوو، زوو زگەکەی لەبار ببات..! بە منداڵی خۆم تەزی بووم. ئەوێ رۆژێ هەر ئەوەندە بە دایکم دەکرا، کە خۆی و کچەکانی ببڕای ببڕای هاتوچۆی ئەو ماڵەشێخەی نەکەن و باوکیشم دڵی لێیان پیس کردبوو..

وێنەی دووەم کە ئێستاش وا دەزانم بە بەرچاومەوەیە. خزمێکی کۆلکە مەلامان هەبوو، هەموو جارێ کە لە گوندی بهاتایە شاری و ژنە کلۆڵەکەی لەگەڵ بوایە. ئەو ژنەی لە مەلا زۆر جوان و رێکوپێکتر بوو. ئەو دەمی بەبێ یەکو دوو بۆ ماڵی ئێمە دەهاتن. بەڵام بەو منداڵییەی خۆم هەستم کردبوو، مەلا لە رێگا لەگەڵ ژنەکەی شان بەشان ناڕوات. بگرە دەیان هەنگاو بە پێشی دەکەوت و ژنەی بەستەزمانەیش دەبوو وەک کوچکوچە لە دووری چەند هەنگاوێکەوە بەدوای مەلاوە _ بێت. منیش بۆ ئەوەی لە پێشەوە شەڕ بە مەلا بفرۆشم و بەوە ڕانەگات قسەی گەورە گەورە بۆ بابم بکات. لەوەی دەبێ ئێمەی منداڵیش نوێژ بکەین و کە میوانمان دێت، مەسینە و دەستشۆر ئامادە بکەین، تاکو ئاو بەدەستی میوان دابکرێت. کە من لە منداڵیمەوە زۆرم رق لێ دەبۆوە و هەرکە گەورەش بووم، رێگام نەدا خوشک و براگچکەکانیشم ئەو شتە بکەن.

کە لە دەرگەی دەرەوەی ماڵەوەمان دەدرا، لە بۆشایی بنی دەرگەکەوە تەماشام دەکرد. ئەگەر ئەو مەلایە بووایە، کە بەلچکی کەواو و سەلتە شپڕێوەکەی دەمناسییەوە. جارێ دەرگەم لێ نەدەکردەوە و _ دایکیشم لە دڵەوە پێی خۆش بوو _ بۆ سەربان غارم دەدا و لەناو دەلاقە کراوەکانی ستارەی سەریان سەیرم دەکرد، کە مەلاژن لە دەرگە نزیک دەبوەوە، ئەوجا بەراکردن دەهاتمە خوارەوە و دەرگەم لێ دەکردنەوە. بۆ جاری یەکەم مەلا بەو گەمەیەی نەزانی، بەڵام کە ژنەکەی لەتەکییەوە وەستابوو، بەوپەڕی توڕەیی تێێرادەخوڕی.. چەغە سەگە دوورکەوە، دوورکەوە.. ژنەی بەستەزمانیش سەری لەبەرخۆی نابوو، ورتەی نەدەکرد..! جاری دووەمیش رێکەوت، هەمان بەزمم بە مەلا کرد و مەلا لە فیتی من گەیشت ! زۆرم لێ توڕە ببوو، بەدەم نانخواردنی نیوەڕۆوە

هەرپشووی خۆی دەخواردەوە. کە باوکم هاتەوە و لە بەردەمی ئەو و زۆر بێشەرمانە، لە ناکاو هەتا شەقەزللە گرتی لە لاروومەتی سرەواندم و سەربردەکەی بۆ باوکم گێڕایەوە و گوایە ئەتکم کردووە و چیتر پێ ناخاتە ماڵی ئێمەوە. باوکم لە دڵەوە ئەو یارییەی منی پێ خۆش بوو، زۆریش بەوە قەڵس ببوو کە مەلا بەبێ هیچ بیانوییەک ئەو زللەیەی لێ دام. باوکم بە توڕەیی بە مەلای گوت.. کەس میوان لە ماڵی خۆی دەرناکات، هەر کاتێک هاتی ئەوە بەخێر بێی ! ئەگەر چیتریش بۆ ماڵی من نەهاتی، بەخێر نێی..!

## کەرەوزی قوتابخانە و ئەندازیاری زەنگین

لە ساڵەکانی تەواوکردنی قۆناغی خوێندنی سەرەتاییمدا، بەیانیان شیر و هێلکە و سەوزەی وەک کەرەوز و تەرەتوله، هەندێ ڕۆژانیش میوەیان پێمان دەدا. ئەو ڕۆژانەی کەرەوز لە ناو تەشتیکی پڕ ئاو، گیاوگوری ڕۆژ بوو. زۆربەی قوتابییەکان ئەو کەرەوزەمان نە دەخوارد. قوتابییەک هەبوو ناوی سەیفەدین بوو کە قەڵەویش بوو. بلەز هەموو کەرەوزەکەی بە تەنیا نۆش دەکرد. ئێمەش هەموو بە چەپڵەڕێزان زیاتر هانمان دەدا.

ڕۆژان هاتن و تێپەڕین، من لە خوێندن لەگەڵ سەیفەدین دابڕام. ئەو چووە ناوەندی زازا و بەندەش لە ناوەندی کۆماری بووم. ئەگەر بەرێککەوت یەکترمان بدیتایەوە، دەنا هەتا لە زانکۆش، من لە بەغداد و ئەو لە شاری مووسڵ بوو. دوای زەمەنێکی زۆر، من تازە لەگەڵ نەجیبەخان هاوسەرگیریمان کردبوو. واتە بەهاری ساڵی ١٩٨٤ کە هێشتا پێشمەرگە بووم و بە هۆی بریندارببوونەکەمەوە لە مانگی دوازدەی ساڵی ١٩٨٣ەوە، زۆرتر لەناو شاری هەولێر بە پەنادزە و لە شانیی چارەسەری بریندارییەکەم دەژیام. ڕۆژێکیان لەلایەن دەستەخوشکێکی نەجیبەوە کە مەسیحی بوو. لە ماڵی خۆیان لە عینکاوە بانگ کرابووین. بۆ دەمەدەمی نیوەڕۆکەی خۆمان گەیاندە بەردەم ماڵەکەی ڕەسول گەردی لە گەڕەکی مستەوفی کە هەنوکە شوێنەوارەکەی کراوەتە ئەپارتمان. لەو سوچە ترومبێلی نەفەرات بۆ عینکاوە دەچوو. لەسەر شۆستەکە چاوەڕوانی پاسەکەمان دەکرد. گوێم لێ بوو یەکێک لەناو دوکانێکەوە هەر بە عەباس.. عەباس.. هەتیم ئەوە لە بۆ جواب نادەیتەوە ! قسەی دەکرد. ئەفەندییەکی قیت و قۆز کە بەو گەرمایە قاتی لە

بەرەو بە پێکەنینەوە رووبەڕوومان هات و دەیگوت.. چیە ئەوە نامناسییەوە..! کە زیاتر لێمان هاتە پێشەوە، دەستی درێژکرد و تەوقەیەکی گەرمی لەگەڵ کردم و بە چرپە پرسی.. جارێ ئەو کچە شۆخە کێیە لەتەکتەوە! منیش بە دەنگێکی تەواو وەڵامم دایەوە.. ئەوە نەجیبەی هاوژینمە و تازە زەماوەندمان کردووە. سەیفەدین لەپێشەوە پیرۆزبایی لێ کردم و هەر بە پێکەنینەوە دەستی گرتبووم، وا بزانم هەر نەتناسیمەوە ! چییە ئەو سەیفەدینەت لە بیر چووەتەوە، کە هەموو کەرەوزی پۆلەکەمانتان دەرخوارد دەدام..! یەکسەر وەک فیلم ئەو دیمەنەی ئەوێ رۆژان هاتەوە بەرچاوم. بەڵام ئێستاکێ ئەو سەیفەدینە زەلامێکی کەتەی تێکسمڕاوە، لەزگبوو بڕوا بە چاوی خۆم نەکەم. کەچی گەرمتر باوەشمان بە یەکتریدا کرد و تاموچێژی ئەوێ رۆژانمان کردەوە. سەیفەدین خێرا چوو لە دووکانەکە دوو ساردی ناوشوشەی بۆمان هێنا و پرسی، ئەوە بۆ کوێ دەچن!

بۆ عینکاوە دەچین. سەیرم کرد سویچی سەیارەکەی دەرهێنا و فەرمووی لێ کردین بەرەو ئەو مارسیدیسەی کە تۆزێک لەولاترەوە لەسەر جادەکە رایگرتبوو. لە رێگا زۆرمان قسە کرد و گێڕایەوە.. ئەو ئێستا ئەندازیارە و لەوڵاتێکی خەلیج کار دەکات. تا بڵێی بارودۆخی ژیانی بە سەرەوەیە. بە داخەوە بوو کە بەیانی دەگەڕێتەوە و بوار نابێت، زیاتر یەکتری ببینین. هەرچەند زۆری تەکلیف کرد کە ئێوارەکەی لە یانەی ئەندازیاران بەیەکەوە بین. بەڵام ئێمە گفتمان بەو خێزانە دۆستەی عینکاوە دابوو کە شەویش لە لای ئەوان دەمینێینەوە. سەیفەدین لە رێگا بە نەجیبەی گوت.. ئەو عەباسە هەر لە سەرەتاییەوە خەریکی سیاسەت و کوردایەتی لێ دەباری. ئەوەی من بزانم بە هۆی رەوشتەجوانەکانی خۆیەوە نەبووە بە هیچ! منیش هەرگیز تخونی شتی لەم جۆرە نەکەوتووم. بە هۆی سەروەت و سامانەکەمەوە، کامە مەسولی هەرەگەورەیانە، خۆیان بە دوامدا دەنێرن و دەعوەتم دەکەن. کە دڵنیام خەڵکە ماندوو و تێکۆشەرەکەی دەوروبەری خۆیان، دەبێ بەپشی پشی ئەو جەنابی مەسولە ببێنن. ئەم گێڕانەوەم بۆ ئەوەیە کە بۆ ئەم رۆژگارەی هەنوکە، وەک نەخشی سەر بەردە، مەسولە دەوڵەمەندەکانی سەرکەلاکی ماندووبوون و قوربانی خەڵکی بێشومار، کتومت بەرخوردەکانیان بەو ڕەنگە ورد دەکەنەوە..

# هەڵسوکەوتی منداڵانە و بارگەی نەفامی

لە دوا ساڵەکانی خوێندنی سەرەتاییمەوە، چووبوومە ریزی یەکێتی قوتابیانی کوردستان و چالاکیم هەبوو. ئەوە بوو لە قۆناغی خوێندنی ناوەندی وەک ئەندامی لێژنەی قوتابخانەی ناوەندیی کۆماری هەولێر دەست بە کار بووم. لە پۆلەکەی خۆشمەوە شانەیەکم بەرێوە دەبرد، رەشاد و رزگار و فەریک بوون. ئەو قوتابییەی دوایی بۆ ئەو دەم لە لایەن هەرسێیەکەی دیکەمانەوە بە ناپەسند دەژمێردرا. چونکە بەو مێرد منداڵییەی خۆیەوە _ من باسی چۆنیەتی بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی ئەوێ رۆژێی خۆمان دەگێڕمەوە _ ئەو کوڕە بەرچاوە دەستی لەگەڵ هەموو یەکێک تێکەڵ دەکرد. بە تایبەت زۆربەی ئەوانەش بە دەوروبەرییەوە بوون لە خۆی هەراشتر بوون. هەتاکو وای لێهات جارێکیان رەشاد، کە خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری ناحیەی قوشتەپە بوو. لە پەنا دیواری پشتەوەی قوتابخانەکە، کە ئەو دەم چۆڵەوانی بوو، لە شانی ئەو قوتابییانەی دیتبوو کە هەم زۆر لە ئێمەمانان بەتەمەن گەورەتر و هەمیش نەیاری یەکێتی قوتابیانی کوردستان بوون. تەنیا ئەوەبوو لە بواری وەرزش لە هەموو قوتابییەکانی ناوەندییەکە چالاکتر بوون. ئیتر رەشاد هەر ئەو رۆژە، زۆر بە توڕەیی منی ئاگادار کردەوە کە ئەو چیتر لە ریزی قوتابیانی کوردستان کار ناکات، ئەگەر ئەو فەریکە ئەندامی ئەو رێکخراوە بێت. منیش لەو دەمی هاوڕای بووم و راپۆرتێکمان بۆ سەرەوەی خۆمان نووسی، لەو بارەوە چوغلمان کرد. داوامان کرد دەبێ لە ریزی یەکێتی قوتابیانی کوردستان دەربکرێت. ئەوەبوو لە لیژنەی سەرەوەی ئێمەش هەمان را و بۆچوونیان هەبوو. ناوبراو بە بڕیاری لیژنەی شار لە ریزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان دوورخرایەوە. پێڕاگەیاندنیشی خرایە ئەستۆی من و هوشیار فەتاح کە ئەویش ئەندامی لیژنەی ناوەندییەکەمان بوو. برادەری مەبەستمان لەناو قوتابیان جیا کردەوە و ئەو بڕیارەمان پێگوت. زۆر تێکچوو و لەحەژمەتان دەستی بەگریان کرد و بە چاوی پڕ لە فرمێسک ئێمەی بە جێ هێشت و چیتر توخنمان نەکەوتەوە.

زەمەن هات و تێپەڕی ئەو کوڕەم کەمورزۆر بەرچاو نە دەکەوت. هەتا دواتر لە رۆژەکانی ئەزمەی رێکخستنەکانی کۆمەڵەدا، بە رێکەوت لە مواجەهەیەکی زیندانییەکانی کۆمەڵە لە ئەبوغریب _ ی ١٩٧٨، رووبەڕوو یەکترمان دیتەوە و دواتر لە رێگای هێڵێکی رێکخستنەکانی دەوروبەری هەولێر زانیمەوە، کە لە رێکخستنەکانی کۆمەڵەدا بەشدار و

چالاکە. فەریک دواتر بووە پێشمەرگە و مرۆڤێکی قارەمانی لێ دەرچوبوو، بەداخەوە لە پێشمەرگایەتی شەهید بوو

## ئەکرەم زەرگە و کۆلێرە بە ڕوون

هەنوکە لە تەمەنی سەرووی شەست و پێنج ساڵیدام. کە بە سەرجەلەی دیمەنەکانی ئەزمونی ژیانی منداڵیم دادەچمەوە. ئەو سادە و ساکارییەی بەرۆکی ژیانی خێزانێکی پڕ لە گۆڕانکارییە ئانوساتەکانم بیر دەخاتەوە. بە تایبەت لە رووی گوزەرانی ژیان و داوێنی بنەماڵەیەکی نەخوێندەواری و کوشتەی دەستی دارەتە سەقەتەکانی ئەو کەلتورە بە زۆر داسەپێنراوەی خەساندنی مێشک و هەر جۆرە بیرکردنەوەیەک ئەگەر هەبوبێت، ئەنجام بووە. بەڵام دارەتێک لە لایەک تژی لە راستگۆیی، چاوتێری و جۆرە ژیانێکی سەربڵندانەی بێ فرووفێڵی رووکەش بەڵام لە پەنا گیشەی ئایین لەو ئاووهەوایەدا بەزۆر فێری درۆکردن و چاوچنۆکی، لەبیرکردنی هەستونەستی مرۆڤبوون. پەلەپروسکێی دەم چیراوکەی ژیانێکی ساردوسڕ، پشت بە خۆ نەبەستن. نەبوونی هەر جۆرە تۆلەرانسێک لە چۆنیەتی بەرخوردی هەڵسوکەوتەکانی ژیانی رۆژانەدا. نەبوونی هەر جۆرە بیرکردنەوەیەک و زاڵبوونی برۆ بدە بەرێ زمانیحاڵ بووە و وەک زیوان تێکەڵ بە رەوسەی هەڵسوکەوتمان بووە و پاکیِ سروشتی ژیانی پێ ناشیرین بووە.

لێرەشەوە دیمەنی ئەو رۆژانەی کە بە سەردان دەچوومەوە گوندی شێخانان، بۆ لای ماڵی مامەکەم و ئامۆزاکانم. لە ناویاندا ئەکرەم زەرگە کە دواتر بە حاجی ئەکرەم ناسرا. سەرباری ئەوەی لەمن بچوکتر بوو. بەڵام هەر لە تەمەنی منداڵییەوە نێوانمان خۆش و پڕ لە یەکتر خوێندنەوە بوو. یەکێک لەو شتانەی ئەوێ رۆژێی گوندی، تەندورکردنەوەی بەرماڵان بوو. کە لە نێوان چەند ماڵێکەوە هاوبەش بوو. لەبۆ ئامادەکردنی نانەکولێرەی سبەینە و ئێواران. یاخود ئەستورکەبەڕوون و ناسکەنانی سەرسێلێی دوای نانکردنی بەیانییان. بە چەشنێک ژەمی خواردنی سبەینان یەک تامولەزەتی ئەوتۆی هەبوو کە هەنوکەش بۆی بە تامەزرۆم. ئەوجا ئەگەر ئەو خێزانەش هەبوو و خولاپێداوبوونایە. مێگەلە مەڕ و ڕەوە چێڵ و مانگایان هەبوایە. ئەوە ئەو نانە گەرمە تێکەڵ بە پەنیری نوێ و ماستی سەرتودار و لۆر و فرۆ دەبوو.

ئەو ڕۆژە لە ماڵی مامەکەم کولێرەبەڕوون و پەنێر کەوتبووە بەرەبەری ئێوارە. ئەز و ئەکرەمی ئامۆزام کە بە کەلەشیش لە من گچکەتربوو. بە یەکەوە لە لێواری تەندورەکە خۆمان دانوساندبوو. مامۆژنم دەتگوت لە نیازمان گەیشتبوو. لەگەڵ دەرهێنانی کولێرەکان لە تەندورەکەوە، یەکسەر کولێرەکانی دەخستنە ئەو سەبەتە بچوکەوە کە لە ناو بەرانپیلەکەی خۆی تەقەتی کردبوو. لەو دەمە ژنی ئامۆزایەکم وەک فریشتە پەیدابوو، بە مامۆژنمی گوت.. میوان هاتووە و بابچێتەوە ماڵ و ئەو سۆرکردنەوەی کولێرەکان لە ئەستۆ دەگری. مامۆژنم سەبەتە کۆلێرەکەی لەناو بەرانپیلەکەی دەرهێنا و ئەکرەمی کوڕی وەک باشوکە لە دەستی رفاند و پێی غارێی پێوەنا. منیش سەرم لەدوو نا. ها لەوێ.. ها لێرە.. ئەکرەم دەتگوت بزبزۆکە بە کەس نەدەگیرا و منیش بەدوای ماوەیەک وازم لە سەردوونانی هێنا. بە ناو قەرسیلەکەی پشت ماڵان بۆ لای ئەو دەستە منداڵانەی گوندی چووم کە لە سەرجۆخینان بە لاسایی کردنەوەی گەورەکان، خەریکی کێلەبەردانی بوون. زۆری پێ نەچوو ئەکرەم بە خۆی و پاشماوەی کولێرەکانی ناوسەبەتە بچوکەکەوە پەیدابوو. سەیرم کرد تەنیا یەک دوو کولێرەی بۆ من هێشتوتەوە. بەڵام من، ئەوەی مابوەوە لەگەڵ منداڵەکانی دیکە بە یەکەوە بەشمان کرد و خواردمان.

## منداڵیم لە هەمێزی دونیای گەورەکان

هەرکە بۆ ناو تەمتومانی تەمەنی منداڵیم دەگەڕێمەوە. مێشکم تەنیا لەگەڵ یادەوەرییە تفت و تاڵەکان جۆللانە دەکات. دواتر لە ناو گەڕەلاوژێی ئەزمونی سەرەتایی نەفامیم لە مەیدانبازی حیزب و سیاسەتدا. هەوڵ و کۆششەکانی خەباتی ژێرزەمینی ناو شار و کاروانی پێشمەرگایەتیم بەسەر پێوە بوومە. هەنگاوە نەترسەکانم هەوجاڕی کێڵانی بەیاری مێشکمی بەدەمەوە بووە و پێیان شاگەشکە بووم.

جیهانی ئێمەی منداڵ لەوێ ڕۆژانیشدا، بە تەنێ لەگەڵ تەمەن و بەژن و باڵا، ژن و مێردایەتی، لە دنیای گەورەکان جیادەکرایەوە. وەکیتر منداڵان لەو ژیانە جیاوازییەکییان لەگەڵ ئەوانەی بە تەمەن گەورەتر نەبوو. هەتا لە هەڵسوکەوتەکانمان، دەبوو شوێنپێی ئەوان کەسوکارمان هەڵگرین. هەر لە منداڵیمانەوە، دارەتەکانی کۆمەڵی بەرسێبەری کاڵای دواکەوتوویی، نەزانی و نەخوێندەواری، بڕیاردەری سەر زەین و کردارمان بوون. بە

جۆرێک فەنتازیای منداڵی، زیرەکی خۆڕسک و ناسینی جیهانی زەنگینی یاری زارۆکان.. هتد، ئەگەر لێرە و لەوێش هەبووبێت، ئەوە هەر تاکوتەرای منداڵان پێیان ئاشنا بوون و پێیانەوە خەنی بوون.

لە ئەزمونی ژیانی منداڵی خۆمەوە. منداڵێکی چەتون و لاسار لە گوێگرتنی کۆمەڵ بۆ بوونە کۆیلەی ئایین و بگرە هەر لە تەمەنی پێنج ساڵیمەوە بۆ خوێندنی ئایینی و چوونە نوێژ و ڕۆژوگرتن ملمنەداوە. ئەوجا بە هەند هەڵنەگرتنی بەهاکانی ئەو ڕێوڕەسمە بە زۆر داسەپێنراوە. من نازانم بێجگە لە دارەتی خۆشەویستی دایک بۆ کوڕیەکەی، چی دەستمایەی دایکم بووبێت، کە لە بۆ پاراستنی من لە زۆرەملییەکانی باوکم و لە بەرانبەر ڕەتکردنەوەی هەر جۆرە نەریتێکی کۆنینەی دواکەوتوو. دایکم بۆ من قەڵای کۆڵنەدانم بوو. راستە لێدانی زۆرم خواردووە و هەتا ئەویش پرۆشکی بەرکەوتووە. بەڵام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر لەسەر ململانێی خۆم لاساریم نواندووە. بە بێ ئەوەی یەکێک لە گەورەکانی دەوروبەرم فێری شتێکیان لەو بارەوە کردبم. لە ناو خێزانەکەی ئێمەدا لە هەموو خوشک و برایەکانم بزێوتر بووم. من برا گەورەی دوو خوشک و دوو برا، تەنیا خوشکێکم لە خۆم گەورەتر هەبوو کە کچی ماڵ و نەخوێندەوار بوو. بێجگە لە باوک و دایکە نەخوێندەوارەکەمان، کەسێکمان نەبوو لە هیچ بارەیەکی ژیانەوە ڕێنماییەکمان بکات، یاخود ڕێپیشاندەرمان بێت.

## لە پەنا گیشەی تاڵ و تفتییەکانی ژیاندا

کرۆکی ژیانی منداڵیم لەگەڵ خۆیدا یەک تۆپەڵە پرسیار و گومان، بەرانبەر بە زیندەگی و دەوروبەرمی بە کۆڵەوە بووە. بەبێ ئەوەی چ خۆم وەڵامێکم لەگەڵ باڵاکردنی تەمەنی منداڵیم دەستکەوتبێت، یاخود یەکێک دەستی گرتبم و لە ساباتی گلۆربوونەوە بەدەم ژیانەوە فریادرەسم بووبێت. کەچی نەگبەتییەکان لەگەڵ چەتوونیی خۆم و وەیشومەکانی کاروانی گەورەبوونم لە جولەی نەخستووم و بگرە بە هەناسەبڕکێی ئێرە و ئەوی کەمونۆر ڕووبەڕوویان بوومەتەوە. تارادەیەکی نیوەچڵ بە پچڕ پچڕی دەرەقەتیان هاتووم

# هەولێر و بەردەوامی کاروانی خوێندنم

لە هەورازی تەمەنی مێردمنداڵی مندا، هەژاری و ژیانی دەردەسەری ڕۆژانە، باری گرانی خێزانەکەم و خۆم وەک کورە گەورەی خێزان، ناگزوریی و نەداریی بەدەم هەراشبوون سێبەری بەسەرمانەوە بووە. لەو تەمەنە چڵەپۆپەی کردووە و بەوپەڕی لاملی بیر و هۆشم بۆ ناو کەلاوەی خەباتی پیشەیی قوتابیان جوڵاومەتەوە. ئەوجا بەرەو هەواری رووت و ڕەجاڵی بواری سیاسەتکردن، باریکە ڕێچکەی خۆی هەتا مەودایەکی دوورودرێژی سەرتاپای تەمەنم نەپساندووە.

شاری هەولێر لەوێ ڕۆژانی سەرەتایی هەرزەکاریمدا، جێگە و پێگەی لە بنەگەی بیر و هزرم داناوە. هەنوکەش سەرباری دووری نیشتەجێبوونم، کە وا بزانم دوا مەنزلی ژیانم دەبێ. هێشتا لەگەڵ هەولێر نەپچڕاوم و بۆی دەسووتێم. خوێندنی ساڵەکانی ناوەندی کۆماری و ئەوجا ئامادەیی هەولێر، کارکردنی هەمەچەشنەی دووکانداری و کرێکاری ڕۆژانە، پاشان گاگۆڵەکردنی بەرمەیدانی خەباتی پیشەییی و ڕێکخراوەیی ژێرزەمینی پەنا و پەسیوان. هەمووی لەناو ئەو شارەدا بووە. لەو تەمەنەی سەرباری حەزی ژێرکاریگەری ڕێچکەی کوردایەتی باوکم، لە دوو شتی دیکە تێر نەدەبووم، ئەویش چوونە سینەمای فرسەتتەلەبی، گەمەکردن و دواتر سەیرکردنی یاری تۆپێن بوو. سینەما بۆ بەندەیەکی رووتەڵەی ئەو ڕۆژە، یەکەم [illegible]کەناڵێکی پڕ بە سودترین سەرچاوەی دامەزراندنی سەرەتایی تێگەیشتنی منی داناوە. پاشان خوێندنەوەی پچڕپچڕی و گەڕان بەدوای کەناڵەکانی دیکەی هۆشیاری ئێرە و ئەوێ، هەڵەداوان و بەبێ هیچ بەرنامەیەک، دەستم بۆ هەموو لایەک گێڕاوە. لە ڕێگای سەیرکردن و بەدواداچوونی یارییەکانی تیپی تۆپی پێی یانەی بروسک و هەڵبژاردەی هەولێر. بۆ یەکەمجار سەردانی شارەکانی سلێمانی و کەرکوک و مووسڵم کردووە. لەو بوارەوە بە خەڵک و ئاو و هەوای جۆربەجۆر تێکەڵ و ئاشنا بووم. بێگومان کەوتنە ژێر کاریگەری مامۆستای کۆچکردووی وڵاتپارێز (بەگۆک) و پاشان هاندان و هاوکاری برادەری کۆچکردووم (مەجید حمدەمین کەساس) لە بیرم نەچوونەتەوە. من لە پێشەوە لە ڕێگای ئەوانەوە بە دنیای شیعر و ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردەواری ناسیار بووم و کەموزۆر لە ڕێگای نووسینەوە بە قەد و باڵایانەوە ئاوێزان بووم.

له بیرمه برادەرەکانم بە تایبەت لە نموونەی جەلال تاهیر و محمەد زاهیر کە هەردوکیان بە ژیان ماون، نەمران حمدەمین حسین و سدقی ئامێدی، سەباح عبداللەی زیندوو، نموونەی وەفاداری و رەوشتبەرزی بوون. لە بواری برادەرایەتی کردن تابلێی سادە و بێفرۆفێڵ بوون و بۆ من مایەی هاوکاری و فێربوون بوون.

## ئەو تاوەی خۆم ناسی

رۆژێک بەدەم قرچەی گەرمای هاوین، لە کۆڵانەکەی خۆمان لە گەڕەکی سەعدوناوە، لە بەردەمی ماڵە زەنگینێک تووشی ئەوکچەیان (ف) بووم. هەندێ جاران لە ماڵەکەی ئەوان لە وانەی ژمێریاری هاوکاری خوشکەکەیم (ن) دەکرد. ئەو کیژە یەکسەر دەستی لە مل کردم و زۆر بە توندی بە خۆیەوەی نووساندم. ئەو چەندی کردی، جورئەتم نەکرد منیش دەستی لە مل و ماچی بکەم. هەموو گیانم ژێر ئارەقەی شەرمنی کەوتبوو. لەو چرکە ساتەی ئەو بە تەواوی بەرزەفتی کردبووم کە لە من بە قەڵافەت تر بوو. لەسەر شەلوارەکەی بەرمەوە، هەردوو شلکەی رانی خێواندبووە ناو گەڵم و درکم بە ڕەپبوونێکی سەیر و خورپەیەکی ئەوەندە سەمەرە کرد کە هەموو گیانی راچڵەکاندم. کەفی سپی بەسەر شەلوارەکەمەوە دەرکەوت. هەر واقم لە خۆم وڕما و لەپڕ هاواری دایکی کیژەکە بە هۆش خۆمی هێنامەوە و کیژەش بە هەڵەداوان دەستی لێ بەردام و بۆ ژوورەوەی خۆیان قوچاندی و دەرگەی بە قایمی پێوەدا. من ئەوەندە دوور نەکەوتبوومەوە، دەرگەکە بە توندی کرایەوە و دیار بوو دایکی لە سەربانەوە ئێمەی بەو دیمەنەوە دیتبوو. گوێم لە جوێن باران کردنەکەی بوو. هەڕەشەی ئەوەی لێ کردم کە جارێکی دیکە پێ نە نێمە ماڵەکەی ئەوان و بە بەردەرگەی ئەواندا گوزەر نەکەم. دەنا لە لای باوکم چوغلم دەکات. ئیتر منیش لە شەرمان سەرم لە بەرخۆم نا و بە پەڵەپروسکێ لەو ناوە دوور کەوتمەوە و جارێکی دیکەش نەچوومەوە ماڵیان. لێرەوە و بەو جۆرە بۆ یەکەمجار خۆم ناسی و لە باڵغبوونی خۆم گەیشتم..

## هەندێ لە سەرەتای ڕۆژانی ڕێکخراوەییم

بەدوای زیاتر لە ساڵێک لە پلەی پاڵێوراویم لە ریزەکانی (پدک) لەگەڵ شانەیەک کە جەمیل ڕەنجبەر سەرشانەمان بوو، دواتر حیسام بەرزنجی شانەکەی بەڕێوەی دەبرد. زۆربەمان لە قۆناغی ناوەندی بەرەو قۆناغی ئامادەیی هەنگاومان نابوو. ڕۆژێکیان لەگەڵ تەواوبوونی پشووی سەری ساڵ و دەست پێکردنی ڕۆژانی یەکەمی ساڵی نوێی خوێندن لە ئامادەیی هەولێردا. ئەو ساڵە یەکەم ساڵ بوو، قۆناغی خوێندنی ئامادەیی لە دوو ساڵی ببوو بە سێ ساڵ. ساڵی یەکەم بۆ هەموو قوتابییەکان گشتی بوو، لە ساڵی دووەمەوە خوێندن بۆ زانستی و وێژەیی دابەش دەبوو. لەو ڕۆژەدا حیسام بەرزنجی لەگەڵ برادەری گیانی بەگیانیم محمد زاهیر لەوێ ڕۆژاندا هاتنە گەڕەکی سەعدوناوە کە ماڵی محمد و من لەو گەڕەکە بوو. لە پیاسەیەکی گۆڕەپانەکەی بەردەمی وێستگەی شەمەندەفەری هەولێردا، کۆبوونەوەیەکی سەرپێیی لەگەڵ کردین. حسام بەبێ یەک و دوو کردن لە دەستپێکی کۆبوونەوەکەدا. هێرشێکی توندی کردە سەر باڵی مەکتەبی سیاسی و بە پێی دڵی خۆی وەسفی کردن. منیش بەبێ ئەوەی حسام و محمد زاهیر پێی بزانن. لە لایەکی دیکەوە جەمیل ڕەنجبەر بەر لەو پەیوەندی پێوە کردبووم، بە مژدەی بوونم بە ئەندامی ڕپارتی و گواستنەوەمی بۆ شانەیەکی ڕێکخراوەیی لە لای عبداللە پەشێوی شاعیر پێراگەیاندبووم. کە ئەوان ڕۆژ ناوبرا و مەسئولی لێژنەی پیشەیی ناو قوتابییان بوو. هەروەها حسام بەوەش ئاگادار نەبوو، کە من لە ریزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستانیش لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری ئەو لیژنە و شانانەی بەڕێوەم دەبردن، بەگەر کۆمیتەی شاری قوتابیانی سەر بە باڵی م.س ڕێچکەمان گرتبوو.

حسام هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو. وەک فیشەکە شێتە لێی بەدەنگ هاتم و وەڵامی قسەکانیم دایەوە. کە هەر هۆیێکی لە خۆی زانی کە زۆر بە ڕاشکاوی و بەبێ پاراستنی نهێنییەکان، هەواڵی بەگەرکەوتنی خۆم و ئەو قوتابیانەم بۆ باس کرد. کە ئێمە لەگەڵ باڵی م. س ـــ ین. ئیتر یەکسەر هەڵوەستەی کرد و ڕووی لە محمد زاهیر کرد و گوتی: لەو بێدەنگییەت گەیشتم، کە ئەتۆش لەگەڵ عباس دا، بەگەر ئەوان کەوتووی و هەردووکتان ڕێگای هەڵەتان گرتووە و خۆتان زەرەر دەکەن، چونکە حیزب لەوە بەهێزترە کە بە هەڵویستی چەند قوتابییەکی ئێرە و ئەوێ لە ناو بچێ. من ئەوە زانیم عباس لەگەڵ برادەرە جەلالییەکانی وەک جەمیل ڕەنجبەر هەڵخەڵەتاوە، ئەدی ئەتۆ

بۆ محمد زاهیر...! لەو تاوە محمد هیچ قسەی نەکرد. بەڵام بەدوای جیابوونەوەی حسام بەرزنجی لێمان، بە منی گوت: ئەو بە یەکجاری واز دەهێنی و چیتر بەشداری خەباتی ڕێکخراوەیی ناکات و زۆرتر لە ژیانی دوای خوێندن بە وەرزش و تۆپێن خەریک بوو، بەڵام هاوڕێتی لەگەڵ ئەزی هەر خۆش بوو، هەتا هەنوکەش نێوانمان ماوە.

من بۆ ماوەیەکی کەم لە پەیوەندی حیزبی لە لای عبدالله پەشێو بووم. دواتر بە هۆی دوورکەوتنەوەی لەناو شاری هەولێر و بوونی بە مامۆستا لە گوندێکی دووری شاری. هەمدیسانەوە بۆ لای جەمیل ڕەنجبەر گەڕامەوە کە بەرپرسی لیژنەی پیشەیی قوتابیان بوو. ئەو زنجیرە شانەیەی ئێمەشی بەڕێوە دەبرد، کە من کرابووم بە سەرشانە و شانەی یەکەم بریتی بوون لە هوشیار فەتاح، جەلال تاهیر، جەوهەر کرمانج ، میرزاعەزیز. شانەی دووەم مەهدی کاوانی، نجمەدین عزیز سەریەشاخی، قادر وەلاشی.

## کوڕە نا عاقڵەکەی حیزب..!

من لە ڕێگای محمد سلێمان کە تا ڕادەیەک لە لەتیف بەرزنجی بەرپرسی لقی پارتی باڵی مەکتەبی سیاسی لە هەولێر نزیک بوو. بە پرتەوبۆڵەی ناتەبایی ناو ڕیزەکانی خوارەوەی ئەو پارتییەم لە دژی سەرانی بەڕێوەبەری ئەو حیزبە لە هەولێر زانی. ئەو منی ئاگادار کردەوە کە لە ناو قوتابیان خۆم لەو جۆرە کەسانە دوور بگرم کە لە عەلەیی مەلاماتۆڕ، حمەدەمین فەرەجی پارێزگاری ئەودەمی هەولێر، شێخ لەتیف. بە قسەی ئەو، ئەو کوڕە ناعاقڵانەی حیزب قسەوقسەلۆکی هەڵبەستراو دەهێنن و دەبەن.

دەڵێن قوچەک لە ئاگردان گەرمترە. بۆ ئەوێ ڕۆژێ و دواتریش ئەوەندە بۆ من بەس بوو، کە زیاتر خۆم بەدوای ئەو کەسانەوە بگەڕێم. وەک ئەوەی لە خۆمەوە بیانوو بدۆزمەوە. زۆربەی هەڵسان و دانیشتنم لەگەڵ ئەو توخمانە بوو، بگرە لەوانیش زۆرتر دەموچاوی ناشیرینی دەوروبەری ئەو سێ کەسە مەسولە ناوبراوانەی سەرەوەم دەگوت و هەتا لە کۆبوونەوەکان ڕەخنەی توندم دەهێنایە گۆڕێ و دەنووسی. دەربارەی کارە دزێوەکانیان بەرانبەر بە خەڵک و ڕوومەتی ناشیرینیان لە هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی و پردانە سەروەرییەکانی مرۆڤ وێردی سەر زمانمان بوو. لە بیرمە چەند جارێک لەلایەن جەمیل ڕەنجبەر وەک دڵسۆزییەک ئاگادار کراومەتەوە، کە ئاگام لە زمانی خۆم بێت و بە ناوی دۆمینە و تاولە کردن لە چایخانەکەی وەسمان لەبن قەلاتێی بەرانبەر

موتەسەریفییەتی هەولێر دادەنیشتین. جەمیل هۆشداری دامێ کە زۆر لەو چایخانەیە لەگەڵ ئەو توخمانە دادەنیشم کە سەری زمان و بنی زمانیان قسەگوتن بوو بە مەسولە ناشیرینەکانی ئەو حیزبە. بەڵام لێرەدا نابێ جلەوی قسەکانم تەنیا بە لای سۆز و حەزی هەمیشەیی خۆم بەرەڵڵا بکەم و ئەوەش بڵێم.. ئەو دەمیش زۆربەی هەرە زۆری ئەندام و هەوادارانی ئەو حیزبە لە گوێی گادا نووستبوون. هەر فەرمودەی سەرانی حیزب و کورە ئاقڵە ئەڵقەلەگوێیەکان دەیخوارد. لەناو ئەو خەڵکەوە هەبوون وەک زەنگەسۆرە بە دەوریی ئەو مەسولانەوە، بە دەموچاوی خەڵکی رەوشت بەرز، بە هەڵوێست، خاوەن کەسایەتی و قسە لە ڕوویان وەدەدا لە لایەک و خەڵکی سەربڵند و خاوەن کەسایەتی پاک لەبنی بیرێ تەپەیان دەهات.

لەو زەمان و زەمینەدا، ئەو لیژنەیەی ئێمە لەناو قوتابیاندا لە رووی چالاکی و هەوادار پەیداکردن و لە مەیدانی تێکۆشانی پیشەیی ناو قوتابیاندا. بەرانبەر ڕێوشوێن و ڕێنماییە کرچوکاڵەکانی بەرێوەبردنی پرۆسەی خوێندن لەو شارەدا. ئێمە بەبێ بەرخورد نەدەماینەوە و دەنگمان دەبیتسرا، بەتایبەت بەرانبەر هەندێ لە بەڕێوەبەری قوتابخانەکان و پەروەردەی هەولێر کە تەنیا لە دژی هەڵسوڕانی کوردایەتی دەهاتنەوە. چ لە فەرمانی پەروەردەی هەولێر، لەوەی نابێ قوتابی بە جلی کوردی دەوامی قۆناغی ئامادەیی بکات. هەتا ڕمگاتە ئەوەی نابێ رۆژنامەی دیوار لەو قوتابخانانە بە زمانی کوردیش لەپاڵ زمانی عەرەبیدا هەڵبواسرێ. کە بۆ مێژوو رۆڵی مامۆستایانی وەک مەلا عوسمان مەلا سالح، حەیدەر هەمزە، زوبێر بلال و جەلال شەریف، فاروق بهائەدین خەلیفە بە ئێمە ناشاردرێتەوە. کە هەمیشە لەچاو مامۆستا لایەنگرەکانی دەسەڵات، پشت و پەنای قوتابیان بوون بۆ چالاکی نواندن لەو بوارانەدا. بێگومان ئەو چالاکی و روویەڕوو. بوونەوەی بۆرە پیاوەکانی رژێم لە بواری پەروەردەوە، لەگەڵ مزێج و بەرژەوەندی دەسەڵاتداری کەسانی وەک لەتیف بەرزنجی و حمدەمین فەرەج بە پلەی یەکەم و عبدوڵڵا ئیسماعیل _ *مەلا ماتۆڕ* _ بە پلەیەکی دواتر یەک نەدەهاتەوە و ئەوانە لە ئازاردانی ئەو قوتابیە هەڵسوڕاوانەدا درێخییان نەکرد.

ماوەیەک بوو لەو ئابوونەی کە لە لیژنەکەی ئێمە کۆدەبوەوە، مانگی وا هەبوو لە دە دیناری تێدەپەڕاند. کە ئەو دەم ئابوونە لە پەنجا فلوسەوە دەستی پێ دەکرد. ئەوەی زۆرتری بدایە بە ئارەزووی خۆی بوو. برادەرێکمان هەبوو بەداخەوە ناوەکەیم لە

بیر نەماوە، مانگانە لە پێنج دیناری کەمتری نەدەدا. هەروەها زیادی کێخوا قەمبوور ئەوەندەی لەگەڵ ئێمە بوو، لە دوو دیناری کەمتری وێر نەدەکرد. ئیتر لەو پارەیەی کۆ دەبوەوە، بە بڕیاری لیژنەکەی خۆمان و رازیبوونی راستەوخۆی مەسئولەکەمان چ عبدالله پەشێو یاخود جەمیل رەنجبەر، مانگانە یارمەتی و کۆمەکی سێ دینارمان بە ج ک دەکرد، کە رۆڵەی خێزانیکی هێجگار دەستکورت بوو، باوکی نەمابوو، دایکە کلۆڵەکەی بە بێوەژن کۆشی ئەو منداڵانەی لە ژوورێکی لاچەپی بەکرێ لە حەساری ئاغا عوزێرییەکان بەخێو دەکرد. لەسەردانێکی بەندە بەو گوزەرانە پەڕپوتە کولەمەرگییەیان ئاشنا بووم. ئەوە بوو بە دەست پێشکەری خۆم، ئەو پێشنیارەی هاوکاری کردنەم جێبەجێ کرد. بەڵام لەجیاتی دەستخۆشی، سەریەشەیەکی بێتام و لێپێچینەوەیەکی وەرسکەرانەیان لەگەڵ کردم.

لە سەرەتاوە من بەوە ئاگادار نەبووم، بۆ ئەو بیانووە بە من دەگرن ! لەسەر یارمەتیدانی هەڤاڵێکی گەنجی بەلەنگاز کە رۆڵەیەکی تێکۆشەری ئەو حیزبە بوو. بەڵام دواتر لەگەڵ زیاتر هەڵکشانی ئاستی خوێندەواری و وریا بوونەوە، دەرکەوتنی سەرەداوی بیانووەکان، تێگەیشتم ئەوە سزادانی من و ج ک بوو لەوێ رۆژاندا. لەسەر جۆری قسەکردنەکانمان و هەتا گرتنی ج ک لەلایەن موتەسەریف بە بیانوی دروستبوونی کێشەی هەرەشەکردن لە بەرێوەبەری ناوەندی کۆماری م. نەشئەتە فەندی، کە زۆر بە دژی کوردبوون و خەباتکردن دەجوڵایەوە. لە قوتابخانەکە زۆرتر فشاری دەخستە سەر ئەو قوتابیانەی جلی کوردییان لەبەر بوو. یاخود چالاکییان لە قوتابخانەکە دەنواند، کەچی هەمان ئەو مامۆستایانە رێگایان بە بەعسیبوون و چالاکی ئیتحادی وەتەنی بەعسییەکان خستبووە سەرپشت.

ئەوجا برادەرایەتیکردنی خەڵکانی وەک جەعفەر عبدالواحید و پەشێو و محەمەد مەنگوڕی و یوسف دەرگەلەیی و جەلال فەتحوڵڵا و مستەفا رابەر و عەزەگورگە، محمد عەجەم.. هتد ،کە زۆرتر وەک کەسانی رۆشنبیر و کوردیزان و نووسەر و پێشمەرگەی قارەمان گوێمان لێ دەگرتن و بە تەمەن لە ئێمە گەورەتر بوون. بەبێ ئەوەی ئاگامان لە هیچ کەینوبەینێکی نا تەبایی حیزبی بێت. هەر لەو ماوەیەدا بە بڕیارێکی سەرەوەی لقی پارتی بە هەنجەتی سەرقاڵی جەمیل رەنجبەر بە کاروباری قوتابیانەوە، لە ناکاو کوڕێکی عەزیز هەرکی _ *وشیار* _ لە شوێنەکەی جەمیل کرایە بەرپرسی لیژنەی پیشەیی

قوتابیان، کە بۆ هەڤاڵان سەیر بوو، چونکە هەموو ئەندامەکانی دیکەی لیژنەکە لە نابراو بەرچاو تر و بە خەبات و چالاک تر بوون. بەڵام دیسانەوە دوایی تێگەیشتم، ئەو مەدرەسەی حیزبێنیکردنەی ناو کوردان، هەر لە سەرەتاوە هەمیشە کاری بۆ ئەوە کردووە، دەسەڵاتی ناو حیزب و پلە و پایەکانی بەردەسکەوتی چاچنۆکانە، بکرێتە دەسکەلای بنەماڵە و عەشیرەت و گوند و شارێکی دیاریکراو و لەلایەن ئەوانەوە قورخ بکرێ.

لێرەدا منیش بە راپۆرتێکی پڕ لە تورەیی ئەوێ رۆژان کە تێیدا گوزارشتی هەڵچوون دەچۆڕایەوە، رەخنەم گرت و لە سەرەوەش وەڵامیکی زۆر توندم بۆ گەڕایەوە. کە خودی عەزیز هەرکی باوکی وشیار نووسیبووی و لەجیاتی لیژنەی ناوچەی هەولێر ئیمزای کردبوو.

من بەبێ ئەوەی لە خۆم بگەم، لەگەڵ وشیار کەوتمە ناتەبایی و رەخنەکوتکردنی درشت و وردی هەڵسوکەوتی لە کۆبوونەوەکاندا، بە جۆرێک ناخۆشم کردبوو. وشیار ناچار لە بیانویەک دەگەڕا، وەک دەڵێن لە قافم بگرێ. ئەوە بوو لە ئاخیرەکەی ئەو یارمەتیدانەی مانگانەی ج.ک ـی بە نایاسایی رەخنە گرت کە بەبێ رەزامەندی لیژنەی ناوچە کراوە و پێی گوتم ئەگەر راینەگرم. ئەو راپۆرتم لەسەر دەنووسی و بەرزی دەکاتەوە. منیش زۆر لاسارانە بێمنەتم کرد و بەبێ ئەوەی قەناعەتی پێ بکەم لە سەری سوور بووم.

لە لایەکی ترەوە من و ــ ج ــ و وشیار هەرسێکمان، لە ریزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستاندا، وەک ئەندامی کۆمیتەی شاری هەولێر، هەفتانە لە کۆبوونەوەی ئەو کۆمیتەیە یەکترمان دەگرتەوە کە وشیار عزیز تازە پلەی ئەندامێتی لەو کۆمیتەیەی پێ سپێردرابوو. ئەوەش بۆ ئەوێ رۆژان مایەی پرسەک لەسەر دانان بوو، چونکە دەیان ئەندامی قوتابیان لەو چالاک و دیارتر بوون. شانسی ئەندامبوونی ئەو کۆمیتەیان نەبوو، چونکە بێ پشت و پەنا و ئەو دەمە لەو جۆرە خەمەیان نەبوو، کەسە تێکۆشەرە راستەقینەکان بیریان لە پلەوپایە نەدەکردەوە..!

ئەو دوورچوونەی من لە گێڕانەوەکەمدا، خوێنەر دەبەمەوە سەر ئەوەی هێشتا ساڵی ١٩٦٩ بوو. رۆژێکیان جەمیل رەنجبەر لە شانی سعدالله پەرۆش باسی ئەوەیان لەگەڵ هێنامە گۆڕێ کە لە لقی قوتابیانی هەولێر ئەندام لقێکی نوێ دادەنێن. کە وا بزانم ئەندام

لقەکە بەرپرسی کۆمیتەی شەقڵاوەی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە کۆلێجێکی زانکۆی بەغداد وەرگیرابوو. کاروباری خۆی و گوزەرانی بۆ بەغداد گوستبوەوە.

لەو پێکەوە دانیشتنەدا، ئەو دوو برادەرە قسەیان هێنا سەر ئەوەی، کە ئەوان بۆ پاڵاوتنی یەکێک لەنێوان ئەز و محسن کەریم مورتکەیی بە نیازن، کە هەردووکمان لە کۆمیتەی شاری هەولێر وجوودمان هەبوو. هەتا ئەوەشیان بە گوێدا چرپاندم، کە گوایە بە هۆی هەڵسوڕاوی خۆمەوە، من شانسم زیاترە. دوای چەند رۆژێک جەمیل رەنجبەر ئەوەی بۆ درکاندم کە ە. س وەک ئەندام لق لە پاڵاوتنی من و محسن رەزامەند نییە و ئەو وشیار عزیزی پاڵاوتوە. بێگومان بەلامەوە ئاسایی بوو کە هیوا لە پاڵاوتنمان رازی نەبێت. چونکە منیش لەشانی محسن لە بوونی خودی ئەو بە ئەندامی لقی قوتابیان لەوە و پێشووتر رەخنەی توندمان گرتبوو. راستە هیوا کوڕی بنەماڵەیەکی تێکۆشەر و خاوەن چالاکی کۆمەلایەتی بەرچاو بوون بەتایبەت لە ناو بازنەی مەسولەکان. هیوا س لەچاو ئەز و محسن زۆر لەپێشەوە تر بوو لە لای لەتیف بەرزنجی و دەوروبەرەکەی. بەلام لەناو قوتابیان و چالاکی مەیدانی _ *ئەگەر چالاکی هونەری هەڵپەرکێ و تیپی ئاهەنگ گێڕانی لێ دەرچێت* _ تا بڵێی دەست و پێ سپی بوو. لەوێ رۆژان تاکە یەک قوتابیشی پێ نەدەهاتە ریزی قوتابیانەوە

هەموو لایەک ئەو راستییانەیان دەزانی، بەلام هەروەک چۆن هیوا س بەبێ گەڕانەوە بۆ هەر جۆرە شایستەیی و هەڵبژاردنێک، بەڵکو تەنیا بە پشتگیری لەتیف بەرزنجی کرایە ئەندام لقی قوتابیان. ئاواش مانۆڕی پشتگوێ خستنی راوبۆچوونی خودی قوتابیان و بەلاوەنانی رای دوو لە ئەندامەکانی لقەکە، وشیار ع لە قوتابیانیش بووە ئەندام لقی هەولێر.

لە کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی شاری قوتابیانیش، بڕیاری بە ئەندامبوونی وشیار ع لە لقی قوتابیانی هەولێر خوێندرایەوە. من و محسن و جەوهەر رەخنەمان گرت، بەلام چ سودێکی نەبوو. چونکە جەمیل رەنجبەر بە ڕاشکاوی ئەوەی باس کرد کە لە حیزب فەرمانی پێ کراوە ئەو بڕیارە جێبەجی بکات. ئەوە بوو من و محسن وەک نارەزایی لە بەشداری نەکردنی چیتری کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی شاری قوتابیان هەڵوێستمان وەرگرت و بایکۆتمان کرد.

## وەیشومەی حیزبایەتی

بەهاری ساڵی ۱۹۷۰ زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی کورد لە باشووردا، بە هۆی جاڕدانی بەیاننامەی یازدەی ئازاری نێوان ڕژێمی ئەوسای بەعس و سەرکردایەتی بارزانی، هەرێمەکە کەوتبووە شایی و لۆغانەوە. لە مێژووی کۆماری عیراقی سەر ترپەکەلەکی کودەتای سەربازی خوێناویدا، بۆ یەکەمجار بوو لەلایەن دەسەڵاتی حوکمڕانی بەغدادی ئەو دەم، بە شێوەیەکی سەرزارەکی و فەرمی، دان بە مافە سەرەتاییەکانی خەڵکی کورد لەو وڵاتەدا هێنرا. خەڵک بە گشتی دڵخۆش بوون، بزاڤی ڕزگاریخوازی خەڵکی کوردی، لەگەڵ بوژانەوەیەکی ئومێد دەستلەملانێ بوو. بەڵام لەناو بەشێکی کەمینەی ئەو خەڵکەدا، کە خۆیان لە نیمچە لە شکرێکی چەکدار، واتە ئەندام و هەوادارانی باڵی مەکتەبی سیاسی دەدیتەوە. هەموو بە هەناسەی ڕۆژانێکی تەنگ و توون پشوویان دەخواردەوە.

ئەو ڕەوتە کەوتبووە بەردەم ئەنجامی فەشەل و شەرمەزارییەکی حاشاهەڵنەگر. یەکەم یادگاری ئەو ڕۆژانە، خۆی لەو خۆپیشاندانەی قوتابیان دەدیتەوە، کە دیار بوو بە ئاگاداری دەزگاکانی ڕژێمەوە ڕێخۆشکەری بۆ کرابوو. جەماوەری قوتابیانی خۆپیشاندەر بە هەندێ دروشمی بازاریی پڕ لە جوێن. کاروانەکەی خۆیان هێنابووە بەردەم ئەو چایخانەیەی وەسمان لە سێبەری قەڵاتێی نزیک بە سەرای موتەسەریفییەتی هەولێر بوو.

ئەو زەمانە هەندێک لە کەسانی سەر بە باڵی جەلالی لەو چایخانەدا دادەنیشتن. لە بیرمە ئێمە کۆمەڵێک لەو برادەرانە بە دەوری جەمیل ڕەنجبەر گردببووینەوە، کە تازە لە لای بارەگای لقی پارتی _ باڵی م س _ لە هەولێر هاتبووەوە. جەمیل ئامۆژگاری کردین کە خۆمان گورگە نەکەین. لەشانی زۆربەی خەڵک پێخۆشبوونی خۆمان بۆ ئەو دەستکەوتە گرنگەی کورد نەشارینەوە. لە ڕاستیدا ئەوە ڕای جەمیل خۆی بوو، چونکە ئەو وەک هەر کوردێکی وڵاتپارێز و نیشتمانپەروەر، لە دڵەوە بۆ خۆشی سەرجەمی خەڵک خۆشحاڵ بوو.

قوتابییە خۆپیشاندەرەکان کە گەیشتنە بەردەم چایخانەکەوە، هەڵوەستەیان کرد و بە پەنجە هەڵشەقاندن و هوتافە ئاگرینەکانیان، گەفیان بۆ ئەو چەند کەسەی ناو چایخانەکە دەنارد. پاش تێپەڕیوونی کاروانی خۆپیشاندەران، هەر جەمیل ئامۆژگاری

کردین، که هەر یەکەمان بۆ خۆی ئاگاداری خۆی بێت، بە وریایی هاتوچۆی قوتابخانە و دەرەوە بکەین، بەڵام تا دەکرێ خۆمان لە وەڵامدانەوەی هەڕەشە و پەرچەکردار بەدوور بگرین.

لێرەدا سەرباری ئەوەی ئەز لە ڕێکخستنی حیزبی سڕ کرابووم و بەشداری کۆبوونەوەی کۆمیتەی قوتابیانی شاریشم نەدەکرد، کەچی لەگەڵ جەمیل ڕەنجبەر و بەشێکی زۆری برادەرانی دیکەدا، لە پەیوەندییەکی هاوڕێیانەی بەردەوامدا بووم. زۆرجاران لە شوێنی دیاریکراو یەکترمان بەسەر دەکردەوە، بەبێ گوێدانە هەر جۆرە هەڕەشەیەک لە یەکتری گرد دەبووینەوە و باسی دەردەسەرییەکانی وەیشومەی ئەو جۆرە سیاسەتە خراپەی خۆمان دەکرد.

ڕۆژێکیان مانگی چوار بوو لە ساڵی ١٩٧٠، هێشتا قوتابیان بۆ سەعیکردن و خۆ ئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەی شەشی ئامادەیی ئیزن نەدرابوون. وشیار ع لە قوتابخانە پێی ڕاگەیاندم کە مەودای سڕکردنەکەم لە حیزب هەڵوەشێنراوەتەوە و دەبێ بۆ کۆبوونەوەیەکی پێویست بچمە فلانە شوێن و یەکێکی تر لە شوێنەکەی ئەودا کراوەتە بەرپرسیاری لیژنەی پیشەیی قوتابیان. بەڕەقی وەڵامم دایەوە و پێمگوت: من بەشداری ڕێکخستنی حیزبێک ناکەم، فلان و ڕفیسار بەڕێوەی ببەن. خوا هەڵناگری ئەو بە پێکەنینەوە گوتی: غەدر لە تۆ کراوە و داوای بوردنی کرد و یەکسەر رووی وەرگێڕا و بەجێیهێشتم. هەر ئەو ڕۆژە لە قوتابخانە لە ڕێگای جەلال تاهیرەوە بیستم کە لەلایەن دەستەیەک لە یەکێتی قوتابیانی کوردستانی ڕەسمییەوە. فلان و فیسار برادەری خۆمان لەلایەن لیژنەی کوتەکی ئەو یەکێتی قوتابیانە دارکاری کراون. کە لە رابردوو ئەندامی لیژنەی کوتەکی قوتابیانی باڵی م.س بوون. بەڕاستی منیش زۆر لە خۆم قرقرام، بە تایبەت هەندێ لەو قوتابیانەی بە هۆی بوونیان بە ئەندامی یەکێتی قوتابیانی بەعسییەکان لە رابردوو نیوانم لەگەڵیان باش نەبوو. هەنوکە کە سەنگەریان گواستبوەوە و کە چاویان پێم دەکەوت، مۆڕەیان لێ دەکردم و بە وشەی تەمبێکردن، ڕۆژانە بە ناوی یەکێتی قوتابیانی کوردستان _ باڵی لایەنگری سەرکردایەتی بارزانی _ گەفیان لێ دەکردم.

لەو کەشوهەوایەی پڕ لە فشاری دەروونیی دەوروبەرماندا، ڕۆژێکی دیکە بە پەنادزە لەگەڵ جەمیل ڕەنجبەر لە پەراوێزی چالاکی سیمینارێکی ئەدەبی، یەکترمان دواند و

ئاگاداری کردمەوە کە گوایە م مورتکەیی ئەندامی کۆمیتەی شاری قوتابیانی خۆمان، پەیوەندی بە یەکێتی قوتابیانی کوردستانی رەسمی کردووە و هەموو نهێنییەکانی ئێمەی پێداون. ئایا من هیچ زانیارییەکم لەلا هەیە..! چونکە من و ناوبراو لە رۆژانی رابردوو، هەمیشە هاوبیر و هەڵوێستەکانمان بە تەواوکەری یەکتری دەخوێندرانەوە. لێرەدا خۆم لە جەمیل تارومار کرد کە بۆ ماوەیەکی کاتی نێوانمان ساردی تێکەوت.

کە هاتمەوە ماڵ هەموو گیانم بە دڵەراوکێ تژی بوو. لە سەریان بەدەم پیاسەکردنەوە بە ناوی دەرس خوێندنەوە، بە تەنگاوی و سەرەدیقانێی کۆڵان دەهات و دەچووم. لە خانووی دراوسێیەکمان، سعدی مام فەرحانی لەگەڵ دایک و باوکی دەژیان. ئەو خێزانە ناسیاوی لەمێژینەی بنەماڵەی ئێمە بوون. ئەوان خۆیان خەڵکی پردێ بوون. سبەینەکەی رووبەرووی یەکتر هاتین. دوای بەیانی باشکردن.، سەعدی یەکسەر باسی ئەوەی لەگەڵ کردمەوە، کە لە باروددۆخێکی نا هەموارم دەبینی و ئەوەی لەگەڵ باس کردم کە _ سعدی خەلیل _ ی مەسول لقی قوتابیانی رەسمی رایسپاردوە کە قسەم لەگەڵ بکات. ئەو ئامادەیە لە بارەگای قوتابیان و ئەو رۆژە مقەرەکەیان لە بەرانبەر مزگەوتی کویتی لە گەڕەکی تەیراوە بوو. ئامادەیە بە شەخسی من ببینی و رۆژەکەشی دیار کردبوو. هەتا سعدی مام فرحانی ئەوەشی لەگەڵ باس کردم کە ئەز لە دوا پۆلی قۆناغی ئامادەییم و داهاتوویەکی گەشم لەبەردەمدایە و کوڕی خێزانێکی هەژار و سەربڵندم. حەق وایە دڵم بەو کەسوکارەم بسووتێ، کە چاویان لەوەیە دوارۆژێکی ئومێدبەخشیان بۆ دابێنم. وا باشترە ئاوڕ لە خۆم بدەمەوە و فریای دوارۆژی خۆم بکەوم و فرسەتی دەرچوون لە شەشی ئامادەیی لەدەست نەدەم. بۆ لەسەر جەلالییەکان خۆم تووشی سەریەشەی زیاتر دەکەم و درەنگ و زوو ئەوانیش هەر دەگەڕێنەوە ژێر چەتری سەرکردایەتی بارزانی..! من سەرم لەبەر خۆم نابوو، شەوەکەی باش نەنووستبووم، زۆرم خەو دەهات. پێمگوت دوایی یەکتر دەبینینەوە و لەو بارەوە جوابت لێدەگێڕمەوە.

سەرباری ئەو تەمەنی هەرزەکارییە، تازە بە تازە کەوتبوومە دەمی چاوکردنەوە. بەڵام بۆ دڵنەوایی خۆم، بۆ سەردانی _ لقی یەکێتی قوتابیانی کوردستان — ی رەسمی و دیتنی سەعدی خەلیل کە کاتی خۆی چاکەم بەسەرییەوە هەبوو. پرسم بەو کوڕە ئامۆزایەی باوکم _ محمد سلیمان _ کرد کە دەمزانی هێشتا لەگەڵ داموودەزگای باڵی مەکتەبی سیاسی و لەتیف بەرزنجی لە هەولێر هاموشۆی گەرموگوڕی هەیە. ئەویش

بەدوای هەندێ خۆگرخاندن، ڕۆژێک محمد سلێمان بەو مەرجەی لە لای کەس ناوی نەهێنم وەڵامی لێ گێڕامەوە و گوتی برادەران بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەت بەبێ دڵەڕاوکێ و ترس، پێیان خراپ نییە سەردانیان بکەیت و ئاگاداری خۆت بە، وەک خەڵکانی دیکە بەبێ ئەوەی ناوی کەس بهێنی نهێنییەکانی لای خۆت نەدرکێنی. ئەوە بوو بۆ ڕۆژی دیاریکراو لەگەڵ سعدی فرحان بەیەکەوە و بە ناوی سەردانی سعدی خلیل.، چووینە بارەگای لقی قوتابیان. بەڵام لەوێ بۆم دەرکەوت، لەلایەن دوو لە ئەندام لقەکە و قوتابییەکی پردەیی، کڵاویان لەسەری سعدی مام فرحان و منێکی دەست و پێ سپی نابوو. لە تێنەگەیشتنی مانۆڕی لەو جۆرە تێکەوتبووم. چونکە سعدی خلیل ماوەیەک بوو بۆ لقی قوتابیانی کەرکوک گواسترابووەوە و کورتە نامەیەکیشی لە لای سعد عبدالله بۆ من بە جێ هێشتبوو. کە هەرگیز ئەو نامەیەم نەدیتەوە. لە چوونە ژوورەوەی ئێمەدا، هەر لە دەرگەوە تووشی ئەکرەم مەنتک و محمد عباس بووم. بەخێرهاتنیان کردین و ئێمەیان بۆ ئەو ژوورە برد کە سعد عبداللەی لێ بوو. من لە پێشەوە سۆراغی _ سعدی خلیل _ م لێ کردن و هەر بە پێکەنینێکی منداڵکارانە گوتیان سعدی هەر سعدییە، چ سعدی خلیل بێت، یاخود سعد عبدالله...!

سعد عبدالله بەدوای بەخێرهێنانێکی ئاسایی، _ سعدی فرحان _ ی بۆ دەرەوەی ژوورەکە ئیزندا و لەگەڵ ئەزی وەک لێکۆڵینەوە کەوتە دواندنم. سەرەتا داوای لێ کردم کە ڕاپۆرتی پاشگەز. بوونەوە لەو یەکێتی قوتابییانەی ڕابردووی جەلالییەکان بنووسم. یاخود وەک خەت مایل بمینمەوە. بەبێ ئەوەی بە ووشەیەکیش باسی ڕێکخستنی پارتایەتی بکات. من هەندێک بە شپرزەیی وەڵامێکی بێ بنج و بنەوانم دایەوە و گوتم: من هاتووم سەردانی برادەرایەتی سعدی خلیل بکەم، نەوەک بۆ پڕکردنەوەی نامەی پاشگەزبوونەوەی ناچاری و بوونە خەتمایل..! ئیتر سعد بەلالوتی نامە و قەڵەمەکەی بۆ کنە خۆی کێشایەوە و پێی گوتم: ئاوا بە پێی خۆت هاتویتە بەردەستتمان، ناتوانین بەبێ لێکۆڵینەوە ئیزنت بدەین، هەتاکو وەڵامی ئەو کۆمەڵە پرسیارانە نەدەیتەوە. منیش کە یەکەم جارم بوو لە ژیان تووشی دۆخی لەو جۆرە ببم. بە ڕاستی لە ترس و نیگەرانیدا، هەر لێوی خۆم دەکرۆشت و ئارەقەی شین و مۆرم کردبوو. کەوتبوومە خۆخواردنەوە، لەوەی بۆ ئەوەندە خەشیم بووم و بە پێی خۆم، خۆم خستە داوی

ئەوانەوە. کە لەوە گەیشتبووم بەرانبەر برادەرەکانی ڕێکخراوەیی قوتابیان، گەرەکیانە شەرمەزارم بکەن و پاکانەم پێ پڕبکەنەوە..!

سعد عبدالله کە دیتی من مشوەش بوومە، زیاتر فشاری بۆ هێنام. کە مادام ڕاپۆرتی پاکانە نا نووسم، دەبێ وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەمەوە. تەماشام کرد پرسیارەکان لەسەرەوەی بیست پرسیار دەبوون، هەموویان لە دەوری یەک بازنە دەخولانەوە. واتە ئاشکراکردنی ناوی ئەو کەسانەی هێشتا لە لای ئەوان ئاشکرا نەبوون. بۆ نموونە لە سەرجەمی ناوی ئەندامی کۆمیتەی شاری قوتابیانی ڕابردوو، تەنیا ناوی مەسولی کۆمیتەکە و دوو دانەی تر هەبوون. من ناوی خۆم و محسن مورتکەییم خستە تەکیانەوە و بەبێ ئەوەی ناوی یەکێکی تر ئیزافە بکەم. کە لە لای ئەوان ئاشکرا نەبوون. دوایی سەبارەت بە ناوی ئەندامی لیژنەی کوتەک، ناوی هەموانیان لە لا هەبوو، تەنیا ناوی خۆم نەبێت. لێرەشەوە ناوی خۆشم بۆ ئیزافە کردن. پاشان ئەوان گەرەکیان بوو، لە دەمی منەوە بە بەشێکی زۆری شیرازەی ڕێکخستنی قوتابیان، لە دواناوەندییەکان و ئامادەیی ئازادی کە تازە کرابوەوە و ئامادەیی هەولێر، ئاشنا بن. من تەنیا باسی هەندێ لەو ناوە دیار و ئاشکرایانەی ئامادەیی هەولێرم بۆ کردن کە خۆشیان پێیان دەزانی، چونکە بە هۆی هەڵبژاردەکانی ساڵی ١٩٦٩ بۆ کۆنگرەی یەکێتی قوتابیانی عیراق، لەپێشەوە هەموو ناسرابوون.

دواتر بە هاوکاری سعدی فرحان دەستبەردارم بوون. هەناسەیەکی درێژم هەڵکێشا و گەڕامەوە سەر سەعیکردنی ڕۆژانەی خۆم. لە فرسەتێک لەگەڵ جەمیل ڕەنجبەر دانیشتم، سەرلەبەری ئەو دیدارە و لێکۆڵینەوە لەگەڵ کردنەم بۆ گێڕایەوە. کە نەیارانی من لە لای ئەو زۆریان بۆ تێکوشی بووم. بەڵام جەمیل دڵی دامەوە و زۆری هاندام کە خۆم لەگەڵ خوێندنەکەم ماندوو بکەم، گوێ بە قسەوقسەلۆکان نەدەم، هێشتا لە هەرەتی تەمەنی گەنجێتی دام. زۆرم بە بەرەوە ماوە و دنیاش هەر ئەو یەک دوو ڕۆژە نییە و ڕۆژان ڕۆژی بە دواوەیە. لەناو برادەرەکانیش زۆرم بۆ هەڵبەسترابوو، بەڵام بۆ ساغ. بوونەوەی درۆودەلەسەکانیان، تاکە یەک کەسیان لەسەر چوغلکردنی من، نە بانگ کرد و نە لە کەسیشیان کۆڵییەوە. بەڵکو پڕوپاگندەکانیان سەبارەت بە ئەزی، وەک شێرەبەفرینەی پەنا کەندوان و بەر سێبەری پەناوپەسیوان، هەر ئەوەندە بەرگەیان گرت، کە ڕۆژە سەختەکانی خەباتی لەدایکبوونی کۆمەڵەی مارکسی ـــ لینینی دەستی

پێ کرد و ئەوانە لە هیچ کونج و کەلەبەرێک سەرەدیقانێکانیان لەگەڵ ئەو ڕۆژانە دەرنەهێنا و بوونە ئاردی ناو دڕکان..! کەچی بۆ بابایەکی وەک من، ئەو لێکۆڵینەوە بووە مایەی گۆشبوونی زۆرتر و باوەڕ بە خۆبوونم و ڕێبازی خەباتکردنی داهاتووم. دەرسێک بوو گەلێکی تشت فێر کردم. کە جارێکی تر وا بە ئاسانی دەستەخرۆ نەبم و کەس بە خۆرایی لەکە نەخاتە سەر کاروانی سەربەرزانەی کۆششەکانم.

سەرنج

لیژنەی کوتەک. ئەو لیژنەیە لە ریزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان ـ باڵی جەلالی، لەلایەن دەستەیەک قوتابی خۆبەخشی هەرزەکارانەی ئەو دەمی بە سەرپەرشتی ئەندامی لقێکی قوتابیان دروست ببوو. لەوێ ڕۆژی زۆرتر بە مەبەستی تەمبێکردنی چەند قوتابییەکی بەعسی و مامۆستایەکی خۆفرۆش دامەزرا بوو. بە فیعلیش سێ مامۆستای بەعسی ـ حەمید مەرمەرچی لە ئامادەیی هەولێر و مامۆستایەکی دیکە لە ناوەندی کۆماری و مامۆستایەکی خانەی مامۆستایان لە هەولێر تەمبێ کران. لەو چاوپەنایەوە بۆ کاڵفامی و هەرزەکاری ئەوێ ڕۆژێ، ئەو لیژنەی کوتەکە، لە پرکێشی و دەستدرێژی بۆ سەر چەند قوتابییەکی شیوعی هەڵەپاس و زماندرێژ، کاری ناهەمواری ئەنجامدا. دواتریش بە هەمان ئاوەزی هەرزەکارانە لە دەستبەکاربوونی یەکێتی قوتابیانی کوردستانی ـ باڵی مەلایی، ئەو کارە بۆ دەستدرێژیکردنە سەر قوتابیانی جەلالی و شیوعی گەرموگوڕتر پەرەی پێدراوە و من بە زمانی ئەوێ ڕۆژان شتەکەم گێڕاوەتەوە و بۆ دواتر ئەو کارانەم لە فەرهەنگی کۆشش و کاروانی پەنجا ساڵەی رابردووم بە لەکەیەکی ژیانم خوێندوتەوە و دەرسم لێ وەرگرتووە

# ڕۆژان ڕۆژی بە دواوە بوو

ساڵی حەفتا بە خۆ ئامادەکردنێکی مام ناوەنجی بۆ تاقیکردنەوەی وەزاری پۆلی شەشی ئامادەیی _ بەشی وێژەیی چووم و بە سەرکەوتوویی تاقیکردنەوەکەم بڕی. بە هۆی هەژاری و دەستکورتی خێزانەکەمان، ناوی زانکۆ لەلام ئەستەمێکی داخراو و بە خەونیش چوونە کولێج بە خەیاڵمدا نەدەهات. بەڵام لە سایەی قوربانیدانی دایک و باوکم، خوشک و برایەکانم لە وەی پاش دەیان ساڵی ژیانی شاری، بۆ یارمەتیدانم بۆ چوونە بەغداد و لە کۆلێج خوێندنم بە ماڵ و حاڵێکی شپرزەوە گەڕانەوە ناو ژیانی پڕ کوێرەوەریی گوندی و خانوویێکی قوڕی ڕەقوڕووت. ئەو هەنگاوە بۆ یەکێکی وەک من، هەر لەزرە خەونی سەوز و سوور دەچوو. زۆرجاران بە خۆم باوەڕم نەدەکرد.

بەدوای وەرگیرانم لەکۆلیجی ئاداب _ بەشی کوردیی زانکۆی بەغداد و دەوامکردنم لە پاییزی ساڵی ۱۹۷۰ دا و دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێی جیاوکەی ژیانی پڕ لە خۆشی و ناخۆشی لە تێگەیشتن و پێگەیشتنم دەستی پێکرد. دەبوو لە هەموو بارەیەکەوە بە خۆم رابگەم.

دوو سێ هەفتە بوو دەوامی یەکەم ساڵی زانکۆم دەستی پێ کردبوو. سەرەتای تیکەڵ بوونەوەی هەردوو ئۆرگانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە پایتەختی عیراقەوە، لە سەفرەیەکی قوتابیان بۆ باخچەکانی حەبانیەی خوارووی بەغداد ڕێچکەی بەست. بەبێ ئەوەی لە بیرم بێت، کێ و چ دەزگایەک لە ئەنجامدانی ئەو سەفرەیە دەستپێشکەربوو.

قوتابیانی کۆنە جەلالی بە ڕێکەوت، یاخود پلاندارێژراو، زۆربەمان لە کۆلێژە جیاوازەکانی زانکۆی بەغداد لە یەک پاسی گەورە کۆ ببووینەوە. عەزیز مەحمود و یاسین ئەنوەر کە پێشتر ناسیبوومن، لە قۆناغی سێیەمی بەشی کوردی بوون. وەک دەمڕاست سەرپەرشتی ئێمەیان دەکرد. هەر لەو سەفرەیەدا لەگەڵ حەمە قەراخی، ئازاد نەجمەدین، ئەحمەد سابر و زۆری دیکە یەکترمان ناسی. لە ناو برادەرەکانی هەولێریش ئەرسەلان بایز، عوسمان گەزنە، سابر مەحمود هەبوو.

ئەو ڕۆژە جەماوەرێکی هێجگار زۆری قوتابییە کوردەکان لە هەموو کۆلێجەکانی زانکۆ کۆببوونەوە. گوایە خواردنی نیوەڕۆ بەیەکەوە بۆ هەموو لایەک کرابوو. بەڵام کاتێک ئاگاداری ئێمەیان کردەوە، هیچ جۆرە خواردنێکمان بۆ نەمابوەوە و ناچار زگی خۆمان کوشی و بەدوای شوێنێک گەڕاین. تاکو سەر و سەندەویچ و لەفەی ساردوسڕمان

دەستكەوت. كە بەندە لەلایەن یاسین ئەنوەرەوە داوەت كرام و عەزیز مەحمودیش بە سەرداهات. لەو سەفرەیە كیژوكاڵ لە هەموو كۆلێجەكان هاتبوون.

بۆ ئەز ئەو تێكەڵبوونەی نێوان كیژ و كوڕان، بەدوای دیمەنی تێكەڵاوی پۆل لە دەوامی زانكۆدا، دیاردەیەكی تازە بابەت بوو. لە خوامان دەویست لەگەڵ كچێك دوو ووشە بگۆڕینەوە. جاری وا هەبوو بە چەندان كوڕ دەوری كچێكی ناسراومان دەدا. ڕۆژەكەی بە شایی و هەڵپەڕكێی كوردەواری ڕازابوەوە. عەزیز مەحمود و یاسین ئەنوەر دەستەگوڵی خۆیان بردبوەوە و زۆربەی كات لەسەر چۆپی كچی جوان لە دەستیانەوە بوون. هەروەها ئەو ڕۆژە ڕۆژی عەشق عەشقێنی بوو. هەر كچ و كوڕێك بۆ خۆیان لە پەنایەكەوە، ئارەزووی ناو دڵی خۆیان بۆ یەكتر دەخوێندەوە. كاتەكە بە زوویی بەسەرچوو، درەنگانێك شاوری گرد بوونەوە و خۆئامادەكردن بۆ گەڕانەوە لێدرا. ئێمەی برادەرانی گۆڕین لە هەموو كونجێكەوە بۆ لای پاسەكە قۆشمەمان بوو، نەوەك شوێنەكەمان بگیرێ. لەو بینەوبەردەیەدا من و ئەرسەلان سەرمان بەیەكەوە نابوو، باس باسی ڕێكخستنی نوێ و خوێندنەوەی فەلسەفەی سۆسیالیستی زانستی بوو. لە ناكاو بەسەر شەڕی عەزیز مەحمود و چەند قوتابییەكی تر داكەوتین. كە چەند دانەیەكیان فەیلی بوون، بە زاراوەكەی خۆیان جوێنی ناشیرینییان بە عەزیز دەدا و گەرەكیان بوو، گەلەكۆمەكی لێ بكەن. كە بەڕاستی لە بیرم نەماوە لەسەر چی بوو. ئەرسەلان و ئەز لەسەر عەزیز بە جواب هاتین و شەڕەكە خەریك بوو گەورە دەبوو. چونكو قوتابیان لە هەردوو لاوە لەسەر ناسیارەكانی خۆیان كردەوە. ڕاستە گروپەكەی ئەوان بە ژمارە زۆرتر بوون، بەڵام ئێمە لەوان بە دەستوبردتر دەستمان كردەوە. تاكو هەندێ قوتابی بێلایەن كەوتنە نێوان و لەیەكیان كردینەوە. ئێستاكەش لە بیرم نەچووەتەوە، لە كۆتایی ئەو دەمەقاڵێیە بازاڕییەی نێوانماندا تاكەپێڵاویكی یەكێك لە قوتابییە فەیلییە دەمشڕەكان، چۆن چۆنییەك كەوتبووە دەست عەزیزەوە و هەر سەری ئەو قوتابییەی پێ دەكوتا. ئەویش هەموومانی جوێن باران دەكرد. منیش دەستوبرد تاكە پێڵاوەكەم لە دەستی عەزیز دەرهێنا و بۆ كوڕە فەیلییەكەم هاوێشت. لەگەڵ دانەوەی پێڵاوەكەی، نازانم چۆن لە دەمم دەرچوو، پێم گوت: فەرموو قۆندەرە ئیبن قۆندەرە..! كابرا لەشەرمان عەزیزی بەردا و گەرەكی بوو بەرانگژی من بێتەوە. دیتم چیا عباس كە قوتابی كۆلێجی پزیشكی بوو، ئەندامی سكرتارییەتی یەكێتی قوتابیانی كوردستان بوو. لە پشتەوە ئەو برادەرە

فەیلییەی گرت و زۆری سەرزەنشت کرد و ناوێکی بەو بەیەکهەڵپژانەدا کرد. کە دواتر زۆربەی شەڕکەرەکان لەناو ی ق ک بووینە دۆست و هاوڕێی یەکتری، بەتایبەت بەدوای تێکەڵ بوونەوە و ساغبوونەوەی یەک یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە عیراقدا.

## تێکەڵبوونی خوێندکاران و ئاشنابوون بە شێوەزاری یەکتری

لە بەشی کوردی کۆلێجی ئەدەبیات _ لە زانکۆی بەغداد _ ی ئەوێ رۆژێ. هەموو قوتابییە وەرگیراوەکان بە ناسنامە کورد بوون. لە شار و شارۆچکەکانی بادینان، هەولێر، کەرکوک، سلێمانییەوە بگرە تا دەگاتە خانەقین و مەندەلی و کوردەکانی دانیشتوی بەغداد، لەو بەشی کوردییەی کۆلێژی ئاداب هەبوون. خەڵکی هەر ناوچەیە بە گشتی، بە شێوەزاری دیاریکراوی خۆمان دەئاخافتین. بە جۆرێک بەشی کوردی بەبێ ئەوەی بەوردی درکی پێ بکات، ببووە سەکۆیەکی بە کۆمەڵی خوێندکارانی ئێرە و ئەوێی باشووری کوردستان. کە رۆژانە بە تێکەڵی خوێندن لە برێتی قسەکردنمان، ن گوێمان لە دیالیکتیکی یەکتریی دەبوو. بەڵام دیسانەوە ئەو تێکەڵی و پێکەوەبوونە بەبێ گرێ و تەنگوچەڵەمە نەبوو. ئەوە جیاوازی بیروباوەڕی سیاسی و ئینتمای حیزبی هەمەڕەنگەش هەر لێگەڕێ. لەگەڵ ئەوەی زۆربەی هەرە زۆری قوتابیانی بەشی کوردی لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا، ئەندامی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بوون. بە هەمان رادەی کەمتر لەگەڵ رێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان دابوون، بەڵام ئەندام و لایەنگرانی حشع هەبوون، هەوادارانی حیزبە کارتۆنییەکانیش پەیدا ببوون. دیسانەوە ئەڵقە رۆشنبیرییەکانی کۆمەڵەی مارکسی _ لینینی _ یش بە شێوەیەکی نهێنی هەبوو، کە زۆرتر لە ریزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان خۆیان دەدیتەوە.

راستە لە ناو پرۆگرامی خوێندندا، وانەی خوێندنی مەم و زینی ئەحمەدی خانی بە دیالیکتیکی کرمانجی سەروو دەخوێندرا. بەڵام وانەکانی دیکەی زمان و ئەدەبی کوردی، وانەی مێژوو و جوگرافیا بە شێوەزاری کرمانجی خواروو بوو. کە لە لای قوتابییەکانی بادینان بە قورسی و سەرگرانی وەردەگیرا. قوتابیانی ناوچەکانی سۆران لە خوێندنی مەم و زین بە کرمانجی سەروو هیچ نیگەرانییەکیان نەبوو.

راستە هەلێکی باش و رەخساو بۆ هەموو قوتابییەکانی ناوچە جیاجیاکان هاتبووە پێشەوە. کەچی لە رووی پراکتیکی زۆربەی هەرە زۆری قوتابییەکانی بادینان، مەگەر چەند دانەیەکی بەدەگمەنی لێ دەرچوبیت، زۆرتر بە دەوری یەکترییەوە بوون. زۆر بە کەمی تێکەڵی ناوچەکانی تر دەبوون، تەنیا دانیشتنی ناو پۆلی لێ دەرچێت، دەنا زۆر بە زەحمەت لەگەڵ قوتابی ناوچەکانی تر هەڵسوکەوتی رۆژانەیان هەبوو، بە تایبەت لەگەڵ قوتابیانی شاری سلێماندا دانویان نەدەکوڵا... بەرچاوترین گروپی ئەو تیکەڵبوونە، بەشێکی قوتابییەکانی خەڵکی هەولێر بوون کە لە ناویان هەندێک لە قوتابییە کۆییەکان هەوێنی پێکەوە گونجان بوون. زۆر لە قوتابیانی هەولێر لەنێوان بادینی و کەرکوکی و خانەقینی و فەیلی و سلێمانی جیاوازییان نەدەکرد. ئەوانەی بادینان بە سۆرانی قسەکردن لە لایان سوغرە بوو. زۆرتر مەیلیان بە لای عارەبی قسەکردنەوە بوو. وەک لە هاتوچۆی شاری مووسڵ و مامەلەی ئابووری لەگەڵ ئەو شارەدا، خوێندنیان زۆرتر بە زمانی عارەبی بووە و بەو زمانە راهاتبوون و لە بە کارهێنانی وشەیەکی شێوەزاری سۆرانی لە قسەکردنی لەهجەکەی خۆیان کفر بوو.

هەر بۆ نموونە جارێکیان بە بۆنەی جەژنی رەمەزانی موسلمانانەوە، تووشی برادەرێکی بادینی هاتم و ناوی شوکری بوو پێمگوت: شوکری جەژنت پیرۆز بێت. بە داخەوە تێنەگەیشت یاخود خۆی لە گێلیُ دا. قوتابییەکی دیکەی بادینی بەناوی کەمال، بەشوکری گوت: کورۆ عەباس دەبێژی عیدە وە موبارەک بێت. ئیتر شوکری بۆ کەماڵی وەرگرتەوە و گوتی: کورە دە بێژە عیدە رەمەزانی موبارەک بێت، ئەو جەژنە و پیرۆزەت لەنک کێ هێناوە..!

## نموونەیەکی دزێوی شەڕەشاری ناو بەشی کوردی

لە قۆناغی سێیەمی زانکۆدا بووم، لەگەڵ قوتابییەکان لە وانەی مێژوی ئەدەبی کوردی و لە دەمی پشووی نێوان وانەکاندا لە پۆل دەهاتینە دەرەوە. بە رێکەوت لەگەڵ مامۆستا خەریکی قسەکردن بووم. لە ناکاو بە شێوەزاری بادینی و سۆران، قیژ و هۆڕی شەڕە قسەی رەق و جوێنم بەرگوێکەوت خێرا مێزەکەی مامۆستام بە جێ هێشت و لە دەرەوە لە ناو باخچەی بەردەمی پۆلەکانەوە دیتم. کۆمەڵێک قوتابی بادینی بەشی کوردی، دەوری عبدالله علی رشیدی قوتابی کۆلێجی ئیدارە و ئابووریيان داوە و گەرەکیانە بە گەلەکۆمەکی بیپشکنن. ناوبراو کە هاوڕێیەکی ئەڵقە رۆشنبیرییەکانی کۆمەڵە بوو، هەفتەی یەک دوو جار بۆ سەردانی برادەرەکانی لە بەشی کوردی، سەری لە کۆلێجی ئاداب دەدا.

هەندێ قوتابی سۆرانیش بەرانگژی ئەو قوتابییە بادینیانە ببوونەوە و لە دژی یەکتری لە دەمەقاڵێدابوون. منیش کە چاوم بەو دۆخەی کاکە عەبە کەوت. لەوە ترسام و گوتم رەنگبێ، بڵاوکراوەیەکی نهێنی کۆمەڵەی یاساغی بەدەستەوە بینرابێت. یەکسەر بە هەڵەداوان کاکە عەبەمان لەبەر چنگیان دەرهێنا و گوێم لێ بوو، کچێکی قوتابی بادینی کە ناوی خدیجە خانم بوو، ئەندامی لیژنەی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بوو لە بەشی کوردی، لەبەرانبەر من گوتی: عباس تۆ کە ماوەیەک مەسولی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە بەشی کوردی بووی، بۆ دەتەوێ ئەو _ لەفیفە _ دەرباز بکەی کە بەیاننامەی ئەوان لە بەشی کوردی بڵاو دەکاتەوە و ئەو بەیاننامەمان تەسلیم ناکات ..!

من حەپەسام ! لەفیفی چی و حاڵی چی! کاکە عەبە و لەفیف کوجا مەرحەبا (لەفیف ناوی جەماعەتەکەی مەلا ماتۆڕ و شێخ سەتار بوو کە تازە یەکەم بەیاننامەی جاڕدانی خۆیان بەناوی لەفیف بڵاو کردبووەوە) یەکسەر هاوارم بەسەر ئەو کیژەدا کردەوە و گوتم: دەبێ ببوری عەبە هەرگیز لەفیف نییە و ئێوە شەڕ دەفرۆشن. ئەگەر ئەوەندە ئازان، زۆر چاک دەزانن کێ ئەندامی لەفیفەکانە و بە ئاشکرا دەمانچە هەڵدەگری و بەیاننامەی لەفیفەکان لە کۆلێج بە رۆژی رووناک هەڵدەواسی، بۆ ناچن پڕ بدەنە ئەو...!

بە هەر شێوەیەک بوو بە هاوکاری قوتابیانی وەک نجمەدین سەریەشاخی و کەمال ئەمین، خالد جوتیار، کاکە عەبەمان لەو تەنگەژە دەرباز کرد و برادەران هەتا بەردەمی

بەشی ناوخۆی قوتابیان بردیانەوە. خۆشم ئەوەندەی بۆم کرا، کەوتمە هێمنکردنەوەی دۆخەکە. کەچی لە پڕ ئەو جارە دوو قوتابی خەڵکی سلێمانی (حەسەن و نەریمان مەستی) کە هەردووکیان مرۆڤی کوردپەروەر بوون، لە لایەکی دیکەوە لەگەڵ دوو قوتابی هەولێر. نە ناویانم و نە لەسەرچی مشتومڕیانە لە بیرنەماوە، بەرانگژی یەکتربوونەتەوە و خەریک بوو شەڕی لێ دەکەوتەوە. چونکو قوتابیانی دیکەی بادینی و کەرکوکی و خانەقینی لە بەرانبەر ئەوانەی سلێمانی کەوت. بوونە لای هەولێرییەکان، ئەوانەی سلێمانیش لە بەرانبەریان وەستابوون

لە بیرمە یەکێک لەوانەی سلێمانی بە بادینییەکی دەگوت: کەری مولەوەنیش بووەتە لای هەولێریان..! بەراستی ئەو دەمی لەو قسەیە نەگەیشتم، مەبەستی ئەو برادەرە چییە..! لێرەدا بە هاوکاری برادەرە قوتابییە کۆییەکان (شێرکۆ فەتح الله، وریا خدر، بەهزاد ئیسماعیل، رزگار عبدالرزاق، محمد غریب، و چەند برادەرێکی دیکەی شاری کەرکوک، وەک عورفان مەردان و فتح الله کریم، مەردان عومەر و خانەقینییەکانی وەک فازل ئەرکەوازی و عبدالحسین و چەندانی دیکە، کەوتینە نێوانیان و لە یەکترمان دوور خستنەوە. لە هەلێکدا من لە __ حسن __ ی سلێمانیم پرسی، کە برادەریمان خۆش بوو - حەسەن ئەو کەری مولەوەنە چی بوو..! گوتی: ئەی ئەو بادینییانە هەر لە کەری رەنگاورەنگ ناکەن..! بەراستی دەمی پێکەنینیش نەبوو، هەر زۆر پێکەنیم بە تایبەت بەدوای ئەو شەڕەوە گۆنگەرەکەی عەبە خەریک بوو لە بیر دەچووەوە.

## شەڕە دەنووکی نێوان مامۆستایانی بەشی کوردی

لە خوێندنی زانکۆوە یەکێک لەو شتانەی بەردەوام مایەی سەرسوڕمانی من بووە. بەرخوردی سەیروسەمەرەی مامۆستاکانی بەشی کوردی بوو. بە تایبەت نا تەباییان لە بەرچاوی قوتابیەکاندا. ئەگەر دکتۆر ئیحسان فوئادی لێ دەرکەم، کە خاوەن کەسایەتی گران و سەنگین، لە هەموو مامۆستاکان هێمن و بە حەوسەلەتر بوو. ئەو مرۆڤە وەک سەرۆک بەشی کوردی، هاوکاری و کارئاسانیکردن بۆ قوتابیەکان، سەرتۆپی رەوشتبەرزی و چڵەپۆپەی پراکتیکی بوو. بە داخەوە هەندێک لەو مامۆستایانە لە ناوچەگەرێتی،

گرەوی حەزونەزی خۆیان دەبردەوە. هەندێکیان لە بورجی عالی سەیری قوتابیەکانیان دەکرد. وەک ئەوەی رۆژێک لە رۆژان خۆیان قوتابی نەبووبن.

راستە قوتابییە خاوەن بیروباوەڕە چەپ و کۆمۆنیستەکانی ئەو دەم، تارادەیەکی زۆر مایەی پەیوەندی گەرموگوڕ بوون لەگەڵ مامۆستای هەڵگری ئەو بیروباوەڕە ـــ *ئەوەش هەر بە ناو بوو* ـــ دەنا لە مەیدانی کاسبیکردنی ژێر بە ژێرەکی لەگەڵ سیاسییە جامبازەکانی خۆ پێگەیاندن وەک مەنهەج لە قۆشمەدا بوون.

لە لایەکی دیکەوە بەشێکی زۆری مامۆستاکانی بەشی کوردی، بە تایبەت ئەوانەی خاوەن بڕوانامەی دکتۆرای سۆڤیەتی کۆن بوون، دژایەتی و بەربەرەکانی کۆڕی زانیاری کوردیان نەدەشاردەوە. ئەوان دیسانەوە بە چاولێکەری بەرپرسە سیاسییە کاسبەکانی کۆن و نوێ، لە یەک کاتدا دەسرازەیەک پلەوپایەی حیزبی و حکومی و بازاری و بازرگانی خولیایان بووە. ئەو مامۆستایانەش کە هەر بە کار و پیشەی مامۆستایەتی دڵیان ئاوی نەدەخواردەوە. خۆیان بە مەغدور و غەدرلێکراو دەزانی، کە پلە و پایەکانی ـــ کۆڕی زانیاری کورد ـــ یش بۆ ئەوان قورخ نەکراوە. ئینجا نیشانەکانی دواکەوتوویی مرۆڤ لەو چاو بە یەک هەڵنەهاتن، بەخیلی، بێ چاوڕوویی، دوو ڕوویی، درۆ و بوختان بۆ یەکتر هەڵبەستن بەخۆرایی.. هتد لە بەژن و باڵای هەندێک لەو مامۆستایانە وەک گەڵای پاییز هەڵدەوەری و بە نێو ریزەکانی ئەو قوتابیانەدا بڵاو دەبووەوە، کە لە داهاتوو دەبوونە مامۆستا و کارمەندی بەرێوەبردنی کۆمەڵ.

پاشان سەرباری هەموو ئەو پاشەگەردانییانە، بەڵگەی زیندوو بگێڕمەوە لە بۆ قسەکانم. شەڕە دەنووکی ناوبەناوی خودی ئەو مامۆستایانە لەگەڵ یەکتری لەبەر چاوی قوتابیاندا. بە دەیان جنێوی بازاڕی و منداڵکارانە و پەلاماری یەکتریان داوە و نامەوێ ناوی ئەو مامۆستایانە بهێنم کە ئەوە بەشێکی رەفتار و هەڵسوکەوتیان بوو. زۆربەی ئەو قوتابیانەی ئەو ساڵانە ١٩٧٠ ـــ ١٩٧٤ لە بەشی کوردی لە زانکۆی بەغداد بوون، وەک نموونەگەلێکی ئەو ئاکارانەیان بە چاوی خۆیان دیتوە و بوونەتە نێوانکار کە شەڕی نێوان ئەو مامۆستایانە دامرکێننەوە.

# گەرمسە ڕێکخراوەییە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە

کۆمەڵەش هەر لە سەرەتاوە بۆ دروستکردنی ڕێکخستنێکی نوێ لە کوردستانی باشووردا، هەر بە قسەی گەورە گەورە سەبارەت بەو ڕێکخراوە تازەبابەتە گیرفانانی لێ پڕ کراوە خەڵکی ڕەشورووت تێیدا تەپوتۆزی بۆماوەتەوە. بەو بیانوەی ئەو تەنزیمانەی رابردوو هەمیشە بە هەرەمەکی خەڵکیان وەرگرتووە و گوایە و دەبێ هەموو تاکێکی کۆمەڵ بۆ سیاسەتکردن و حیزبایەتی قۆشمە بکات..! مەگەر ئەوە هەر لە بیر و ئەندێشەی هەندێ سەربازی نەناسراوی دەروێش ئاسای پاک و دڵسۆز جێگای نەبووەتەوە، دەنا لە دامێنی مندالدانی کۆمەڵەی مارکسی لینینیشدا، هەمان بەزموڕەزمی تەنزیماتە زۆر و زەبەندەکانی تر سێرەی تفەنگی لە تاریکییەوە گرتووە. بە جۆرێک زۆربەی گەرەسەی ئەو ڕێکخراوەش بە درێژایی زەمەن بە هەموو ڕەنگێک بەرگی گۆڕیوە بۆ مسۆگەرکردنی کاسبیە سیاسییەکەیان. هەر لە قورخکردنی مەسولبوون هەتا سەرلێواری مەرگ و تا دەگاتە داهێنانی گوفەکدانی هۆز و بنەماڵە درێخییان نەکردووە.

ئەوان ڕۆژانی سەرەتای دروستبوونی کۆمەڵە لەناو کوردەکانی بەغداد و بەتایبەت لە ناو خوێندکاراندا. ئەگەر بڵێم لەو ڕۆژانەدا خەڵکی دەورووبەری کۆمەڵە، هەتا لەناو ئەو خەڵکەی لە شارێکی وەکو سلێمانی لە ژێرِ چەتری کۆمەڵە گرد بیوونەوە. ئەوانەی بەغداد بە ژمارە و ناوەڕۆک، زۆر لەپێشەوە تر بوون. نەک بەو مانایەی لە نرخی سەربازە نەناسراوەکانی گیانفیدای سلێمانی و بازنەکەی کەم بکەینەوە. بەڵکو ئەو دەمە بەغداد ببووە کۆبەندی کۆمەڵێکی زۆری جەلالییە کۆنەکان و هەر خۆیشی بەغداد سەنتەری زانکۆ و ڕۆشنبیری و پایتەختی عیراق بوو. قوتابییەکی هێجگار زۆری هەمەچەشنەی کوردی لێ کۆببوەوە و وەک خوێندکاری زانکۆ و پەیمانگاکان لە بەغدادی پایتەخت نیشتەجێبوون.

ڕێکخراوی کۆمەڵە وەک چەندان ڕێکخستنی دیکەی لە پێش و دواتر، تەنیا بە بانگاشە و خۆ پێهەڵواسین، بە حەزی لاساییکردنەوە بە ناوی کرێکاران و زەحمەتکێشانەوە خۆی هێناوبردووە، دەنا لە پراکتیکدا ڕێکخراوی توخمی هەرە بزێوی بورژوایی، وردە بورژوای شۆڕشگێڕ و هەڵپەرست _ *وەک لە هەولێر دەڵێن، هەڵەپاس* _ بووە. بەدەگمەن لێرە و لەوێ کرێکارێک، تاکوتەرا زەحمەتکێشی تێکەوتووە. چونکو هەتا لەناو جوتیارەکانی گوندیش کە لە خەباتی پێشمەرگایەتیش بەدوای شار،

هەڵسوڕاوێکی کۆمەڵە بووم. زۆرتر جوتیارە زەنگین و گوزەران خۆشەکان هەواداری کۆمەڵە بوون.

لە شارێکی گەورەی وەک بەغداد، کرێکارە کوردەکانی ریزی کۆمەڵە لەچاو ئەو هەموو کرێکارە کوردەی بە هۆی هەبوونی کرێکاری روویان لە بەغداد کردبوو، لەژێر رێژەی سفرەوە نقەی هاتووە. بەڵام ئەو رێژەیە لەناو خوێندکار و کارمەندی نێرە و ئەوێی کورد لە دامودەزگا حکومییەکانی بەغداد بەرزترین رێژە بووە. بە کورتی ئەوە یەکێکە لەو تەنگەژانەی رێکخراوی کوردی کە هەر لە سەرەتاوە بانگاشەی سەقەتی بۆ خۆی بە دارێ وەکردووە و حەقیقەتی بە لاوە گرنگ نەبووە. بۆ بەڵگەش کۆمەڵە لە ئانوساتێکی نەخوازراودا، لەسەر دەستی رابەرە وردە بورژواکانی، وەک پۆڕی توککراو لە گۆڕ نرا و تاکە یەک کرێکاری ناو ئەو رێکخستنە دەنگی لێوە نەهات..!

بۆ ئەوەی زۆر لە مەبەستی ئەو بازنەیە دوور نەکەومەوە، بە پێی ئاگاداری و زانینی خۆم باس لە خەباتی کەرەسە دیارەکانی کۆمەڵە لەناو شاری بەغداد دەگێڕمەوە. مێژوویەک بە ماندووبوونی دەیان سەربازی لەبیرکراو تۆمارکراوە کە ناویان لەناو کولەکەی تەڕیش ناهێنرێ. چونکو وەک پێویست ئەو توخمانە لە دوای کەللاکەوتویی، شەهیدبوون، و لە رۆژگارێکی دواتری کۆمەڵەدا، بە کەلاکەوتوویی ماونەتەوە و هەوڵی خەشیمانە و دوور لە ویژدان دراوە بۆ بنکۆم کردنیان. بە تایبەت هەندێکیان بە ژیان نەماون و بگرە لە کۆڕی خەباتدا گیانی خۆیان لەدەست داوە. هەندێکشیان هەنوکەش دەژین. بەڵام کونجی قەناعەتیان پێ گیراوە و کەس باکی پێیانەوە نییە. وەک ئەوەی هەر ئەوانەی ئەمڕۆ کەوگیر بەدەستبووین و هەر خۆیان خاوەن دەسکەوتە مشەکانی بەر سێبەری دەسەڵاتی فلان و فیسار حیزبی رۆژە سەختەکانی سەردەمی بەعس بوون..!

کەسی دیکە لەوان رۆژە سەرەتاییەکانی لەدایکبوونی کۆمەڵە و بۆ بەسەرپێ کەوتنی گیانفیداکاری نەکردبێت..!

بەگشتی خوێندکارە کوردەکانی زانکۆی بەغداد، لەوان ساڵی ١٩٦٨ _ ١٩٧٥دا زۆرتر لەگەڵ رووکردنە بیروباوەڕی شۆڕشگێڕی (مۆدەی ئەو دەم) مارکسیزم _ لینینزم دەهاتنەوە. لە ناویاندا دەیان توخمی گورجوگۆڵی مەیدانی خەباتی پیشەیی، وەک هەڵگرێکی بێ ئەملا و ئەولای ئەو فەلسەفەیە دیار بوون. چ لە بڵاوکردنەوەی نووسین و وتار بە تایبەت لەسەر تاکە گۆڤاری مانگانەی رزگاری لە پێشەوە و دواتر رۆژنامەی

هەفتانەی کوردی _ هاوکاری _ و دواتر ڕۆژانەی مەودا کورتەکەی _ برایەتی _ کە زۆرتر ناوەڕۆکی ئەو نووسینانە، سەبارەت بە سۆسیالیستی زانستی دوور لە دەستتێوەردانی ڕێبازی سۆڤیەتی بوو. بۆ نموونە ناوەکانی فوئاد قەرەداخی، نەوشیروان مستەفا، بەکر حوسێن، شاسوار جەلال، فوئاد مەجید میسری، فازیلی مەلا مەحمود، دلێر ، سەربەست بامەڕنی، فەهمی قەرەداخی.. هتد لە ناوە دیارەکانی ئەو کاروانە سەرەتاییە بوون. ئەوانە هەموویان بە شێوەیەک لە شێوەکان لە گەل کۆمەڵە بوون و بگرە هەندێکیان لە یەکەم هەنگاوەوە، لە دامەزراندنی کۆمەڵە جێگایان هەبووە. دواتر بە هۆی جیاوازی تێڕوانینی عیراقی و کوردستانی، بەشی هەرە زۆری ئەو خەڵکە بە توانایە لە بواری فیکری و مەعریفی لە کۆمەڵە دەرچوون. چ ڕێکخستنی جیاوازیی سەرلەنوێیان دروست کردووە، یاخود هەر لە سیاسەت و خەباتکردن دوورەپەرێز ماونەتەوە.

من ئەوێ ڕۆژێ بونیادی فیکریم لەو ئاستەدا نەبوو، لە نزیکەوە درک بەوە بکەم کە کۆمەڵە بەدوای دەرچوونی توخمە هەرە تێگەیشتوەکانی فەلسەفە و بیری سۆسیالیستی زانستی (بۆ ئەوێ ڕۆژێ) و ئەگەر مام جەلالی لێ دەرچوایە، لە سەرجەمی ئەندامانی کۆمیتەی بەڕێوەبەری هەرێمەکانی _ سەرکردایەتی کۆمەڵە، لە ١٩٧٠ _١٩٧٤، وەک ئەزموون دەریخست. کۆمەڵە خاوەن کادرێکی سەرکردەی قاڵبوەوەی مەیدانی ئەو بیروباوەڕە رادیکاڵییە نەبووە کە خۆی پێوە بادەدا. ڕاستە پیاوی تێکۆشەر و خاوەن دەستپێشکەری و دڵسۆز بوون، بەڵام بەڕاستی ئاستی فیکرییان پریمیتیڤ_ سەرەتایی_ و کەم زەخیرەی ئایدیۆلۆژی بوون. ئەگەر لاپەڕە زۆر و زەبەندەکانی گۆڤاری ئاڵای سوور _ *ئۆرگانی کۆمەڵە کە سێ ژمارەی لێ دەرچووە*_ بەسەربکەینەوە، لە هەندێ وتاری وەرگێڕدراوی زمانی عەرەبی لێ دەرچێت، کە سەبارەت بە ململانێی سۆڤیەتی _ چینی و گۆشەنیگای تیۆری سێ جیهانی ماوتسی تۆنگ و تێڕوانینەکانی ئەلبانی و یەمەنی خواروی ئەو کات لێ دەربکرایە، شتێکی ئەوتۆی لێ نەدەمایەوە کە دەستمایەی باسکردن بێت. بە جۆرێک ئەو سەرکردایەتییەی کۆمەڵە لە دەست و پێ سپییەتی خۆیانەوە، بەشێکی هەرە زۆری ئەو زەخیرەیەی کۆمەڵەیان بە کۆپی و وابەستەیی ماویزم قورمیش کردبوو. هەموو ئەندام و ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی کۆمەڵە لە پانتایی واق واقی نەبوودا، بە لاساییکردنەوەی مامۆستاکان چاومان نوقاندبوو، لە بورجی عالی بانگی قولەی قافمان دەدا..!

لەگەڵ هەموو ئەو واقیعە تاڵەدا. نموونەگەلێکی هاوڕێیان هەبوون، لە مەیدانی هەڵسوڕان و کوڕی ڕۆژە سەخت و دژوارەکان بوون. بە تایبەت کەسانێک کە من لە شاری بەغداد ناسیومن و لە نزیکەوە بەرخوردم لەگەڵ کردوون. هەروەک نەریمان مەحمود خانەقی کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٠ یەکەم ڕێکخەری ئەز بووە لە بازنە ڕۆشنبیرییەکانی کۆمەڵە و هەنوکەش لە ژیاندایە. نەریمان ئەگەر یەکەم کەسی خانەقی نەبێت لەگەڵ لەدایکبوونی کۆمەڵەدا، ئەوە لە یەکەمینەکانی ئەو قوتابییە خانەقینیانە بووە کە لە پێشەوە لە ریزی کۆمەڵەدا لەناو قوتابیانی بەغداد و خانەقی هەرڵسوڕاو بووە.

پاشان یاسین ئەنوەر کەرکوکی کە دوو ساڵ لە پێش منەوە بوو. مرۆڤێکی خاکی، بێفیز و بێ فروفێڵ. گیانبازێکی پڕ لە قوربانی و بە پیرەوەچووی خواستەکانی ڕۆژ. سیاسەتی وەک هەواری دڵسۆزی و هەست و نەستی پاک و بێگەرد وەرگرتبوو. کچێکی هاوپۆلی خۆی خۆش دەویست، کە هەموو خێزانەکەی بۆ دۆستایەتی و بوونە کۆمەڵە گۆش کردبوو. ئەو کوڕە چەندە مرۆڤدۆست بوو، ئەوەندەش کوردپەروەر و وڵاتەکەی خۆش دەویست. بە چەشنێک بە هەڵسوکەوتە دڵگیرەکانی، جەماوەرێکی هێجگار فراوانی لە ناو قوتابیانی زانکۆی بەغداد بە دەوری خۆیدا کۆ کردبووەوە. بۆ ڕاستیش لە کۆنفرانسی قوتابیانی کوردستان لە سلێمانی بە دەنگی یەکەم بووە بەرپرسی لقی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە بەغداد. ئەو ئەرکە بۆ یاسینی جوانەمەرگ سەرەخۆرە بوو، یاسین لە بەجێگەیاندنی ئەرکێکی سکرتاریەتی قوتابیان لە ڕێگای نێوان بەغداد _ کوت دا، بووە قۆچی قوربانی و یەکەم شەهیدی کۆمەڵە _ *کە لە بیری کەسێکی دەسەڵاتداردا* نییە _ و کەسمان جارێکی دیکە نەماندیتەوە. یاسین بە ئاسانی لەکیس کاروانی یەک دەسرازە هاوڕێی کۆمەڵە چوو، بە مەرگی ناوەختی خۆی هاوڕێ نزیکەکانی داخ لە دڵ کرد، بۆشاییەکی بەرچاوی لە کۆڕی هاوڕێیەکانی لە زانکۆی بەغداد و کۆلێجی ئاداب و کەرکوک و دۆستە گیانی بەگیانییەکانی بە جێ هێشت. یاسین خەونە گەورەکانی لە پێکەوەنانی خێزانی ژێر ساباتی چەندان ساڵ دڵداری بە ناکامی بە جێ هێشت. گەشەکردن و بەرەوپێشەوە چوونی کۆمەڵەی بۆ قەدەری بەر تەوژمی ڕۆژە ناخۆشەکان رادەست کرد. شانبەشانی یاسین، عەزیز محمودی دەستەبرا و هاوڕێی شەو و ڕۆژی هەبوو، کە لەناو خوێندکارانی زانکۆدا، ئەستێرەی گەشی بەرخۆدان و

موقاوەمەت بوو. بە پشتیوانی و هاوکاری یەکتری، داروبەردی قوتابیانی بەغداد لەبەر پێیان دەلەرزی. لە بیرمە عەزیز و یاسین لە ڕۆژانی شاڵاوە بەدناوەکەی سەر فەیلییەکانی بەغدادی ژێر حوکمڕانی ڕژێمی بەعسی ئەو دەم. هەردووکیان کتوپڕ لە شانی هاوڕێیەکانیان بوون، لە پرستۆ و شەرمەزارکردنی ئەو شاڵاوە. بەبێ گوێدانە هەر جۆرە مەترسییەک لە بەدەنگەوەهاتن و هاوکاریکردنی قوتابیانی بەغداد، لەپێناوی کارئاسانی بڵاو. بوونەوی بەیاننامەی ریسواکردنی ئەو شاڵاوەی بەعس، جوامێرانە لە مەیدانەکە مایەی گەرم وگوڕکردنی کوڕی ئەو ڕۆژە بوون.

عەزیز مەحمود وەک ڕۆڵەی تاقانەی دایکە کڵۆڵ و خوشکە بێنازەکانی، خۆی بە ڕۆڵەی هەموو خەڵکی کورد دەزانی. بۆ قوربانیدان و تێکۆشان سەری پێوە نەبوو. بە کورتی هەڵکەوتوویی یاسین ئەنوەر و عەزیز محمود و نەریمان محمود لەناو خوێندکارانی ئەوێ ڕۆژێدا، وەک چاوساغێکی بە ئەمەکی کۆمەڵە لە هەڵسوڕان و چاڵاکی نواندن لە بەرایی کاروان بوون. هەرسێکیان بەدوای کۆشش و هەوڵدانی بێوچانیان لە بەغداد، لەناو خەڵکی شارەکانی خۆشیان ـ کەرکوک و سلێمانی و خانەقی ـ چ لەسەرەتا و چ لە ڕۆژە ناخۆشەکاندا، ڕۆڵی بەرمەیدان بوونیان هەبووە. بەتایبەت دوای نەمانی یاسین، عەزیز لە شانی جەمالەڕەشدا، بۆ سلێمانی و کۆمەڵە لە ڕۆژانی تەنگانەی ١٩٧٥ ـ ١٩٧٦ دا، قەڵایەکی لە رووخان نەهاتوو بوون. بە تایبەت بۆ پشتیوانی و هاوکاری ـ ئارام ـ ی هەڵکەوتووی تەنگانەیی کۆمەڵە، پشت و پەنایەکی پتەو بوون. هەردووکیان بەدوای پەیوەندیکردنیان بە مەفرەزە تاک و توکەکانی کۆمەڵە لە شاخدا، یەک لە دوای یەک لە هەڵەی هاتنەوە ناو شاری سلێمانی، بە ئاسانی لەلایەن هێزەکانی ڕژێمەوە گیران و دوایی لە لووتکەی هەڵوێستی وەڵامدانەوەی ئازار و ئەشکەنجەی گرتوخانەکانی ـ هێئە خاسە ـ ی کەرکوک و زیندانی مووسڵ لە سێدارە دران. کە کۆمەڵە و خەباتی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی کوردیان سەربڵند کرد. بەڵام موقاوەمەتی شۆڕشگێڕانە لەوێ ڕۆژگاردا، دوو کادر و مرۆڤی کەموێنەی لە جۆری عزیز مەحمود و جەمالەڕەشی لە دەست چوو کە وێنەیان دروست نەبووەوە.

ئینجا دێمە سەر باسی سەربازێکی نە ناسراوی دیکەی ڕۆژانی دەستپێکی دروستبوونی کۆمەڵە هەتا ساڵی ١٩٧٨ لە شاری بەغداد و شام. ئەویش ئینسانی سەربڵندی خانەقینی ـ ئیبراهیم عبدالعلی ـ ناسراو بە برایم قوربانییە. ئەو مرۆڤە بۆ

خۆی پیاوێکی کاسب و زەحمەتکێشی دووکانداری شەقامێکی بەغداد _ شارع النهر _ بوو. من بەوە ئاگادار نیم چۆن هاتوتە ریزی کۆمەڵەوە. بەڵام بە دڵنیاییەوە لە رێگای شاسوار جەلال و دارۆ و نجمەدین عزیز، یەکەم کەسی خانەقینی بووە، بەدوای ئەریمان مەحمودەوە لە شاری بەغداد، پەیوەندی بە کۆمەڵەوە بووە و سەرەتا هەر لە ریگای ئەو دووانەوە کۆمەڵە لەناو گەنج و قوتابیانی خانەقینی بڵاوبوەتەوە. کە پێشتر لەناو رێکخستنەکانی _ باڵی م. س _ ی کۆن یەکتریان ناسیوە، لە نموونەی حیکمەت محمد _مەلا بەختیار _ و جەبار فەرمان، مەجید غاندی _ سیروان _ و کەسانی دیکە.
رەنگبێ زۆر کەسی لە ژیاندا ماو لەو راستییە ئاگادار نەبن، کە ئەو برایم قوربانە لەوان رۆژانی سەرەتای کۆمەڵەوە، لە کەسەکانی پێشەوە بێت، لەوەی لە بژێوی ماڵ و منداڵەکانیدا، جاری وا هەبووە هەموو مەسرەفی بە چاپکەیاندنی گۆڤاری _ ئاڵای سوور _ی لە ئەستۆ گرتووە. بگرە دووکان و ماڵەکەی وەکرێکی نهێنییەکانی کۆمەڵە بووە، لە شانی عەلی ئامەخان و ئەنوەر زۆراب و برایم حسین، ماڵەکانیان هەواری شاراوەی زۆر کۆبوونەوەی هەرێمی بەغداد بووە.

بەڵام یەکێک لە رەوشتە بەرزەکانی برایم قوربان، ئەوە بووە هەرگیز هەوڵی خۆدەرخستن و سنگ دەرپەراندنی شێنەیی و پەنا سێبەرانی نەبووە. لووتکەی هەڵوێستی شۆرشگێڕانەی برایم قوربان لەپاڵ ئیبراهیم عەزۆ و ئەنوەر شاکەلی، لەدەمی ئاشکرابوون و گیرانی بەشێکی بنکردایەتی کۆمەڵە و رۆیشتنی سەرکردایەتییەکەی بۆ ئێران، ئیعتراف لەسەرکردنیان لەلایەن گیراوەکان کە وەک لیژنەیەکی کار بەڕێوەبەری رێکخراوەیی بۆ بەغداد دانرابوون. ئەو مرۆڤە خۆنەویستانە، نەوەک بواریان بۆ گیرانی بەردەستی دامودەزگای رژێم نەهێشتوتەوە، بگرە لە هەڵوێستێکی کەموێنەی رۆژە سەختەکانی مێژووی کۆمەڵەی ساڵی ١٩٧٥ دا، هەرسێکیان بەیەکەوە بریاری خۆبەدەستەوەنەدان، بڕینی مەودای نێوان سنوورەکانی عیراق و سوریا بە پێ بۆ خۆگەیاندنە شام داوە، بە گیانی لەخۆبوردەیی و سەرکەوتوویی جێبەجێشیان کردووە.

برایم قوربان سەرباری بە جێ هێشتنی دووکان و کار و کاسبییەکەی، کە تاکە لوقمەی بەخێوکردنی ماڵ و منداڵەکانی بووە. ژن و دوو منداڵ _ نەبەز و جوتیار _ لەگەڵ دایکە پیرەکەی تەسلیم بە قەدەر کردووە و رێگای هات و نەهاتی سەرفرازی گرتووە. نەوەک گیران و خۆبەدەستەوەدانی بەردەستی دەزگای ئەمنی عیراقی کە لەوێ

ڕۆژاندا تۆزییان بە کەسانی شۆڕشگێڕ دەکرد. کەچی لە سێبەری دەواری سەرکەلەکی دەسەڵاتی حیزب و حکومەتی هەرێم، وەک دەیان مرۆڤی دیکەی ڕۆژە سەختەکان، هەتا موچەیەکی خانەنشینی و بژێوێکی ژیان بەو جۆرە مرۆڤە سەربڵندە ڕەوا نەبینراوە.

پاشان هەبوونی کەسانی وەک ئەرسەلان بایز، نەجمەدین عزیز، عەباس محمد، حەمە قەراخی و سەلام بەرزۆ، سەعدون فەیلی و هیوا ڕەئوف و سادق و چەندانی تر ناوەکانیانم لە بیر نەماوە. لەوێ ڕۆژانی نەشونماکردنی کۆمەڵە ناشاردرێتەوە

بەڵێ ئەوانە بەشێکی دیاریکراو، نموونەگەلێکی کەسە دیارەکانی خەباتی سەرەتای کۆمەڵە لە بەغداد بوون. بەبێ ئەوەی من کۆشش و تێکۆشانی سەربازی دیکە دیزەبەدەرخۆنە بکەم. بەڵکو تەنیا من لە نزیک و دوورەوە پێیان ئاگادار نەبوومە و تێکەڵیان نەبووم. بەوپەڕی ڕێزگرتنەوە لە ماندووبوون و قوربانیدانییان، داوای بوردنیان لێ دەکەم کە ناوم نەهێناون یاخود لەدەمی نووسینەکەم بە بیرم نەهاتونەتەوە. هیوادارم کەسانی دیکە هەبن ڕاستی ئەوانیش تۆمار بکەن و لێفەی لە بیرچوونەوەیان لەسەر هەڵدەنەوە.

## بەلاوەنانی کاری دووسەرەی ئێرە و ئەوێ

وەک لە بەشێکی ئەو یادەوەرییانەدا قامکم لەسەر داناوە، هەرگیز بۆ کارکردنی دوو سەرە سەرم نەهێناوەتە بەرێ و هەر لە هەرەتی تەمەنمەوە دەقم بەوە گرتووە. کارکردن لە ڕێکخستن و دەزگای دووسەرە خۆم بە دوور بگرم.

لێرەدا هەندێک بەسەرهاتی ئەو سەرەداوانە لە پانتایی کاروانی ژیانم دەگێڕمەوە. لەپاش ڕەتکردنەوەی تەکلیفە گەفاوییەکەی س. ع، لەوەی لە یەکێتی قوتابیانی کوردستانی مەلایی و جەلالی _ دوو سەرە کار بکەم _ خەت مایل بم.

جارێکی دیکە لە پۆلی یەکی بەشی کوردی بووم. لە پشووی سەری ساڵ هاتبوومەوە هەولێر. یەک دوو جاری دیکە برادەری دێرین _ س. گۆمەشینی _ م دیتبوو، کە تازە بەدوای بەیاننامەی ئازار لە شاخ هاتبوەوە شار. ناوبراو پێش ئەوەی بچێتە شاخ و پەیوەندی بە شۆڕشی ئەیلوولەوە بکات. شان بە شانی ئێمە لەناو شاردا، لە قوتابخانە لە ڕیزی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بوو. وەک ئێمە ئەندامی پارتی باڵی جەلالی بوو.

له کۆتایی ساڵی ١٩٦٨ له کتوپڕێک له دوای وەرنەگیرانمان له دەورەی نائیب زابتی و له شوێنێکی دیکه گێڕاومەتەوە. پەیوەندی به ریزەکانی هێزی پێشمەرگەی سەرکردایەتی بارزانییەوە کرد بوو. لەو سەردانەم بۆ هەولێر که له چایخانەکەی هاوینەی ئەودیوی قەڵاتێم دیتەوە. دوای پیرۆزبایی که له زانکۆ دەخوێنم. دۆستانه سوور بوو لەسەر ئەوەی دەبێ یەکتر ببینین. چونکو کارێکی گرنگی پێم هەیە. منیش گوتم باشه چ ڕۆژێک دەڵێی..! گوتی: سبەینێ له چایخانەکەی باغی شار له فلانه سەعات چاوەڕوانت دەبم و بەیەکەوەش نانی نیوەڕۆ دەخۆین.

من پێشبینی ئەوەم نەدەکرد س لەگەڵ هیچ دەزگایەکی هەواڵگری کوردی و غەیره کوردی کار بکات. کاتێک که یەکترمان دیت، بەدوای هەندێ پێشەکی و وەسفی دەزگای پاراستن و گرنگی من له بەغداد و خزمەتکردنی شۆڕش، دواڕۆژی خۆم و زۆر شتی دیکه، که بەراستی به لای منەوە گوێزژماردن بوو. گوتم: س ئەوە باسی چیم لەبۆ دەکەی.! من هێجگار ئەوەندە کاڵفام نیم، خۆم تێکەڵ بەو جۆرە داموودەزگایانه بکەم. ئەوە پیاوی خۆی گەرەکه و به خەڵکی وەک من ئەو کاره ناکرێ و داوای بووردن دەکەم

که چووەوە بەغداد. به ڕێکەوت لەگەڵ ئەکرەم مەنتک سەردانی زانکۆی مستنسریەمان کرد. ئەو ساڵێک بەدوای منەوە پۆلی شەشی ئامادەیی تەواو کرد. منیش هەر ئەو ساڵه لەو زانکۆیه له کۆلێجی قانوون وەرگیرابووم. بەڵام له تەسجیل بەویان گوت، ناوی ئەو لەگەڵ وەرگیراوەکانی لیستی یەکێتی قوتابیانی نیشتمانی عیراقدایه. که دیاره بەشی یەکێتی قوتابیانی کوردستانیش بەبێ پاره لەناو ئەو لیستەدا هەبوو. بەڵام ئەوەی من بەپاره بوو. من ئەو پارەیەم نەبوو بۆ کرێی خوێندنی ساڵانه. هەر ئەکرەم وەک برادەرایەتییەک پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم بۆ سەرێکی ڕۆژنامەی _ التآخی _ له گەڕەکی _ المسبح _ نادەم و هەر ئەو ڕۆژه نامەیەکی بۆ کەریم سنجاری دامێ که ئەو دەم سکرتێری علی عبدالله بوو لەوێ. بەیانی که نامەکەم برد و به ڕێکەوت له بەردەرگا تووشی کەریم هاتم و لەناوی ئەوم پرسی، گوتی: من خۆمم. دوای وەرگرتنی نامەکه و دەربڕینی خواستی خۆم لەوەی بەڵکو به ڕۆژ لەو شوێنه کارێکم دەست بکەوێت، تاکو به پارەکەی کرێی خوێندن مەیسەر بکەم. کەریم زۆر به ڕێز و گەرمییەوە به دەنگمەوە هات. ئەوەندەی بۆی کرا لەوێ ڕۆژدا، کارئاسانی بۆ کردم که چاوم به علی عبدالله بکەوێ. بەڵام ئەو بەهەناسەساردی به ڕێی کردم. دیسانەوە کەریم میهرەبانی نواند و بەو

ترومبێلەی پێی بوو، منی گەیاندەوە گەڕەکی _ الوزيريه _ بۆ چوونەوە دەوامی بەشی کوردی. لە ڕێگا دوو جار ئەوەی دووپات کردەوە، کە بەردەوام پەیوەندی پێوە بکەم. بەڵکو لە جێگایەکی دیکە کاریکم بۆ بدۆزێتەوە. من ئۆمێدم دانا و چیتر بەدوای خوێندنی ئەو کۆلێجەی دیکەدا نەچووم. چەند جاری دیکە بە ڕێکەوت یەکترمان لێرە و لەوێ دەدیتەوە. زۆر لوتفی پیشان دەدا، کەچی من بواری سەردانیکردنیم نەبوو. تاکو گرفتەکەی کاکە عەبەی بەشی کوردی کۆلێجی ئادابی بەسەر داهات. دیارە من وەک خۆ بە قوربانی کردنێک، خۆم کردە گیانفیدای پاراستنی کاکە عەبە و دەربازکردنی لەو گێلەوێژە ناهەموارە، کەچی لەگەڵ ڕۆژگار ئەو برادەرە لەشانی چەندان برادەری دیکەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە بەغداد، کە گیران لەژێر ئەشکەنجە ناویان هێنابووم. من ئەوەشم بەلاوە ئەوەندە گرنگ نەبوو، چونکو نەگیرام. بەڵام ناوبراو کە هاتە شاخ نەوەک هەر لەو گۆڕە لەگەڵ ئەزی دڕدۆنگ بوو. بگرە بە ئامۆژگاری هەندێ کەسی عەقڵ قوندەی ئەوێ ڕۆژێی شاخ، نەوەک هاوڕێیانە لەگەڵم نەجوڵایەوە، بگرە بە خراپە پاداشتی بە قوربانی بوونەکەمی دایەوە.

بۆ ئەوێ ڕۆژێ لەلایەن کەسانێکی پارتی لە بەشی کوردی، ئەو داکۆکی کردن و دەربازکردنەی کاکە عەبەیان بە خەستی لە ملی من شەتەک دابوو. ئەوەبوو لیژنەیەک لە لقی پێنجی پارتیی ئەو دەم بارەگاکەیان لە گەڕەکی ئەعزەمیە بوو، کەوتنە لێکۆڵینەوە لە بەندە و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو شاهیدانەی هەوڵیاندا بوو، کاکە عەبە بیشکنن کە گوایە بەیاننامەیەی _لەفیف _ یان بەدەستەوە دیتبوو. لێژنەکە لەلایەن محمد ڕەزا و ئەندامێتی کەریم سنجاری و حسین ناوێک و فتح الله کریمی قوتابی هاوپۆلم بوون. لێرەش کەریم کە بەندەی دیتەوە، لە بەردەمی هەمووان بە جوانی پێناسەی منی کرد و کەسێکی ئەوها و ئەوهام. تا ڕادەیەک دەستباری من بوو لە ڕەتکردنەوەی تۆمەتی شاهیدەکان و قەپاتکردنی ئەو دۆسیەیە. هەتا بە جۆرێک بۆ لەمەودوا، قوتابییەکانی ریزی پارتی و یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە من دەسڵەمینەوە، نەوەک شتێک پەیوەندیم بە دەزگاوە هەبێت..!

لەو شوێنە بەدواوە من کەریمم نەدیتەوە. هەتا بەهاری ساڵی ١٩٧٤ کە بە کۆمەڵ پەیوەندیمان بە شۆڕشی ئەیلوولەوە کرد. ئەویش کە من چوومە بەشی ئیعلام، شوێنی نیشتەجێ بوونمان لەو خانووانەی قەسری سەلام_ی چۆمان بوو. لەخوار بنکەی

ئیعلامەوە، بنکەی شەکیب عەقراوی هەبوو، کە بارەگای دەزگا بوو. لەو ڕێگایە یەک دوو جار لەگەڵ کەریم سنجاری، بەرانبەر یەکتری دەبووینەوە. بە گەرموگوڕی دەهاتە پێشەوە و ئامادەیی خۆی بۆ هەرکارێک هەمبێت، دەردەبڕی.

ئەوەبوو عەزیز محمودی هاوڕێم، هاتە ناوچەی چۆمان و زۆربەی کات، میوانی من و ئەنوەر مەحمود بوو، کە هەردووکمان لەگەڵ محمد زادە یەک هۆدەی هاوبەشمان هەبوو. بەرێککەوت لەوان ڕۆژاندا، زادە سەفەری ئێرانی کردبوو، عەزیز لە شوێنەکەی ئەو دەخەوت. عەزیز گرفتی دەرنەچوونی ئەمری دامەزراندنەکەی وەک مامۆستا لە پێنجوین لە ئەمانەتی پەروەردە گیریخواردبوو. ئیشەکەی ڕەوانەی ئیدارەی مەکتەبی سیاسی کرابوو. لە وێشەوە بۆ دەزگا. لە زۆر لاوە هەوڵی بۆ درابوو، دوو هەفتە زیاتر هیچ دەنگی نەبوو. عەزیز قرقرابوو لە خۆیەوە کەوتبووە خۆگورگە کردن. لە بۆ تەنیا فەرمانەکەی ئەو لە دەزگا گیری خواردووە..! تاکو ڕۆژێکیان من لە خۆمەوە سەردانی کەریم سنجاریم لەو شوێنە کرد. مەسەلەی عەزیزم بۆ باس کرد. ئەویش بەبێ ئەوەی بیشارتەوە، گوتی.. مامەلەکەی وا لەبەردەم کاک شەکیبی یە، دەتەوێ بەیەکەوە سەردانی بکەین. بەدوای چا خواردنەوەیەک، کە ئەو خەریکی هەندێ ئەوراقی بەردەمی بوو، سەری هەڵبڕی و گوتی: چیت گوت؟ گوتم: باشە. کەریم گوتی: بەڵام دەبێ بەڵێنم پێ بدەی کە تۆش پشتگیریم بکەی..! یەکەمجارم بوو شەکیب ببێنم، قژی سەری خر بە مووس تاشیبوو، وەک ئاوێنە دەبریقایەوە. سەرەتا سەری هەڵنەبڕی، دوای کۆخەیەکی کەریم سەری راست کردەوە و لەپشت مێزەکەی خۆیەوە، بەخێرهاتنی کردم. ئەوجا کەریم کارەکەی هاتنی منی بە کورتی بۆ باس کرد، لەسەر ئەزیش قسەی حەزی دڵی خۆی کرد. شەکیب دوای هێنانە پێشەوەی مامەلەکە، بەبێ زیادوکەمی لە منی پرسی: کەفالەتی ئەو عەزیز محمودە دەکەی کە پیاوێکی باشە. گوتم: بەڵێ و گەرەکم بوو هەندێک دەربارەی عەزیز قسەی بۆ بکەم. دیسانەوە سەری قیت کردەوە و پێی گوتم: قسەکانت بۆ کەریم بکە. بەڵام دەبێ تۆش لە جێگای باوەڕی ئێمە بیت. هەر ئەوەندە و کەریم هیمای دەرچوونی بۆ کردم. کە هاتینەوە ژوورەکەی کەریم، من پشووم هاتەوە بەر و کەریم بە پێکەنینەوە ڕووی تێ کردم و گوتی: بە ئاسانی کارەکەی ڕواند..! لەگەڵ ئەو قسانە. یەکێک مامەلەکەی عەزیزی دایە دەست کەریم، دیار بوو ڕازی بوونی شەکیبی

لەسەر نووسرابوو. دەبوو کەریم بەو ناوەڕۆکە، نووسراوی فەرمی بۆ ئیدارەی مەکتەبی سیاسی بنووسی.

کەریم مامەلەکەی وەرگرت و شتێکی لەسەر نووسی و بە کابرای گوت، هەر ئێستا چاپی بکەن. نوسخەی ئیدارەی م. س بە پێچراوی بهێنەوە. کە کابرا ڕۆیشت. کەریم زۆر بە هێمنی ئەوەی شەکیبی بە شێوەیەکی روون دوویات کردەوە، کە مادام ئەو دەزگایە باوەڕی خۆی بە تۆ داوە، تۆش دەبی لەمەودوا کارمان لەگەڵ بکەی. منیش بەو دەمولوتفەی ئەوێ ڕۆژی، بە کورت و کرمانجی ئەوەم خستە بەردەمی، کە من بەبێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکم بەو دەزگایەوە هەبێت، وازم لە دوارۆژی خۆم و خوێندنەکەم هێناوە. وەک پێشمەرگەیەک لە بەشی راگەیاندن خزمەت دەکەم و درێخی ناکەم. قسەمان زۆر کرد، تاکو ئەوەی من هەر ئەوەندەم بۆ مایەوە، ماوەیەک لەسەرم بوەستن. خۆم دیمەوە لاتان و وەڵامەکەتان دەدەمەوە.

بەراستی نازانم لەبەرچی بوو هەتا خۆیشم لە بیر نەمابوو، کە بۆچی هاتووم و خەریکە سەرلەکوێ دەردەکەم..! لەو داڵغانەدا بووم. کابرای گۆرین نووسراوە پێچراوەکەی هێنایەوە و کەریم پێی گوت، بیداتە ئەزی. منیش بە سوپاسێکی زۆرەوە ماڵیاواییم لێ کرد و هەتا بەردەرگە بەرێی کردم. بەڵام ئەوەندە پەشۆکا بووم وام هەست دەکرد، لە هۆڵی تاقیکردنەوەیەکی قورس دەرچووم. لەو دەمە کزە بایەکی سارد و بەفراوی دەموچاوی سواخ دام، بەخێرایی و بێ هەڵهێنان رووم لە شوێنەکەی خۆمان کرد. لە دوورەوە سەیرم کرد عەزیز مەحمود بە تەنیا سەری لەبەر خۆی ناوە و جانتا بچکۆلانەکەی بە شانەوەیە و لە هەورازەکە گلۆردەبێتەوە. کە چاوی بە من کەوت بۆی پێدەکەنم، خەندەیەکی لەسەر لێوان دروست بوو. گوتی: چییە مردوو بە چی پێدەکەنی..! گوتم: ئۆغر بی..! گوتی: سەرێک لای خاڵە شەهاب و شاسوار دەدەم، بۆ ئەوەی شەوەکەی لە لای یەکێکیان بمێنمەوە و بڕیارم داوە بۆ پێنجوین بگەڕێمەوە. چیتر حەوسەلەی چاوەڕوانی دامەزراندنەکەم نەماوە. بەیانی بۆ ماڵئاوایی دێمەوە لاتان. یەکسەر نووسراوەکەم بۆ دەرهێنا و سەربردەکەم بە بتونی بۆ گێڕایەوە. عەزیز بە هەموو دەموچاوی گەشایەوە و گوتی: بەو هەموو برادەرە هیچیان بۆم پێ نەکرا، کەچی تۆ خەمی کارەکەی منت خوارد. دەستی لەمل کردم و نووسراوەکەی وەرگرت و بە دڵ خۆشییەوە بۆ لای ئەو برادەرانە ڕۆیشت.

سبەینێ بە درەنگی سەروسکوتی عەزیز پەیدا بوەوە. دیار بوو لە بازاڕی چۆمان لای دابوو، نان و کەبابی گەرمی نۆش کردبوو. بە جووتە کەوتینە پیاسەکردن و پێی گوتم، هەموو قسەکانی تۆم بۆ خاڵە شەهاب گێڕایەوە و جارێ سەرم لە شاسوار نەداوە. خاڵە شەهاب رایسپاردوە، کە بە یەکەوە لە فرۆشتگا بچینە سەردانی و دەیەوێ بتبینی. منیش گوتم، باشە دوای سەردانی خاڵە شەهاب، بە یەکەوە بۆ لای شاسوار دەچین، ماوەیەکە سەرم نەداوە.

دوای بەخێرهاتن و هەندێ دانیشتن، کە چەند کەسێکی دیکەش لەوێ بوون خاڵە شەهاب بە تەنیا جیای کردمەوە و ووتی: ئێمە وەک کۆمەڵە دەمانەوێ لەگەڵ ئەو برادەرانە کار بکەیت و رەتی نەکەیتەوە: من لەو دیدەنییەی دوێنی زیاتر تێکچووم. بەبێ دواکەوتن وەڵامێکی بلەزم دایەوە. کە بە داوای بوردنەوە هەرگیز کاری دوو سەرە ناکەم. من بە بیروباوەر کۆمەڵەم. ئەگەر هەر گومانێک دەکەن، ئەوە لە کۆمەڵە دەرم بکەن. یەکسەر دەستی لەسەر شانم دانا و بە دڵدانەوە ساردی کردمەوە و ووتی: دوایی لەگەڵ برادەران قسە دەکەم.

لەو شوێنەوە بۆ جێگای کارەکەی شاسوار بە ترومبێل دوور نەبوو. کە ئێمە گەیشتینە ئەوێ، دەمی نانخواردنی نیوەڕۆ بوو، سێ قۆڵی لەگەڵ شاسوار دامەزراین. پاش هەندێ باسوخواسی تەواوبوونی کارەکەی عەزیز، شاسوار سەیرێکی منی کرد و گوتی: چییە مردوو بێتاقەت دیاری..! منیش سەرلەبەری بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە. بە رووم پێکەنی و گوتی: لە یەکێکی وەک تۆ هەر ئەوە چاوەڕوان دەکرێ. کە بە شداری کاری دوو سەرە نەکەی، هەر گوێشی مەدەرێ. ئەوە بوو لەوێ عەزیزم بە جێ هێشت و شاسوار بۆ ماڵەکەی خۆی لە زینوێی شێخی بردییەوە و منیش بۆ چۆمان گەڕامەوە. چووم هەندێک عارەقم کڕی و شەو بۆ بەباکردنی هزری پەشۆکی، لەگەڵ ئەنوەر سەری خۆمان گەرم کرد..

## ساڵی ١٩٧٥ و گەڕانەوە بەغداد و خوێندن تەواوکردن

ئەو ساڵەی بۆ بەشی زۆری خەڵکی کورد بە ساڵێکی شووم دەخوێندرایەوە. بەدوای تەسلیمبوونەوە بە دەسەڵاتی بەعس لە سلێمانی و گەڕانەوە هەولێر. بەدەم حەسانەوەیەکی پڕ لە دەردە دڵی. ڕۆژێک لەگەڵ چەندان برادەری دیکەی وەک خۆم، ڕێگای بەغدادمان گرت. تاکو مامەڵەی چوونەوە بەر خوێندن لە زانکۆ بە ئەنجام بگەینم. هەر یەکەمان لەو پۆلەی بە جێ مان هێشتبوو دەستمان بە خوێندن کردەوە.

ڕاستە ئەوەی من دوا ساڵ بوو. بەڵام گرفتی گوزەرانی ژیان و شوێنی حەوانەوەم پەرێشانی کردبووم. قەیاسێک بەدوای ئیشدا گەڕام. لە شەقامی ڕەشید ئوتێل نەما، سەری پێدا نەکەم. بەڵکو کارێکی شەوانەم دەست بکەوێ. لێرەدا جارێکیان لە چایخانەکەی بەرلەمان، چاوم بە برادەری منداڵیم محمد زاهیر کەوت. ئەو هێشتا کۆلیجی ئیدارە و ئابووری تەواو نەکرد بوو، خوێندنەکەی بەشەو بوو، بە ڕۆژ کارێکی ژمێریاری لە دائیرەیەک هەبوو. بەدوای قسەوباس، کە زانی من لە باروذۆخێکی پەرپوت دام. پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم، هەتا شوێنێک پەیدا دەبێت، بچم لە لای ئەو بخەوم. بەڵام دەبی سبەینان زوو دەرچم و شەو درەنگ بگەڕێمەوە. تاکو خاوەن هوتێلەکە نەزانی من لەوێ دەخەوم. لەگەڵ محمد چووەوە ژووروکەی و سەیرم کرد عبدالله علی رشید کە لە بەغداد خزمەتی سەربازی دەکرد. ئەویش بۆ شەو لەو هوتێلە _ هوتێل لوبنانی نوێ _ جێگای هەیە. دواتر هەر لە ڕێگای ئەوانەوە، خالد جوتیارم دیتەوە. ئەو لە چایخانەی کندی لە شەقامی جمهوری دادەنیشت. ڕۆژانە لە دوای دەوامی هەردوو لامان، بە تایبەت بۆ ئێوارە هەتا درەنگ، بە تاولەکردنەوە یەکترمان خەریک دەکرد و زۆربەی جار ژەمە خواردنی چەند ڕۆژێکم لێ دەبردەوە. بەڵام ماڵی ئاوا بێت، ڕۆژێکیان گوتی: برا نابێت هەروا بە قەلۆشی بژیت. گوتم: چی بکەم باشە..! ئەو کە لە ڕۆژنامەی هاوکاری هەفتانە، بەڕێوەبەری لاپەڕەی کاروباری قوتابیان بوو. بەر لە ئێمە تەسلیم ببوەوە و لەپاڵ خوێندنەکەی بە یارمەتی _ یەکێتی قوتابیانی کوردستان _ ی کارتۆنی، ئەو کارەی لە ڕۆژنامەکە بۆ زامن کرابوو. خالد گوتی: دەتوانی بۆ هەموو هەفتەیەک مادەیەک لەسەر کاروباری قوتابیان چ بە خۆت بینووسی یاخود لە زمانی عارەبی وەریگێڕی، لەو لاپەڕەیەی خۆم بە ناوی خوازراوەوە بۆتی بڵاو دەکەمەوە. مانگانە بژێوی ژیانی ڕۆژانەت دەردەکات. بۆ شوێنی خەوتنیش گوتی: خۆم لەگەڵ چەند برادەرێکی هەولێری کە لە

دەزگای هاوکاری کارمەندن و دڵنیام دەیانناسی _ محمد عبدالخالق ، کەمال عەلی، حەیدەر مەلا نەفتە_ بەنیازی گرتنی شوقەیەکین لە جادەی کفاح. من قسەیان لەگەڵ دەکەم، هەتا خوێندنەکەت تەواو دەبێت، بۆ خەوتن تۆش پێک بکەن. ئەو پێشنیارەی خالد بووە مایەی دەستگرتنم، تاکو بتوانم ئەو چەند مانگەی بەر لە تاقیکردنەوە بگوزەرێنم و کۆڵ نەدەم. من هێشتا هەر لە لای محمد زاهیر دەخەوتم، ئەو شەوە نەچووبوومەوە ئەوێ و لە لای برادەری دێرینم سەباح عبدالله بووم. بۆ ڕۆژەکەی خالد بە هەڵەداوان بە دوامدا دەگەڕا و ئاگاداری کردمەوە، کە بەیانی زوو تووشی محمد زاهیر بووە و درەنگی شەوێ دائیرەی ئەمن عبدالله علی رشیدیان پێچاوەتەوە و ژوورەکەشیان پشکنیوە، بەڵام هیچیان نە دۆزیوەتەوە، چونکو بەر لەیەک دوو ڕۆژ، عەبە خەبەری گیرانی برادەرانی دیکەی هەبووە، ئەو بڵاوکراوە و کتێبانەی یاساغ بوون، هەمووی گواستبوەوە لای محمد زاهیر، بەبێ ئەوەی من پێی بزانم. بەڵام لە لایەکی دیکەوە بە هۆی ئەنوەر شاکەلی بەو گرتنەی برادەرانم دەزانی و جارویار لە بەردەمی عەبە و محمد زاهیر و خودی خالد جوتیار باسی وازهێنانی خۆم دەکرد. ئیتر من دەستێکم کەوتە پاش و یەکێک لەپێش. خالد ئەوەشی پێڕاگەیاندم کە محمد زاهیر کەلوپەلەکانی خۆی و منیشی لەو هوتێلە نەهێشتووە. ناچار کە ئەو ڕۆژە دەوامی کولێژ تەواو بوو. لەگەڵ خالد چوومەوە ئەو شوقەیەی لە شەقامی کفاح بەکرێیان گرتبوو. تا بڵێی پەشۆکاو و بە دڵەڕاوکێ بووم. خالدیش لە من باشتر نەبوو. باش بوو لەبەر دەرگای شوقەکە بە تەنیا تووشی محمد حاجی عبدە هاتین. پێشتریش یەکترمان دەناسی و لە هەولێر ماڵمان لە یەکتر دوور نەبوو. هەروەها خالد باسی منی بۆ کردبوو، حەمە پیاوانە بە دەنگەوە هاتبوو. گوتبووی، کەس حەقی بە سەرەوە نییە، عباس لەگەڵ ئێمە بژی، کەسیش باسی کرێی لەگەڵ ناکات. شوقەکە بە ناوی خۆمە، دەتوانی لە کنە مە چەندی دەیەوی بمینێتەوە. بەیەکەوە چوینە سەرەوە و حەمە یەکسەر لە لای خۆی کلیلێکی دەرگەی دەرەوەی بۆ کۆپی کردبووم و پێی دام و گوتی: ئەوە جێگا و قەرەوێڵەی منە، دەتوانی بۆ خۆت لەسەری بخەوی. من بۆ خۆم پێخەفی زیادەمان هەیە بە کاری دەهێنم. خالد کردییە فشقیات و گوتی بۆ ئەوەت لەگەڵ من نەکرد، دیارە ئێوە هەردووکتان کۆنە جەلالین، یەکتر وەردەگرنەوە..! بەڵام من بە دەنگ هاتم و گوتم، کاکی خۆم زۆر مەمنونم، من هەر لەسەر ئەو پێخەفە زێدەتان دەخەوم و بەشە کرێی خۆشم دەدەم.

جێگای خۆت هەر بۆ خۆت. ئەوجا خالد گوتی، کاکە من هەر ئەو شەو لێرە دەخەوم و با عباس لە جێگاکەی من بخەوی. من بە کاری لاپەڕەی کاروباری قوتابیان سەفەری شارەکانی کوردستان دەکەم و _عباس _ یش لەمەودوا بە نووسین هاوکاریم دەکات و لە بڵاوکردنەوەی ئەو نووسینانەوە، بژێوی بۆ مەیسەر دەبێت.

لەو قسانە دابووین، حەیدەر و کەمالیش هاتنەوە. ئیتر لە هەولێر ئەوانیشم دەناسی، دوای چاک و چۆنی.. حەمە پێی گوتن.. ئەوە عباس لە لای ئێمە دەبێت و من کرێی ئەویش دەدەم. حەیدەرە شەل بە پێکەنینەوە گوتی، ئەویش برای ئێمەیە و ماڵی خۆیەتی. پاشان کەمال هەندێ خۆی هێناوبرد و گوتی، ئەوجا چییە، خەڵکی گەڕەکی خۆمانە و من لە منداڵییەوە دەیناسم. دواتر بە یەکەوە لە ماڵەکە چووینە دەرەوە، حەمە بۆ زانکۆی مستنسریە ڕۆیشت کە لە بەشی ئینگلیزی بە شەو دەیخوێند و بەرۆژیش لە دەزگای هاوکاری وەک وەرگێڕ کارمەند بوو. حەیدەر و کەمالیش ملی ڕێگای کاری خۆیان گرت. خالد و بەندەش بەرەو چایخانەی کندی و لەوێ قۆناغمان گرت. ئەوجا هەردووکمان کەوتینە دەردەدڵی خۆمان، سەبارەت بەگرتنی ئەو برادەرانەوە

من لەو سەروبەندەدا بە هەر شێوەیەک بوو، محمد زاهیرم دیتەوە و کەلوپەلەکانی خۆم وەرگرتەوە. بۆ ماوەی نزیکی دوو مانگان لە لای ئەو برادەرانە مامەوە. ئەو ماوەیە لەگەڵ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە ئەوەندە گەرموگوڕ نەبووم، پێش گیرانی ئەوانەی بەغداد، چەند جارێک لەگەڵ برایم حسێن و ئەنوەر شاکەلی دانیشتبووم، کە ئەندامی هەرێمی بەغداد بوون. بۆ یەکجاریش ئەو هاوڕێیانە لە منیان نەپرسی، ئەرێ تۆ چۆن دەژی کە بەشی ناوخۆ و کۆمەکی قوتابیانم نەمابوو..! من بەشێکی زۆری ئەو سەربردانەم لە زنجیرەی یەکەمی بڵاوکراوە نووسیووە و بەپێویستی نازانم دووبارەیان بکەمەوە. تەنیا ئەوە نەبێت، لە رووم نەدەهات لەو بارودۆخەدا، بارگرانی بخەمە ئەستۆی برادەرێکی وەک برایم قوربان کە ئەو دەم ئەوەندە برادەرایەتیمان گەرموگوڕ نەبوو. دەمزانی ئەو چەند باری قورسە و دواییش برادەرانی گیرا و ئیعترافیان لەسەر کرد و لەدوا دیدەنی لەگەڵ ئەنوەر شاکەلی بۆ ماڵئاوایی کە خۆی و برایم عەزۆ و برایم قوربان بەرەو شام رادەکەن، بۆ ئەوەی خۆیان لە چنگ دەزگای ئەمنی عیراقی دەرباز بکەن. هەر سێکیان ئیعترافیان لەسەر کرابوو و بە هۆی هەڵوێستی ئازایانەی خۆیانەوە دەستگیر نەکران. هەروەها ئەو چەند جارەش، عەزیز مەحمودم لە بەغداد لە چێشتخانەی عەبدوڵڵا لە فولکەی رەسافی،

یاخود بەراگوزاری دوو جاریش هەر لە بەغداد، شاسوار جەلالم دەدیت. بە هۆی پاداشتی ئەو نووسینانەی لە رۆژنامەی هاوکاری و رۆشنبیری نوێ و ئەستێرەی منداڵان بڵاوم دەکردەوە، لەسەر پێی خۆم وەستا بووم، کە مانگانە ١٠ _ ١٥ دیناری دەکرد و زۆری پێ قانیع بووم و بەشی دەکردم.

بەدوای تەواوکردنی خوێندنەکەم بۆ هەولێر گەڕامەوە. یەک دوو مانگ بە یارمەتی کەریم رەسول، لە لای وەستایەکی خانوو کردن، کەوتمە کرێکاری کردن. تاکو دەستمایەیەکی سادەم پەیدا کرد بۆ یارمەتی کەسوکارەکەم. سەرەتا بە هۆی عائیدونەوە، لە سەربازی تەسریح کرام. کەچی دوایی دائیرەی تەجنیدی هەولێر ئەو تەسریح بوونەی هەڵوەشاندینەوە و وەک هەر دەرچووی ئەو ساڵەی کۆلێجەکانی عیراق، راپێچی _کۆلێجی ئەفسەری یەدەک_یان کردم. ماوەی هەفتەیەک لەو ئۆردوگایەدا خەریکی تاقیکردنەوەی بەدەنی و پشکنینی پزیشکی بووم. لە هەموویان تێپەڕیم. کەچی بەیانییەکیان زوو، لە گۆڕەپانی عەرەزیات، لەناو نۆسەد دەرچووی کۆلێج لە هەموو عیراقدا، بانگی ناوی ئەزیان کرد و بەمایکرۆفۆن گوتی: عباس محمد حسين اتلع بره و راجع القلم فورا و بدون تاخير (واتە عباس م. ح کێیە، بابێتە دەرەوە و یەکسەر سەردانی قەڵەم بکات، بەبێ دواکەوتن.) خەریک بوو لەناو قەدەوە بپسێم، زۆرم لە خۆ کرد بەسەرپێیانەوە بە پیر دەنگی مایکرۆفۆنەکەوە بچم و لە دڵی خۆمدا گوتم، چی دەبێ با ببێ، تازە مردن هەر مردنە، ئەو لاق وەشاندنەی ناوێ..! گەیشتمە لای ئەفسەرەکەوە و گوتم: منم ئەوەی بانگت کرد. تەماشایەکی کردم و گوتی: جنابک عائد من جيب العميل و تريد تسير زابت احتيات فی الجيش العراقی الباسل..! (واتە، جەنابت گەڕاوەی لای جەیبی نۆکەری و دەشتەوێ ببی بە ئەفسەر لە سوپای عیراقی نەبەز..!) منیش وەک ئەوەی شاباشم بکەن و هەموو ترسەکەی ناو دڵ و دەروونم رەوییەوە، بە دەنگێکی لەو توڕەتر گوتم: ئەوە لە تەجنیدی هەولێر وەک دەرچووی کۆلێجێک منیان بۆ ئێرە رەوان کردووە، نەوەک بە ئارەزووی خۆم هاتبم..! ئیتر لە جاران توڕە و توندتر بەپێش خۆی دام و تەسلیمی قەڵەمی کردم و فەرمانی پێدان، عباس م. ح وەک سەربازێکی ئاسایی بۆ ئۆردوگای _ محاویل _ لەگەڵ دوو پاسەوان بنێرن. دوو پاسەوانەکە مرۆڤی نەجیب بوون و دەبوو مەسرەفی ئەوانیش بکەم، هەر لە گۆڕەپانی حلاوی، یەکێکیان دەستبەردارم بوو. تەنیا یەکێکیان مایەوە و بەیەکەوە بۆ پێش نیوەڕۆ

گەیشتینە ئۆردوگای ناوبراو، بەڵام لەوێش گوتیان جێگامان بۆ سەربازی دەرچووی کۆلێج نییە و ڕەوانەی _ئۆردوگای المسیب _ یان کردم.
بەدوای نزیکەی سێ مانگ سەربازی لەو ئۆردوگایە، دیسانەوە لە ڕێگای تەجنیدی گشتی بەغداد، مامەڵەی تەسریحم وەک عائد کردەوە و لە سەربازی ڕزگارم بوو.

## سەردانی گوندی نازەنین

کۆتایی بەهاری ساڵی ١٩٨٠ هێزێکی پێشمەرگەی یەکێتی بە مەسولیەتی مەلابەختیار و حەمەی حاجی مەحمود بۆ ناوچەکانی خۆشناوەتی لە پارێزگای هەولێر هاتبوون. زۆرتر مەبەستی هاتنەخوارەوەی ئەو هێزە ڕاوەدوونانی ئەو قوەتەی سلێمان بیرێژی بوو. کە لە ناوچەکە وەک باندێکی چەکدار ببوونە میرمحێی ناوچەکانی خۆشناوەتی.
ڕاستە سلێمان پارتیزانیکی سەرکەوتوو بووک. لەو تەنگاوکردنەی بەرپەلاماری ئەو هێزەی یەکێتی، سلێمان خۆی لەلایەن چەکدارێکی دەستەکەی خۆیەوە، بە ناوی عەوڵاتورگە لە گوندی چیوەی سەروو تیرۆر کرا و چەکدارەکانی دەوروبەری پەرتەوازە بوون.
مەلا بەختیار لە نامەیەکیدا بۆ ڕێکخستنەکانی ناوخۆی کۆمەڵە لە هەولێر، داوای یەکتر بینینی کردبوو. سەرەتا گوندی داربەسەری عەلی مەولوودی لە وراتی کۆیە دەستنیشان کردبوو. من لەگەڵ ڕێپیشاندەرێکی ناوچەکە، کە لە لایەن _کۆسرەت _ ـەوە پێم ناسێنرابوو. بەداخەوە ناوەکەیم لە بیر نەماوە و پیرەمێردێکی هێجگار قسەخۆش بوو. ئەوەبوو بە پیکابەکەی عومەر ئۆغەرانی، کۆمەڵێک پێڵاوی ئەدیداس و جلوبەرگی ژێرەوە و کراسی هەمە جۆرەم لەگەڵ خۆم برد و بۆ کاتی دانراو گەیشتینە شوێنی دیاریکراو. کەچی مەلا بەختیار و قوەتەکە، بە پەلە گەڕابوونەوە دۆڵی نازەنین و کورتە نامەیەکی بە جفەرەی بۆ بەندە بە جێ هێشتبوو. لە فلانە ڕۆژ بە هەندێ پارەوە بۆ پێشمەرگەکان بگەینە گوندی نازەنین. ناچار کەلوپەلەکانمان لە ماڵی عەلی مەولوود جێهێلا و ڕێگا و ڕێگا بۆ شاری گەڕاینەوە.

ئەو جارەیان بۆ رۆژی دیاریکراو لەگەڵ مەناف مەلاقەرەیی بە جووتە و بە سواری ماتۆرەکەی وەک کارمەندی کشتوکاڵی بە رێگای شەقڵاوەوە، کە یەک چەردە کتێب و چاپەمەنی شارمان لە خۆ بار کردبوو. لەگەڵ یەک گوژمە پارەی باشی ئەو رۆژە کە لەلایەن کۆمیتەی شەهید ئیبراهیم عەزۆی هەولێر، بۆ کۆمەک بەو هێزەی یەکێتی بردبومان. من و سەفین لە پێشدا تەگبیری ئەوەمان کردبوو. کە لە هاتنە پێشەوەی پرسینی سەیتەرەکان، هەردووکمان کارمەندی کشتوکاڵین، بۆ هەندێ پشکنینی دار و درختی باخچەکانی نازەنین دەچین.

ئەوەبوو لەسەری چوونمان بە پێی ئەو شارەزاییەی خۆم، بەناو شارۆچکەی هیراندا تێپەڕین. لە سەیتەرەکانی سەربازی هەردوو لای هیران کەس پرسیاری لێ نەکردین. ئێمەش راست بە بنار و قەدپاڵی زنجیرە شاخی سەفین، رێگای خۆڵی نازەنینمان گرت و نیوەڕۆ پێش ئەوەی بگەینە ناوەڕاستی گوندی، لە دوورەوە هەستمان بە هەبوونی پێشمەرگە لەسەر گرد و شوێنە بەرزەکان کرد. سەر و جەمەدانیشمان هەڵگرتبوو، بۆ ئەوەی لە لای ئەو پێشمەرگانە نە ناسرێین، سەروگوێلاکی خۆمان پێچایەوە و بە ناوەراستی گوندیدا تێپەڕین. ئەو شوێنەی بۆمان دانرابوو، باخچەکەی خاڵە کاکەی نازەنینی بوو.ئەو باخچەیە کەوتبووە ئەو سەری گوندی سەر رێگای گوندەکانی سناوە و جەلی. دروست لە ناو قەرەبالغی سەر رێگاکەوە، پێشمەرگەیەکی ریشدار لێمان هاتە پێش و گەرەکی بوو رامانگری و بزانی ئەو دوو سوارماتۆر دەموچاو پێچراوە چین. بەڵام من شۆڕش حاجیم ناسییەوە، کەساڵی رابردوو هەر لە رێگای رێکخستنەکانی هەولێرەوە، لەگەڵ دەستەیەک هاورێی کچ و کوڕ پەیوەندییان بە شاخەوە کردبوو. دیتم شۆڕش بەری لەو پێشمەرگە ریشدارە گرت و پێی گووت. لێیان گەڕێ.

هەندێک لەسەر رێگاکە لە کەرخی دوا باخچەکان هەڵوەستەمان کرد. تاکو جوتیارێکی گوندیمان لێ پەیدا بوو. سۆراخی باخچەی خاڵە کاکەمان لێپرسی و گوتی، بۆ چ کارتان بەو باخچەیە هەیە.! ئەوێندەرێی کەناری رێگاکە هەوە، کە کەپرە قیتەکەی دەبینرا. منیش دوای سوپاسکردن وەڵامم دایەوە، ئێمە کارمەندی کشتوکاڵین، دار و درختەکان بۆ رشاندن دیاریدەکەین. گوتی، دە بە قوربانتان بم، لە باخچەکەی منەوە دەست پێبکەن. خەریکە هەموو درختەکان وشک دەبنەوە. گوتم خالۆ لە پەرگەوە بەری لێدەگرین و دەگەینە لای ئەوەکەی تۆش. من جوتیارەکەم دەناسی و ناوی حەمە سوور

بوو. له ساڵی ١٩٧٤ ئیسماعیلی کوڕی ئەندامی ئەڵقەیەکی ڕۆشنبیری کۆمەڵە بوو، له ئامادەیی هیران و گوتم: له بیرت ناکەین. گوتی: کەوایە ئەوە دەچمەوە بۆ نیوەڕۆ پێخۆرێکتان بۆ ئامادە دەکەین و چاوەڕوانتانم. ئەو لەو قسانەدا بوو، سەفین پێی به بەنزین وەنا و کابرای له ناو تۆز نقوم کرد. پاشان به پێ ماتۆڕەکەمان لەگەڵ خۆ بەو ڕێچکەیەدا برد که بەرە و باخچەکه شۆڕدەبوەوە. له دوورەوە دیتم ئەرسەلان و مەلا غەفور و م .کاوە لەگەڵ خاوەن ماڵ بەرەو پیرمانەوە هاتن. دوای به یەکتر شاد. بوونەوە و دەست لەمل یەکتری کردن، مەلا بەختیاریش بۆ بەخێرهێنانمان له ژێر کەپرەکه هاتبووە دەرەوە و لەگەڵ ئەویش بۆ جاری دووەم یەکترمان دیتەوە و به گەرموگوڕی یەکتریمان لەباوەش کرد. جارێ ئێمە سەرلەبەری هاتن و چۆنیەتی گەیشتنەکەم بۆ باس کردن و ئەو جارەش به خزمەتی خاڵه کاکه گەیشتمەوە. که له ساڵی ١٩٧٤ یەکترمان دەناسی و گووتم: لەسەر ڕێگاکه تووشی حەمەسوور هاتین، بۆ ئەوەی نەمان ناسیتەوە، ئەو سوالفەم لەگەڵ کردووە، بەڵکو یەکێک بنێری، که هیچ خواردن و شتی ئەوهامان بۆ ئامادە نەکات، ئەو جارە به هیچ ڕاناگەین، ئەگەر حکومەت ڕێگامانی دا، هەفتەی داهاتوو گەڕاینەوە باخچەکەی بۆ دەڕشێنین..!

پاش هەندێ قسە و باسی گشتی. لەپێشەوە لەگەڵ مەلا بەختیار به جووته له برادەران جیا بووینەوە. باروبۆخی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەمان له پارێزگای هەولێر و ناو شاری تاوتووێ کرد. لەو دەمیدا چەند پێشمەرگەیەک لەسەر گردەکانەوە هەواڵی ئەوەیان به مەلابەختیار گەیاند که چەند چەکدارێکی غەوارە بەویەری سۆرکێ وە بەرەو سناوە دەڕۆن. مەلا بەختیار وەک تای تەورداس هەستایە سەرپێ و به پێش پێشمەرگەکانەوە بەراکردن بەرەوشوێنی دیاریکراو هەییپیان لێ کرد. من ئەو جولەیەم بەلاوە سەیربوو. که گەڕانەوە دیار بوو چەکدارەکان بەسەر ئاوەگرد کەوتبوون و بەدەست به تاڵی هاتنەوە. به ڕاشکاوی سەرنجی ڕەخنەی خۆم دەربڕی که نه دەبوو ئەم ئەو کارە بکات. ئەوجا سەبارەت به پێشەوە چوونی کاری ڕێکخراوەیی سەرکردایەتی ناوخۆی کۆمەڵە. ناوبراوم وەک ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە ئاگادار کردەوە. ئەویش دەربارەی کێشە و گرفتەکانی یەکێتی به گشتی، به تایبەت بەدوای جیابوونەوەی زۆربەی بزووتنەوە له یەکێتی و دروستکردنی حیزبی سۆسیالیست. گەلێ زانیاری بۆ باس کردم و به ناوی خۆی کورتە نامەیەکی بۆ کۆمیتەی سەرکردایەتی ناوخۆ نووسی. ئەو پارەیەش له ڕێکخستنی

هەولێرەوە هێنابووم ٢٥٠٠ دیناری ئەو ڕۆژە بوو. کە١٥٠٠ دینار وەک هاوکاری بۆ پێشمەرگەکان. ئەوەی دیکەش وەک کۆمەک پێشکەش بە خودی هاوڕێیان کرا _ مەلا بەختیار و ئەرسەلان _ کە تازە هەردووکیان ژنی یەکەمییان گواستبووەوە شاخ. هەرچەندە ئەرسەلان لەگەڵ ئەو هێزەی مەلا بەختیار بە ناوی سەرپەرشتیکردنی رێکخستنەکانی کۆمەڵە لەناو هێزەکانی یەکێتی لە پارێزگای هەولێر و خەڵکی گوندەکانی بەردەستیان هاتبووە خوارەوە. بەڵام بە هۆی بوونی ژنەکەی لە بنکەکانی سەرکردایەتی و راسپاردنی بۆ بەڕێوەبردنی ئێزگەی دەنگی شۆڕشی عیراق، هەر لەگەڵ مەلا بەختیار رێ و رێ گەڕایەوە. دواتر لەگەڵ هەریەک لە ئەرسەلان و مەلا غەفور و جەمیل رەنجبەر ، م. کاوە بە تەنیا پیاسەیەکم کرد، ئەو دیارییەی خۆمانم پێشکەش بە ئەرسەلان کرد کە زۆر دڵی پێ خۆش بوو. چونکو بۆ گەڕانەوە و هەندێ مەسرەفی ماڵدانان، دیار بوو گیرفانی پارەیەکی ئەوتۆی تێدا نەبوو. هەندێک پارەی گیرفانیشم پێشکەش بە مەلا غەفور و جەمیل و کاوە کرد و ژن و منداڵەکانیان هەر لە شار بوون و رێکخستنی ناوشار بەردەوام، مانگانە کۆمەکی بە ماڵ و منداڵی مەلاغەفور و کاوە دەکرد. بەڵام ژنەکەی جەمیل خۆی مامۆستا بوو. هەرسێکیان و هەر یەکەیان بە جۆری بیرکردنەوەکانی ئەو رۆژە، لە بەڕێوەچوونی شۆڕش و هێزی پێشمەرگە قسەی خۆیان هەبوو، بە تایبەت مەلا غەفور و جەمیل رەنجبەر لە هەڵسوکەوتی سەرکردەکانی کۆمەڵە لە شاخ، ئەوەندە گەشبین نەبوون و قسەی زۆریان پێبوو.

بەر لە ئامادەبوونمان بۆ گەڕانەوە، هاوڕێیان یەک چەردە بڵاوکراوە و پۆستی ناوەندی کۆمەڵەیان بۆ سەرکردایەتی ناوخۆ دانابوو. بە هەر شێوەیەک بوو هەندێکمان لە بن کوشینی دانیشتنی خۆمان تەقەت کرد. ئەوەی تریشمان بە نایلۆن پێچایەوە و خستمانە ناو تەنکی بەنزینی ماتۆڕەکەوە. ماڵئاوەییمان لە یەکە یەکەی ئەو برادەرانە کرد. کە ئەوانیش نامەیان بۆ کەسوکارەکانیان هەبوو. بە رێگای خۆماندا بە رێکەوتین. هەتا گەیشتینەوە دوا کۆنترۆڵی سەربازی هیران. کەس نەیگوت ماڵتان لەکوێ. کەچی لەو سەیتەرەیە رایان گرتین کە بەسەرگردەکەی کۆتایی هیرانەوە بوو، کابرای سەرباز تەماشایەکی کردین کە لەناو تۆزوخۆڵ راگیراوین. بە زمانی عارەبی پرسیاری ئەوەی لێ کردین، بەو سەر و پۆتەلاکە خۆڵاوییە لەکوێوە بۆ کوێ..! منیش کە لە پشت سەفین دانیشتبووم، گوتم هەردووکمان کارمەندی کشتوکالین، بۆ پشکنینی دارودرەختی نەخۆش

لە گوندی نازەنین دێینەوە و بۆ شەقڵاوە و هەولێر دەچینەوە. یەکسەر داوای پێناسی لە من کرد، منیش پێناسی کارمەندییەکەم رادەستی سەربازەکە کرد. سەیری هەوییەکەی کردم و گوتی: اسمک عباس شجابک للمنتقە الجبلیە..! (واتە ناوت عەباسە و چی تۆی گەیاندوتە ناو ئەو شاخانەوە..!) منیش یەکدەست وەڵامم دایەوە بەوەی: لیش ما یعجبک اسمی عباس..! (بۆ عەقلت نایبڕێ ناوم عەباس بێت) سەربازەکە لەو وەڵامەم واقی وڕما. بەڵام خواوکردانە دیار بوو ئەفسەرێکی دوو ئەستێرە لەسەر ئەو کۆسپەی بەردەمی خانووەکەی سەیتەرەکە راوەستابوو، بەسەر سەربازەکەیدا قیژاند.. افتح تریق الهم..! (رێگایان بۆ بکەرەوە و با بڕۆن) هەردووکمان هەتا ئەو تاوە خەنجەرت لێدابایین، دڵنیام لە پەشۆکاوییان نەمان دەگوت ئۆف..! چاوەڕوانی ئەوە بووین، هەنوکە نا هەنوکە ئەو سەربازە فەرمانی هاتنەخوارەوە لە ماتۆرەکە و پشکنینمان بدات. بەڵام ئەو دەنگە و وەرگرتنەوەی پێناسەکەم و رێگا بۆ کردنەوەمان، ئەوەندە مژدەیەکی خۆش بوو، سەفین بە تەڕ دەستی بەنزینی دایە ماتۆڕی چەمبەری، وەک باشوکە بۆی دەرچووین. لە رێگادا ناو ناوە سەفین ئاوڕی لێم دەدایەوە و دەیگوت.. اسمک عباس و شجابک للمنتقە الجبلیە ..! لە شەقڵاوە لە چایخانەیەک، تۆزوخۆڵی رێگامان داوەشاند و ئاوێکمان بە دەموچاوی تۆزاوی خۆ وەکرد و پشوویەکمان هاتەوە بەرێ و هەولێر خۆت بگرە هاتینەوە. پاش چەند رۆژێک لە سۆراخی ئەو ئەفسەرەی فریامان کەوت و لەو تەنگەژەیە چارەنووس قوڕبەسەرییە رزگاری کردین. بۆم دەرکەوت ناوی عبدالخالق بوو، لە رابردوو ئەوانیش خەڵکی گەڕەکی سەعدوناوە بوون، منی ناسیبووەوە.

## چوونەوە شاخ

لە گێڕانەوەی سەرەتای کاروانی سەلەنوێی پێشمەرگایەتیم و لە زنجیرەی یەکەمی چاپکراوی یادەوەرییەکانمدا، خۆم و خوێنەرم گەیاندبووە بنکەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە و یەکێتی لە کوێستانەکانی پەنا قوتەی مامەندەی سەر سنوورەکانی نێوان رۆژهەڵات و باشووری کوردستان. لێرە بە دواوە کە هاوینیساڵی ١٩٨٠ ی ئەو ساڵە هێشتاماڵی خۆی لەگەڵ وەرزی پاییز تێکەڵ نەکردبوو. بە پاشماوەی بویەرەکانی ئەو کاروانە دەگەمەوە.

من که گەیشتمە بنکەکانی یەکێتی لە کوێستانی توژەڵە. بە هۆی فێنکی ئاووهەوای ئەو کوێستانە و سەختی شاخ و دۆڵەکان، خۆ پاراستن لە هێرشی فڕۆکە جەنگییەکانی رژێمی بەعس، دوور لە گەرمای گوندی ناوزەنگ و زەڵێ. بەشێکی زۆری بنکە و شوێنکار و گوزەرانی ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە و یەکێتی، لە شانی بوونی بارەگای هەمیشەیی ئێزگە و ئیعلامی شۆڕش خۆیان لە کوێستانی توژەڵە دامەزراندبوو. هەر پەنا گاشەبەرد و لێوارە جۆگەلە و شەتاوێک، کەپری دەستکردی لە لێوار قیتکرابوەوە. یاخود بە هەڵدانی خێمەی شڕ و پینەکراو ئاوەدانی بەسەرەوە جمەی دەهات.

لە رۆژانی یەکەم کە تەواو بەدەم رێگاوە شپرێو ببووم. بۆ چەند رۆژێک لە ماڵی ئەرسەلان بایز و پەخشان خان، مەلا بەختیار و رووناک خان میوان بووم کە ئەودەم خێمەکانیان لە تەک یەک بوو. بە هۆی داماڵینی پێستی پشت و قاچ و پێیەکانم کە لە سەفەرەکەم پێیان گرفتار ببووم، چاویان بەسەرمەوە بوو. پاشان بۆ یەک دوو هەفتە چوومە ئەو کەپرەی ناوەندی کۆمەڵە، کە ئەو دەمی عومەری سەید عەلی لەوێ بوو. هەر لە رۆژانی یەکەمەوە هەستم کرد، ئەرسەلان فشارێکی زۆری لەسەرە بۆ راپەڕاندنی کار و ئامادەکردنی بەرنامەی رۆژانەی ئیزگەی دەنگی شۆڕشی عیراق. وەک پێویست دەرەقەتی کاروبارەکانی نووسینی رۆژانە نەدەهات. بۆیە لەسەر داوای خۆی و مەلا بەختیار، رۆژانە بە نووسینی چەندان گوتار و پەخشان و کورتە ساتیرەوە، لە هاوکاری کردنیان درێخیم نەکرد. ئەو دەمە لە ئێزگەدا، بێژەری رەسمی پشکۆی سەعید ناکام بوو. کە زۆرتر لەگەڵ بەرپرسەکانی ئەو دەمی ئیعلامی مەرکەزی کۆک بوو. لەگەڵ ئەرسەلان و برادەرانی دیکەی ئێزگەکە لەو مەنجەڵە دانووی نەدەکولا. هەروەها شەهاب عوسمان لە بێژەری نووسینە کوردییەکاندا، رۆڵێکی سەرەکی هەبوو. وەک مرۆڤێکی هەڵسوڕاوی دڵسۆز بە کۆمەڵە و شۆڕش، تا بڵێی گەرموگوڕ بوو. بەشێکی ماندوبوونەکانی بەرێوەچوونی ئێزگەکە لەسەر شانی ئەو بوو.

هەر لەوێ رۆژێشدا لەناو مەسئول و کادرە سەرەکییەکانی ئیعلام و ئێزگە بە تایبەت مەسولەکانیان، ساردوسڕییەکی بەرچاو لە پەیوەندی نێوانیان هەست پێدەکرا و قاوەی یەکتریان نەدەخواردەوە. کە زۆرتر رەنگدانەوەی ناتەباییە شەخسییەکانی نێوان ئەندامانی دەستڕۆیشتوی ناوەندی کۆمەڵە بوو. بە جۆرێک کادر و پێشمەرگە خوێندەوارەکانی ئیعلام لە هاوکاریکردن و نووسین بۆ ئێزگە قرقەپیان هەڵبژاردبوو. هیچ

لایەکیان خۆیان لە کاروباری یەکتری نەدەگەیاند..! من یەک بەخۆم لە هەواری سەردانی برادەرانی ئێزگە، هاتووچۆی بنکەکەی ئیعلامیشم دەکرد و پەیوەندی هاوڕێیانەم بە هەموو کادر و پێشمەرگەکان ئاسایی بوو، بەتایبەت لەگەڵ بەکر خۆشناو و هەڤاڵ کوێستانی و نالەی حەفید هاوڕێیانە بوو.

بەدوای مانگێک و ڕەوشی ئاو و هەوای ناوچەکە بەرە و ساردبوون دەچوو. زۆربەی ئەو بنکە و بارەگایانەی لە هەواری توژەڵە بوون، بۆ شوێنەکانیان لە ناوزەنگ و زەڵێ باریانکردەوە. منیش ئەو دەم لە بنکەکەی نەوشیروان کە هەر لەسەر زینێکی بەردەم دۆڵێکی هەڵکشاو بەرەو قوتەی مامەندە، لە خڕی ناوزەنگ بۆ ماوەیەک جێگیر بووم. کە ئەو لە هاوینەش جێگۆڕکێی نەکردبوو. وەک مەسولێکی خاکی خانووی بنکەکەی بەدەست و قامی خۆی و پێشمەرگەکان پێکەوە نابوو.

ماوەیەک لەو بنکەیەی نەوشیروان مامەوە. بەڵام ڕۆژانە هاتوچۆی ئیزگە و ئیعلامم لە توژەڵە دەکرد. لە هاوکاریکردن بۆ نووسین بۆ بەرنامەی ڕۆژانەی ئێزگە درێخیم نەدەکرد. دوو مانگێک زیاتر بوو لەوێ بووم. بۆ خەوتنیش سەرەتا هەر لە ژوورەکەی نەوشیروان دەنووستم. بەڵام دوایی جێگای خۆم گواستەوە ژووری پێشمەرگەکان. لەوانەی لە بیرم ماون، مامەقالە، مام شێرکۆ، بەهرەم دووکانی، دیار ،هتد.. و زۆرتر خۆم بە کاری نووسین بۆ ئێزگە و گوتار بۆ گۆڤاری کۆمەڵە خەریک دەکرد. دواتر نەوشیروان داوای لێ کردم کە بچمە بنکەی ناوەندی کۆمەڵە لە زەڵێ و لەوێ بمێنمەوە. چونکو بەشێکی ئەو هاوڕێیانەی ناوەندی بۆ جەولەکردن، بۆ ناوچەکانی خوارەوە دەڕۆیشتن. زۆری نەبرد هێزەکانی قیادەی مووەقەتە _ پارتی _ هاتنە دەوروبەری گوندی بێدەلانی بەرانبەر شێنێ و بنکە سەرەکییەکانی سەرکردایەتی ینک. یەکێتیش بانگی هەندێ لە هێزەکانی لە هەورامان و قەرەداخ و شاربازێڕ و ناوچەکانی هەولێری کرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گەف و هەڕەشەی پەلاماردانی هێزەکانی پارتی نەیار. باش بوو دوایی بە هیمەتی هەموو لایەک ئەو شەڕە نەقەوما. هێزەکانی هەردوولا بۆ شوێنەکانی خۆیان پاشەکشەیان کرد. تەنیا لەناو هێزەکەی یەکێتیدا، هەرێمی یەکی ئەو کات بە فەرماندەی هەرێم و کادرە ڕێکخراوەیی و عەسکەرییەکان بۆ بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە لەو قسەوقسەلۆکانەی لەسەر مومارەساتی مەسولی یەکەمی هەرێم هەبوو، گلدرابوونەوە. لەو بینەوبەردەیەدا لەگەڵ هاوڕێیان م. پشکۆ، شاهۆ، سەرکەوت، سامان _ فەرەح ،

ئاسۆی شێخ نوری و ئەبو شەهاب _ ئیحسان کەرکوکی _ و ئەوانی دیکە، بوومە ئاشنا کە پێشتریش هەندێکیانم دەناسی و زۆربەیان لە بنکەی ناوەندی دەمانەوە. کە لە مانگ زیاتری خەیاند.

## خەفارەتی بنکە

ئەو رۆژە پاییزێکی درەنگی ساڵی ١٩٨٠ بوو، لە بنکەکانی ناوزەنگ و زەڵێ بۆ ئامادەکردنی خواردنی رۆژانە لە ناو پێشمەرگەکاندا بە تۆبەت بوو. هەر رۆژەی پێشمەرگەیەک بە ریز خەفارەتی دەگرت. ئەو پێشمەرگە خەفەرە لە ئامادەکردنی نانی بەیانییەوە هەتا ئێوارە، خۆراکی سێ ژەمەی ئەو رۆژەی بۆ پێشمەرگە و میوانەکانی بنکەکە ساز دەکرد. دیارە چای لێنانی سێژەمەش سەربار بوو. ئەز وەک سوخەتی ئاسایی خۆم، بەبێ گوێدانە پلەوپایە و هەڵوێستی فلان و فیسار مەسول، خۆم لە خەڵک جیا نەکردووتەوە و بەردەوام هەوڵم وەک زۆربەی خەڵک بژیم. بە هەڵسوکەوت لە خەڵک دانەبڕێم.

لە بنکەی ناوەندی کۆمەڵە ناوی خۆم لە لیستی خەفارەتی رۆژ تۆمار کرد. سەرباری ئەوەی هەندێک لە پێشمەرگەکان نارازی بوون. لەوەی تەنیا کەسێکم لە مەسولەکانی کۆمەڵە لەوێ رۆژان ئەو کارە دەکەم..! بەڵام نەوەک هەر بەوە نەوەستام، بگرە رۆژانە بەدوای تەواوکردنی کارەکانی نووسین و راپەڕاندنی کاروباری بنکەکە. فرسەتم هێناوە لە شانی پێشمەرگەکان بۆ داربڕین و هێنانەوەی بە شان و پشت. لە یەکەم رۆژی خەفارەتەکەشم کە لە کاتژمێر چواری بەیانییەوە، لەلایەن پاسەوانی شەو بێدارکرامەوە. هەم بۆ ئەنجامدانی یەک سەعاتی پاسەوانی بنکەکە و هەمیش دوای یەک سەعاتەکە، قاوەڵتی بۆ پێشمەرگە و میوانەکانی بنکەکە ئامادەبکەم.

یەکەمجاری خەفارەتەکەم بۆ بەختی من سەرمایەکی وشک و برینگ بارگەی خستبوو. داروبەرد بە یەکەوە بەستبووی. ئاوی سۆندەی راکێشراو بۆ بەردەم بنکەکەمان یەک پارچە شەختە بوو. کە لە سەرچاوەی ئەو کانییەوە راکێشرابوو لە نزیکی بنکەکەی لقی یەکێتی ناوچەکانی سەرکردایەتی بوو. سۆندەکە ببوو بە یەک پارچە شەختە. بەدوای تەواو. بوونی سعاتی ئێشک، دوو دەبەم دیتەوە و بەو سەرمایە چوومە

سەرکانییەکە و هەرچۆنێک بوو، شەختەکانم شکاند و بۆشکەکانم پڕ ئاوی کەللەتەزێن کرد و بۆ بنکە هێنامنەوە. پاشان کەوتمە مشوری ئاگرکردنەوە، تاکو لۆبیا و نۆکاو بخەمە سەرئاگر بۆ پێخۆری بەیانی کە بۆ ئەو ڕۆژە بڕیار بوو.

بە تەورێک هەندێ دارم شەتوپەت کرد. کە زۆری سەخڵەت کردم، چونکو دارەکان تەڕ بوون. پارچە دارەکانم لەناو قوناگردانەکە کەڵەکە کرد. لە پێشەوە بە پێی عەقڵ پێداشکانی ئەو دەمی خۆم، هەندێ پەڕە کاغەزم خستبووە ژێرەوەیان. نەدەبوو نەوت بۆ ئاگرکردنەوە بە کار بێت. هەرچەندە یەک شخارتەی پڕم تەواو کرد. بەدوای هەندێ دووکەڵکردن، ئاگرم بۆ نەدەکرایەوە. لێرەدا ماڵەکەی فەرەیدون عبدالقادر لە تەک بنکەی ناوەندی بوو، ئەو دەمە خۆی لە ماڵ نەبوو، ژنەکەی و شوانەی کوڕی لەوێ بوون. تومەز پاکیزەخان لە پەنجەرەی ژوورەکەیانەوە، من دەبینی کە خەریکی ئاگرکردنەوەم و بۆم ناکرێتەوە! دڵی پێم سووتاوە، کاتەکەش تا دەمات درەنگتر دەکەوت. هەنوکە نا هەنوکە پێشمەرگەکان لە خەو بێدار دەبنەوە. لە ناکاو پاکیزەخان وەک فریشتە لێم پەیدا بوو، یەکسەر دوای ئاخ هەڵکێشان، بۆ پەشۆکاویم و هەڵاوسانی چاوەکانم، کە ئەوەندە لەبەر دووکەڵ فووم کردبوو، چاوەکانم لەگەڵ ئاوسان سوور ببوونەوە.

پاکیزە خان ماڵی ئاوابێت، یەکسەر کەوتە هاوکاریم و بگرە بە خۆی هیمەتی کرد، بە هێنانی هەندێ پوش و پەلاشی وشک لە ناندینەکەی خۆیەوە ئاگرەکەی بۆ کردمەوە، مەنجەڵەکانم لەتەک خستنە سەر ئاگرەکەوە. بەڵام ئەو پێخۆرە تازە بە ژەمی بەیانی ڕانەدەگەیشت. ناچار لەپاڵ مەنجەڵەکان، کتلی و قۆری چای لێنانیشم خستە پەناوە. هەرچۆنێک بوو بە یارمەتی پاکیزەخان و سابر ڕەسول کە میوانی بنکەی ناوەندی بوو، بەر لە هەمووان لە خەو ڕابوو. چەند قوتوە پەنیرێکمان قاش قاش کرد و لەسەر سینییەکم دانا. ئەوجا پێشمەرگەکانم لە خەو بێدار کردەوە. هەموو پێیان سەیر بوو کە وا درەنگ بێدار کراونەتەوە، کە دەبوو لە ترسی پەلاماری فڕۆکەی جەنگی، بەیانی زوو ڕابن و لە ئامادەباشی خۆ حەشاردان دابن. باش بوو ئەو ڕۆژە ئاسمان هەوراوی و فڕۆکە نەبوو. کەچی پتکوپلارەکانی سابری برادەری خۆم، زیاتر ماندووی کردبووم، هەردەیگوت.. کوڕی بابم بۆ خۆت لە حکومەت ئەشقیا کرد..! برسی بووی، بێ جلوبەرگ بووی، معاشت نەبوو، هەموو سبەینان بە پاک و خاوێنی بۆ کاری فەرمانبەری نەدەچووی. بە من ناڵێی لە چیت کەم بوو، وا داتە شاخ و کیوی بووی..! دەبیخۆ هەتا دەتوانی نان و دووکەڵ بنۆشە..!

# چاویلکەی یەکلاق و سەفەری رۆژهەڵاتی کوردستان

لە رێگای هاتنم بۆ بنکەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە و ینک لە ناوزەنگدا. بە هۆی هەڵدێرانەکەی چیای ئاسۆس کە لە زنجیرەی یەکەمی چاپکراودا گێڕاومەتەوە، لاقێکی چاویلکەکەی چاوم شکابوو. هەرکە لە چاوم دەکرد. برادەران هەموو دەیانگوت و دەیانگوتەوە.. ئێمە کلاشینکۆفی یەکلاقمان دیتووە، بەڵام نەمان بیستووە، چاویلکەی یەکلاقیش هەبێت..! ئەوە بوو رۆژێک لە کۆبوونەوەیەکی فراواندا، کە بۆ دروستکردنی کۆمیتەی تەنفیزی شۆڕش لەنێوان کۆمەڵە و بزووتنەوەی ناو یەکێتی و هێڵی گشتی یەکێتی، هەندێ کەسایەتی بێلایەن بڕیار بوو بێتە دامەزراندن. لە گەرمەی گفتوگۆکاندا، بە زۆری گەنگەشەکان لەسەر کۆی ژمارەی بەشداربوو لە ئەندامانی پێشنیارکراوی هەر لایەنەی ناوبراو گەرم بوو. من لە خۆمەوە دەنگم هەڵبڕی کە برادەرانی بزوتنەوەوە من و جەمیل رەنجبەر و ئەرسەلان بایزیان بە زیاد دەزانی. من دەست پێشکەری ئەوەم کرد، کە بۆ جەمیل رەنجبەر خۆم دەکێشمەوە. لێرەدا عومەر شێخموس ئەندامی مەکتەبی سیاسی ئەو دەمی یەکێتی، پێشنیاری کرد کە پێشتریش باسی لەگەڵ کردبووم، سەفەرێکی ئەوبەو بکەم-هەم بۆ دروستکردنی چاویلکەیەکی دوو لاق و هەمیش بردنی نامەیەک بۆ دەفتەری مامۆستا شێخ عزالدین لە بۆکان. گوتی: مادام حاجی مەمۆ ئەوەندە لە خۆبردەیە، ئەگەر نەوشیروان رێگا بدات، بۆ ئەو دیوی دەنێرین. تاکو هەم لە چاویلکەی یەکلاق رزگاری ببێ و هەمیش کۆمیتەی تەنفیزیش لە دایک نابێت..! بەفیعلیش ئەو جۆرە کۆمیتەیە هەر لەدایک نەبوو، کە وا بزانم زۆرتر لاساییکردنەوەی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول بوو. لە پراکتیک بووە زڕە خەون و ئەو باسوخواسە جارێکی دیکە نەهاتەوە گۆڕێ.

بۆ بەیانی نەوشیروان بەدوایدا ناردم. هەندێ یارمەتی دام بۆ ئەوەی ئەو سەفەرە بکەم. بۆ چاویلکە دروستکردن و سەردانی بۆکان. کە لەگەڵ خۆم نامەکەی ــ م. س ــ ی یەکێتی بگەیەنم و سەردانی کانوونی نووسەرانی رۆژهەڵات بکەم. پێشتر نامەی یەکێتی نووسەرانی کوردستان لە شاخ بۆ ئەو مەبەستە ئامادە بوو. بەیانی زوو لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی نەخۆش و بریندار، بەرەو سەردەشت بە رێ کەوتین.

هێشتا بەشێکی زۆری ئەو ناوچانە لەژێر کۆنترۆڵی هێزی پێشمەرگەی حیزبە چەک بە دەستەکانی ڕۆژهەڵاتەوە بوو. لەم سەرەوە لە بازگەکانی پێشمەرگەی حیزبی دیموکرات، هیچ گرفتێکیان بۆمان دروست نەکرد. بۆ ڕۆژی دوایی بە پسولەی یەکێتی گەیشتینە سەردەشت و شەوەکەی لەئوتێلێکی کوردەواری خەوتین، کە نوێنەری پەیوەندییەکانی یەکێتیش لەوێ بوو، کەماله پیرەی کۆیی بوو. کەمال زۆری هەوڵدا هەمووومان بە کۆپتەر ڕەوانەی ورمێ بکات، بەڵام هەر جێگای بریندارەکانیان کردەوە کە ژمارەیان لەدەوری دە پێشمەرگەی هەمەجۆری بریندار بوو. من و چەند برادەرێک ناچار بە سواری ماشین بۆ مهاباد بەڕێکراین. لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێم، دەبوو مشوری هەڵگرتنی پسولەی ڕێگادان بۆ بازگەکانی دەسەڵاتی ئێرانی کە لە دەوروبەری شارەکان جێگیر بوون، لەگەڵ پسولەی ڕێگادانمان بۆ بازگەکانی پێشمەرگەی دیموکرات و کۆمەڵە هەڵبگرتایە. لە هەر یەکێکیان دەبوایە ئەو پسولەیەی لایەنەکەی تر بشارینەوە. دەبوو ئەو نامە و پۆستە قاچاخانەش بە شاراوەیی بپارێزم کە لەلایەن دەوڵەتی ئێرانی و حیزبی دیموکرات، تونتنی قاچاخ بوو. بە کورتی سەفەرێکی پڕ لەسەرچڵیم لەپێش بوو، کە لەبەر خاتری دروستکردنی چاویلکە تووشی ببووم.

لە یەکەم بازگەی دەرچوون بەرەو مهاباد، جەندرمەکانی ئیتلاعات ڕایانگرتین و بە وردی لە شوناسنامە و بەرگەی عبوریان دەپێچایەوە، کە لەلایەن خۆیانەوە لەناو شاری سەردەشت بۆمان دروست کرابوو. بە هەزار دەردی سەر دەربازمان بوو. پاش ماوەیەک لەلایەن بازگەیەکی سەر ڕێگای پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکرات لە ڕەبەت، ئەوجا لە چەند شوێنی دیکە، بە ئاسانی تێپەڕین. هەتاکو گەیشتینە دەروازەی شاری سابلاخ. لەوێ ماوەی دوو سعات زیاتر بەبێ مانا بیانویان پێگرتین. ئەگەر لەبەر ئەو پۆستانە نەبوایە، هەر لەوی ڕێ و ڕێ دەگەڕامەوە..! کە هاتینە ناو شاریش زۆر بە زەحمەت لە هوتێل جێگایان کردینەوە. داوای پسولەی مۆڵەتی ئیتلاعاتی ناوشاری سابلاخیان لێمان دەکرد. بە هەر شێوەیەک بوو، لە ژوورێکی ساردوسڕی سەربانی ئوتێلێک، ئەو شەوە جێگایان کردینەوە. من بۆ بەیانی زوو، سەرێکی کتێبخانەکەی سەیدیانم دا و هەر ئەوێم پێدەزانی. لە ساڵی ١٩٧٤ لەگەڵ ئەنوەر شاکەلی بەیەکەوە سەردانمان کردبوو. سەیدیان سەرەتا بە پارێزەوە هاوکاری کردم بۆ چوونە لای دکتۆری چاو و دوایی لە دروستکردنی چاویلکە، خۆی لەگەڵم هات و بۆ نیوەڕۆ بۆیان تەواو کردم. چاویلکەم لە چاو کرد و

یەکسەر بەرەو بۆکان بە ماشێن ملی ڕێگام گرت. ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە ناوشار و یەکسەر سۆراغی ماڵی سەلاحی موهتەدیم کرد. ئەو کەسەی لێم پرسی، هەر خۆی لەگەڵم هات و رادەستی ماڵی ئەوانی کردم. کە زانییان لەلایەن یەکێتییەوە لەو دیو هاتووم، زۆریان ریز لێ گرتم و بۆ ژووری میوانانیان بردم. دوای هەندێ حەسانەوە، سەلاحی موهتەدی کە یەکەمجار بوو، ببینم بە روویەکی گەشەوە بەسەریکردمەوە و لەگەڵ خۆی بۆ هۆدەی نانخواردنی ئێوارەی بردم. بەدوای خوانی ئێوارە، بۆ چای خواردنەوە چوینە ژوورێکی پۆشتەتر کە بە رایەخ و مافوری رەنگاورەنگ راخرابوو. تا درەنگانی شەو، دیوەخان جمەی دەهات. دەمەتەقێ و گفتوگۆکان بەزۆری دەرباری بزافی چەکداری کورد و چالاکی پێشمەرگە و گرفتەکانی نێوان دیموکرات و کۆمەڵە بوو. من لەگەڵ سەلاحی موهتەدی باسی ئەو نامەی بۆ مامۆستا شێخ عزالدینم هێنابوو، قسەم کرد. ئەو یەکێکی نیشان دام کە لە بیرم نەماوە، ناوی چی بوو، گوتی: ئەو برادەرە خۆی لە دەفتەری مامۆستایە و نامەکە تەسلیم بەو بکە. بۆ سەردانی کانوونی نووسەرانیش، گوتی، بەیانی یەکێک لەو پێشمەرگانەی ئێرە، هەتا ئەوێشت دەبەن.

سبەینەکەی بە یەکجاری لە ماڵی سەلاحی موهتەدی بە رێکەوتم، بەدوای سوپاسی زۆرەوە بۆ بەدەنگەوە هاتنم، ماڵ ئاواییم لێ کردن. کە چوومە بنکەی کانوونی نووسەران، سەرەتا کەسێکم لەوێ نەدیتەوە، تاکو بەرەبەری نیوەڕۆ، کە ئەوەی بە بیرم ماوەتەوە، یەکێک بەناوی رێبوار بە گەرمی و دۆستانە پێشوازی لێ کردم. بە یەکەوە لەسەر ئەوە ساغبووینەوە، کە بۆ لەمەودوا پەیوەندی نووسەرانەی هەردوولامان گەشە پێبدەین، لە فرسەتی گونجاو سەردانی بنکەی یەکتری بکەین و بەیەکەوە سیمنار و کۆڕ و کۆبوونەوەی هاوبەش بگرین، ئەدەبیاتی نێوانمان بگۆڕینەوە. ئەوان بۆ پەیداکردنی هەندێ پێداویستی تایپ و رۆنیۆ و کەرەستەکانی چاپەمەنی گفتییان دا، بەڵام هەرگیز نەچووە بواری پراکتیکەوە. دواتر هەر بە یارمەتی ئەوانەوە مەفرەزەیەکی کۆمەڵە، بە ماشێن هەتا دەوروبەری شارۆچکەی رەبەتیان بردم. شەوەکەی هەر لە بنکەی ئەو پێشمەرگانە مامەوە. بۆ رۆژی دوایی بە سواری تراکتۆر گەرەکم بوو، بۆ بەری گوندی بێوران بپەڕمەوە. بەڵام لەو بارگەیەی پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکرات لە کەناری رەبەتدا هەبوو، رێیان پێگرتین و بە جۆرێکی نارێک، هەڵسوکەتیان لەگەڵ کردم. لە پێشەوە بە ئەمرکردن بەندەیان لەناو عەرەبانەی تراکتۆرەکە دابەزاند و هەموو

کەلوپەلەکانمیان بەوردی پشکنی و بردمیان لە هۆدەیەکی چۆل و لەوێش خۆمیان پشکنی، کە بێجگە لە پسولەی ڕێگاپێنەگرتن، لەگەڵ هەندێک پارەی کەمی عیراقی و ئێرانی نەبێت، هیچی تریان بەرچاو نەکەوت. لەو ژوورە گلیان دامەوە. بۆ بەختی من لەناکاو دوو پێشمەرگەی دیکەی یەکێتییان هێنا، کە لە موعالەجەکردنی نەخۆشی دەگەڕانەوە. یەکێکیان مەلا غەفوری هاوڕێم بوو. ئەوان باسی ئەوەیان بۆ کردم، کە لەو بازگەیە هەر ئەمڕۆ، سەرەتا ڕێگای تێپەڕینی ملازم عومەر و سالاریشیان نەداوە، پاش چەندان کاتژمێر ڕێگایان بۆ کردونەتەوە و تێپەڕیون. بەرەبەری ئێوارە، بۆ ئەوەی نەبینە بار بەسەریانەوە، ئەو کەسەی کە بە ناڕێکی مامەلەی لەگەڵ هەمووومان کردبوو، ناوی مەلا عەزیز بوو، لەو هێزەی کەریم حەداد فەرماندەی بوو. بە لووتبەرزی لێمان بەژوور کەوت و کەلوپەلەکانی هەرسێکمانی دایەوە دەستمان، بە لالووتی بەڕێمانی کرد. باش بوو مەلا غەفور و ئەو پێشمەرگەی دیکە شارەزا بوون، بەدوای ڕۆیشتنێکی دوو سەعاتی و لە پەڕینەوەی چەمێکەوە گەیشتینە ئاوەدانی. کە سەرباری ئەوەی دونیا تاریک ببوو، خەڵکەکە بەو درەنگە بە پەرۆشەوە پێشوازییان لێ کردین. ئێمەیان دۆستانە وەرگرتەوە، کە مامەلەی ناشیرینی ئەو کادرەی حیزبی دیموکرات _ مەلا عەزیز _ یان لە بیر بردینەوە.

## یەکێتی نووسەرانی کوردستان لە شاخ

سەرەتای پاییزی ساڵی ۱۹۸۰ بوو. بنکەی ناوەندی کۆمەڵە لە زەڵێ زۆر قەرەباڵغ ببوو، هەبوونی ئاسۆی شێخ نوریم قۆستەوە و بە مۆڵەت وەرگرتن لە سکرتێری کۆمەڵە، و لەسەر پێشنیاری ئەرسەلان باروبارگەی خۆم بەیەکجاری بۆ توژەڵە، دەوروبەری بنکەی ئێزگەی دەنگی شۆڕشی عیراق گواستەوە. دوو هەفتەیەک لەگەڵ ئەرسەلان و پەخشان خان، لەو تاکە ژوورە دەخەوتین کە تازە بۆ ژیانی زستانەیان دروست کرابوو. دواتر بە هۆی هاتنی یوسف زۆزانی بۆ سەرپەرشتی پرۆگرامی عارەبی ئێزگەکە، خێمەیەکی دوو نەفەریمان پەیدا کرد، لە خوارەوە لە نزیک برادەرانی ئامادەکردنی پرۆگرامەکانی ڕۆژانەی ئێزگە جێگامان گرت، سەرباری ئەوەی خەریک بوو، سەرماوسۆلە ڕەشماڵی خۆی هەڵدەدا.

ئەو ماوەیە لەناو کۆی ئەو نووسەر و رۆشنبیرانەی لە دەوروبەری ئیعلام و ئێزگە بیرۆکەی یەکێتی نووسەرانی کورد لە شاخ هاتبووە گۆڕێ. ناوەکانی ئەوانەی بە بیرم ماون... ناسر حەفید ناله، هەڤاڵ کوێستانی، ئەرسەلان بایز، شەهاب عوسمان، حسین بەفرین، بەکر خۆشناو، عباس محمد... لە بنکەکانی یەکێتی دیارترینیان بوون.

ئەو بیرۆکەیە لە رێگای دۆستایەتی نێوان ئەو برادەرانە و هەندێ لە نووسەرانی ریزەکانی حشع لە شاخ، بەتایبەت رەفیق سابر و م. ئەحمەد دڵزار، محمد رەنجاو ، ئەحمەد رەجەب، گەرموگوڕتر کرا. کە زۆرتر بۆ وەڵامدانەوەی هەنگاوەکانی رژێمی بەعس بوو، لە فشارخستنە سەر نووسەرە بە هەڵوێستەکانی شار و ناوەوەی کوردستانی باشوور لە لایەک و پشتگیریکردنی خەباتی چەکداری شاخەکان لە دژی بەعس و پەیوەندیکردن بە تێکڕای ئەو نووسەرانەی لە شاخ لە ریزەکانی بزاڤی چەکداری شاخدا هەبوون. کانوونی نووسەرانی کورد لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا. هەروەها لەو بارەوە لە رێگای شەهاب عوسمانەوە پەیوەندی بە بەشێک لەو نووسەرانەی شارەوە کرا و پشتگیری تەواوی خۆیان بۆ هەنگاوی دامەزراندنی یەکێتی نووسەران لە شاخ دەربڕیبوو. بەدوای چەندان دیدار لە نێوان رەفیق سابر و ئەحمەد دڵزار لە ناو حشع و برادەرە نووسەرەکانی ناو ینک لە کوێستانی توژەڵە و بەری تۆکان. کۆبوونەوەی دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کوردستان لە قەدپاڵێکی شاخەکانی سەرەتای دۆڵی توژەڵە کرا. کە زۆربەی ئەو نووسەرانەی لە پێشەوە ناوم هێناون، بەشدار بوون و رەفیق سابر و ئەحمەد دڵزار و هەڤاڵ کوێستانی و عباس محمد و بەکر خۆشناو وەک یەکەم دەستەی بەڕێوەبەر هەڵبژێردران و گۆڤارێکیش بەناوی _ پێرو _ بڕیاری لێدراو بەکر خۆشناو وەک سەرنووسەر و برادەرانی بەڕێوەبەر وەک دەستەی نووسەران دیاریکران. ئەوەندەی لە بیرمە، ژمارەی یەکەمیش لەو گۆڤارە دەرچوو..

# شەهیدبوونی جەمیل رەنجبەر

بەدوای رەوانەوەی هەرەشەکانی ئەو هێزانەی قیادەی موەقەتەی پارتی لە هێرشکردنە سەر بنکەکانی سەرکردایەتی یەکێتی لە خرپی ناوزەنگدا و کشانەوەیان بۆ ناوچەکانی پێشوی خۆیان. هێزەکانی یەکێتیش کەوتنە گەڕانەوە و جموجۆل بەرەو ناوچەکانی خوارەوە. بەندەش یەکێک لەو پێشمەرگانە بووم، کە خۆم بۆ ئەو جەولەیەی هێزێکی یەکێتی ئامادە کردبوو، کە بەرەو ناوچەکانی هەولێر و کەرکوک شۆردەبوونەوە. برادەرانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی لە بەڕێکردنی ئەو کاروانەدا بوون کە نەوشیروانیش لەناویاندا بوو، هەرکە چاوی بە بەندە کەوت لە تەک جەمیل رەنجبەر شان بەشانی یەکتری لەو کاروانە جێگامان گرتووە. هاتە پێشەوە و داوای لە من کرد و تۆزێکی دوورخستمەوە و پێی گوتم: بە سود وەرگرتن لە پەندێکی ئینگلیزی کە دەڵێ، هەموو هێلکەکان بە یەکەوە مەخەنە سەبەتەیەکەوە. باشتر وایە تۆ بگەڕێیتەوە و جارێ دەست لەو سەفەرە هەڵگری. منیش بەبێ خۆ تەنگاوکردن، بە گوێم کرد و دوعاخوازیم لە جەمیل و سابر رەسول و ئەو هاوڕێیانە کرد، کە بۆ ناوچەکانی هەولێر لەگەڵ کاروانەکە دا بوون. بە ئاگاداری نەوشیروان خۆی و ملازم عومەر ئەو تفەنگەی شانی خۆشم بۆ هاورێ کاوە مەخموری بە سابر رەسول دا کوتە دیاری. بەدوای یەک دوو رۆژ، هەواڵی جەرگبڕی شەهیدبوونی جەمیل رەنجبەر و یەک چەپکە پێشمەرگەی شەهید و بریندارمان پێگەیشت. دیارە لەو کاروانەدا وەک ئەوەی بۆ سەیران بچن، لە گوندەکانی نێوان لووتکەکانی کێوەرەش و ماخۆبزنان، بە رۆژی رووناک کەوتبوونە بەر پەلاماردانی کۆپتەرەکانی رژێمی بەعس. ئیتر بە گوێکردنی نەوشیروان بۆ ئەزی بە باش گەڕایەوە. لێرە بە دواوە کەوتمە پەیوەندی کردن و هاتوچۆی ئەو کۆمەڵە هاوڕێیەی کە ماوەیەک بوو، بە هاوکاری حشع و حسک لە ریزەکانی قیادەی مووەقەتە وازیان هێنابوو بریتی بوون لە شەماڵ حەوێزی، مەجید ئاکرەیی، کاروان ئاکرەیی، رەجەب، شەریف ئامێدی، ابراهیم _ شوان _ کە خەڵکی هەولێر بوو، (ئەوانەی لە بیری من ماون) هتد.

ئەو برادەرانە لەو بەری ئەو پردە دارەی سەر ئاوەکەی نێوان توژەڵە و نۆکاندا، لە بەری نۆکان لەناو خێمەیەکی شڕوشپڕێو دەژیان. من بەدوای چوونەخوارەوەی جەمیل رەنجبەرەوە چەند جارێک سەردانم کردن و هەندێک لەوانیش دەهاتنە سەردانی ئێمە کە لەگەڵ ئەرسەلانیش پێکەوە گفتوگۆی هاوڕێیانەی یەکتر ماندیکردنمان گەرم دەبوو.

لێرەدا وەک دەڵێن قافی ئەو نووسینەم لەسەر جەمیل رەنجبەر و بەدیداری شەهادەتی هاوڕێیانی گومناو، مەجید ئاکرەیی و هەڤاڵە نەمرەکانی پێشکەش دەکەم و دوایی دەگەڕێمەوە سەر تەواوکردنی پاشماوەی باسی ئەو هاوڕێیانەی سەرەوە.

هاوڕێتی جەمیل رەنجبەر و ئەزی بۆ قۆناغی خوێندنی ناوەندی کۆماری هەولێر دەگەڕێتەوە کە ئەو ساڵێک لە پێش منەوە بوو. پەیوەندی ئەوێ زەمانی سەرچاوەکەی بۆ ریزی یەکێتی قوتابیانی کوردستان دەچێتەوە. ئەو بەیەک گەیشتنەمان وەک دوو هەڵسوڕاوی ئەو رێکخراوە. ناسینی جەمیل و تێکەڵبوونی بۆ سادەیی و خاکی بوونەکەی، هەروەها کوردی قسەکردنەکەی زۆر سەرنجمیان بە لای خۆیدا راکێشابوو. دیسانەوە ناسیاوی بنەماڵەی هەردوو لامان هۆکارێکی دیکەی نزیک. بوونەوەمان بوو. هەر لە رێگای جەمیل رەنجبەرەوە بۆ رێکخستنی پارتی پەلکێش کرام، بە جۆرێک وەک دوو برادەر باسوخواسی ئەدەب و نووسین، راوکەیەکی دیکەی زیتر خوو بەیەکەوە گرتنمانی ئاسان کردبوو. نابی ئەوەش لە بیر بکەم هەردووکمان ئەو دەمی لە تیپی فوتبۆل و تێنسی سەرمێزی قوتابخانە، باشتر خێواوبووینە باری بیروهۆشی یەکتری. جەمیل لە فوتبول لە بەندە بەتواناتر بوو و زۆرتر پێشکەوت، کەچی من لە تێنسی سەر مێز لەو باشتر بووم.

لە رێگای جەمیل رەنجبەرەوە من بە رەوتی جیابووەوەی ١٩٦٦ ی باڵی م س ئاشنا بووم و بەگەر کەوتم. هەتا بەیانی یازدەی ئازاری ١٩٧٠ بەیەکەوە لە ناو یەکێتی قوتابیانی کوردستان و رێکخسنەکانی پیشەیی پارتی و هەتا یەکێتی لاوان هاودەم و هەڵسوڕاو، نزیک بە نزیکیمان هەبوو.

جەمیل گەنجێکی بەرچاو و بەسەلیقە بوو. لە هەڕەتی تەمەنییەوە لە پاڵ کاری رێکخراوەییدا، زۆر بە شێلگیریی کەوتبووە ناو جیهانی شیعر و ئەدەبیات، لە خوێندەواری و خۆ رۆشنبیرکردن بێدەرەتان بوو. عاشقیکی پڕ لە هەست و نەستی ناسک بوو، خولیای دنیایەکی تژی لە خۆشەویستی بوو. جەمیل کە نازناوی رەنجبەر بوو، لەگەڵ هاوڕێیەکانی، هەتا برایەکانی برادەرێکی گیانی بە گیانی بوو، لە مامەلەکردنی رۆژانەدا هەمیشە خەمخۆری هەمووان بوو.

بەدوای چوونە شاخ لە ساڵی ١٩٧٤ و بەشداریکردن لە بزاڤی چەکداری شۆڕشی ئەیلوول. دوور و نزیک ئاگاداری یەکتریمان هەبوو. تاکو لەگەڵ هاتنەپێشەوەی رۆژانی

ئاشبەتالی ١٩٧٥، کۆمەڵەی مارکسی لینینی لە سەرەتا وەک ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕ، ئاڵای بەردەوامی موقاوەمەت و درێژەپێدانی بزاڤی پێشمەرگەیی لە کوردستانی باشوور جاردا. لە بیرمە لە ڕۆژێکی سەرەتای مانگی ئازاری ئەو ساڵەدا، بەشێکی دیاریکراوی هاوڕێیانی کۆمەڵە کە لە ناوچەکانی باڵەکایەتی _ بنکەکانی سەرکردایەتی شۆڕش هەبوون. نزیکەی دە ئەندامی کۆمەڵە لە یەکتر کۆبوونەوە و بە نیازی دروستکردنی مەکۆی ئەو کارە، بەرەو ناوچەکانی زنجیرە شاخی سورێن لە پشتی ماوەت بە ڕێ کەوتین. یەکێک لەو هاوڕێیانە جەمیل ڕەنجبەر بوو. بە درێژایی مەودای گوزەری ڕێگاکەمان، کە ئەزموونێکی تاڵ و تفت بوو. ڕەنجبەر هەرچەندە وەک بەندە ئەندام و پێشمەرگەیەکی ئاسایی کاروانەکە بوو، کەچی هەمیشە لە گشتمان زیاتر پەرۆشی ڕێکوپێکی بوو، لە زۆربەی کاروبارەکانی وڵاخ بارکردن، پاسەوانی و دابەشبوون بەسەر ماڵی جوتیارەکانی ئەو گوندانەی پێیدا تێدەپەڕین، هاوڕێیەکی بە حەوسەلە، دەم بە پێکەنین، هاوکار و خاکی لە کۆمەککردن بۆ هاوڕێیەکانی لەسەر پێیان بوو.

ڕۆژان چوون و هاتن. ڕاستە شیرازەی ڕێکخستنمان لەناو کۆمەڵەدا، نزیکی یەکتر نەبوو. من زۆرتر بە هۆی تەواوکردنی دواساڵی خوێندنەکەم لە بەغداد، کەم و زۆر لەگەڵ ڕێکخستنەکانی ئەوێ بووم. بەڵام لا بەلا بەوە ئاگادار بووم جەمیلیش لەگەڵ کۆمیتەی ناوشاری هەولێر هەڵسوڕاو بوو. لێرە و لەوێ کە یەکترمان دەدیتەوە، ئەویش زۆری لەگەڵ دەگوتم، کە بێمەوە بۆ ناو ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی هەولێر. کە هێشتا ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە زۆرتر، خەتوختوتی بڵاو بوو، بەڵام من سەرم نەدەهێنا بەرێ و ئەو دەمیش لەگەڵ هەڵوێستی تەسلیمبوونەوە بە ڕژێم زۆر نەیار بووم.

ئەو برادەرانەی کۆمیتەی هەولێر بەدوای ڕۆیشتنی مامۆستا جەعفەر و ئەرسەلان بایز و دەستنیشانکردنی عبدالرزاق سێگرتکانی بۆ بەڕێوەبردنی کۆمیتەی هەولێر و ناتەبایی نابراو لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکانی بەڕێوەبەری کۆمەڵە لە لایەک و دووری شوێنی جەمیل ڕەنجبەر لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵە لەناو شاری هەولێردا، کە زۆرتر بە هۆی مامۆستاییەکەی بوو لە ناوچەی سیدەکانی پارێزگای هەولێر، ئەو ڕێکخستنانەی هەولێر بە هۆی دەستەپاچەیی کادرەکانی لە کاروباری ڕێکخراوەیی نهێنیدا و هەبوونی کەسانی خەتمایل، تووشی دوو سێ شاڵاوی ڕاوەدونان و گرتنی بەرفراوانی دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێم بوو. بەشێکی هەرە زۆری هەڵسوڕاوە گورجوگۆڵەکانی گیران و هەندێکیان لە

ڕێکخستن کشانەوە و هەندێکی تریان بۆ شاخ دەربازبوون. لەو شاڵاوانەدا جەمیل ڕەنجبەر دوو جاران لەسەریەک، بە هۆی ئیعتراف لەسەرکردنی گیراو و چەند ساڵێک کەوتە زیندانی ئەبوغریبەوە لە بەغداد. بەدوای لێبوردنی گشتی ڕژێم کە بە هۆی جلەوگرتنی دەسەڵات، لەلایەن سەدام حسینەوە دەرکرابوو، ئەویش یەکێک بوو کە بەر لێبوردنی گشتی کەوتبوون.

هەنوکەش وا دەزانم دوێنێیە. بەدوای ڕۆژی یەکەمی بەربوونی لە زیندان و لە ڕێگای هاوڕێ سدیقی برایەوە کە ئەو دەمی ئەندامی کۆمیتەی شەهید ئیبراهیم عەزۆی کۆمەڵەی پارێزگای هەولێر بوو. شەوەکەی لەگەڵ باوکم بۆ دیداری لە ماڵی باوکی بەیەک گەیشتینەوە. جەمیل هەر لە ڕۆژانی یەکەمی بەربوونییەوە، لەسەر چوونە شاخ سوور بوو. ئەوەبوو لە ڕێگای ڕێکخستنەوە کارئاسانی بۆکراو پەیوەندی بە شاخەوە کرد. لە شاخیش وەک کادر و بەرپرسێکی هەڵسوڕاو لەگەڵ پێشمەرگەیەکی ئاسایی جیاوازی نەبووە، کەم کەس بە مەسولبوونی ئاشنا بوون. ڕۆژانێک لە سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٨٠دا، جەمیل چ وەک هاوڕێ و چ وەک برادەرێکی لەمێژینەی یەکتری، زۆربەی کات لە بنکەکانی ناوەندی کۆمەڵە و ڕاگەیاندن و ئیزگە، لە هاودەمی یەکتری جیا نەدەبووینەوە، بەیەکەوە لەسەر بارودۆخی ناهەمواری کۆمەڵە و بزاڤی چەکداری شاخەکان، ڕا و بۆچوونەکانمان نزیکی یەکتربوو..

لە دەمی بەرێکەوتن لەگەڵ کاروانی ئەو پێشمەرگانەی بەرەو ناوچەکانی هەولێر بە ڕێ دەکەوتن، هەردووکمان شان بەشانی هاوڕێ سابر ڕەسول خۆمان ئامادە کردبوو، بەڵام لەسەر داوای بەرپرسی کۆمەڵە، من بە جێ مام و ئەوان ماڵئاواییان لێ کردم. چ ماڵئاواییەک کە بۆ جەمیل ڕەنجبەر و محمد خالدی کۆیی، بەبێ ئەوەی بەهزرماندا بێت، ماڵئاوایی یەکجارەکی بوو. جەمیل ڕەنجبەر و دەستەیەک پێشمەرگە لە پەلاماردانی کۆپتەرەکانی ڕژێم شەهید بوون..

هەر یەک دوو ڕۆژی دواتر و ئێوارەکەی هەواڵی مەرگەساتی شەهیدبوونی ئەو هاوڕێیانە گەیشت و هەمووماني تاساند. بە تایبەت جەمیل وەک مرۆڤێکی هەڵکەوتوو، بەرویۆمی کەلەکەبوی دەیان ساڵەی کۆششی نەپساوە، کادر و ڕۆڵەیەکی جێی چاوانی لێ دەرچووبوو. جەمیل نەوەک هەر تێکۆشەرێکی بێپەروای خەباتی چەوساوەکان بوو، شاعیر و نووسەرێکی خاوەن سەلیقەی ناسکی بواری ئەدەبیات بوو. عەشق و

خۆشەویستی دوو پەیڤی گیانی بە گیانی ئەزموونی ئەو سوارە سەربڵندە بوون. شەهیدبوونی جەمیل رەنجبەر وەک چەندان هاورێی دیکەی ناو شیرازەکانی کۆمەڵە و بزاڤی چەکداری کەلێنێکی گەورەی بە جێ هێشت. لێرەوە بۆ باسەکەی سەرەتا دەگەڕێمەوە..

من کە لە ناو شاری هەولێر بووم لە ساڵانی ١٩٧٥_ ١٩٧٨ ناسیاوی و دۆستایەتیم لەگەڵ ئەو برادەرانە گەرم بوو بەتایبەت لە رێگای رەهبەر جەلال و شەماڵ حەویزی. تارادەیەک بە نهێنی بە کۆشش و خەباتی ژێرزەمینی یەکتریشمان دەزانی کە ئەوان ئەو رۆژە زۆرتر لە دەوری یەکتری، وەک بازنەیەک دیراسەی فەلسەفەی مارکسیزم _لینینزم یان دەکرد. هەتا جارێک بە یەکەوە لەگەڵ بەشێک لە برادەرانی ئەو گروپەدا، سەفەرێکی بە کۆمەڵی ناوچەکانی بادینانمان کرد. لە شاریش بەردەوام گفتوگۆی هاورێیانەمان هەبوو. لەو سەرلەنوێ یەکتر دیتنەوەی سێبەری بزاڤی چەکداری شاخ. ئەو برادەرانە بە هەست و نەستی هاورێیانە و دڵ و دەرونێکی پاکو دڵسۆز، وەک هەر مرۆڤێکی سەربڵندی خەباتی شۆڕشگێڕانەی بێ فروفێڵ، بەبێ ئەوەی فەرمانی گرتنیان لەلایەن دامودەزگای رژێمی بەعسەوە هەبوبێت، بەبێ ئەوەی سەربازی قادسیەی سەدام بووبن، بەڵکو تەنیا و تەنیا خەمە گەورەکانی کورد بوون، چەوساندنەوەی خەڵکی کورد و داگیرکردنی کوردستان، فەزای ئازارەکانیان بوو، چاویان بەرایی نەدا لە سێبەری رژێمی بەعس، کە بە ئاگر و ئاسن بەربووە گیانی خەڵکی کورد، ژیانی ئاسایی خۆیان لەژێرسیبەری ئەو رژێمە درێژە پێبدەن. ئارەزوومەندانە بەرەکانی خەباتی چەکداری شاخەکانیان، لە ساڵی ١٩٧٨ ەوە گەرم کرد. سەرەتا لە ریزەکانی هێزی پێشمەرگەی قیادەی مووەقەتە دەستبەکاربوون. بەراستی ئەو جۆرە قوربانیدانە تەنیا لە ئەقەلیەتێکی خەڵکی کورد لەو رۆژە بەدیکراوە.

وەک لە پێشەوەش گوتومە، جەمیل رەنجبەر لەو بارەوە قسەی زۆری لەگەڵ کردبوون. منیش لە شانی ئەو خوازیاری ئەوە بووم، ئەو دەستە کادر و ئینسانە شۆڕشگێڕە، لەگەڵ کۆمەڵە یەکانگیر ببن و تێکەڵ بە رێکخستنەکانی کۆمەڵە بن، رۆڵی خۆیانی تێدا بگێڕن. ئەوەندەی من ئاگام لێ بوبێت، لەگەڵ جەمیل رەنجبەر و هەتا ئەرسەلان بایزیش، ئەو مەسەلەیەمان لەگەڵ نەوشیروان باس کرد. هەتا لە دیداری ئەو برادەرانە لەگەڵ سکرتێری کۆمەڵە، کارئاسانی و هەوڵی زۆرماندا. بەڵام ئەوەندەی بە

بیرم مابێت، هەڵوێستی نەوشیروان، زۆرتر لە باوەڕپێنەکردن و گومانەوە، ئەو ڕۆژە مامەلەی لەگەڵ کردبوون. ئەوانیش هەروا ئامادە نەبوون وەک ئەندامی ئاسایی لە ریزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵە، سەرلەنوێ خۆیان ڕێکبخەنەوە. بەڵام بۆ فلان و فیسار کادری عەسکەری چەکدار لە دەمی سەنگەرگۆڕییان، چەندان پلەوپایەیان پێشکەش کراوە. ئیتر ئەو برادەرانە دواتر هەندێکیان، هەر زوو لەگەڵ حشع و هەندێکی دیکەیان، ماوەیەک لەگەڵ حسک تێکەڵ بوون، پاشان هەموویان سەرلەنوێ لەناو حشع کۆبوونەوە، بێجگە لە شوان کە لەو کارەساتەی یەکترکوشتنی نێوان جەمال عەلی باپیر و شێرکۆی شێخ عەلی دا، وەک رابەری سیاسی هێزەی حسک، بە هیچ و خۆڕایی ئەویش شەهید بوو.

## یەکەم جەولەی بناری قەندیل

کۆتایی مانگی یازدەی ساڵی ١٩٨٠ بوو. سێ مەفرەزەی هەرێمی چواردە _ ئەحمەد مەولوود، محەمەدی کاک هەمزە، عەزەی داودی _ لە بنکەکانی ناوزەنگەوە بە بناری قەندیل بۆ ناوچەکانی خۆیان لە دۆڵەڕەقە دەگەڕانەوە. لە بنکەکانی سەرکردایەتیش، کۆمەڵێک پێشمەرگەی بزووتنەوە و کۆمەڵە و هێڵی گشتی تێکەڵ لە یەکتر کۆ بووینەوە و ناومان لە خۆمان نابوو 'تەتی چوار. ئەوانەی لە بیرم ماون.. حاکم پێشرەو، م. عەزیز، دکتۆر شاڵاو، سواراغای سمایلاغا، دلاوەر، ئەز، ئازاد کاوانی، ئیسماعیل رەشید. بڕیارمان هەبوو بە یەکەوە بۆ ناوچەکانی خوارەوە دابەزین و لەگەڵ ئەو سێ مەفرەزەیەی لە پێشەوە ناوم هێناون بە رێ کەوتین. ئەو دەمە بەندە لە بنکەی ئێزگە بووم و تازە حەمەی حەمەباقی شاعیر پەیوەندی بە شاخەوە کردبوو، لە خێمەکەی بەندە جێگیر ببوو. دوای مۆڵەت وەرگرتن لە ناوەندی کۆمەڵە، ڕێنمایی کرام کە هەوڵ بدەم بە زووترین کات لەگەڵ ئەو هێزەی سەید کەریم لە ناوچەی خۆشناوەتی یەکتری بگرینەوە. کە ئەو کاتە ئەوان، سەرپەرشتی هێزەکانی یەکێتییان لە ناوچەکانی هەولێر دەکرد. لەو بارەوە نەوشیروان نامەی بۆ سەید کەریم نووسی، کە لەپاڵ مەسولیەتی پێشمەرگەیی ئەودا، من خەریکی کاروباری ڕێکخراوەیی کۆمەڵە بم. هەتا ئەو کاتەی وەلامان بۆ

دەگێڕنەوە کە بە یەکەوە بۆ بەشداریکردنی یەکەم کۆنفرانسی کۆمەڵە، بەرەو بنکەکانی سەرکردایەتی سەردەکەوینەوە.

بەیانییەکی زوو شوێنەکەی خۆم بۆ حەمەی حەمە باقی بە جێ هێشت. لە شانی پێشمەرگەکانی دیکەوە لەبەردەم گوندی شێنێ یەکترمان گرتەوە. ملی ڕێچکەی ناو بەفر و بەستەڵەکمان گرت. لەوێ ڕۆژان دەبوو پێشمەرگە، زۆرتر بەو باریکە ڕێگا و ڕێچکانە گوزەر بکات. کە هێزەکانی دوژمن پێی نازانن و بە ئاسانی دەستیان ناگاتێ. هەرکە پەڕینەوە بەرێ بێدەلان، بنارە و بنار بەریز بەدوای یەکترەوە، لەگەڵ خرم و هۆڕی بەفرشێلان قۆشمەمان بوو. ئێوارەیەکی درەنگ لەو قەدپاڵانەی قەندیل بە هاوکاری ئەو پێشمەرگانەی شارەزا بوون. بەسەر دوو داری درێژی رایەڵکراوی سەرچەمێکی قوڵ پەڕینەوە. کە بۆ من یەکەمجار بوو بە شوێنی لەو جۆرەدا بڕۆم. پێشمەرگەکانی پێش و پاشم دەستیان گرتبووم کە جیرە جیرمان بەو کاریتە رایەڵکراوانە خستبوو، نەوەک پێم بخزێ و سەرەوەهەڵدێر لە چەمەکە خۆم ببێنمەوە..!

شەوەکەی لەو بەری چەمەکەوە لەسەر بەفرەکە جێگامان خۆش کرد. ئێمە بەشێکی زۆرمان کیسەی خەومان لە کۆڵ بوو. هەر ئەوەندەمان زانی پێشمەرگانی هاوڕێگامان لە سێ شوێنەوە، یەکو ئاگری گەورەیان کردەوە. تومەز ئەوان هەتا تەوری دار شکاندنیشیان پێبوو. لە چاوتروکانێکدا ئەو دارە تەڕەیانەیان شەتوپەت دەکرد و لەسەر ئاگرەکە قۆمەتیان دەخستەوە. شاڵاوی ئاگرەکە هەموومانی گەرم کردەوە. ئەوان پێشمەرگانە بەدوای نان و چای خواردن و پاسەواندانان. دیتم قاچەکانیان لە ئاگرەکە کرد و لەسەر بەفرەکە کەوتنە شیرین خەوێ. ئێمەش بە چاولێکەری ئەوانەوە، خەو بووە میوانمان. بەیانییەکەی زوو لە خەو رابووین. قەدپاڵ و قەدپاڵی بناری قەندیل لە پشتی قەڵاتوکانەوە، ئاودیوی هەورازی رمکانمان کرد. شەوێ بە درەنگی بەرانبەر لووتکەکانی ماخۆبزنان، نزیکی سەرجادەی کۆمتان، کە زۆر نەبوو ئەو ئۆردوگایەی سەربازی ڕژێم ئەو دەڤەرەی چۆڵ کردبوو. هەتا بەیانی لە پەنا ئاگردانی پێشمەرگەکانی وەک عەزەی داودی و ئەحمەد مەولوود و ئەوانی دیکەوە، سەرمای تووشی ئەو کوێستانەمان لە خۆ رەواندەوە. سبەینەکەی بەدوای نان و چای خواردن. مەفرەزەکەی محمەدی کاک هەمزەی لێمان جیا بوونەوە، بەرەو لووتکەکانی ماخۆبزنان کێڵبوونەوە و بۆ دۆڵەڕەقە گەڕانەوە. ئەوانی دیکەش هەموو بەدوای یەکەوە، جادە و جادە هەتا گوندی بەردگرتکە خۆمان

نەگرتەوە. بەڵام لەو ڕێگایەدا بارانی بە ڕێژنە لە تەڕبوون هێرەی پێکردین. لە ڕێگا تووشی مەفرەزەیەکی دیکەی پێشمەرگەکانی کەرتەکەی ئەحمەد مەولوود هاتین. کە بە چاوەڕوانی فەرماندەکەیان لەو گوندە چۆڵانەی باڵەییان دەسوڕانەوە. کە ئەو دەمی لەو گوندانەدا، تاقولۆق خەڵک بۆ سەر باغ و ڕەزەکانیان گەڕابوونەوە. بە شێوەیەکی کاتی خانووی لە شێوەی کۆلیتیان پێکەوە نابوو. چونکو ناوچەکە بە فەرمانی ڕژێم ناوچەی یاساغ بوو. لە بیرمە لەناو ئەو مەفرەزەیەدا، ژنێکی چەک بە شانی دەوروبەری چڵ ساڵی هەبوو، شان بەشانی کوڕەکەی _ حاجی _ لە کەرتەکەی ئەحمەد مەولوود پێشمەرگە بوون. ناوی ئەو ژنە سەربڵندە ملازم حەلیم بوو، کە خۆی لە کاروباری پێشمەرگەیی نە دەبوارد. وەک هەر پێشمەرگەیەکی ئاسایی، لە حەرسیات و کەمین دەرچوون و خەفارەتی خواردن ئامادەکردن بەشدار بوو. بۆ ئەزی نیمەنی ئەو ژنە پێشمەرگەیە، دڵخۆشکەر و مایەی شانازی پێوەکردن بوو، کە لەو شاخەدا ژنە پێشمەرگەی تاکوتەرا هەبوون، لەگەڵ مەفرەزەکانی پێشمەرگە و لە ناوچەکان دەسوڕانەوە.

تێکڕای مەفرەزەکەی خۆمان، ئەوانەی لە سەرکردایەتی یەکمان گرتبوو. چەند ڕۆژێک لە گوندەکانی دۆڵی خانەقا سوڕاینەوە، ئەو نامە و پۆستەی هەرێمم تەسلیم بە قادر خەبات و حەسەن کوێستانی کرد. من چەند جارێک لەگەڵ هاوڕێیەکانی کۆمەڵە دانیشتم و بە یەکەوە باسوخواسی زۆرمان کرد. کە بۆ بەندە سەرەتایەکی نوێ بوو، لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەی کۆمەڵە یەکتر بناسین. هەتا سەرمان لە گوندی کەلێتەی بناری چیای کارۆخ دا، کە ئەو ڕۆژە لەوێ لەسەر گرفتێکی کۆمەڵایەتی، پێشمەرگەیەکی جەربەزەی هەرێمی حەوت، لە ناکۆکییەکی کۆمەڵایەتیی لەگەڵ دوو هاوڵاتی دیکە، گیانیان لەدەست دابوو. بە هاوکاری قادر خەباتی ئامر هەرێم و حەسەن کوێستانی، و بەتایبەتی کۆشش و ماندوبوونی حاکم پێشڕەو کۆیی، لە شانی هەوڵی هەمووان، جێگای بەرچاو بوو، بۆ ئەوەی ئەو کێشەیە گەشە نەکات و گوندەکە چۆڵ نەبێت، مەسلەتییەکە کرا. بۆ ڕۆژی دوایی هەر بەبناری شاخەکەوە، گوندی دەرگەڵەمان بەسەرکردەوە. من یەکسەر ماڵی ئەو خوشکەی مامۆستا یوسف دەرگەڵەیی، هاوڕێی ریزەکانی ڕێکخستنی ناو شاری کۆمەڵە و ڕۆڵەی جەربەزەی ڕۆژانی تەنگانەم سۆراخ کرد کە عومەر و سالم_ی کوڕیان، لەڕۆژانی خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی لە هەولێر دۆست و ناسیاوم بوون. لەو ماڵە هەژارە رووتەڵەیە، زۆریان خزمەت کردین. کە زانییان بۆ شەوەکەی لەو گوندە

دەمینێنەوە، گلیاندابینەوە و هەتا جلوبەرگی بەرمانیان بۆ شوشتین و خۆشمان لە گەرماوە کوردەوارییەکەیان شوشت. بۆ سبەینێ جلە شوراوە وشکبووەکانی خۆمان لەبەر کرد. کە ئەز و ئازاد و ئیسماعیل بەیەکەوە بووین. لە بیرمە ئەو رۆژە سالم و عومەر لە ماڵ نەبوون، بەڵام خەبات وەک خورتێکی هەرزەکار، تازە باڵای دەکرد، کە زانی من هاوڕێی مامۆستا یوسفم، زۆرتر هۆگرمان بوو. هەر سبەینەکەی لەگەڵ ئەو سەردانێکی قوتابخانەی گوندەکەم کرد. لە نزیکەوە لەگەڵ مامۆستاکان ئاشنای یەکتر بووین. مامۆستا خەلیل دەرگەلەیی زۆر بە لوتف و دۆستانە وەریگرتینەوە، کە پێشتر لە شاری هەولێریش، بە هۆی چاپخانەکەی مام وەسمان لەبن قەڵاتی هەولێر، تەنیشت چاپخانەکەی مام گیومۆکریانی یەکترمان دیتبوو. بۆ بەرەبەری نیوەڕۆ کە گەڕاینەوە، لای مزگەوت و لەگەڵ پێشمەرگەکانی دیکە، مرومۆی گەڕانەوەی دۆڵی خانەقامان دەکرد. پیاوی سەربڵندی ناوچەکە، جەلال بەگ لێمان هاتە پێشەوە و گوتی بۆ نیوەڕۆ بیر لە رۆیشتن مەکەنەوە، لە ماڵی ئێمە خواردنمان بۆ هەمووتان بە رادان داوە. ئەوە بوو لەو دەرفەتیەوە، لەگەڵ ئەو مرۆڤە چاوتێرە بووم بە ئاشنا و هەر کاتێک سەردان، یاخود بەو گوندەدا تیپەڕیمایە، سەردانم دەکرد و لە زۆر لایەنەوە، هەست و نەستی کوردانەی یەکتریمان دەخوێندەوە. هەروەها لەگەڵ کوڕەکانی ناوبراو، بەتایبەت حازم و حمدامین ئالان، پەیوەندی کردنیان بە کۆمەڵەوە، بەرجەستەتر رێچکەی بەست.

درەنگی ئێوارێ بە رێگای زینوی نێوان گوندی کەلێتە و وەرتێدا. خۆمان گەیاندە گەڕەکی بەرۆژی گوندی وەرتێ. ماوەیەک بوو مەخفەری پۆلیسی حکومەت لەو گوندە بوو. بۆ بەیانی زوو، بنارەو بناری شاخەکە و بە کوێستانی مەکێدا، خۆمان گەیاندە زینوی ئەستێرۆکان و بۆ بەرەبەری نیوەڕۆ گەیاندمانە گوندی پڵنگان. ماوەی هەفتەیەک لە دۆڵەڕەقە، گوند بە گوند، بنکە بە بنکەی هێزی پێشمەرگەمان بەسەرکردەوە. لەوێ رۆژان هەبوونی مەفرەزەیەکی دیکەی یەکێتی، بە لێپسراوی عبدالرحیم سەنگەسەری و فەقێ بایزم قۆستەوە. کە یارمەتیم بدەن بۆ پەڕینەوە، بۆ بەری بناری کۆسرەت، لەپێناوی سەردانی قوەتەکەی هێزی پێشمەرگەی کۆیە. کە بنکەیان لە گوندی خدرانی بناری شاخی کۆسرەت بوو. ئەو هاوڕێیانە بەوپەڕی گیانی لەخۆبوردوانە بەپیر داواکەمەوە هاتن. ئێوارەیەکی درەنگ گەرەکمان بوو بە دەشتی بتوێن دا، بە کلکەی داری قەمتەراندا بپەڕینەوە. بەڵام لە تاریکایی شەودا، لەسەر جادەی گوندی

سەروچاوەدا، مەفرەزەیەکی لقی یەکێتی نیشتمانی لە ناوچەکە، بە لێپسراوەی رەشۆی کێخوا رەسولی بێتواتە، کەوتبوونە کەمینی جاش و سەربازی رژێمەوە، ناچار ئێمە بۆ ئەو شەوە گەڕاینەوە. سبەی شەو لە رێگای دۆستێکی هاوڕێیان عبدالرحیم و فەقی بایز، رێگای پەڕینەوەمان بۆ ناوگوندی گردجان بردەوە و برادەران لەو گوندە بە تراکتۆر ئێمەیان لەو چەمەی بەردەممان پەڕاندەوە.

لە بەرەبەیانێکی زوو بەسەر بنکەی پێشمەرگەکانی قوەتی کۆیە لە گوندی خدران وەربووین. بێجگە لە پاسەوان، برادەرانی دیکەی وەک حەمیدی کەریم شانەمان لە خەو بێدار کردەوە و بە دیداری یەکتر شاد بووینەوە. کە ساڵانێک بوو، بە هۆی کەوتنە زیندانی یەکترمان نەدیتبوو. حەمید بە دەست و برد پێشوازی لێمان کرد و ئێمەی هەموو بردەوە ناو ماڵەکەی خۆی، ژن و منداڵەکانی ناردە ماڵە دراوسێیەکیان. هەتا پێش نیوەڕۆ بە خەوتن و حەسانەوەیەکی باش، پشوومان هاتەوە بەرێ. کە شەوەکەی سەرباری ئەو سەرچڵییەی کردبومان، لە هیچ شوێنێک ماندوبوونمان نەڕەواندبوەوە.

لە بیرمە کە لە جێگاکەم راستبوومەوە، یەکسەر بۆ دەموچاو شوشتن چوومە دەرەوە. سەیرم کرد حەمید شانە، بە دەموچاوێکی گەشەوە لەسەربانەکە خەریکی پیاسەکردنە. دوای ئاو بە دەموچاو داکردن، منیش بۆ سەربانەکە سەرکەتم، ئەو نامە و پۆستانەی لە مەکتەبی عەسکەری و ناوەندی کۆمەڵە و برادەران بۆیم هێنابوو، رادەستم کردن. پێش ئەوەی ئەو پۆستانە بخوێنێتەوە، گوتی: دەزانی لە فرسەتێکی زۆر گونجاو گەیشتنە ئێرە.. ئەو وای دەزانی ئەو مەفرەزەیەی عبدالرحیم لە شانی منەوەن..! کە بۆم روون کردەوە، ئەوان تەنیا بۆ گەیاندنی بەندە پەڕیونەتەوە و رەنگبێ هەر بەیانی بۆ دۆڵەرەقە بگەڕێنەوە. من تەنیا خۆم و ئازاد کاوانین. سەیرم کرد وەک ئاوی ساردی پێدا کرابێت، ئاوا رەنگی گۆڕا. دواتر کە هەتا نامە و پۆستەکەی خۆی خوێندەوە، هاوڕێیانی دیکەش لە خەو بێدار بوونەوە و لە سەربانەکە لە یەکتر گردبووینەوە. ئەوجا حەمید باسی ئەوەی کرد کە لەو دوو کەرتەی فەرج و مەندە بەرێوەی دەبەن لەناو قوەتەکەی کۆیە، هیچ ئیلتزامێک بەو ناکەن و بگرە سەرگرانن بە مەسول بوونی ئەو بۆ ئەوان. هەروەها ئێستا فەرەج لەو گوندەیە و دەتوانن قسەی لەگەڵ بکەن، بەتایبەت سەبارەت بە دەست بەسەرکردنی کادرێکی کۆمەڵە، واتە ش. ح. کۆیی..!

من هەر واقم ورِما..! باشە لەسەرچی ! بە شپرزەیی وەڵامی داینەوە، گوایە بە بیانوی دەستدرێژی کردنی کۆمەڵایەتی چەکیان کردووە و گەرەکیانە بە سزای قورسی بگەیەنن..! لێرەدا پێشنیارم بە عبدالرحیم و مەفرەزەکەی کرد، کە هەندێک خۆیان درەنگ بخەن و لە رۆیشتن پەلە نەکەن و هاورێیانە رازی بوون. ئەوە بوو سەرچڵانە و بەبێ ئەوەی گوێ بە هیچ مەترسییەک بدەم. تەنیا ئازاد کاوانی لەدوور بەدووریم، بە تەنیا چووم لەگەڵ فەرج کەوتمە قسەکردن، بە ناوی سەرکردایەتی کۆمەڵەوە، بۆ ناوەندی کۆمەڵە داوەتی خۆی و مەندەم پێشکەش کرد. کە کۆمەڵە بە نیازە لەو نزیکانە کۆنفرانسی یەکەمی خۆی ببەستێ و هەروەها پێشنیارم پێ کرد، کە هەموو قوەتەکەیان بەیەکەوە، جەولەیەکی ناوچەکانی خۆشناوەتی بکەین و لەگەڵ ئەو هێزەی بەسەرپەرشتی سەیدکەریم لە ناوچەکەن یەکتری بگرینەوە. فەرەج زۆر لەوە نیگەران بوو، کە سەید کەریم هەرەشەی بۆ ناردوە. من لە لای خۆمەوە هەوڵم لەگەڵ دا، کە ئەوانە هەر قسەوقسەلۆکن و باوەڕیان پێ نەکات. لەو بارەوە فەرەج کە بەراستی خورتێکی گورج و دەستوقامێکی ئازایانەی پێوە دیار بوو. ئەوەندەی لەگەڵ من دەدوا، تفەنگەکەی لەناو گۆلمی گرتبوو. رەخنەم لێ گرت و بە پێکەنینەوە تفەنگەکەی لە شان کرد و هاتە سەر بیانوو هێنانەوە بۆ نا شایستەیی مەسولی یەکەمی قوەتەکەی کۆیە و رەخنەی توندی هەبوو. بەندە بە لەسەرخۆیی و بە راشکاوی وەڵامم دایەوە. کە ئەو هاورێ حەمیدی مەسولی یەکەمی قووەتەکە، یەکێک لە مرۆڤە تێکۆشەرە ئازاکانی ناوچەکە و رۆڵەیەکی جەربەزەی خەباتی نەپساوەی هاورێیەکانی کۆمەڵەیە. چەندان ساڵان تاڵ و تفتی زیندانی چەشتوە و حەق وایە ریزی لێ بگیری و لەلایەن کەسانی شارەزای پێشمەرگایەتی وەک تۆ و مەندە، دەبی هاوکاری بکرێ. چونکە وەک دەیبینم، ئێوە خۆتان مەسولی مەیدانین. هەر ئەوەندە بەڵێنی دا.. کە دەگەرێتەوە ناوچەکانی کۆیە و مەندە و مەفرەزەکەی دەدۆزێتەوە و بە یەکەوە لەدەمی گەیشتنەوەی مام جەلال دەگەنە بنکەکانی سەرکردایەتی. ئەگەر مەندە رازی بێت، بۆ بەشداریکردنی کۆنفرانسی کۆمەڵە ئاگادارمان دەکەنەوە. پاشان هاتینە سەر باسی ش. ح، سەرەتا زۆر گرژ بوو، لەسەر قسەکانی خۆی سوور بوو، بەڵام دواتر لە ئەنجامی حەفت و هەشتێکی درێژدادڕەوە کە من باسی ـش ـ یم بۆ گێڕایەوە، لەوەی یەکێک بووە لەو خوێندکارە چاونەترسانەی زانکۆی مووسڵ و لەگەڵ چەندان خوێندکاری دیکەی کچ وکوڕ هەمان زانکۆ، لەوێ رۆژانی

تەنگانەدا، لەخۆبوردوانە لە رێگای رێکخستنەکانی کۆمەڵە لە ناو شاری هەولێردا پەیوەندیان بە شاخەوە کردووە. قەناعەتی کرد بەوەی _ش_ خۆی و تفەنگەکەی تەسلیم بە من بکرێتەوە. ئەویش راپۆرتی خۆی بۆ سەرکردایەتی بنووسی و بڕیاری یەکجارەکی لەو بارەوە، بۆ سەرکردایەتی به جێبهێلین.

بۆ هەندێ باسوخواسی رێکخراوەیی من زۆرم گوت، ئەو کەمی بیست و بە نادڵی سەری بۆ مەسەلەکان دەلەقاند. بەڵام هەرگیز سەری نەهێنا بەرێ بۆ بە مەسول زانینی حەمید کەریم شانە و بۆ هاتنە خۆشناوەتی لەگەڵ ئێمەدا. بە شێوەیەکی سارد ماڵئاواییمان لە یەکتری کرد. جارێکی دیکە یەکترمان نەدیتەوە و ئەو شەهید بوو. بۆ رۆژی دواتر هەموو مەفرەزەکان، هەر یەکە بە لایەک بڵاوبوونەوە، فەرەج و ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵی بوون، بەرەو ناوچەکانی کۆیە کێڵبوونەوە، عبدالرحیم و مەفرەزەکەی گەڕانەوە شوێنی خۆیان، من و مەفرەزەکەی حەمیدی کەریم شانە کە دەوری هەشت پێشمەرگەیەک دەبوون، بە یەکەوە لەبەرانبەر داری قەمتەرانی، بە کەناری پردی ئیزۆپ دا، بۆ شەوەکەی خۆمان گەیاندە دۆڵی ئەسحابانی بەردەمی سماقوڵی گەری. لە گوندی سماقوڵی سەروچاو، لە دیوەخانەکەی کێخوا عەبدە، لەگەڵ هاوڕێیان سەید کەریم و ئەوانی دیکە یەکترمان گرتەوە. بۆ یەکەمجار لەو ماڵە، بە دیداری حەمە توفیق رەحیم گەیشتم. کەڕاوەیەک بوو لەوڵاتی فەرەنسا گەڕابوەوە. مرۆڤێکی گران و سەنگین، رەوشت بەرز و بە مەعریفە بوو. لەگەڵ ژیانی پێشمەرگایەتی تا بڵێی سادە و خاکی بوو. نامە و پۆستی سەرکردایەتیم تەسلیم بە سەید کەریم کرد و سەربردەی ئەو جەولەیەی بناری شاخی کۆسرەت و دیدار لەگەڵ فەرەج کۆیی و گفتوگۆی نێوانمان و باسەکەی _ش _ م بۆ سەید گێڕایەوە.

لە بیرمە بۆ یەکەمجار لەگەڵ کێخوا عەبدە، یاری شەترەنجم کرد، دیار بوو شەترەنجی باش نەدەزانی، بە ئاسانی لێم بردەوە. ئەو دەمە لە یاری شەترەنج خراپ نەبووم و هاوڕێیان زۆریان پێ خۆش بوو. لەو ماوە کورتەدا لەگەڵ هاوڕێیانی پێشمەرگە نێوانمان گەرموگوڕ بوو، بە تایبەت لەگەڵ سەید کەریم دۆستانە بوو، لە هەموو وردودرشتێک پرس و رامان بە یەکتر دەکرد

## بانگی سکرتێری کۆمەڵە و خۆگەیاندنە دۆڵی شاورێ

ماوەیەک بوو لە پاییزی ساڵی ١٩٨١دا، چەندان لەو پێشمەرگانەی قووەتەکەی دەشتی هەولێر، کە لە شانی ئەو هێزەی لەگەڵ سەید کەریم بوون. سەریان کردبووە سەرم، تاکو سەید کەریم قەناعەت پێ بکەم، هەموو هێزەکە پێکەوە جەولەیەکی دەڤەری بەستی شەرغە لە دەشتی هەولێر بکەین.

یەکەمجار سەید گفتی ئەوەی دا. هەفتەی داهاتوو هەموومان ئەو جەولەیە بەیەکەوە دەکەین. دوایی دیار بوو کەرتەکەی ئازاد خۆشناو بۆ جەولەی دەشتی هەولێر سەرگران بوون. تارادەیەک سەید کەریمیش لە پرتە و بۆڵەیان گەیشتبوو. پێشنیاری ئەوەی بۆ ئەزی کرد کە لەجیاتی ئەویش بۆ ئەو جەولەیە لەگەڵ پێشمەرگەکان بچم.

ئێمە ئەو مەفرەزەیە کە ڕێباز _ ڕەفعەت عبداللە_ یش تازە لەناو حسک سەرلەنوێ بۆ ڕێزەکانی ینک گەڕابووەوە. بەگەر ئەو مەفرەزە کەوت. ڕێباز کادرێکی سەرەتایی خەباتی پێشمەرگەیی هاوڕێیانی کۆمەڵە بوو. یەکێک بوو لەو ئەندامانەی ڕێکخستنەکانی ناو شاری هەولێر. لە شانی چەند هاوڕێیەکی دیکە بەر شاڵاوی گرتنی ساڵی ١٩٧٧ نەکەوتبوو. لەگەڵ چەندانی وەک عەلی سالح، شاخەوان، محمد عەجەم، م.سەردار،، ئەریمان، سامی.. هتد پەیوەندیێان بە مەفرەزە سەرەتاییەکانی یەکێتی لە ناوچەکانی هەولێر کردبوو. دواتر ڕێباز بە هۆی ناتەبایی لەگەڵ ئەو برادەرانەی کۆمەڵەی ناو مەفرەزەکانی ینک لە ناوچەکەدا. بۆ ماوەیەک بۆ لای حسک سەنگەر گۆڕی کردبوو. بۆ مێژوو ڕێباز نەیارێکی سەرسەختی شەڕی کوردکوژی ناوخۆیی و ناکۆکی لاوەکی بوو. کەچی هەر لەو جۆرە شەڕە نگریسەدا تیرۆر کرا.

لەو جەولەیەدا، زۆربەی کات ڕێباز شان بە شانی قاسم کرێکاری بوو. ڕۆژێکیان لەسەر داوای عەلی سالحی مەسول عەسکەری هێزەکەمان، بۆ سێ مەفرەزە لە یەکتری جیا بووینەوە. عەلی سالح خۆی و دەستەیەک پێشمەرگە بەرەو گوندەکانی دەوروبەری ئاڵتون کۆپری _ پردێ _ بۆ دەستوەشاندنی شۆڕشگێڕانە ڕۆیشتن. دەستەی دووەم هاوڕێ کاوە و ئەحمەد قەمبەری بۆ دەوروبەری رووباری کۆیە و تەقتەق بە ڕێ کەوتن.

ئەو هەشت پێشمەرگەی مابووینەوە، زۆربەمان نە شارەزا و لە پێشمەرگایەتی کەمئەزموون بوون. ڕێباز لە هەمووان زیاتر شارەزای ناوچەکە و ئاشنای بارودۆخی ناخۆشی ئەو دەمی پێشمەرگایەتی بوو. لە نێوان گوندەکانی بایزاغا و بانیماران، بەردبڕ

و بەڵەبان، نێرەگین و قەمبەر و هەڵەت و پەڵەتەکانی ئەو ئاقارانەی ڕۆژئاوای وڵاتی کۆیە دەسوڕاینەوە. ئێوارەیەکی درەنگ کە لە شوێنی ئیختفای ڕۆژ بەرەو گوندی قەمبەر ڕێگامان گرتبوو. ڕێباز و قاسم نێرەگینی هاتنە تەکمەوە و قەناعەتیان پێ کردم. هەردووکیان بەو شەوە بەرەو گوندی سێکانی و ئاوماڵ بە تەنیا جیا بوونەوە. ئیتر ئێمە ئەو شەش پێشمەرگەیە.. هوشیار کەریم، حاکم قاسم، ئەز، سابری کوڕە خەزوری سابر ڕەسول، م.زیرەک، م. ڕۆستەم سەرمان پێکەوە نا. دیارە ڕێباز و قاسم هاتنەوە لای ئێمەیان بۆ ڕۆژی پێش یەکگرتنەوەی هەموو مەفرەزەکان، بردەوە گوندی نێرەگین کە شەوەکەی لە ماڵی مەلا محمەدی نێرەگین یەکتری دەگرینەوە.

ئەوەبوو ئێمە بەو شارەزاییە سەرەتاییەی لەو گوندانە پەیدامان کردبوو. ئەو چەند ڕۆژەمان بە ڕۆژ لە چۆلەوانی و بە خۆشاردنەوە بەسەر دەبرد. تاکو بۆ ئێوارەیەک کە پێشتر بریار بوو، هەندێ نامە و پارەم بۆ بگاتە ماڵی دایکی فاروقی عەلی مەولوود لە گوندی بانیماران. فاروق بە خۆی لەگەڵ مەفرەزەکەی ئەحمەد قەمبەر ڕۆیشتبوو. هەتا ئێوارەیەکی درەنگ هەر شەشمان لەو ماڵە ماینەوە و کەلوپەلەکانم بەدەست گەیشت، کە کوڕە خاڵەکەی فاروقی سەیارەی پیکابی هاتوچۆی شاری هەولێری هەبوو، بە سوپاسەوە بۆی هێنابووم. بۆ شەوەکەیش هەر براکانی فاروق ژوورێکی لاچەپیان بۆ دۆزینەوە، کە هەتا بەرەبەیان لەوێ بە حەرسیات ماینەوە. تومەز هۆدەکە خۆی قشپلدان بوو، بۆنی قشپل دادی پێ کردین. بەدوای دانانی لیستەی پاسەوانی کە لەلایەن هوشیار کەریم دانرا. ناوی من کەوتبووە دوو سەعاتی پێش دوا پێشمەرگەوە کە هەر هوشیار خۆی بوو. بە گیانێکی لە خۆ وەڕس بوو بۆ پاسەوانی چوومە دەرەوە.

ڕاستە دنیا سارد و سڕ بوو، ورشە ورشی بایەکی سارد ئەو ناوەی دەکێڵا. باو و گەردەلوولەکە تا دەهات بە هەڕوگیفتر خۆی بە دار و دیواردا دەدا. هەر لە لوورەلووری دوور و نزیکی ڕەوە گورگێکی برسی دەوروبەری مێگەلە مەڕی شەوینی دەچوو. بە خۆم و تفەنگی دەستم کە وەک چۆڵەکەی بەر باران هەڵدەڵەرزیم. چەقەچەقی ددانی خۆم لە پەنا سواندەی خانووەکە دەبیستەوە. بە ڕاستی سەربازی ئەوەی چاویلکەکەی چاوم پاک دەکردەوە، تاکو باشتر ئەو گردۆڵکەی لای پێشەوەی گوندەکە ببێنم. چونکو وەک ئەوەی چاوم ڕەشکەوپێشکەی بکات، دیدم لەو دوورەوە هەستی بە جولەی تارمایی مرۆڤ

دەکرد. کە لە دەوروبەری تەپکە شاخەکانی پەنا گردەکەوە سێبەریان وەک جۆلّلانە دەهات و دەچوو.

وەختێ پاسەوانییەکەم بە تەمبەڵییەکی پڕ لە خەوالویی بەسەر برد و لە دەمی رادەستکردنی پاسەوانی دوای خۆم دابووم. دیتمان یەکێک بە پەنادزە گەیشتە لامان. یەک پاشۆل نان و پێخۆریشی هینابوو. بە چرپە هۆشداری داینێ کە زوو خۆمان کۆکەینەوە. گوایە کۆمەڵێک چەکدار لەو گردۆلکانەی بەرانبەرمان دامەزراون. رەنگبێ تاوێکی دیکە پەلامارتان بدەن. بەبێ ئەوەی بە ناسنامەی یەکتر بزانین..! بەبێ ئەوەی بزانین ئەوانە دوژمنن یاخود پێشمەرگەی هێزەکانی حسکن کە خۆیان بۆ لوقمەیەکی ئاسان دانوساندوە. ئەو پیاوە ئامۆژگاری کردین زوو بەخۆ کەوین و گوتی: من هەتا ئاقاری پشتەوەی گوندی بەرێتان دەکەم.

بلەز پێشمەرگەکانی دیکەمان بێدار کردەوە. هەموو بە خاو و خلیچی خۆیان پێچایەوە. بە تەنگەتاوی بەدوای ئەو نەناسراوە کەوتین. دیار بوو شوانەکەی ماڵی خاڵی فاروقی بوو، ئێوارە تا درەنگ لە لامان دانیشتبوو. لە شەوینی ناو مەڕ و بزنەکانییەوە وەک خۆی گوتی، زەلامە چەکدارەکانی سەرگردەکەی بە دی کردبوو. ئەو ئینسانە سادە و دڵپاکە سەرباری فریاکەوتنمان و بێ گوێدانە هەر جۆرە مەترسییەک، ئێمەی هەتا بەردەم ئەو لوولە شاخە سەرکراوە برد. کە بە ئاقاری کەندولەندان تێکەڵ دەبوو. بەحەق شوێنی ئیختیفا و خۆشاردنەوەی مەفرەزەی گەورەی تێدا دەبوەوە. شوانەکە ئێمەی گەیاندە ئەو شوێنەوە و دڵنیای کردینەوە کە تازە کەس پێتان نازانی و هیچ چەکدارێکیش جەسارەت ناکات لێرە . پەلامارتان بدات. ئەو خواردنەی هێنابووی بۆمانی بەجێیهێشت و گەڕایەوە. ئێمەش هەموو بە حەپەساوی و ترس و شپرزەیی، بەبێ دەنگی هەر یەکە بەشی خۆمان لە خۆراکەکە هەڵگرت و یەک یەک و بە مەودای کورت، بۆ قووڵایی ئەو هەڵەتە پەرتوبڵاوە بەدوای یەکتری کەوتین. دوو سەعات زۆرتر دوورکەوتینەوە. ئەوجا لە پەنا سێبەری گەوەڕە کەندەلانێک ئۆقرەمان گرت و حەساینەوە. لێرەدا بەدوای نانخواردنی ئەو چێشتەنگاوە، ئەو نامە و پۆستانەم کردەوە، کە لە شارەوە بۆم هاتبوو. نامەیەکی کورتی رێکخستنی شاری تێدابوو، کە بۆ ئەزی نووسرابوو. تاکو هەموو پێشمەرگەکانی هێزەکە بە زوویی کۆ بکەینەوە و بگەینەوە لای

سەید کەریم و بەیەکەوە بۆ فلانە ڕۆژ ڕوو لە دۆڵی شاوڕێ بکەین. کە نەوشیروان چاوەڕوانمان دەکات

بەدوای یەک دوو ڕۆژان، هەموو پێشمەرگەکان لە شەوێکی ئەنگوستەچاوی سارد و سەرمادا، لە پەنایەکی سەر جادەی کۆیە _ هەولێر پەڕینەوە. بۆ ڕۆژی دوایی بەبێ راوەستان لە تاریکایی شەو گەیشتینە گوندی سکتان. بەدەم پشوودانێکی حەسانەوەی کورت و نانخواردنێکی خێرا سەرلەنوێ ملی ڕێگامان گرتەوە. گوند بە گوند بەدوای سۆراخی برادەران، بەرەبەیانی شەوی دواتر خۆمان لە گوندی شێخوەسانان دیتەوە. کە سەید کەریم و هێزەکە لەوێ بوون. بەڵام سەید خۆی بۆ ڕاوی چوو بووە شاخی دەرەداری و هەتا عەسرێکی درەنگ نەگەڕایەوە. بەدوای یەکتر دیتن و چاکوچۆنی. ئەو نامەی شارم بە سەید نیشاندا و گوتی: لە ڕێگای هەرێمی حەوتیشەوە بە هەمان ناوەڕۆکی ئەوەی دەبێ بۆ فلانە بەروار هەموو هێزەکە بگەنە دۆڵی شاوڕی _ گوندی گوڵان _ هاتوە و نەوشیروان لەوێ چاوەڕوانە. دوای هەندێ قسەوباس لەسەر بارودۆخەکە و ئەو هاتنەخوارەوە کتوپڕەی نەوشیروان بۆ ئەو ناوچەیە جێگای پرسیار بوو. لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی دەشتی هەولێر لە پێشەوە بەڕێ کەوتین. بنارە و بنار بە گوندی زێوە _وە بۆ سبەی شەو خۆمان گەیاندە گوندی _هەرتەل _ ی بەردەمی دەرەهەرتەلی ڕێچکەی بەرەو کوێستانی ساوسیوکان لەسەر تۆقەرەی زنجیرە چیای کارۆخ. بە مەبەستی ئاودیوبوونە دۆڵی شاوڕێ. سەید کەریم و ئەوانەی دەوروبەری بە لای گوندی وەرێدا ڕێگایان گرت. بە مەبەستی هێنانی مەفرەزەکەی کەیفی بەگی وەرێ، کە تازە لەناو _ حسک _ ـەوە بۆ ناو هێزی پێشمەرگەی _ ینک _ گەڕابوەوە و وەک مۆڵەت لە گوندەکەی خۆیان بوو، کە لە پەنا شاخی شیشار بوو. سەرباری ماندووبوونێکی زۆر، ئەو مەفرەزەی دەشتی هەولێر بە دڵسۆزی و هیمەتێکی ورەپرۆکێن، ڕێچکۆکەی ناو شاخ و داخان. بۆ درەنگی شەوێ لە مزگەوتی گوندی هەرتەل لەگەڵ هێزەکەی دیکە یەکترمان گرتەوە. زۆربەی پێشمەرگەکان لەبەر مەترسی هێرشی جاشی ناوچەکە، بە هەر چوار ئالیی گوندەکە دابەش ببوون. بەو شەوە لەگەڵ سەید کەریم لە سەربانی مزگەوتەکە بەدەم پیاسەکردنەوە، باسی ئەوەم بۆ سەید کرد کە ئەگەر یەکێکی شارەزای گوندی لەگەڵ خۆمان بەرین و لە فرسەتی تاریکە شەو، کە بەردەوام تەمتومان لەو وەرزەدا ئەو شاخە دادەپۆشی، لە دووری دوو مەتر چاو چاوی نابینی و من ساڵی

١٩٧٤ پێیدا ڕۆیشتووم. دەکارین هەر بە ڕێچکەی سەرتۆقەرەی چیای ماکۆک بۆ گوندی _گوڵان _ ی دۆڵی شاوریی شۆڕبکەینەوە. چونکو بە هۆی بڕینی ڕێگای زۆر و بە دەرە هەرتەل و سەرکەوتنە سەر ساوسێوکان و سوڕانەوە بۆ دۆڵی شاوریێ زۆر دوور دەکەوینەوە و کاتی زۆرمان دەڕوات. سەید ئەو پێشنیارەی منی پێ باش بوو. ڕێگاکە قەد بڕیوو، بەڵام بۆ ئەویێ ڕۆژێ موجازەفەیەکی سەرگەرمانە بوو. ئەو زنجیرە شاخە بە تەپکە و مۆڵگای سەربازی ڕژێم تەنرابوو. ئەوە بوو دۆستێکی شارەزا لەو گوندە سەعات دووی شەو، بەدوای دانانی نهێنی شەو و مەترسی لەیەکدابڕان. هەموو هێزەکە وەک دەسرازەیەکی بە یەکەوە بەستراو، یەک بەدوای یەکەوە ریزمان گرت و هەتا دەمی سەرکەوتنە سەر شاخی ماکۆک ئێمە لە دواوەی هێزەکە دەڕۆیشتین. من لەو جۆرە هەوراز بەسەرکەوتنانەدا، هەمیشە گۆچانێکم بەدەستەوە بوو. لە ڕێگادا سەیرم کرد، پێشمەرگەیەکی بێچەک پەکی کەوتووە. ناچار گۆچانەکەی خۆم دایە دەستی و کە بە وردی تەماشام کرد. کورە خۆ ئەوە سەلاح حمدامینە کە دواتر لەناو پێشمەرگە بە سەلاح کەمین ناسرا. بەڵام بواری ئەوە نەبوو بەو شەوە یەکتر بدوێنین. پێشمەرگەکانم ڕاسپارد کە ئاگایان لێی بێت و بەجێی نەهێڵن. چونکو لێرە و لەوێی شاخەکە بە کەناری تەپکەی سەربازی ڕژێمدا تێدەپەڕین. ئەو دۆستەی گوندی لەسەر شاخەکەوە ڕێچکەی شۆڕبوونەوەی بۆسەر گوندی گوڵانی دۆڵی شاوری بۆ دەستنیشان کردین و خۆی گەڕایەوە. ئێستاش لە بیرم نەچووتەوە یەکەم دەستەی پێشمەرگە کە بە خێرایی بەو هەڵدێرە شۆڕبووینەوە، هاوڕێیان عەلی سالح، ئەحمەد قەمبەری، ڕێباز، م بەکر، بەندە، مەلاغەفور، حەمەتۆفیق بوو. بە لۆقە لۆق سەرەولێژ گلۆربووینەوە. پێش ئەوەی خانووەکانی گوندی لە سێرەی چاومان دەرکەون. لەسەر تەپۆلکە هەڵدێرێکەوە ئاوڕمدایەوە و دیتم بەدوای قەتارەی ئاودیوبوونی کاروانی پێشمەرگەکانەوە، تەمتومانەکە وەک شەپۆلی سەر ئاوی مەنگ، بەدوای گومبوونی پێشمەرگەکان لە سێرەی ڕەبایەکانی دوژمن، لچکەکانی پەردەی شۆڕبوەوەی خۆی کۆدەکاتەوە و ڕوو لە ڕەوینەوە بەرەو ئاسمان بە قونەخشکێ هەڵدەکشێ و بوار بۆ ڕووناکبوونەوەی دونیا دەرەخسێنێ.

بڵند و نەوییانمان زۆر بڕی، تاکو سەعات پێنجێ بەرەبەیانی ئەو سبەینە، یەکەم دەستەی پێشمەرگە بەناو گوندی کەوتین. کە گەیشتنە نزیکی مزگەتەکەی گوندی، سەیرمان کرد نەوشیروان بە تەنیا لەسەر بانەکەیە و بەو بەیانییە پیاسە دەکات. کە

چاوی بە ئێمە کەوت، وەک ئەوەی مژدەیەکی درابێتێ، بە گەرمی بە پیرمانەوە هات و یەکە یەکەمانی لە باوەش گرت و زۆری ماندوو نەبوون لێ کردین و رووی لە من گوتی: حاجی مەمۆ بەراستی بەم گەیشتنە بە دەستوبردەتان لە ناوچەکانی هەولێرەوە دڵتان خۆش کردم. ئەگەر ئەمڕۆ هەتا ئێوارە نەگەیشتنایە ئێرە، ئەوە بۆ شەو من لێرە رۆیشتبووم و بەرەو بنکەی سەرکردایەتی ملی رێگام گرتبوو. بۆیە بۆم دەرکەوت، ئێوە ئەو کادر و پێشمەرگانە، بەڕاستی خەڵکی بە وەفا و دڵسۆزی سەر ڕاستی رۆژی تەنگانەن. مایەی ئەوەن پیاو شانازیتان پێوە بکات و هەر رۆژێک بمێنم و دەسەڵاتم هەبێت، هەتا ماوم هەر ئێوە بە رەفیقی گیانی بەگیانی خۆم دەزانم. دەبێ بە نزیکترین خەڵکی خۆمتان بخوێنمەوە!

ئێمەش هەر یەکەمان بە پێی خەملینی خۆمانەوە دڵنیامان کردەوە. کە هاوڕێیانی کۆمەڵە هەمیشە گیان لەسەردەست دەمێننەوە، بۆ بەدەنگەوە هاتن و فریاکەوتنی هاوڕێیانی خۆیان، لەپێناوی سەرکەوتن و بەرەوپێشەوە چوونی کۆمەڵە و خەباتی شۆڕشگێڕانەمان.

لە بیرمە هەتا من درێژەم بەو قسانە داو گوتم: دەزانی ئەو پێشمەرگانە، بەوپەڕی گیانبازی و لەخۆبردەیی، لەنێوان سێ رۆژ و سێ شەواندا، سەرباری هەر جۆرە مەترسییەکی رێگا، بە پیر بانگی تۆوە خۆمان گەیاندوتە ئێرە.

ئێمە لەو قسانە دابووین، سەید کەریم و ئەوانی دیکە بەدوای یەکەوە گەیشتن. لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دەنگۆی گەیشتنی ئەو هێزەی ناوچەکانی هەولێر، سەعات بەدوای سەعات، دەورروبەری نەوشیروان قەرەباڵغ تر دەبوو.

# دەستبەسەرکردنی تۆفیق بیرێژی

ماوەیەک بوو مەفرەزەکانی یەکێتی لە ناوچەکانی خۆشناوەتی هەولێر، لابەلا بەدوای ئەوەوە بوون، سۆراغی ئەو مەفرەزەیەی تۆفیق بیرێژیان دەکرد. کە یەکێک بوو لە برایەکانی پێشمەرگەی پارتیزان _ سلێمان بیرێژی _ و سلێمان خۆی لەلایەن یەکێک لە هاوکارەکانی پێشمەرگایەتی خۆیدا _ عەولاتورگە _ وە تیرۆر کرا و تاوانکار تەسلیم بە رژێم بوەوە. ئەو مەفرەزەیەی تۆفیق، پاشماوەی هێزەکەی دەوروبەری سلێمان بوو. ئەوانەش سێوی باخەڵی خۆیان بە هەموو ئەو حیزبە نەیارانەی شاخ پیشان دەدا. بە راستی کەس نەیدەزانی خەریکی چین و چی دەکەن. تارادەیەکی زۆر بەو چەکەی دەستیانەوە، تەنیا بەسەر خەڵکەوە مێردەزمەیەک بوون. دەنا کەموزۆر تەقەیەکیان لە دوژمن نەدەکرد.

ئەو رۆژانە زۆربەی مەفرەزەکانی یەکێتی لە دۆڵی بالیسان بەسەرپەرشتی سەیدکەریم جەولەمان دەکرد. هەواڵێکیان بۆ سەید هێنابوو، کە تۆفیق بیرێژی و مەفرەزەکەی، وان لە ناو رەوەندەکانی گوندی گەرەوان و گەرەوانی دەشتی هەریرێنە. ئەوە بوو سەید تەکلیفی لەو مەفرەزەی دەشتی هەولێر بە مەسولیەتی هاوڕێ کاوە و مەفرەزەیەکی هەرێمی چواردە بەمەسولیەتی عەلی نەبی و لەشانی ئەز ئەو ئەرکە بە ئەنجام بگەیەنین.

لە ئێوارەیەکی درەنگدا، بە پەلەپروسکێ بە تەنکێشی گوندی چیوەی حاجی بەدیعییەوە، ملی سەرکەوتنە سەر _چیای هەورێ_مان گرت. لە تاریکە شەوێکی دوای نیوەی شەوێ بەسەر ماڵە رەوەندەکانی گوندی گەرەوان و گەرەوانمان دادا و یەکەیەکەی ماڵباتەکانمان لە خەو بێدار کردەوە، بەبێ ئەوەی کەسێک لەناو ئەو ماڵانەدا بدۆزینەوە.

هەر لە تاریک و روونی ئەو بەرەبەیانییەدا، پێش ئەوەی بۆ هێزەکانی رژێم لە ناوچەکە ئاشکرا بین. بەدوای وەرگرتنی ژەمەنانی بەیانی و نیوەڕۆ، رێچکەی رێگای سەرکەوتنە سەر شاخی بەنی هەریرمان گرت. چ رێگایەک، هەر ئەوەندەمان خۆش بوو هەتا سەرکەوتینە سەر تۆقەرەی شاخەکە، ئیتر کەوتینە ناو تەمومژی رووی داروبەردی سەر ئەو رێچکەی گرتبومان، بە جۆرێک لەبەر چاوماندا لووتکە بە لووتکە دەکەوتەوە. ناچار هەموو لە تەک یەکەوە دانیشتین. پشوویەکی چاکمان هاتەوە بەرێ. بەدوای قاوەڵتی

بەیانی، کە تازە گزنگی تیشکی خۆر خەریک بوو، دڕی بە تەمومژەکە دەدا، لە نزیک و دوورەوە ئاسۆمان لێ بەدیار کەوت و شاگەشکەی کردین.

لەو سەفەرە تۆفیق گەرەوانی ڕێپیشاندەرمان بوو. دیار بوو لە ڕۆژانی شۆڕشی ئەیلوول لەو ناوە پێشمەرگایەتی کردبوو. شارەزای سەر شاخەکە بوو. بەدەم هەندێک سوسەکردن بەملا و بەولادا، باریکە ڕێچکەیەکی دیتەوە. هەموومان دوو دوو بەدەم ڕۆیشتنەوە ریزمان گرت. پاش مەودایەک ڕۆیشتن، پێشمەرگەکان لە ڕێکردن سست و سستر دەبوون. تومەز کەسێکمان دڵۆپە ئاوێک لە ناو مەتارەکەیدا نەمابوو. بە هۆی ئەو ژاژی و پەنیرە وشکەی قاوەڵتی بەیانی کە بەنانی خواردبومان، ئەو ئاوەی پێمان بوو، بنمان هێنابوو. بەرادەیەک هەندێکمان لەتێنوێتیدا، زمانی بەسەر شێی سەر تاشە بەردەکان دادەهێنا، تاکو هەرهیچ نەبێت دەممان فێنک بکاتەوە.

چەند پێشمەرگەیەک پەکیان کەوتبوو. ئەوانەی لە دواوە بوون، چەک و فیشەکدانەکانی ئەوانیشیان بە کۆڵدا دابوو، بۆ بارسووکییان لەوەی بتوانن هەنگاو هەڵگرن و نەکەوینە بەر قرچەی گەرمای نیوەڕۆ. دەتوانم بڵێم ڕێگای دوو سعاتمان ، وەک تۆفیق گەرەوانی حەوزی ڕەواندوزی، دەیگوت، بە هەشت سعات بڕی. ئەوجا بە هیمەتی هەر تۆفیق خۆی، ڕێگای زینەتێرمان دۆزییەوە. بەرەبەری ئێوارە من و دوو پێشمەرگەی دیکە بەدوای تۆفیق گەیشتینە لای ئەو یەک دوو ماڵەی گوندی زینێ. ئەوە بوو دوو هێسترمان لەو ماڵانە بە ئەمانەت وەرگرت. ماڵی ئاوابێت، تۆفیق لەجیاتی ئێمەش بەدوای پێشمەرگە پەککەوتووەکان داچوو. بۆ پاش عیشایەکی درەنگ گەیشتنەوە. شەوەکەی لەو ماڵانەمان بەسەر برد، هەر لەوێش پێکەوتین کە دوێنێ شەو تۆفیق بیرێژی لە لای ئەوان بووە و بەرەبەیانی بۆ بەری بالیسان پەڕیوەتەوە. ئێمەش هەرخۆمان لەگەڵ مەفرەزەکەی سەیدکەریم لە مزگەوتی ئەو سەری گوندی بالیسان، سەر ڕێگای گوندی کانی بەرد گفتمان هەبوو.

بۆ ڕۆژی دواتر بە باریکە ڕێچکان خۆمان گەیاندە گوندی دەراشی بەرانبەر بالیسان و شەوەکەی لەناو بالیسانمان کرد. ئەوان هەواڵێکی هەبوونی تۆفیق بیرێژییان لەلا نەبوو. بەڵام بۆ ڕۆژی دواتر لە ڕێگای ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە لە بالیسان. بەوە ئاگادار کراینەوە کە ناوبراو لە خوارەوەی گوندی بالیسان لە ماڵی سەرکارێکی ئەنوەریەگی بالیسانییە. لەو دەمەش خودی سەید کەریم بەیانییەکەی زوو بۆ ڕاو چووبووە دەرەداری

پشتی گوندی شێخوەسانان. لەگەڵ عەلی نەبی و حەمەتۆفیق و خدری برای عوسمانە گچکەل و شێخ سلێمان و چەند پێشمەرگەیەکی تر، زۆر بە نهێنی لە دەمی نیوەڕۆدا، لە چەند لایەکەوە دەوری ماڵەکەمان گەمارۆ دا، پاشان عەلی نەبی و خدر لە پێشەوە، حەمەتۆفیق و من و شێخ سلێمان و مەلا غەفور لە دواوە. لە کتوپڕێکدا خۆمان کرد بەو ماڵەدا و تۆفیق و چەکدارێکی دیکە بە واقوڕماوی دەستیبیان پێنەکرایەوە. چونکە تفەنگەکان بە سوارکراوی لەناو لەپی دەستان بوو. هەر جولەکیان دەبووە مایەی کوشتنی بەر دەسترێژی هەموو لایەک. باش بوو بەبێ تەقە و ڕووداوێکی ناخۆش، هەر لەو ژوورە هەردووکیان چەککران و بە دەستبەسەری هێنرانە دەرەوە و بۆ ئەو شوێنە بران کە هەموو پێشمەرگەکان لێی کۆ ببوونەوە.

## پەلاماری کۆپتەر و داستانی گەرەوان

وەرز بەرەو کۆتایی زستان و سەرەتای بەهاری ساڵی ١٩٨١ بوو. نامەیەکی ناوەندی کۆمەڵە ئاراستەی سەید کەریم و ئەزی کرابوو. تاکو لەگەڵ ئەو نوێنەرانەی کۆنفرانس کە لەناو پێشمەرگە و کادرەکانی کۆمەڵە لە ناوچەکانی دەرەوەی هەولێردا، لەلایەن ناوەندی کۆمەڵە خۆیەوە دەست نیشان کرابوون. بەرەو بنکەکانی سەرکردایەتی بە ڕێ بکەوین. ماوەیەکیش بوو چەند مەفرەزەیەکی هەرێمی حەوت و قادر خەباتی ئامر هەرێم لەشانی ئەو هێزەی خۆشناوەتی لە ناوچەکە بوون. ئەوە بوو لەگەڵ سەید چۆنیەتی ئەو گەڕانەوەمان تاووتوێ کرد و بە باشمان زانی بەسەر چیای کۆڕەکەوە، ئاودیوی حەوزی ڕەواندوز ببین. واتە بە گوندەکانی بلێ و بلێی تەنکێشی شاخی کۆڕەک ئاودیوی گوندەکانی گەرەوان و گەرەوانی حەوزی ڕەواندز و سەلانی قەدپاڵی چیای هەندرێن بەرەو گوندی دەرگەڵە ڕێگامان بوو.

پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ بە ڕێگای ناو گوندی گەرەوانی سەروو، لە گوندی گەرەوانی خواروومان کرد. کە ئەو ڕۆژە هێزێکی حسک بە مەسولیەتی سەیدکاکە و عەوڵابۆر لە گوندی گەرەوانی سەرووی سەر ڕێگاکە بوون. قادر خەبات پەیامێکی دۆستانەی بۆ عەوڵابۆر نارد کە ئێمە تەنیا بەو ئاقارە تێدەپەڕین و نیازی خراپمان نییە.

لە دەمی تێپەڕینی کاروانەکەی ئێمەدا، هەموو سەربانە بڵند و سوچەکانی گوندەکەیان لێمان گرتبوو، بەڵام بەبێ تەق و تۆق تێپەڕین. کە زیاتر بۆ هەڵوێستی

عەولابۆر گەڕایەوە، کە هەم خۆی خەڵکی گوندەکە بوو، هەم لەو کاتیشەوە سۆزێکی بە لای یەکێتی دا هەبوو، لایەنگری شەڕی خۆکوژی ناوخۆ نەبوو. لەو گوندەی گەرەوانی خواروودا، ماڵی وەسمان بەگ هەبوو، کە ماوەیەکی زۆر نەبوو، خۆی و مەفرەزەیەکی بچوک لە ناو _حسک_ ـەوە بۆ ریزەکانی هێزی پێشمەرگەی یەکێتی سەنگەریان گۆڕیبوو. بە هەمووومان نزیکەی شەست پێشمەرگە دەبوون. بۆ ئامادەباشی هاتنە پێشەوەی رووداوی نەخوازراو، هێزەکەی هەرێمی حەوت چوونە بەری لای خوارەوەی گوندی کە ماڵی وەسمان بەگی لێ بوو. ئەوان لەوێ و ئەوەی مانەوە لەگەڵ سەید کەریم لەبەری سەرەوەی گوندی جێ و رێمان گرت.

ئەو رۆژە تۆفیق بیرێژیش لە لامان دەستبەسەر بوو، کە لەلایەن ئەو دەستە پێشمەرگەیەی خودی سەید کەریم چاودێری دەکرا. شەوەکەی هەمووومان لە مزگەوتی گوندی کۆبووینەوە و هەتا درەنگانی شەو بەدەم باسوخواسی هەمەچەشنە، یەکتریمان سەرقاڵ کردبوو. بەیانی لەگەڵ هەڵهاتنی خۆرەتاودا، سەید کەریم لەشانی وەک خدر و تۆفیق گەرەوانی، رێگای راوەکەوی بناری ئەو کێوانەی دەورووبەریان گرت. ئێمە بەدوای نانخواردنی چێشتانێ بۆ مزگەوتی گوندی گەڕاینەوە. ئەوانەی بە بیرم ماون د. مەجید، مەلا غەفور، حەمە تۆفیق، ئەز هەبوون. خۆمان خەریکی خوێندنەوەی ئەو کتێب و گۆڤارانە کردبوو کە لە ناو کۆڵەپشتەکانمان بوو. پێش نیوەڕۆیەکی زوو، وەسمان بەگ لەگەڵ قادر خەبات لێمان بە ژوور کەوتن. بەدوای یەکتر ناسین و چاکوچۆنی، وەسمان بەگ داوای لەو چوارەمان کرد کە شان بە شانی قادر خەبات و پێشمەرگەکانی ئەو بەری گوندەکە، داوەتی کردین.

نازانم چ خورپەی چ تەلەسمێک بوو، هیچ یەکێکمان سەرمان نەهێنابەرێ، کە بچینە ئەو شوێنە و ئامادەی ئەو داوەتە بین. بەوە قەناعەتمان پێکرد، کە مادام پێشمەرگەکانی ئەوبەری داوەتەکەیان قبووڵ کردووە، هاتنی ئێمەی پێویست نییە و بە سوپاسەوە بەرێمان کرد. وەسمان بەگ کادرێکی کۆمەڵەی ناوچەکەی لەگەڵ بوو، کە ناوی حەمەلاو بوو. ئەو کادرە لە لای ئێمە مایەوە و دوای کۆمەڵێک گفتوگۆ سەبارەت بە کۆمەڵە و بەستنی کۆنفرانس. حەمەلاو رەخنەی ئەوەی لێ گرتین، کە یەکێک بەناوی کادری کۆمەڵەوە، بەبێ ئەوەی پارەیەک وێر بکات، داوای لەو شوفێرە خاوەن ترومبێلە کردوە، بەیانی بچیتە رەواندز و هەندێ پاقلاوە و خواردنی کەباب و خواردنەوەی بۆ بهێنێ..!

ئێمە دەممان بوو بە تەڵەی تەقیو و هەر بەوە وەڵاممان دایەوە، لەناو کۆمەڵەشدا خەڵکی نەوسن و چەمبەری بێ ئوسول هەیە، دوایی هەوڵ بدە ناوەکەی بۆمان وەرگرە و خۆمان بەدواداچوون دەکەین.

لەناو ئەو قسانە دابووین. لە ناکاو لەلایەن پاسەوانەکان ئاگادار کراینەوە، کە لەلایەن چەندان کۆپتەری سەربازی پەلاماردراوین. دەنگی رێژنەی شەستیر و ساروخی کۆپتەرەکان، کە لەگەڵ دەنگی گرەگری بەشێکی دیکەی کۆپتەری دیکە لە ئاسمانی گوندەکەوە تێکەڵی یەکتر ببوو. کۆپتەرەکان لەو چەند شوێنەی بۆیان دەستنیشان کرابوو، بە خەستی گوللەبارانیان دەکرد و دەستیان نە دەپاراست.

ئەو جێگایانەیان لە ناو تۆزوخۆڵ راگێرابوو. گەرەکیان بوو هێزی پیادە دابەزێنن. ئێمە ئەوانەی ناو مزگەوتەکە، هەندێک بە پەنجەرە و دەلاقەکراوەکانەوە، هەندێک بە دەرگەوە دەرپەڕین و لە بیرمە مەلاغەفور و حەمە تۆفیق و من بەدوای دکتۆر مەجید کەوتین. هەموو پێشمەرگەکانمان بانگ کرد، کە دەست بکەنەوە و رێگای دابەزاندنی هێزی دوژمن نەدەن. ئێمە ئەو پێشمەرگانە شان بەشانی قادر خەبات کە رەشاش برێنێکی بەدەستەوە بوو، لە پەنا تیشە شاخێکی سەرجادەی ناو گوندەکەوە، بە هەموومان دەستڕێژمان لەو کۆپتەرانە دەکرد کە بۆ سەر زەوی و شوێنە پێکراوەکان نزم دەبوونەوە. یەکێک لە کۆپتەرە پەلاماردەرەکان، ساروخێکی لەو شاخە گرت کە لە پەنایەوە تەقەمان لێ دەکرد. بەڵام ساروخەکە دروست لەسەر ئەو جادەیەی بەردەممان دای لە هاوڵاتییەک و سەری لەمل _ەوە پەڕاند و لاشەکەی کرد بە دوو بەشەوە و سەرەکەی وەک میزراح لەسەر رێگاکە خولی دەخواردەوە. لەو تراژیدیا زەندەقبەرەوە دکتۆر مەجید وەک پزیشکێکی پڕ هەستی مرۆڤانە، تفەنگەکەی بەدەستەوە گرت و پێی غارێی بۆ سەرجادەکە پێوەنا، تاکو بگاتە ئەو تەرمە دوو کەرتەی سەر جادەکەوە، کە ناوی ئیبراهیم کوردەی بەستەزمان بوو. منیش بە ناچاری و لەبەر گیانی دکتۆر مەجید دوای کەوتم، بلەز بەیەکەوە بەشەکانی جەستەمان هێنایەوە تەک یەکتری و دکتۆر بە جەمەدانییەکەی داپۆشی. ئەوەندەمان بۆ کرا خۆمان بگەیەنینەوە بەردەم تیشە شاخەکەوە. دوو کۆپتەر لە سوڕانەوەیاندا، گەیشتنەوە بستە ئاسمانی سەر جادەکە و بە ساروخ دایانگرتینەوە. بەڵام ئێمە تازە جێگامان قایم و هیچ ساروخ و گوللە شەستیرێک ئێمەی نەدەگرتەوە. لەو تێکقڕقڕانەدا گوێمان لە دەنگی قادر خەبات بوو کە لەسەرەوەی

ئێمە لەبن کەپکە شاخێکەوە دەیقیژاند.. لێم دا، کورە پێکام، تەماشا بکەن، چۆن دووکەڵ لەو کۆپتەرە هەڵدەستی کە لە ئاسمانی گوندەوە دەیقوچاند. لەو لاشەوە ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵ رەحمان سەیدە و مام هێدی گەیشتبوونە ماڵەکەی وەسمان بەگ، بۆ داوەتەکەی نیوەڕۆ، دروست لەسەر سفرەی خواردن یەکەم دەستڕێژی ساروخی کۆپتەرەکان بەر ئەو شوێنەی ئەوان کەوتبوو. سەرباری ئەوەی شەهید و بریندارىان تێدا بوو، ئەوانەی بەرنەکەوتبوون، چاپوکانە خۆیان گەیاندبووە ناو ئەو گاشەبەردە زلانەی لەپشتەوەی ماڵەکەی وەسمان بەگ هەبوون. دلێرانە بە هەموو چەکێک لە بەرەنگارییەکی کەموێنەی پەلاماری کۆپتەرەکان دابوون. لەو شەڕە پڕ قارەمانییەی ئەو کۆمەڵە پێشمەرگە، بۆ یەکەمجارم بوو، رووبەڕووبوونەوەی شەڕ و پەلاماری لەو جۆرەی هەشت کۆپتەری جەنگی رژێم بەشداری بکەم. بە راستی ئەو پێشمەرگانە نموونەی نەبەزی و ئازایەتی بوون، بە هیمەت و قارەمانێتی خۆیان، پەلاماردانی کۆپتەرەکانیان پوچەڵ کردەوە و کۆپتەرەکان لە بەرانگژبوونەوەی پێشمەرگەدا بەزین و بە ناچاری ئاسمانی ناوچەکەیان بە پاشەل پێکراوی چۆڵ کرد. کە دواتر زانیمان دوو لەو کۆپتەرانە بە پێکراوی لە حامیەی سۆرانی سەربازی نیشتونەتەوە کە لەناو سەرنشینەکانیان، کوژراو و بریندار هەبوونە و بە ئەمبولاسان بۆ نەخۆشخانەی سەربازی گوازراونەتەوە. پێشمەرگە ساغەکان کە بە دووری یەکەوە پەرت ببووین، تێکرا و بە رێکی رووکمان لەو دوو شوێنە کرد کە پێشمەرگەی شەهید و بریندار لێ کەوتبوو. شەهیدەکان کە یەکێکیانم لە بیرمە ناوی مستەفا قەڵاتی بناری باڵەیی قەندیل بوو. بە شێوەیەکی کاتی و بە یارمەتی خەڵکی گوندەکە، لەگەڵ تەرمی ئیبراهیم کودەی هاوڵاتی شاردرانەوە و سەید کەریم لەسەر قەبران پێمان گەیشتەوە. دکتۆر مەجید کە خەریکی تیمارکردنی بریندارەکان بوو، سەری لە بناگوێم ناو و گوتی: کورە ئەو شوفێرە هاتووتەوە و یەک تەنەکە پاقڵاوە و چەندان بوتلە عارەقی لەگەڵ کۆمەڵێک خواردن هێناوە و لەسەرقەبرستانی داناوە. دەبێ چ پێشمەرگەیەکی کۆمەڵە ئەو بەرخوردە جوانەی کردبێ..! دواتر ئەو دەنگۆیەی گەیاندە سەید کەریم و ئەو هەندێ پێشمەرگەی نارد، بوتلە عارەقەکانیان شکاندبوو، چەردە پاقڵاوە و خواردنەکەشیان هێنابوو. پێشمەرگە کەوتنە سەری، بەڵام سەید و حەمەتۆفیق و دکتۆر مەجیدو من و مەلاغەفور دەممان لێ نەگێڕا.

ئەو ڕۆژە، یەکێک لە ڕۆژە هەرە ناخۆشەکانی ژیانم بوو. بە پراکتیک لە شەڕێک بەشدار بووم، خۆم هیچ سەرەتایەکی ئەزموونم پێ نەبوو، مەرگی بەردەستی ساروخ و شەستیری کۆپتەری جەنگی هێرەی بە پێشمەرگە و گوندەکە دەکرد. لە هەموو لایەکەوە دەنگی کۆپتەرەکان، شریقوهۆڕی ساروخ و شەستیر، هەموو دەنگێکی گریان و فیغانی کپ کردبوو، کەس جێی پێی جێ نەبوو، هەمووان زۆرتر خەریکی راکە راکە و خۆشاردنەوە بوون. مەسولی یەکەمی ئەو هێزە لەوێ نەبوو. پێشمەرگەکان بەبێ هەر پلان و ئامادەباشی و چەکی دژەکۆپتەر، کەوتبوونە دۆخێکی ناهەموارەوە، دەنگە دەنگی هاندانی قادر خەبات و مەلا غەفور کە ئەو تفەنگە قوتە برنۆیەی لە تۆفیق بیرێژی گیرابوو، لە لای پێشمەرگەیەکی زەندەق چوو وەرگرتبوو، بە نیشانە تەقەی لە کۆپتەرەکان دەکرد. بە جۆرێک هاوار و هاندانی ئەوان، لەگەڵ دەستڕێژی هەموو جۆرە تفەنگێکی دەستی ئەو پێشمەرگانەی پەنا گاشە بەرد و بن گەوەرە شاخ تێکەڵ بە یەکتری ببوون، ئاوازێکی سازگاری موقاوەمەتی خوڵقاند بوو. ئەو دەمە لە نزیک دکتۆر مەجید و مەلا غەفور و حەمە تۆفیق لە ژێر کەپرەی ئەو گەوەرە شاخەی بەرانبەر جادەکەی ناو گوند سەنگەرمان گرتبوو، وامان دەزانی کۆپتەرەکان تازە بە ئاسانی دەستمان لێ هەڵناگرن، هەموومان تەنیا بە هیماکردن، یەکتریمان دەدواند. لەگەڵ هەر دەستڕێژ و تەقەیەک، بە تایبەت لەدەمی نزمبوونەوەی کۆپتەرەکان و پەلاماردانی سەنگەرەکانمان، دڵی یەکترمان خۆش دەکرد، کە ئەو کۆپتەرانەمان ناچار دەکرد بۆ ئاسمان بەرزبنەوە و ڕێگای دابەزاندنی سەربازەکانیانمان نەدەدا، کە هەر جارەی نزیک دەبوونەوە، دەماندیت پێبلکەی جولاو شۆڕدەکەنەوە، تاکو ئینزالی پێ بکەن. کەچی دەستوەکەری ئەو چەردە پێشمەرگەی ناو گاشەبەردەکانی سەر ڕێگای گوندی سەڵان، ڕەشاشی دەستی قادر خەبات و ئاربیکەکەی ئاواتی مەکتەبی عەسکەری، ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو، کە ئەو پلانەی دوژمنیان پوچەڵ دەکردەوە. تاکو لە عەسرێکی درەنگ کۆپتەرەکان ئاسمانی گوندەکەیان بە جێ هێشت. هەمووان پشوویەکی درێژمان هەڵکێشا، کە ئەو جارەش لە مردنی مسۆگەر ڕزگارمان بوو.

بەدوای شاردنەوەی شەهیدەکان، کەوتینە خۆمان بۆ تاووتوێکردنی دۆخی بریندارەکان، کە زۆریەیان بە ساچمە و پرۆشکی ساروخ و گوللە شەستیر و پرۆشکە بەرد بریندار ببوون. شوکور برینی زۆربەیان جێگای مەترسی نەبوون. وڵاخی بەرزە بۆ

هەموویان پەیدا کرا. لەگەڵ ئێوارە بە کاروان بە رەو گوندی سەڵان کێل بووینەوە، لەوێشەوە بە درەنگی شەوێ لەناو گوندی دەرگەڵەمان کرد. کە خەڵکەکەی بەو شەوە درەنگە، هاوکارییەکی بەرچاویان کردین

## کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵە

بەهاری ساڵی ١٩٨١ بوو. سەرجەم دامەزراوەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، لە بارودۆخی ناهەمواری باشووری کوردستان بە گشتی و لە سێبەری دۆزی چەکدارانەی شاخ بە تایبەت، سەرقاڵی بەستنی ئەو کۆنفرانسە و دۆزی دەستبەسەرکردنی نەوشیروان مستەفا _ سکرتێری کۆمەڵە _ لە لایەن مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی حسک بوو.

لە نەبوونی ئان و ساتی ئەوێ وەختی نەوشیروان لە خرپی ناوزەنگدا. لە لایەن توخمە دیارەکانی ئەوانەی زیندان _ فەرەیدون عبدالقادر و کۆمیتەی هەرێمەکان _ سالار عەزیز، نیمچە لە یەک نزیکبوونەوەیەکی سەیروسەمەرەی کاتی لە نێوان ئەو دوو تاقمە ناتەبایەی دوێنێی ناو هەناوی سەرانی کۆمەڵە، لەناو شیرازەکانی پێشمەرگەی شاخدا کەوتبوە سەرەتاتکێکردن. مایەی ئەو نزیکبوونەوە دەرکردنی ژمارەیەکی تایبەتی گۆڤاری کۆمەڵە _ کۆمەڵە_ بە چاپ گەیەندرا. کە بە چەندان وتاری پڕ لە ناکۆکی و بیانووئامێز و یەک تۆپەڵە پرتە و بۆڵەی پلاراوی بۆ خودی سکرتێری گیراوی کۆمەڵە وەک فرسەتتەلەبی سیخناخ کرابوو.

لەو کەشوهەوایە نائاساییەدا، رۆژ لە دوای رۆژ نوێنەرەکانی کۆنفرانس _ وەک گوتمە ئەوانەی شاخ لەلایەن ناوەندی کۆمەڵەوە بە تەزکیە پالێورابوون _ بۆ بنکەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە لە ناوزەنگ و زەڵێ ی بناری قوتەی مامەندەی سەر سنووری نێوان هەردوو بەشی باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستان دەگەیشتن. ئەندامانی کۆنفرانس دەستە دەستە کەوتبوونە دەمەتەقێیەکی گەرموگوڕی یەکتردواندن. بڵاوبوونەوەی کتوپڕی دەنگۆی دەربازبوونی نەوشیروان و ئازادبوونی لە دەستبەسەریدا، هەموو کزەبایەکی ئەو گفتوگۆیانەی کاڵ کردەوە. لێرەوە بەشی زۆری نوێنەران روویان لە دەمی سکرتێری کۆمەڵە بوو. گرفتەکانی نێوان پاشماوەی کۆمیتەی کۆنی هەرێمەکان، لەگەڵ خودی

سکرتێری کۆمەڵە بە گشتی لە لایەک و ئەندامانی سەرکردایەتی کۆنی کۆمەڵەی بەربووی زیندانی رژێمی بەعس بەتایبەتی لە لایەکی دیکەوە، کەوتە سەرەوەی هەموو جۆرە دەنگۆیەکی دیکەی (نەبوونی مام جەلالیش لەوێ رۆژێ لەناو چەقی باسوخواسەکاندا سەربار بوو) ناو هاورێیان. مقۆمقۆی ئەو ناتەبایی و هەڵنەکردنی مجێزی مەسولەکان لەگەڵ یەکتری، بە ئاشکرا بە ناو بەشێکی زۆری نوێنەرانی کۆنفرانس بڵاوببوەوە. لەو سەکۆیەی ململانێ شەخسییەکاندا، ئەو برادەرانەی زیندان بە خشکەیی و لەپێناوی بێزارکردنی کەسە دیارەکانی کۆمیتەی هەرێمەکان لەگەڵ بیرکردنەوەکانی نەوشیروان دەستلەملانێ بوون. کە خودی نەوشیروانیش پلان و بێ پلان بە ئاشکرا بە لای بیر و کردارەکانی ئەوانەی زیندانی دای خولاندبوەوە و بگرە سکرتێری کۆمەڵە خۆی فاکتەری سەرەکی بوو لە دژایەتیکردنی ژێر بەژێرەکی ئەو برادەرانەی کۆمیتەی هەرێمەکاندا. کە تارادەیەکی زۆر هەتا لە پەیوەندییەکانی رۆژانەش نێوانیان ساردوسڕ بوو. بەڵام لێرەدا تۆباڵی ئاڵۆزکردنی سەرەداوی ئەو گەنگەژە شەخسییانە، وەنەبێت لە ملی ئەوانەی زیندان بە تەنیا بووبێت. بەڵکو رۆڵی لایەنداری سکرتێری کۆمەڵە بەگشتی و، بێمنەتی و خۆ بەزلزانینی توخمە دیارەکانی کۆمیتەی هەرێمەکان بە تایبەتی مەغروری و نازکردن بەبیانوی ئەوەی کە لەراستیدا، ئەوان بوون بەشێکی سەرەکی ئەو کەسانەی لە دەمی لێقەومانی کۆمەڵە بە دەوروبەری _ئارام_ەوە بوون. کۆمەڵەیان لە تەنگانە و لێقەوماوی بە جێ نەهێشت و بە رابەری شاسوارجەلال شانیان دابووە بەر راستکردنەوەی باری لەنگی کۆمەڵە لە رۆژە تەنگەکان ١٩٧٥ _١٩٧٧ دا. دیوێکی دیکەی باشتر ئاڵۆزکاوی بوونی دۆخی هەمیشەیی کۆمەڵەی لێ کەوتەوە و بەبێ ئەوەی لەو دەمی درکی پێ بکرێت، مژدانەی سەروگوێکردنی کۆمەڵە رێچکەی گرتووە.

بە پوختی دەڵێم، ئەوانەی زیندان بە زیرەکییەکی مەکرۆیانەی باوەشی فەرەیدون عبدالقادر کە شاگەشکەبوونی خۆیان بە کەسایەتی بێ مونافیسی مام جەلال بە ئاشکرا دەردەبڕی و هەڵبژاردنی کەسایەتی نەوشیروانیان بۆ بەرێوەبردنی کۆمەڵە_یان بۆ ئاسانتر هەزم دەکرا و لەو پێناوەدا چەپکە گوڵی خۆیان بەدەستهێنا. کەچی ئەوانەی کۆمیتەی هەرێمەکان، زۆر بێمنەت و لاسارانە رووی رەخنە و پتکوپلارەکانیان بە زۆری لە خودی مام جەلال و ئەوجا نەوشیروان بە نهێنی و ئاشکرا دەردەبڕی، بەبێ ئەوەی هیچ بەرنامەی جیاوازییان هەبێت.

کۆنفرانسی یەک لەهەڵکردنی تەپوتۆزی سەراسیمەی یەکتر بەکەمزانین، دەستی بە کارەکانی کرد. دەمڕاستەکانی کۆمیتەی هەرێمەکان بە شێوەیەکی بەرچاو پشت ئەستووری خۆیان بە کادرە سەربازییەکانی ناو هێزی پێشمەرگەی یەکێتی لەوێ ڕۆژێش نەدەشاردەوە. بەڵام دیارە نەوشیروان ئەو دەمیش لە هەمووان بە ئەزموون و خوێندەوارتر لە لایەک و خاوەن دەسەڵاتی ڕەهای دوای مام جەلال لە بواری بەردەستبوونی ئیمکاناتی چەک و بودجەی یەکێتی. نەوشیروان بە پشتیوانی زۆربەی هەرە زۆری نوێنەرەکانی بەرەی برادەرانی زیندان و خەڵکانی تری ناو کۆنفراسەکە، بە ئاوەزێکی هێمنانە بەرەکەی لە ژێر پێی توخمە دیارەکانی کۆمیتەی هەرێمەکان کێشایەوە و ئەوانی بە شێوەیەکی مەیدانی بە پشتیوانییەکی لاواز هێشتەوە. بە جۆرێک هەندێک لەو توخمانە، بێجگە لە مەلا بەختیار، ئەوانی دیکە بە ناچاری پاشەکشەیان کرد و کەوتنە پەراوێزی ڕووداوەکانەوە.

## جەولەیەک لەشانی نەوشیرواندا

بەدوای تەواوبوونی کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵەوە، هێزێکی پێشمەرگەی یەکێتی کە زۆربەیان پێشمەرگەی ناوچەکانی سەرکردایەتی و کەرکوک و گەرمیان و سلێمانی بوون، بە سەرپەرشتی نەوشیروان بەرەو ناوچەکانی هەولێر بە بناری قەندیل بە ڕێ کەوتن. قاسم کرێکار کە ماوەیەک بوو بە هۆی کۆنفرانس و نەساغی لە لای ئێمە لە بنکەی ئێزگە لە خێمەکەی من مابوەوە بەیەکەوە لەشانی مەفرەزەیەکی هەرێمی حەوت کە لە ناویان حەسەن کوێستانی و نەبی چالاک و حەمەڕەشی گەلاڵەیی هەبوون بۆ چوونەخوارەوە لەسەر خواستی نەوشیروان بەگەر ئەو هێزە کەوتین. ئەو ڕۆژە ئەز هیچ ئەرکێکی دیاریکراوم نەبوو. زۆرتر بە نیازی ساغبوونەوە لەوەی ژن بهێنم، یاخود بەرەو هەندەران کۆچ بکەم. لەو جەولەیە شان بە شانی قاسم کرێکار بەشداریم کرد.

هەتا ناوچەی قەڵاتوکان نزیک بە نزیکی کاروانەکەی نەوشیروان ڕێمان دەکرد. بەدەم ڕۆیشتنەوە هەندێک جاران جووت دەکەوتین. بەدەم قسەوباسی هەمە جۆرەی جوگرافیای ناوچەکەوە، ناوی شوێنەکان، شاخ و لوتکە بەرزەکان، ڕووبار و دۆڵ و

شێوەکانی پێیدا تێدەپەڕین، جێگای پرسیار و سەرنجی ئەو بوون. لە ڕێگادا و بە تایبەت لە کاتی هاتنە پێشەوەی هەوراز بڕین، هەموومان ماندوو دەبووین. بەڵام بە هۆی تەمەنەوە بێت، یاخود هەر شتێکی دیکەوە. نەوشیروان لە هەموومان زیاتر ماندووبوونی پێوە دیار بوو. بۆ ئاوخواردنەوە تەنگاو، بە هەڵداوان و شپرزە دەبوو. کەچی بە درێژایی ئەو ڕێگا سەختە شاخاوییە مل بەملە، بە پێچەوانەی زۆر مەسولی دیکەی ئێرە و ئەوێ هەر بەپێ دەڕۆیشت و سواری وڵاخ نەبوو.

شەوەکەی گەیشتینە قەڵاتوکان. لێرە چەندان بنکەی پێشمەرگەی یەکێتی هەبوو. بەرەبەیان سەید کەریم و دەستەیەک پێشمەرگە بۆ ڕاوی کەڵە کێوی چوونە شاخەکان و بۆ تاریکی ئێوارە گەڕانەوە، کەلەشێکی ئاژەڵە کێوییان ڕاو کردبوو. ئێمە ئەو مەفرەزەی خۆمان کە حەسەن کوێستانی زۆری مەبەست بوو، بەدوای ئاگادارکردنەوەی نەوشیروان لە ڕێگای منەوە، ئێمە لە پێشەوە  بە ڕێ کەوتین. لە دووری ئەو بنکانەوە لەسەر چەندان تاشە بەردی گەورە گەورە، سەرخەوێکمان شکاند. بەیانی زوو بەر لە خۆرهەڵاتن وەک پێشقەرەوڵی ئەو هێزە، بەدوای یەکترییەوە ملی ڕێگامان گرت. بۆ شەوی دواتر لە کەناری دوا ڕووباری پێش گوندی کۆمتانی وێرانە، هەواری حەسانەوەمان گرت. بەو وردکە نان و ئەو قوتووە گۆشتەی پێمانەمابوو، برسێتی خۆمان ڕەواندەوە. بۆ چاوەڕوانی گەیشتنی هێزەکە، دڵنیابوون لە سەلامەتی ڕێگاکە، لەسەر بڵندترین گردۆڵکەی سەر ڕووبارەکەوە، بە پاسەواندانان عەردمان کردە ڕایەخ و جەمەدانییەکانی خۆمان وەک لێفە بەخۆدادا و خەوتین. بەیانی لە پاسەوانی ئەزی بوو کە سەرەتای هێزەکە بەدەرکەوتن. مەفرەزەیەک بوو بە تۆپەڵ ملی ڕێگایەکەیان گرتبوو. برادەرانم بێدار کردەوە و گوتم چ دەڵێن لە ناکاو دەنگیان بدەین و بزانین چی دەکەن ! کە هیچ پێشمەرگەیەکیان لەو دەڤەرە شارەزا نین. ئەوان پێیان پەسند نەبوو، نەوەک دەستبکەنەوە و تەقە دروست ببێ.

ناچار خۆمان لێ ئاشکرا کردن و سەیرمان کرد، مەفرەزەیەکی ئەو هێزەن کە لەگەڵ د. خدر مەعسوم ــ دان و یەکێکیان بەندەی ناسی و ڕێنماییمان کردن کە ئەوان لەو شوێنەی ئێمەدا، هەم وەک پاسەوان و هەم بۆ حەسانەوە، چاوەڕوانی گەیشتنی تەواوی هێزەکە بکەن. ئێمەش لەسەر پێشنیاری حەسەن کوێستانی بۆ سەر جادەی کۆمتان بەڕێکەوتین. ئەو جادەیەی سەنگەسەر و جادەی چۆمانی بە یەک دەبەستێتەوە و بە

بناری قەندیلدا بۆ قەسروماکوسان تێپەردەبێت. کە گەیشتینە سەر جادەکە، لە دوورەوە چەند رەشماڵێکمان بە دی کرد کە لە پەنا گردۆلکەیەک هەڵیان دابوو. مێگەلە مەڕ و بزن بەو ناوە پەرت ببوون. زۆریشمان برسی بوو، چونکو خۆراکمان پێ نەمابوو. ح. کوێستانی و نەبی چالاک لە پێشەوە روویان لە رەشماڵەکان کرد و ئێمەش لە سەر بەرزاییەکی سەرجادەکە چاومان لێیان بوو، سەگەلی رەشماڵەکان لە هەموو لایەکەوە دەوریان دان و چەند ژنێک لەو رەشماڵانە بە فریایان دەرکەوتن. کوێستانی هەر لەوێوە دوو پێشمەرگەی ناسیاوی خۆی بانگ کرد. دوای تاوێک دانیشتن، دیار بوو ئەو پێشمەرگانە نانێکی بەپەلەیان خوارد، هاتنەوە لای ئێمە و ئاگاداریان کردینەوە بۆ ناو رەشماڵەکان بچین و خۆشیان جادە و جادە ملی رێگایان گرت. بە مەبەستی ترومبێل هێنان بۆ گواستنەوەی ئەو هێزە بۆ گوندەکانی دۆڵی خانەقا. من و قاسم و حەمەڕەش، بەر ئەو رەشماڵە کەوتین کە کوێستانی و نەبی چالاک میوانی بوون. ئەوان بۆ پاسەوانی و چاودێریکردنی ناوچەکە. شوێنەکەی ئێمەیان گرتەوە.

لەو ژەمە خواردنەی چێشتەنگاوی ژێر رەشماڵ، سەیرم کرد قاسم و بەندە و پێشمەرگەکەی دیکە، وەک ئەوەی چەندان رۆژ بێت نانمان نەخواردبێت. ئەو ژنە خاتونە هەر بەوە رادەگەیشت نانی دیکەمان بخاتە بەردەم و چامان بۆ تێ بکات و جامیلکەی پڕی ماست و پەنیری زێترمان بۆ دابنێ. من بە ژیانم ئەوەندە تامەزرۆی خواردن نەببووم، کەچی لەبن ئەو رەشماڵە و تەماشاکردنی ئەو بێرییە نازدارە خوێن شیرین و دەم بە خەندەیە کە زرینگ و هۆڕی بازنەکانی باسکی، وەک مۆسیقایەک چەشەی خواردنی زۆرتری پێ دابووم. ئێمە لەناو جیهانی چاخواردنەوە و سەیرکردنی هاتوچۆی لەنجەولاری ژنەکە و ئەو کچ وکاڵانەی ناوناوە سەریان بەناو رەشماڵەکەدا دەکرد، کە لە بەرچاوی من تێکەڵ بەو سروشتە جوانە تەڕوناسکەی دەوروبەرەکەوە ببوون. کەچی دەنگی لە ناکاوی پێشمەرگەکانی دیکە، بەندەیان لە خەیاڵی ئەو پەرییە بە هۆش هێنایەوە. بە ناچاری خۆمان کۆ کردەوە و بە یەک دونیا سوپاسەوە لەو ژنە ناسک و نازدارە، کە ئەو دەمە لەبەر ئێمە راست ببوەوە. ئەوەندە بەژن و باڵایەکی زراف و شوشەیی هەبوو کە بە قوڵایی چاوەکانی تامەزرۆیی لێ دەباری و برۆ قەیتانییە قەترانییەکانی لێ هەڵدەتەکاندم، وەک ئەوەی چاوەڕاونی کەویارێکی کتوپڕ بێت ..! قەستی ئەوەم بوو، بە تەواوی ئارەزوو هەمێزی لێ وەرینم، بەڵام کوا لە کوێ ئەو

جەسارەتەم دەکرد، لە بەرگی پێشمەرگە و سامی بیروبارەکەم، پرکێشی سەرکێشی لەو جۆرە بکەم. ناچار چاوی ژێر چاویلکەکانم بەردایەوە و بەدوای ڕێچکەی پێشمەرگەکان کەوتم. لەگەڵ گەیشتنەوەی ئێمە بۆ سەر جادەکە و لای پێشمەرگەکانی دیکە، تازە سەرەتای کاروانی هێزەکان دەگەیشتن. پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ، پێشمەرگەکان تێکڕا بە سواری ترومبێل، گروپ لە دوای گروپ گەیشتینە گوندی بەردگرتکە و دەستە دەستە بەسەر گوندەکانی دۆڵی خانەقا دابەش بوون.

## هەواڵی دکتۆر مەجید عەولا

دکتۆر مەجید یەکێک لەو هاوڕێیانەیە کە چ لە ژیاندا و چ لە کۆچی دواییەکەیەوە، یادەوەرییەکانی بە شێوەیەک هەتیوماوەتەوە. ئەوەندەی من پێی بزانم بە هۆی هەڵوێستە جوانە لێوانلێو لە تێکەیشتنەکانی دوا ساڵەکانی ژیانی لە وڵاتی سویددا. دکتۆر مەجید وەک مرۆڤێکی نوێی بەرۆکی قوربانییەکەی و سەقەتبوونەکەی، ئینسانێکی قسە تێر و لە ڕووی ڕاستگۆی بێ موجامەلەی درۆزنانەی لێ دەرچوبوو. بێمنەت بە ڕووی هەموو ئاوڕدانەوەیەکی ئەم و ئەوی دەسەڵاتداری حیزبی خاوەن قسە و کرداری جوامێرانەی خۆی بوو. هەر بۆیەش بۆ یادی ئەو هاوڕێیە نەمرە ئەو نووسینەم تەرخان کرد و پێشکەش بە گیانی ئەو کەڵە پیاوە دەکەم.

ئەو کۆمەڵە پێشمەرگەی لە تەک نەوشیرواندا، بۆ ماڵی باوکی حەسەن کوێستانی داوەت بوون، قاسم کرێکار و ئەزیشی گرتبوەوە. دیار بوو ح. کوێستانی لەگەڵ ناردنی پێشمەرگەکان بەدوای ترومبێل، مشوری خواردنی نیوەڕۆی بۆ نەوشیروان و کادرە مەسولەکان خواردبوو. من و قاسم کە کەوتبووینە شانی نەوشیروانەوە، یەک قاپی پڕاوپڕی گۆشتی کوڵاویان لە بەردەمی ئێمەش دانابوو. هەتا د. خدر معسوم کە لەوبەری نەوشیروانەوە لەتەک د. شاڵاو کۆیی دانیشتبوو، پلاری خۆی تێمان گرت، لەوەی ئەندامەکانی کۆمەڵەش هێرە بە گۆشت خواردن دەکەن. لەسەر سفرەی تژی لە خۆراکی هەمەچەشنەی مشەبازاری ئەو قسانە گەرم بوو. لەو دەمیدا یەکێک کورتە نامەیەکی ڕادەستی نەوشیروان کرد. کە تێیدا هەواڵی گەیشتنی دکتۆر مەجید عەولا بە برینداریەکی سەختی شەڕی کوردکوژی ناوخۆی ناوچەکانی خۆشناوەتی تێدابوو. ئەو

برادەرە باسی دۆخی شپرێوی تەندروستی د. مەجیدی بە نائومێدی گێڕایەوە. گوللەیەکی تفەنگی مانهێڕ بەر لای چەپی سەری کەوتووە و مێشکی دەبینرێ و بەلۆکە ئاوی لە دەمی دەکەن. دایکی مەجید بەسەر جگەرگۆشەکەییەوە، هەر بە هۆڕە هۆڕ گریان و فیغان، فرمێسکی بەسەردا دەبارێنێ.

ئەو هەواڵە بۆ هەمووان جێگای داخ بوو، بە تایبەت بۆ من وەک شۆکێک بوو. دکتۆر مەجید رۆڵەی بنەماڵەیەکی ناسیاوی یەکتری، کادرێکی هەڵکەوتووی پڕ قوربانی شاری هەولێر لە ریزەکانی کۆمەڵە و یەکێتی خوێندکارانی کوردستان، بە تایبەت لەناو قوتابییەکانی زانکۆی مووسڵ و کۆلێجی پزیشکی رۆڵی جوامێرانەی هەبوو. لەوێ رۆژە سەختەکانی ١٩٧٦_١٩٨٠دا. یەکێک بوو لەو هاورێ تاقولۆقانەی ئەوێ رۆژێ، لەسەر داوای رێکخستنی کۆمەڵە، دەستی لە ژیانی خۆشی پزیشکی و ئیسراحەتی شار هەڵگرت. چاونەترسانە لە بەهاری ساڵی ١٩٨٠دا، لە ریزی پێشمەرگاکانی شاخ و شێلگیرانە بە دەستێک چەکی لە شان بوو، بە دەستەکەی دیکەی لەناو پێشمەرگە و خەڵکی گوندەکاندا، وەک پزیشکێکی مرۆڤپەروەر لە بە دەنگەوە چوونی خەڵکی نەخۆش و بریندار بێسڵەمینەوە بوو. من لە گێڕانەوەی قسەی ئەو برادەرەی هەواڵەکەی هێنابوو، تاسام و بە زوویی دەستم لە خواردن هەڵگرت. چەندی کوێستانی و باوکی لێیان پاتە کردمەوە، کە وا زوو دەست هەڵنەگرم و گۆشتی قاپەکەی بەردەمم تەواو بکەم. بەڵام هەموو هەست و نەستم بۆ لای دکتۆر مەجید و دۆخی شرپی ئەو هەڵفڕی.

دوای دەست هەڵگرتنی نەوشیروان و دکتۆر خدر کە ئەو دەمە ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی بوون. لە پێشەوە قسەم لەگەڵ دکتۆر خدر کرد، ئەگەر هەر ئێستا بۆ سەردانی د .مەجید بچین. د. خدر گوتی.. بە چاوان ئێمە ئامادەین، بەس دەبی ئیزن لە نەوشیروان وەرگرین.

ئەوە بوو لە دەمی چای خواردنەوەدا، بە چرپە قسەم لەگەڵ نەوشیروان کرد، کە من و قاسم کرێکار بە هاورێتی د. خدر و د. شاڵاو و مەفرەزەکەیان، هەنوکە بۆ گوندی وەرتێ دەچین، بۆ بەسەرکردنەوەی د. مەجید و فریاکەوتنی کە هەردووکیان بە ئارەزووی خۆیان لەگەڵمان دێن. نەوشیروان بە سەرگرانی وەڵامی دامەوە و دەنگی هەڵبڕی.. ئێوارەیە و دەڵێن لەو رێگایە، مەفرەزەی قیادە مووەقەتە هەیە..! منیش وەڵامم دایەوە.. ئەگەر بن هەر کوچکە بەرد و پەنا هەر دار و پەڵاشێک لەسەر رێگادا، پێشمەرگەی قیادە

مووەقەتە بن، بەندە و قاسم کرێکار هەر دەچین، چونکو کێ دەڵێ، بەیانی بە زیندوویی دەیبینینەوە کە باری تەندروستی ئاوا خراپ بێت..! ماڵیان ئاوابێت ، د. خدر و د. شالاو مرۆڤدۆستانە هاتنە دەنگ و گوتیان.. مادام حاجی مەمۆ بچێت، ئێمەش وەک دوو پزیشک لە شانی ئەو، بە ئەرکی سەرشانی خۆمانی دەزانین، فریای زەمیلێکی هاوپیشەی پێشمەرگەی بریندارى خۆمان بکەوین. ئیتر نەوشیروان هەر ئەوەندەی بۆ مایەوە بڵێ.. ئەگەر هەمووتان کوژران، حاجی مەمۆ بەرپرسیارە لە فەوتاندنی ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی و ئەوانی دیکە. ئەوەم هەرگیز لە بیر ناچێت، لێرەدا کوڕێکی پێشمەرگە کە خەڵکی گوندەکانی باڵەییان بوو بە ناوی کەمال. بەوپەڕی دڵسۆزی خۆیەوە بۆ شارەزایی بەگەرمان کەوت. بەدوای تاوێک خۆمان کۆ کردەوە و ڕێگای گوندی _وەرتێ _مان گرت. لە ڕێگادا قاسم کرێکار و کەمال _ لە پێشەوەی ئێمە دەڕۆیشتن و تفەنگەکانیان لەناو گۆلمی دەستیان بوو. بۆ پاش عیشایەکی درەنگ گەیشتینە ناو گوندی وەرتێ و لە نزیکی مزگەوتی ناوەراستی گوندی، توشمان بە تووشی تەحسین کاوانی بوو، کە لەگەڵ دوو پێشمەرگەی دیکە لە ماڵێکەوە بۆ لای د. مەجید دەگەڕایەوە. دوای چاکوخۆشی کردن، چوینە ئەو شوێنە، کە چایخانەکەی مەحمود سۆفی بوو.

دیمەنێکی هێجگار خەماوی بوو، دایکی د. مەجید لە دوورەوە کە ئێمەی بەدی کرد. وەک ئەوەی فریادرەسی کوڕەکەی گەیشتبێت و بە لالانەوەی دەنگێکی نووساو باوەشی بە یەکە یەکەمانەوە کرد. هەر دەیگوت و دەیگوتەوە.. هەی بە قوربانتان بم، مەجیدم بۆ لە حەولەڕوحی مردن وەرگرنەوە..! ئەوە بوو دکتۆر شالاو بلەز کۆڵە پشتەکەی کردەوە، یەکسەر لە پێشەوە ئەو ئاوی موخەزی هەڵواسراوەی بە جەستەی دکتۆر مەجید، کە لە تەواوبووندا بوو. بۆی گۆڕی و لەو ئاوە موخەزییانەی پێی بوو، بوتلێکی نوێی بۆ قایم کرد. دوای هەندێ تیمارکردن و گۆڕینی بەنداژە پیسەکانی سەری د. مەجید، کە هەمووی خیزاوی بۆنکردوو بوو. منیش لەتەک دکتۆرەکان وەستا بووم، بە حەق مێشکی لە برینەکەی سەرییەوە دیار بوو. دکتۆر شالاو بەدوای تاوێکی کورت گوتی.. ئەوەی دکتۆر مەجیدی لە مەرگ دەرباز کردووە، ئەو مەخەزییە بووە کە بەدەم برینداریيە سەختەکەی هەناسەی مانەوەی پێبەخشیوە. لێرەدا د. مەجید چاوی کردەوە و هەناسەیەکی کزی دۆستانەی هەڵکێشا و بە پچڕ پچڕی گوتی.. عباس هاتی.. ئاگاداری دایکم ببە و بینێرەوە هەولێری. منیش هەر ئەوەندەم بۆ کرا بە ئەسپایی باوەشم

تێوەرهێنا و نیوچەوانم ماچ کرد. گوتم.. ئەوە دکتۆر خدر و دکتۆر شالاوِن بە هاوارتەوە هاتوون. ئەوان دەڵێن مادام ئاوی موخەزی گەیشتوتێ، تازە ئومیدی ژیانی زۆرە و خەمت نەبێت، ئەوان ئەمشەو لێرە بەسەرتەوە دەبن. پاش ئەوەی هەموومان پشوویەکی ئومێد بەخشمان هاتەوە بەرێ، هەر لەو ناوە و لە دەوروبەری د. مەجید دانیشتین. دکتۆرەکان بە دڵنیاییەوە دڵی دایکی د. مەجیدیان دایەوە کە مەترسی حەولەڕوحی کوڕەکەی رەویتەوە و چاک دەبیتەوە. ئەو شەوە بەڕاستی شەوێکی دوورودرێژ بوو. من و دکتۆرەکان لەگەڵ دایکی ،کە بە چرپە سەری لەبن گوێم ناو گوتی.. ئەوە د. سەباحی برات بوو لەگەڵ من هاتە گوندی وەرێ لە بناری شاخی شیشار و دوای تیمارکردنی، ئەو ئاوەی موخەزی بۆ بەست، تاکو لە ڕێگای گواستنەوەی بۆ ئێرە پێوەی بێت. هەر بەدەم دانیشتنەوە، لە چاوەدێری دۆخی د. مەجید، کەسمان خەو نەچووە چاوی. بەیانی د. خدر جیای کردمەوە، کە دەبێ بە زووترین کات بۆ سەرکردایەتی بە رێ بکرێ و لەوێوە رەوانەی نەخۆشخانەیەکی ئیران بکرێت. تازە مەترسییەک لەسەر ژیانی نابێ و مادام ئاوی موخەزی فریاکەوتووە، هیچی لێ بەسەر نایەت.

د. مەجید بە هاوکاری ئەو مەفرەزەیەی تەحسین کاوانی زەحمەتی زۆریان کێشابوو، گەیاندرایە سەرکردایەتی و لەوێ رەوانەی ئیران و دواتر گەیەنرایە وڵاتی سوید. بەدوای ماوەیەک لە فریاکەوتنی د. مەجید کەوتبوەوە سەرپێیان، بەڵام بەگێڕی دەرۆیشت، داخی گران بەدوای دەیان ساڵی ژیانی سێبەری سوید، د. مەجید بەجەلتەی دڵ کۆچی دوایی کرد

## ئیعدامکردنی شۆڕشگێڕانە...!

ماوەیەک بوو لە شانی نەوشیرواندا. زۆربەی مەفرەزەکانی پێشمەرگەی یەکێتی لە ناوچەکانی هەولێر لە دۆڵی خانەقا کۆ ببوونەوە. ڕۆژێکیان مەفرەزەیەکی هەرێمی حەوت لەسەر پردی زەردی جادەی چۆمان، دوو جاشی بێچەکیان گرتبوو. هەر لەو ماوەیەشدا مەفرەزەیەکی دیکەی هەمان هەرێم لە ناو شارۆچکەی چۆماندا، نۆکەرێکی کوردی موخابەراتی عیراقییان بە دیلی هێنابووە دەرەوە. کە لە تێکەولێکەیەکی ژێر بە ژێرەکی نێوان بەرپرسەکان ئەو زەلامەی موخابەراتی عیراقی بە شەش هەزار دینار بەرەڵڵا کرا. ئەو دوو جاشە گیراوە بێچەکەش کە پارەیان نەبوو، بە ئیعدامکردنی شۆڕشگێڕانە

مەحكوم كران..! ئەو زەمانە هەر كەسێک لەلایەن هێزە چەكدارەكانی شاخ، بە تاوان و بێ تاوان بكوژرایە، ناویان نابوو ئیعدامی شۆڕشگێڕانەی بەر شمڕی تفەنگ.

لەو سەروبەندەدا نەوشیروان لە گوندی وەرتێ هەموو كادرە سەربازی و سیاسییەكانی ناو پێشمەرگەكانی هەولێری بانگ كرد. من و حەمەتۆفیقیش لەناویان بوو. بۆ مەبەستی جێبەجێكردنی فەرمانی گوللەبارانكردنی ئەو دوو جاشە بێچەكە. ئەگەر هەر یەكەیان سەر و تفەنگێكی بكڕیبایە، ئەوە بە دڵنیاییی ئازاد دەكران.

نەوشیروان راشكاوانە هەندێ قسەی رەقی لەو كۆبوونەوە كرد. كە گوایە ئەو كادرە سەربازییانەی هەولێر لە پێشەوە، مەسولە سەربازییەكان جەسارەتی پیاوكوشتن ناكەن و دەستوپێ سپین لە خەڵک كوشتن دەمچەفتن. جا بۆ ئەوەی دەستیان بكرێتەوە و ترس لە كوشتن لە دڵیان برەوێتەوە، گوتی: كێ ئامادەیە لە گوللەبارانكردنی ئەو جاشانە بەشداری بكات و بچیتە ئەو گۆڕەوە. زۆربەی هەرە زۆری كادرە سەربازی و هەتا سیاسییەكان، یەک لە دوای یەک ریزیان گرت، تەنیا من و حەمە تۆفیق ئامادە نەبوون ئەو كارە بكەن. لێرەدا نەوشیروان رووی لە ئەزی كرد و گوتی.. ئەوەی ئامادەی ئەو كارە نەبێت جەبانە..! منیش لە پەیڤی جەبان _ ترسنۆک _ زۆر نارحەت بووم و بە دەنگێكی بڵند گوتم.. ئەگەر رەتكردنەوەی گوللەبارانكردنی دوو جاشی گیراوی بێچەک، نیشانەی نێوان جەبانی و ئازایەتی بێت و كادرەكانی پێ تاقی بكرێتەوە. ئەوە رێگای ئاسانتر هەیە، فەرموو كێ لە خۆی رادەبینی، بابێت بە یەكەوە بۆ سەر ئەو رەبایە سەربازییەی مامەڕووت هێرش دەبەین. هەر یەكێک گەڕایەوە، دیارە جەبانە و لە پشتەوە تەقەی لێ بكەن..!

لێرەدا حەمە تۆفیق — یش دەنگی هەڵبڕی و گوتی.. منیش تەقە لەو دوو جاشە ناكەم. ئیتر نەوشیروان بە ناچاری بۆ ئەوەی كەسی دیكە چاومان لێ نەكات، بە توڕەیی گوتی.. بڕۆن لەو ناوە مەمێنن.

هەردووكمان دوور كەوتینەوە، هەندێ لەو كادرە سەربازی و سیاسییانەی هەر دوێنێ نەوشیروان لەسەر جادەی گوندی سەرنەوس، لەسەر ترسنۆكی و پراكتیكی چاوچنۆكانەیان، بە قسە رەقەكانی سووک و چروكی كردبوون. بێشەرمانە ئەو كارەیان بە جێگەیاند و بە دەستە جەمعی دوو جاشییان بە ئیعدامی (شۆڕشگێڕانە) گەیاند..!

دواتر نابێ هەڵوێستی چاونەترسانەی حاجی گەلاڵەیی نەگێڕمەوە. کە بەدوای جێبەجێبوونی گوللەبارانکردنەکەوە گەیشتە وەرتێ و لەگەڵ حەسەن کوێستانی برای بووە دەمەدەمیان و بە دەنگێکی بەرز گوتی.. ئەگەر ئەو دوو جاشە بێچەکەش، وەک ئەو کابرایەی موخابەراتی عیراقی، پارەیان هەبوایە بەرەڵلاتان دەکردن و دەستکەوتەکەتان برابەش لە نێوان مەسول هەرێم و رابەری سیاسی دەبەخشییەوە.

## جەولەیەکی شەڕی ناوخۆی ناوچەکانی هەولێر

ئەو ماوەیە ئەز بە هاوڕێتی قاسم کرێکار و دەستەیەک لە هاوڕێیانی دیکەی پێشمەرگەی ناوچەکانی خۆشناوەتی و دەشتی هەولێر، تژی لە دڵەڕاوکێ بەگەر کاروانی جەولەکەی نەوشیروان پێکۆرمان بوو. لەو گوزەرەدا لەگەڵ یەکێک لەو دەردە کوشندانەی بزاڤی چەکداری تامپۆنم کرد و پێشتر وا بە روونی و بە ئاسانی بۆم روون نەببوەوە.

ئەو کەسانەی لە ناو شیرازەکانی رێکخستنەوە بۆ خەباتکردن بە سەرەتاکانی رێچکەی بیرکردنەوەکانی م.ل چاومان کردبووەوە، ئاسان نەبوو لە هەڵسوکەوتی رۆژانەی بەر سێبەری تفەنگ و لە شاشیەکانی بزاڤی چەکداری شاخ زوو حاڵی بین. هەر لەوێ رۆژەوە غەدر و دەستدرێژیکردنە سەر سەروەرییەکانی خەڵک بۆم قووت نەدەدرا.

هەناسەدانی لولەی دەسەڵاتی چەک بەبێ هۆشیاری، لەگەل کەشوهەوای شۆڕشگێڕی بزاڤی چەکداری یەک نەدەهاتەوە. بۆیە ئەو کادر و هاوڕێ تاکوتەرایانەی لە ناو ریزەکانی بزاڤی چەکداری شاخدا، ئەو سەرەتایانەی بیر و هوشیاری ئایدیۆلۆژیک، رێوشوێنە ئەلفوبێیەکانی رێکخستنیان بە زوویی لە لا کاڵ نەبووەوە. بە راستی بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەین، بە مەسەلەی چەکداری شاخەکان نامۆ کەوتبووینەوە. چی بکەم هێشتا لە ناو بەشێکی زۆری خەڵکی کورد، تفەنگ لە شان بوون، سێبەری دەسەڵات پەیداکردن و نازکردن بەسەر خەڵکەوە زمانی حاڵە. ئەوجا هەر دەسەڵاتێکی سێبەری تفەنگ کە تەنیا لەو پەنایەوە هاتبێت و دەقی پێوە گرتبێت. ئەو دەسەڵاتە هەرگیز لەگەڵ راستی و دروستی، دادپەروەری، مایەکانی خۆشەویستی یەکتری و ریزی بەرانبەر و دڵسۆزی بۆ وڵات و خەڵک لنگاوقوچ دەکەوێتەوە. بەڕێوەبەرانی ئەو دەسەڵاتەش تا

ئاویان لە دوو بێریێ بێت، بە درێژەدانی موزایەدەی کڵاولەسەرنانی خەڵک و گەوجاندنیان ناسڵەمێنەوە و لەبەریدا باوەشێنی بەرژەوەندییە تایبەتەکانی خۆیان دەکەن

جەولەکەمان بەو هێزە مشەیە کە بۆ یەکەمجار بوو، هێزێکی زۆری یەکێتی و بەسەرپەرشتی گەورە مەسولێکی وەک نەوشیروان بەو ناوچانە بجولێتەوە. کێلبوونەوە بۆ گوندی سەلانی قەدپاڵی شاخی هندرێن و شۆڕبوونەوە بۆ هەردوو گوندی گەرەوانی خوارێ و سەرێ، یەکەم قۆناغی کاروانەکە بوو. لە گوندی گەرەوانی سەرێ کە بنکەیەکی بەردەوامی پێشمەرگەکانی _حسک_ ی لێ بوو. هێزەکە سەرەتا تووشی تەقوتۆقێکی دوور بە دوور هات. ئەوانەی حسک زوو لە خۆیان گەیشتن کە نکارن بەرگەی ئەو هێزەی یەکێتی بگرن. سەرباری ئەوەی کەسانێکی مەسول عەسکەری وەک عەوڵابۆر، خەڵکی گوندەکە و ماڵ و منداڵیان دانیشتوی ئەوێ بوون. عاقڵانە دایانە لووتکەی شاخەکانی دەوروبەر و لەوی عاسێ بوون و زەفەریان پێ نەبرا. بەڵام ئەوەندەی بە بیرم بێت، دیسانەوە لە رێگای قادر خەباتەوە، نەوشیروان نامەیەکی بۆ عەوڵابۆر نووسی، کە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە بگەڕێتەوە ناو هێزەکانی یەکێتی، پلەوپایەی خۆی پارێزراوە و یەکێتی شەڕی ئەو ناکات. بۆ ئێوارەیەکی درەنگ ئەو هێزە گەیشتە هەردوو گوندی بلەی ژوور و بلەی ژێری تەنکێشی تیشەکانی چیای کۆڕەک کە بە رەبایەی سوپای داگیرکەری عیراقی تەنرابوو. لەوێش بنکەیەکی دیکەی مەفرەزەیەکی حسک هەبوو، کە ئەوانیش زۆربەیان خەڵکی ئەو دوو گوندە بوون بە مەسولییەتی بورهان بلەیی. من لەگەڵ ئەو هێزەی هەرێمی حەوت و دەشتی هەولێر بە تەقوتۆقی ئێرە و ئەوێ لەپاش بلەی ژوور، گەیشتینە ناو گوندی بلەی ژێر و بۆ شەوەکەی بارگەمان لەسەر کانی و ئاوی مزگەتەکە خست. شەو چەندان کەمین لە دەوروبەری گوندی دامەزران. بەیانی زوو لە چەند لایەکەوە، مەفرەزەکانی حسک بە دوورە تەقە، گوللەبارانی کەمینەکانی پێشەوەی هێزەکەی هەرێمی حەوتیان کرد. ئەوە بوو هەتا دەمە دەمی عەسر بە رێنمایی نەوشیروان، هەندێ نامە بۆ بورهان بلەیی و ئەوانەی دیکەی حسک رەوان کرا. نیوەڕۆکەی مەفرەزەیەکی چەند کەسی پێشمەرگەکانی حسک کە خەڵکی بلەی ژوور بوون گەڕانەوە ناو هێزەکەی یەکێتی و لایەکی بەرەکەی ئەو پێشمەرگانەی دیکەی حسک، سەنگەریان چۆل کرد و شاخەوشاخ ئاودیوی زنجیرە شاخی باری خەتێ بوون. مابوونەوە ئەوانەی پێشەوە، کە دروست سەر ریگای دۆڵی ئاڵانەیان بە دەستەوە بوو، پەنا

ڕەبایەکانی سوپای عیراقییان لەسەر تیشە بڵندەکانی چیای کۆڕەک بۆ خۆ کردبوە سوپەر و تەقەیان لە مەفرەزەکانی یەکێتی دەکرد. بەدوای دوو ڕۆژان لەم جۆرە قونەشەڕانەدا، مەفرەزەکانی حسک بە ناچاری تێکرای ناوچەکەیان چۆل کرد. هێزەکانی یەکێتی بەبێ تەقەی زیاتر بەرەو دۆڵی ئالانە شۆڕبوونەوە. ناوناوەش لە ناو هێزەکەی حسکدا تاکوتەرا سەنگەری دەگۆڕی و پەیوەندی بە هێزەکەی یەکێتییەوە دەکرد. بەدوای چەند ڕۆژێک زۆربەی هێزەکانی یەکێتی کە لە هەموو ناوچەکانی دیکەوە بۆ کۆمەک هاتبوون، لە دۆڵی بالیسان کۆ بوونەوە. لەو لاشەوە هێزەکانی حسک کە هەتا ئەوێ ڕۆژان، لە ناوچەکانی هەولێر، لە ڕووی ژمارەوە هێزی پێشمەرگەی بالادەست بوون لەچاو هێزی پێشمەرگەی یەکێتی. بەڵام لە ڕووی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنەوە زۆر لەدواوە بوون. هەر بۆ نموونە لەوان ڕۆژاندا، هەموو هێزەکانی حسک بە سەرکردایەتی سەید کاکە، لە زنجیرە شاخی هەورێ ی بەرانبەر دۆڵی بالیسان، سەری زینەتیر و کلاوقاسمەوە بگرە تا دەگاتە سەر تیشەکانی دەشتی بتوێن و گوندی سکتان، کۆ ببوونەوە و سەنگەریان گرتبوو. بە درێژایی شەوی پێش هێرشی هێزەکانی یەکێتی، لەو زنجیرە شاخانەدا، ئاگریان بەردابوە پوش و پەلاشی ئەو ناوەوە. دووکەڵی نمانامەی شەڕی کوردۆلۆژی بەری ئاسمانی دەڤەرەکەی داگیر کردبوو.

بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی هێزەکانی یەکێتی لە چەند قۆلێکەوە، کەوتنە هێرشبردن. شەڕی توندی برایەکان دەستی پێکرد و هەتا بەرەبەری نیوەڕۆیەکی درەنگ ئەو شەڕە گەرم بوو. من هەنوکەش ئەو دیمەنەم لە بیر نەچووەتەوە، تیش و بەرد و داری زنجیرە شاخی هەورێ نەمابوو، ئاگری نەگرتبی و چڕە دووکەڵی تاریک بەری ئاسمانی سەر پێشمەرگە شەڕکەرەکانی لە هەردوو لاوە داپۆشیبوو. ئەوێ ڕۆژانیش وتاریکم لەژێر ناوی _شاخی هەورێ دەسووتێ و دوژمنەکانمان لە خۆشییان شاگەشکەیانە..! _ و بەداخەوە ڕەشنووسەکەم نەماوە. لەوێ ڕۆژیش، هەست و نەستی زۆربەی پێشمەرگەی هەردوو لام دەخوێندەوە، کە تارادەیەکی زۆر یاری ئەو جۆرە شەڕە خۆکوژییە نەبوون. چونکە ئەگەر پێشمەرگەی هەردوو لا، بە تەواوی حەز و ئارەزووی خۆیانەوە ئەو شەڕیان بکردایە، ئەوە دەبوو لەسەر ئەو شاخە سەدان تەرم بە خۆڕایی و بێهودە بکەوێ و جۆگەلەی خوێناو تێنوێتی کێڵگە و ڕەزەکانی سەر شاخ بشکێنی.

هەر بۆ نموونە و بۆ مێژوو، ئەو دیمەنەی کۆتایی دوای تەقەی نێوان دوو سەنگەری بەرانبەر یەکی هەر دوو لام لە بیرە. ئەز لەگەڵ ئەو مەفرەزەیەی سەید کەریم و مەفرەزەکەی ئەحمەد مەولوودی باڵەیی بووم. بەرانبەر ئەو سەنگەرەی سەید کاکە و حەسەن وەرتی ـحسکـی لێ بوو. پێشمەرگەکانی حسک هەتا دەمی پێکرانی حەسەن وەرتی لە سەنگەری ئەوان ئاگری گوللەبارانکردنی سەنگەری ئێمە گەرم بوو. لەو سەنگەرانەوە بە هەموو جۆرە چەکێکی دەستی، تەقە لە یەکتری دەکرا. تاکو بەرەی حسک لە هەموو سەنگەرەکان لە شکان و پاشەکشە دابوون. لێرەدا من سێ وێنە دەگێڕمەوە.

وێنەی یەکەم.. هەنوکەش لە بەرچاوم نەسڕاوەتەوە، سەید کاکە و دەستەیەک پێشمەرگەی حسک، لەو سەنگەرەوە کە تەرمی حەسەن وەرتیی یان لێی بە جێ هێشتبوو. لە بەرسێرەی تفەنگی پێشمەرگەکانی ئێمەوە هەستان و پشتیان لە ئێمە کرد و سەنگەری خۆیان چۆل کرد. چەند پێشمەرگەیەک لە لای ئێمەوە خەریک بوو، دەسترێژیان لێ بکەن. بۆ مێژوو دەیگێڕمەوە، سەید کەریم لە تەک منەوە بوو، لوولەی ئەو تفەنگی ئاربیکەیەی گرت کە بەدەست پێشمەرگەیەکەوە بوو، خەریک بوو پلی پێوە دەنا و سەید لولەکەی بەرز کردەوە و دەسترێژەکە روو لە ئاسمان دەرپەڕی و سەیدکەریم قیژاندی.. کەس تەقەیان لێ نەکات و با بە پێی خۆیان بقوچێنن. سەید کاکە شایستەی کوشتن نییە، پێشمەرگەیەکی پڕ ماندووبوون بووە. ئەو هەڵوێستەی سەید کەریم، بۆ من و ئەحمەد مەولوود کە لەو تاوەدا لێمان نزیک ببوەوە، مایەی دەستخۆشی و ئافەرین بوو، لە دڵەوە پیرۆزباییمان لێ کرد.

وێنەی دووەم.. لە دوای نەمانی تەقە و کشانەوەی هەموو هێزەکەی حسک، لە تێکڕای ئەو سەنگەرانەی سەر شاخەکەوە. سەیرم کرد لەو سەنگەرەی تەنیشتمانەوە، پێشمەرگەکان بەسەر شتێکەوە کۆ بوونەتەوە. کە چووم و دیتم تەرمی پێشمەرگەیەکی یەکێتی بوو لە روحدان بوو. گوێم لە دوا ووشەی بوو. بە پچڕپچڕی دەیگوت.. تفەنگەکەم مولکی خۆمە و بۆ ژن و منداڵەکانمی بەرنەوە، تاکو بیفرۆشن و بە پارەکەی بژین. واتە بۆ خەرجی ژیانیان بەدوای خۆیدا شتێکیان بۆ بە جێبهێڵی. یەکسەر گیانی دەرچوو.

وێنەی سێیەم.. ئێمە سەرتیش و تیش بەسەر شاخەکەوە، هەتا بەرانبەر گوندی چیوەی حاجی سەلامی رۆیشتین، کە دەبوو لەو لاشەوە، ئەو هێزەی لەگەڵ مستەفا چاوڕەش هاتبوون، بەسەر شاخەکەوە بن. دوایی زانیمان مستەفا نەخۆش کەوتووە، لە گوندی سکتان و دەوروبەری دامەزراون و تووشی تەقە نەهاتوون. چونکە هەموو هێزەکەی حسک، بە لای گوندی کونەفلوسە و دەوروبەری ئاودیو ببوون و لە زنجیرە شاخی سەفینش پەڕیبوونەوە. ئەوە بوو عەسرێکی درەنگ بوو، زۆربەی هێزەکانی یەکێتی لە دەوری نەوشیروان، کە ئەو دەمە گەیشتبووە گوندی چیوە و گردببوونەوە. من هێشتا لەگەڵ سەید کەریم بووم، لەسەر کانییەکە تووشی سواراغای ئامر هەرێمی چواردەی یەکێتی هاتین. دوای چاکوخۆشی، نازانم چۆنی زانیبویەوە، هەندێ وێنەی ژن لە گیرفانی کورتەک و شەلوارەکەی ح. وەرتیی کوژرا و کەوتووتە لای منەوە. پرسیاری ئەو وێنانەی کرد! منیش وەڵامم دایەوە کە ئەو وێنانە تەسلیم بە نەوشیروان کردوە. لەو قسانە دابووین و لە پڕ لە لایەکی ترەوە دیتم، لەناو کۆمەڵێک پێشمەرگە تفەنگ راکێشانە، یەکسەر رامانکردە نێوانیان، تاکو تەقە لە یەکتری نەکەن. سەیرم کرد هەموو کێشەکەیان لەسەر ئەو چەند هێسترەیە کە لە هێزەکەی حسک بە جێ مابوو. دیسانەوە شرەخۆری خەریک بوو، سەری چەندان ئامر کەرت و مەسئول بخوات..!

# سەرهەڵدانی هزر و بیرکردنەوەی نوێ

خوێنەری دەلال! ئەم یادەوەرییانە گێڕانەوەی سەربردەی پرۆسەیەکی رێکخراوەیی کۆمەڵەیە لەبەرگی کەرتی رێکخستنی شەقڵاوەو لەناوچەکانی دەرەوەی ناوشاری هەولێردا. کە لە پێشەوە بۆ خۆم دەلالەتی زۆر هێمایە و هەنوکەش روحم دەهەژێنێ. ئەم ئەزموونە بۆ من و یەک چەپکە تێکۆشەری بەلەنگازی دەم رووداوەکان، رێچکە گرتنێکی بەرجەستە و تا رادەیەک سەرمەشقێکی نوێ بوو. بە دڵ و بە گیان لە بەر رۆشنایی رێبازە بابەتییەکەی خەباتی کۆمەڵە لە پیادەکردنی پراکتیکی چەمکێکی تازەی سیاسەت لە کاروانی کۆشش و قوربانیدانی خەڵکی کورد سەرەتاتکێمان بوو.

ئێمە یەکە یەکەی هاورێ نەمرەکان لە پێشەوە و زیندووەکانی بە ژیان لە هەوڵێکی بێوچاندا، وەک هەڵگرێکی بیروباوەڕە شۆڕشگێڕییەکەی ئارام_ی دەم رۆژگار خۆمان تاقی کردەوە. بەڵام لە تۆقەرەی دەسەڵاتی سێبەری تفەنگی شاخەوە، بە پلانێکی تۆکمە دەستیان لە بینەقاقامان نا و فرچکیان لە بەر بڕین. من ئەم ئەزموونە بە شەنوکەوکردنی بویەرەکان تەتەڵە دەکەم و دەیگێڕمەوە. خوێندنەوەکەم بۆ نەوەی نوێیە، ئەوانەی نیازیان گرتنەبەری بیرکردنەوەی نوێیە. ئەو بیروباوەڕەی دەبێ تشتێکی داهێنراو بێت و نابێت لەناو کەرەسیسەی ئەجندای حیزبی سواوەی فاشیلی چەند بارە خۆیان سەقەت بکەن. دەبێ لە کانیاوی هەڵقوڵاوی بیرکردنەوەی نەوەی نوێ راوکە دابنێن و لە بۆ دیدی خەڵکی خاوەن شەنگ و تاقەتی لەبن نەهاتوو هەنگاو هەڵهێنن و ئاسۆی ئومێد لەتازەگی بخوڵقێنن.. فەرموون سەرلەبەری ئەو ئەزموونە بخوێننەوەو سەرەداوی هەوڵ و تەقەلاکان ببینن

## قاڵبوونەوە و دەمی لە خۆ گەیشتن

### ڕێکخستن و لەشکری سوور..!

لەدایکبوونی کەرتەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٨١دا، یەکێک لەو هەنگاوانە بوو لەگەڵ خۆیدا، دنیایەک بارودۆخی چاوەڕوانکراوی خەیاڵئامێزی بۆ وەرچەخانێکی بابەتی، گەشەکردنێکی سروشتی کۆمەڵە، بەرەو ئاقاری ڕێکخستنێکی شۆڕشگێری تازە بابەت لەلایەن دەستەیەک لە هاوڕێیە گیانفیداکارەکان لە باشووری وڵات لە باوەش دابوو.

ڕاستە بەدوای یەک ساڵی کەوتنە سەرپێیانی ئەو شیرازانەی ڕێکخستن لە ناوچەکانی هەولێردا، لە سێبەری شاخ و تفەنگدا بۆ یەکەمجار بوو لە دەواری شڕوشلۆقی بزاڤی چەکداری کوردان لەو دەڤەرەدا، تروسکایی هاتنە مەیدانی، بانگی خەڵکی نوێی هەڵگری بیروباوەڕی ئارام کە خۆی لە چوارچێوەی فەلسەفەی مارکسیزم ــ لینینیزم دەدیتەوە، کەوتە سەرەدیقانێ. بەڵام سەد هەیهوو، ئاش لە بارودۆخێک و ئاشەوان لە خەیاڵێکدا..! کەسە کارەکتێرە سەرەکییەکانی هێزی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ــ مام جەلال و نەوشیروان ــ کە بڕیاری لە پێشینەیان هەبووە بۆ سەروگوێکردنی کۆمەڵە و بەزوویی درکیان بەوە کردووە، ئەو جۆرە لەشکرە خەڵکییە ڕێکخراوەییە، واتە کاڵکردنەوەی دەسەڵاتی تاکڕەوی ڕەهای ئەوانی بە نیوچەوانەوە لێ دەخوڵقێ. لە لایەکی دیکەوە لە پراکتیکیشدا بەڕێوەبەرێک، ئارام ــئاسا لە مەیدان نەمابوو کە ئەو مەلۆ زۆر و پەرت و بڵاوەی ئێرە و ئەوێ بە بیری ورد و ئاکاری شۆڕشگێڕانە، قوچەک لە بۆ خەرمانی قوربانیدانەکانی هەڵبچنی و بنیادی چلۆنایەتی لەسەر دابمەزرێنی. ئەوەش دیارە بۆ کەسە مەسولە بێویژدانەکان، سوپای مشەخۆری دەوروبەریان، هێڵکەی دوو زەردێنە بوو. بەڵێ بە خۆتان و بە هێمنی و کاوەخۆ، ئەو ڕاڤە و شرۆڤەی گێڕانەوەی بەشێکی ئەو دەوارە بخوێننەوە و بەسەرهات و کار و کردەوەکان دەور بکەنەوەو بە دڵنیایی ڕیزم بۆ بۆچوونی جیاواز سەبارەت بە نوسینەوەی ئەو یادەوەرییانە هەیە و هیوادارم بەرچاوان بکەون.

کۆمەڵە بەدوای یەکەم کۆنفرانسی لە بە هاری ساڵی ١٩٨١دا، سەرباری ئەو تەنگەژەیەی بەر لە کۆنفرانس و بەدوای کۆنفرانسیشەوە پێوەی دەهەژاوە. بە تایبەت لە بواری سەرنەکەوتنی کۆنفرانس لە هەڵبژاردنی سەرکردایەتییەکی ئاسایی یەکگرتووی تۆکمە.

له دەموساتی پاییزێکی درەنگی ساڵ و سەرەتای زستانێکی توش و بەفراویدا، له لایەن نەوشیروانەوە، بیرۆکەی دروستبوونی کەرتەکانی رێکخستن له ناو هێزی پێشمەرگە و ناوچەکانی دەرەوەی شارە گەورەکاندا، بە بواری جێبەجێکردن شاگەشکە بوو. ئەو وەختەش له لایەن سەرکردایەتی یەکێتییەوە، کۆمیتەی هەولێری _ ی ن ک _ بڕیاری لێ درابوو. بنکەکەیان له گوندی وەرتێی بناری زنجیرە شاخی کارۆخ بوو. ئەرکی ئەو کۆمیتەیە وەک ئەزموونێک، سەرپەرشتیکردن و ئیدارەدانی هێزەکانی پێشمەرگەی یەکێتی بوو له ناوچە پانوپۆرەکانی پارێزگای هەولێر و بتوێن و وڵاتی کۆیە و بەشێکی رانیە و شاخی کۆسرەت. بەڵام بە هۆی دەمچەفتی بەرپرسە سەرەکییەکانی ئەو کۆمیتە هیچی لێ شین نەبوو. بە ماوەیەکی زۆر کورت هەڵوەشێنرایەوە و مەڵبەندەکانی له جێگا دروست کرا. بەڵام هەر بەو کەرەستە سەقەتەوە کە بەشێکی دیاری روانگەی بیر و کرداریان بەربەرەکانیکردنی خەڵکی رێکخراوەیی شۆڕشگێڕ بوو. لەوەی کارەکتێری رێکخستنی تۆکمە بە سەرپێیان نەکەوی و زیانی بۆ کارەکتێری بۆشی ئەوان لێنەکەوێتەوە.

ئەو دەم من زۆرتر لەشانی ئەرسەلان بایز و یارمەتیدانی بۆ بەڕێوەچوونی و کارئاسانی له ئامادەکردنی بەرنامەی رۆژانەی ئێزگەی دەنگی شۆڕشی عیراقدا خۆم خەریک کردبوو. لەوێ رۆژانیش یەکلایەنە وەک هاوڕێیەک له راگەیاندنەکانی یەکێتی نیشتمانی _ تۆژەڵە _ بە تایبەت له هەڵسوڕانی رۆژانەی ئێزگەکە بە پراکتیک هەڵسوڕاو بووم.

رۆژێکیان نەوشیروان بەدوایدا ناردم و باسی ئەوەی لەگەڵ کردم کە ئایا دەمەوێ بە ئەرکی رەسمی بەڕێوەبردنی راگەیاندن دەستبەکار بم..! یاخود ئەرکێکی کاروباری پێشمەرگەیی له ناوچەکانی خوارەوەی هەولێر له ئەستۆ بگرم !

راستە من زۆرتر مەیلم بە لای کارکردن له ناوچەکانی هەولێر بوو. هەرگیز دڵم بە کاری ناو بارەگا و بنکەی دوور له خەڵک خۆش نەبووە. راشکاوانە هەست و نەستی خۆم دەربڕی، بەڵام ئەوەم بە نەوشیروان گوت.. کە من ئەرکی سەربازی و مەسولیەتی پێشمەرگایەتی وەرناگرم. بۆ ناوچەکانی دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی پێشنیاری هاوڕێ کاوە مەخموری، شاخەوان و عەلی سالح و ئەحمەد قومبەری و سابر رەسول، تەحسین کاوانیم بۆ کرد. ئەویش بۆ هەر یەکەیان بیانویەکی هێنایەوە. له درێژەی

گفتوگۆیەکەماندا بۆ کاروباری راگەیاندنیش من لە لای خۆمەوە، ئەودەم وام پێ پەسند بوو کە ئەرسەلان بایز بە هۆی ژنەکەی (پەخشان خان) لەگەڵ خۆیدا بوو، بە فەرمی ئەو بکرێتە بەرپرسی ئیعلام کە هەر خۆیشی مەسئولی ئێزگەش بوو.

ئەرسەلان بایز پێی خۆش نەبوو، من راگەیاندن بە تایبەتی ئێزگە بە جێ دەهێڵم، چونکە لەوێ رۆژان زۆربەی گوتار و پەخشانەکانی بڵاوکراوەی رۆژانە، من دەمنووسی ــ بەداخەوە کەسێکی فرسەت تەلەبی وەک ف. س ــ ی کە ئەو دەمە خوێندەوارییەکی ئەوتۆی نەبوو و خورپەیەکی نووسینی تێدا نەدیترا، بەدوای منەوە سەربەستانە هەموو ئەو بەرهەمانەی بۆ خۆی گێڕابوەوە و قورخی کرد. ئەوە بوو نەوشیروان گوتی.. مادام وایە ئەرکی بەرپرسیارێتی رێکخستن لە ناوچەکانی هەولێر وەرگرە و سەرەتا خۆت ئامادە بکە لە بەرێوەبردنی کەرتێکی رێکخستن بەناوی کەرتی رێکخستنی شەقڵاوە لەو ناوچانە دەست بەکار ببە بۆ چوونەخوارەوە. بۆ بەیانیش لەگەڵ ناوەندی کۆمەڵە بە ئامادەبوونی خودی نەوشیروان و مەلابەختیار وەک مەسولی ناوەندی رێکخستن و فەرەیدون عبدالقادر وەک مەسولی ناوەندی ئیعلامی کۆمەڵە دانیشتم.

پرینسیب و خولیای سەرەکی بیر و هزرم، لە دەستپێکی هاتنەمەیدانی کەرتی رێکخستنی شەقڵاوە، لەوەوە سەرەداوی خۆی هەڵدەکردەوە، کە بۆ کاری رێکخراوەیی بە شێوازە نوێیە داهێنەرەکەی ئاژام، کادرەکان و ئەندام کەرتەکان و خۆم، شان بەشانی پێشمەرگەکان جیاوازیمان نەبێ. لە بواری مەیدانیشدا، هەر یەکەمان لە دابەشبوون، تێکەڵبوون بە خەڵکی گوندی، بە هەمان دەنگوڕەنگی خوێندنەوەی ئاوازی سروتەکانی کۆمەڵەی بەرئاسۆکانی فیکری م. ل بانگی خۆمان بدەین. ناتوانم ماندووبوونی ئەو هاورێ پێشمەرگانەی کەرتی رێکخستن یەکە بە یەکەیان، لە هەوڵ و کۆششی شەو و رۆژیان بۆ پاراستن و پارێزگاری کەرەکتێری رێکخستن و سەروەرییەکانی ئەوێ رۆژان لە بیر بکەم.

ناوەندی کۆمەڵە ئەوەی پێویست بوو هەر بە قسە، بۆ کاری رێکخراوەیی لەو ناوچانەی بۆی دەچین، یەک بەدوای یەکتری قسەی خۆیان کرد. دواتریش من ئامادەیی خۆم و ئەو چەپکە هاورێیەم بۆ ئەو کارە دەربری کە لە بنکەکانی سەرکردایەتی یەکێتی هەبوون. باسی ئەوەشم لەگەڵ کردن کە ئەگەر دەیانەوێ، لەو ناوچانەدا لە بڵاوکردنەوەی دەنگوڕەنگی کۆمەڵە و گەشەکردنی رێکخستن، پەرەسەندنی هێزی پێشمەرگەی یەکێتی

سەرکەوتوو بین. دەبێ تەنیا گفتی ئەوەم بدەنێ، کە هیچ کەسێکمان لەسەر نەکەن بە سیخور و راپۆرتنووس. هەر شتێکیان هەبوو راستەوخۆ لەگەڵ خۆمان باسی بکەن و رووبەرووی خۆمی بکەنەوە. ئیتر بەسەر زارەکی بەڵێنی ئەوەیان پێدام کە لە هەموو رووێکەوە، ناوەندی کۆمەڵە پشتگیریمان دەکەن..! لێرەدا ناوەندی کۆمەڵە بۆ یەکەمجار، لەسەر پێشنیاری خۆمەوە ناوی حاجی ئەکرەم و سەدیق رەنجبەریان وەک یەکەم دوو ئەندامی کەرت دەستنیشان کرد. کە ئەو دەم حاجی ئەکرەم یش لە بنکەکانی سەرکردایەتی و هەر لەگەڵ ئێمە لە توژەڵە دەژیا. پاشان وەک پێشنیار دانانی دوو ئەندام کەرتی دیکەیان بۆ باس کردم، کە لە چوونەخوارەوەمان، خۆم بڕیاربەدەست بم بۆ دەستبەکاربوونیان.

ناوەندی کۆمەڵە، سەرباری هەر باروودۆخێک لەوێ رۆژاندا، بە یەک قروش، بە یەک فیشەک هاوکارییان نەکردین. تەنیا و تەنیا ئێمەی کاڵفامیان بۆ دژوارترین ناوچەکانی پێشمەرگایەتی یەکێتی بە رێ کرد...!

## بەرێکەوتنمان بەرەو ناوچەکانی هەولێر

کۆتایی مانگی دەی ساڵی ١٩٨١بوو، بەفریکی هێجگار زۆر دەڤەرەکەی داپۆشیبوو. هاتوچۆی نێوان بنکەکان ئاسان نەبوو. حاجی ئەکرەم و ئەز، دووقۆڵی لە زۆربەی سەردانەکان بە زەحمەت بەفرەکەمان دەشکاند و بۆ ماڵئاوایی لە هاوڕێیەکان سەردانی هەموو لایەکمان بەبێ جیاوازی کرد.

مەفرەزەیەکی رووتەڵەی چەند نەفەری کە ژمارەمان لە پەنجەکانی هەردوو دەست تێنەدەپەڕی. تەنیا حاجی ئەکرەم و حاجی مەمۆ لە پێشەوە چەکدار بوون. هاوڕێیان کاروان و کاردۆ محمدی برای، وریا قادر و وەلی برای، عزالدین ئەحمەد، مەسعود عەقاری بێچەک بوون.

سەرەتا چەند جارێک بە بەشداری هەموو ئەو هاڕێیانە کۆبووینەوە و یەکەم شتێک کە قسەمان لەسەر کرد، بەڵێندانمان بوو بە یەکتری کە لە رووبەڕووبوونەوەی کار و ئەرکەکەمان لەناو خەڵکی ناوچەکانی خوارەوە، پشتوپەنای یەکتری بین. لە دەمی هاتنەپێشەوەی سەختییەکان یەکترمان لە بیربێت و یەکدی بەسەر بکەینەوە.

ئەو رۆڵە تێکۆشەرانە لە دڵەوە سەرەتای یەکتر خوێندنەوەمان لەبەرنامەدابوو. لەگەڵ یەکتری راستگۆیی قوچەکی هەنگاونانمان بوو. هەر جۆرە ملەیەکمان لەناوخۆ قبول نەبوو. ئەوەندەی ئاومان لە دوو بێرێ هات، وەک نموونەی دەستپاکی، رەوشتی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی سەربڵند قۆشمەمان دەکرد. کاروانەکەمان سەرباری رێگایەکی کاکی بە کاکی گێرە و کێشەی دژوار، کە سەرکەوتنەکانمانی کردە دەستمایەی پێکەوەنانی یەکێک لەو کەرتە بەرچاوانەی رێکخستنی کۆمەڵە. لە رووی چلۆنایەتی و چەندایەتی ئەوێ رۆژێ لە سەرتاپای کوردستانی باشووردا ناو و دەنگی خۆی هەبوو.

ئەو دەستە هاوڕێیە کە دواتر لە پاڵ زنجیرەیەک هاوڕێی هاوبیری تر، بوونە ناوەڕۆکی خەباتێکی دەروێشانەی بێفڕوفێڵ. دوور لە موزایەدەکردنی بنکە و بارەگای گەرموگوڕ. بە جەستە و بیرکردنەوەی ئارەزومەندانەی خەڵکی رەشوڕووت. زەمینە و بوارێکی خولقێنەرمان بۆ کۆمەڵە و هەتا یەکێتی لەو ناوچانە خولقاند. کە مەسول و بۆرە پیاوەکانی پەناکەندووان خەونیشیان پێوە نە دەبینی. یەکەم هەنگاونانی بوێرانەی ئەو هاوڕێیانەی لە ناوچەیەکی هێجگار ترسناکی خەباتی کۆمەڵە و یەکێتیدا، تەنیا نەخشەرێگامان لەو بیروباوەڕەوە هەڵهێنجابوو، کە ئارام _شاسوار جەلال_ لە ساڵی ١٩٧٥ سەرەتایەکەی دەست پێ کردبوو. دەنا وەکی تر، کۆمەڵێ هاوڕێی سادە و خاکی، هەموو سەروەت و سامانەکەی بەردەستمان، تامەزرۆیی خەباتی بێوچانی دڵسۆزانە، وەفاداری و قەناعەتی شۆڕشگێڕانەی بێپەروا بوو. بۆ خزمەتکردن بە خەڵک و هەڵهێنانی تروسکایی ئاسۆی ئومێد بۆ دوارۆژ. هەموومان بێمنەت لە ناخۆشی و دژوارییەکانی بزاڤی چەکداری شاخەکان. بە تەمای شەهیدبوونی سەربڵندانەی کوڕی خەبات بووین. بەڵام دیارە قەدەر و چارەنووس، تەنیا بۆ ئەوە هەندێکمانی هێشتینەوە، کە لە سێبەری سەربڵندی خۆمان لەو کاروانە سەر بە گۆبەندەی ئەوێ رۆژێ، بە پێچەوانەی لەشکری پەنا و پەسیوان، گەندەڵکارانی سەر رەوسەی دەستکەوتەکان، لەبەرانبەر بەناو شۆڕشگێڕە دیماگۆگییە جامبازەکان، ئەوانەی هەردەم مانۆڕی مەکرۆیانەی بەرسێبەری چاوچنۆکی، بێچاو و ڕوویی رەشماڵی کۆشک و تەلارە لەژمارە نەهاتوەکانیانن.. ماینەوە و قەدەری ئەزیش بۆ نووسینەوەی بەسەرهاتەکان، بارگەی تژی لە یادەوەرییەکانی خۆی هەڵدەڕێژی و رووی راستیی رووداوەکان بە شاراوەیی لەگەڵ مەرگی خۆم ناهێڵمەوە.

ئەو رۆژە هەر چارمان، حاجی ئەکرەم، ئەز، کاروان، کاردۆ، لە بنکەی سەرەکی ناوەندی کۆمەڵە لە خڕی ناوزەنگ بۆ بارەگای ئیدارەی گشتی بۆ بنکەکانی گوندی زەڵێ هاتینە خوارەوە. پێشتر و لەپێشەوە عزالدینمان ناردبووە ئەوێ، تاکو هاوڕێیان وریا گچکە، مەسعود عەقاری، دکتور رەوا _ وەلی حاجی قادر _ خۆیان بۆ بەڕێکەوتن ساز بدەن. لەگەڵ گەیشتنمان هەر چواریان دەمودەست لەسەرڕێ بوون.

لە پێش ئێمەوە کاروانەکەی د. کەمال خۆشناو بە بناری کوێستانەکانی قەندیل بەرەوگوندی وەرتێ بوون. ئەوان سی پێشمەرگە زیاتر دەبوون و چەندان وڵاخی بە باریان پێبوو. هەرچەندە بەفری ڕێمان بە هۆی ئەو کاروانەی ئەوان پێیدا ڕۆیشتبوون و بۆ ئێمە شکابوو. ڕێچکەی کوتەکشکاوی ناو بەفرەکە، پێداچوونەکەمانی ئاسانتر کردبوو. بەڵام بە هۆی بارگرانی کۆڵەپشتی تژی لە ئەدەبیات و بڵاوکراوە، کیسەی خەو و جلوبەرگی زستانە و بەردەوامی بەفربارین، بە هێمنی ملی ڕێچکەمان بەدوای یەکترییەوە گرتبوو.

مەفرەزەکەمان لە چەشنی رەوە بەرازێک ملمان لەبەر ملی بەفر نابوو. خرم و هۆڕی بەفری نوێی ژێر پێڵاوەکانمان، لە شێوەی ئاوازێکی مۆسیقی سروشتی قەدپاڵەکانی زنجیرە چیای قەندیل، بەدەم کزەبایەکی بەفراوی سارد و سڕ، ناو ناوە باوەشێنی ئارەقەی ماندووبوونی لێمان دەکرد. ئێمە لەبەر رۆشنایی ئەزموونی سەفەرەکانی رابردوومان بەو بنارەدا، هەر یەکەمان گوژمە خورمایەکمان هەڵگرتبوو. کە بە حەق لە رۆیشتن و بەرگەگرتنی سەرماوسۆلی ناو بەستەلەکی بەفر، وزەو تاقەتێکی باشی پێبەخشین و خورما شەنگ و تاقەتی بە میوانی جەستەمان دەستەبەر کردبوو.

یەکەم وێستگەی حەسانەوەمان بەدوای پەڕینەوە لە رووبارەکەی _ئالییەڕەش _ بوو. لە شوێنی تەنکاوی رووبارەکەوە، کە هەر یەکەمان پێڵاو و شەلوارمان بەدەستێکەوە بوو، بە لاق و لاتەریکی هەتا بەر پشتێن رووتوقووتەوە، دەسرازەی رەشوسپیمان بەدوای یەکترییەوە بەستبوو. بە بێمزەڕەتی لەوبەری رووبارەکەوە خۆمان پۆشتە کردەوە و لەبن ئەو دارە بەساڵاچووانەی کەنارەکەوە، بارگەی حەسانەوەمان لێخست. سەر بە یەکەوەنانمان هەر لە دەستە ئاسکێکی هاوڕێ، لە یەکتری کۆ ببووینەوە. بەو نان و پەنیرەی پێمان بوو، برسێتی ژەمە نیوەڕۆیەکی درەنگمان لە خۆ رەواندەوە. لێرەدا وریا گچکە لەگەڵ حاجی ئەکرەم دەستوبردانە، ئەو شرە کتلییەی بە قەد عزالدینەوە ئاوێزان

بوو، پڕ لە ئاو کرد و خستییانە سەر پشکۆی پاشماوەی ئەو ئاگرەی کە لە کاروانەکەی پێش ئێمە مابووەوە. هەر یەکەمان سەر و چای دێمبووی سەرپێڵوە ڕەژووی گەشمان خواردەوە و بە هیوای دیداری مەلاغەفور و هاوڕێیان نۆشمان کرد. مەلا غەفور لە هەر شوێنێک بحەسایەوە، یەکسەر مشوری چالێنانی دەخوارد. هەمیشەش وەک پارتزانێکی بە دەستوبرد لەو جۆرە سەفەرانەدا، تۆربەی شەکروچای بەقەدەوە بوو. کە بە حەسانەوەی مەلا غەفوری ناوزەد کرابوو. ئەو مەلا غەفورەی وەک هاوڕێیەکی هێجگار دڵسۆزی بیروباوەڕی مارکسیزم_لینیزمی کۆمەڵە، لە شانی هاوڕێیەکانی بۆ گەشەکردن و بەرەو پێشەوە چوونی ڕێکخستنەکان قامەتێکی دیار بوو.

مەلا غەفور بەر لە شەهیدبوونی، لە کۆنفرانسە ناوخۆییەکانی کۆمەڵەی ناوچەکانی خۆشناوەتی لە سەرەتای پایزی ساڵی ١٩٨٣دا، سەرباری بەربەرەکانییەکی زۆری نەیارەکانی بیروکردارەکانمان، بە دەنگی یەکەم بەرپرسیارێتی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوەی بەدەست هێناو و خەریک بوو سەرلەنوێ کەسایەتی ڕێکخستن لەو دەڤەرەدا روحی دەهاتەوە بەرێ. بەڵام قەدەری شەهیدبوونی خۆی و دەستەیەک لە هاوڕێیەکان ئەو خەونەی یەکجاری زیندەبەچاڵ کرد.

بۆ شەو درەنگانێک بەدەم ئەو هەوراز و بنارانەوە، گەیشتینە ئاقاری _ گوندی قەڵاتوکان _ کە لەمێژ نەبوو چەندان بنکە و بارەگای یەکێتی لێ دامەزرابوو. بۆ من تەنیا دیتنەوەی بنکەکەی بەکر پیرۆتی ناسیاوم مەبەست بوو، ئەو بەکر پیرۆتەی لە رۆژگاری رووداوە دڵتەزێنەکانی شەڕی ناوخۆی کوردکوژی ١٩٧٨ی هەکاری بە برینداری لەگەڵ کاروانەکەی پیاوی رۆژانی تەنگانەی کۆمەڵە لە ١٩٧٥_١٩٧٦ تالب رۆستەم (دواتر بە شێوەیەک و بە پاساوی عەقلی قوندەی شاخ تیرۆرکرا) ئەوەی بە ناچاری تەسلیم بە سوپای رژێمی عیراق ببوونەوە. بەڵام بەدوای سارێژبوونی برینەکەیەوە، هاتبووەوە شاخ و وەک ئەندامێکی بە وەفای کۆمەڵە، لە ریزی هاوڕێیەکانییەوە، بەردەوامی خەباتی شۆڕشگێڕی ئەوێ رۆژان بوو.

ئێمە بەو ماندووبوون و سەرمای شەوێکی ناو هەڕوگیڤی بەفرەوە، یەک دوو بنکەمان کرد، تاکو بنکەکەی بەکرمان دیتەوە. بەڵام سەیرمان کرد لە پێشمەرگەکانی کاروانەکەی کۆمیتەی هەولێر سیخناخ بوو. بەکر کە گوێی لە دەنگی من بوو، یەکسەر ناسیمییەوە و لە بنەبانی بارەگاکەیان بەپیرمانەوە بۆ دەرەوە هات. دیار بوو کەمال

خۆشناو لە ژوورەوە دەیشیراند، کە ژوورەکە جێگای کەسی دیکەی لێ نابێتەوە و ئەوانە با بە ڕێگای خۆیاندا بگەڕێنەوە..! لێرەدا بەکر پیرۆت هاوڕێیانە، دەستی منی گرت و هەموومانی بردە ئەولا ترەوە، بەردەم هۆدەیەک کە شوێن و جێگای پێشمەرگەی دەستەکەی خۆی بوون. ئەوانی بۆ بنکەکانی خوارەوە نارد و جێگای ئێمەی کردەوە. ئەوە یەکەم شەوی پێشمەرگایەتی ئەو مەفرەزەیەی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە بوو. لە ڕێگای مەسعود عەقارییەوە، لیستی حەرەسیات و نهێنی شەو دانراو و هەر یەکەمان سەعاتێکی بەرکەوت و دوا پاسەوان خۆم بووم. بەیانی زوو هەموو هاوڕێیانم لە خەو بێدار کردەوە، دەستوبرد نان و چایەکی بارەگاکەمان خوارد. بە سوپاسەوە ملی ڕێگای شۆڕبوونەوەی هەورازی ڕمکانمان بەدوای قەڵاتوکانەوە گرت و بۆ پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ گەیشتینە سەرجادەی کۆمتان لە ناوچەی باڵەییان. سەیرمان کرد چەند سەیارەکی بەتاڵ لە بەردەمی ئەو ڕێچکەیەوە، لە پەنای گردێکەوە مۆڵیان گرتووە. دیار بوو بۆ گواستنەوەی پێشمەرگەکانی کاروانەکەی کۆمیتەی هەولێر هاتبوون. کە یەک دوو پێشمەرگەی ناوچەکەیان لەگەڵ بوو، یەکێکیان سلێمانی برای قادر خەباتی پێشمەرگەی دێرین بوو. ئەوە بوو بە یارمەتی ئەوەوە یەکێک لە سەیارەکان دەستوبرد ئێمەی بۆ گوندی بەردگرتکەی دۆڵی خانەقا گواستەوە.

## سەرەتای دەستبەکاربوون و هەنگاونان

شەو بوو بەدەم نۆبەتی پاسەوانی خۆمەوە، بەدەم سەیری ئاسمانمەوە. وەرزی ساڵ لەناو زستانێکی تەواو خۆی پێچابوەوە. ئەو شەوە ئەستێرەکانی پانتایی ئاسمان، وەک دەیان گوڵمە مرواری ڕەنگاوڕەنگ لە قوڵایی ئاسمانەوە، بۆ سەر زەوی دەبریسکانەوە و مژدەی ڕۆژێکی هەتاویان بۆ سبەینێ دەبەخشی. دیمەنەکە موچرکی چەشەیەکی خۆشی بە هەموو جەستەم داهێنا و شاگەشکەی کردم.

سبەینەکەی لە شانی یەکە بە یەکەی هاوڕێیەکانم، لە گوندی بەردگرتکە بە برادەران حەسەن کوێستانی و حاجی برای، جەلال حاجی و برایمی کوێخوا، مام هێدی و فەقێ محمد و شەماڵ و چەندانی دیکە شاد بووینەوە کە من پێشتر ئاسیاویم لەگەڵیان هەبوو. پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردین و بە تایبەت کە زانییان ئێمە وەک ڕێکخستن بۆ ناوچەکانی هەولێر هاتوینەتە خوارەوە.

هەموومان لە مزگەوتەکە کۆ بووینەوە. لەو دەمەدا سەرەتای کاروانی پێشمەرگەکانی کۆمیتەی هەولێر گەیشتن. هەر ئەو رۆژە لە سنووری هەرێمی حەوت و بە هاوکاری هاوڕێیان پۆلێکی گورجوگۆڵی رێکخستنی کۆمەڵەمان بۆ ناو هێزی پێشمەرگەی ناوچەکە بە سەرپەرشتی مام هێدی و شێخ شەماڵ و پۆلێکیش بۆ ناو خەڵکی ناوچەی چۆمان و قەسرێ بە سەرپەرشتی فەقێ محمد بڕیار لێ دا. لەگەڵ چەندان خەت و ختوتی رێکخراوەیی لە چۆمان و رواندز و قەسرێ و دەستپێکی بەرنامەی کارکردنمان لە خانەقا و باڵەیی بوو. بە هاوکاری مام هێدی و فەقێ محمد (مەلا کاوە) و شێخ شەماڵ لە جەولەیەکی گوند بە گوندی ئەو دوو دۆڵە سوڕاینەوە. بەرنامە و نەخشەرێگامان ئەوە بوو، کە تا دەکرێ بارگرانی دابەشبوونی کادر و پێشمەرگەکانی رێکخستن نەخەینە سەر ماڵە جوتیارەکان. ئەگەر کاری هەرەوەزی کشتوکاڵی و خانووبەرەکردن و دەغل و دان بە ناوهێنان بەروبۆمەکان و هاوکاری کردن بەو خەڵکە پێشکەش نەکەین. بەتایبەت جوتیارە هەژار و نەدارەکان کە لەو بارەوە جێگای بایەخ و رووتێکردنمان بوون.

بە دوای هەندێ کارکردنی رێکخراوەیی لە گوندی وەرتێ، کە بەندە ساڵی پێشووتر هەندێ گەرای کۆمەڵەم لە رێگای عەولا شێخە و سمایل وەرتی و ئەوانەی گەڕەکی بەرۆژی ئەو گوندە _ بە بوردنەوە ناوەکانیانم لە بیر نەماوە_ لەگەڵ مەلاحەسەن و برایەکی گەنجی سمایل وەرتی سازدا. ئەوانە و دۆستایەتی گەرمی مام حاجی شێخە وەک پشت و پەنایەک، سەرەتای دەسپرازەیەکی رێکخستنمان لەو گوندە دەست پێکرد. کە بە حەق لەو رێگایەوە ئەو گوندە بووە بنکەیەکی ئاشکرای هێزی یەکێتی لە ناوچەکەدا.

## سەفەری پێشوترم

لە کۆتاییساڵی ١٩٨٠دا بوو، لەو کاروانەی چەند مەفرەزەیەکی تێکەڵی باڵەکانی ـی ن ک ـ دا کە من و ئازادی مام وسو لەگەڵ ئیسماعیلی مام رەشید کاوانی، جەولەیەکمان بەو گوندانەی دۆڵەڕەقەدا کردبوو کە برادەرانی وەک م عەزیز و حاکم پێشڕەو و دکتۆر شالاو، دڵزاری بەکرەغای کۆیی، سوارەی سمایل ئاغام لە بیر نەچوونەتەوە. لەوێ ڕۆژاندا لە ڕێگای نامەیەکی نەوشیروان بۆ مەلاعوسمانی پلینگانێ، لە نزیکەوە چاوم بە سواراغای هەباساغای ئاکۆیان کەوت کە ئەو دەم ئامر هەرێمی چواردەی یەکێتی بوو. وەک پیاوێکی چاوتێر ڕیزی زۆری لە هەمووان گرت. سەرباری ئەوەی پڕوپاگەندەی ئەوەیان بۆمان کردبوو. کە گوایە ئێمە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی باروبۆخی هەرێمەکەیمان لە ئەستۆیە. لەو سەفەرە سەردانی یەکە بە یەکەی کەرتەکانی پێشمەرگەم کرد. بۆ نموونە لە ماڵی مام کوێخا هەمزەی دونیا دیتەوە، لەگەڵ کوڕەکانی ناسیاویم ڕێچکەی بەست. هەروەها لە بنکە و ماڵەکەی عەلی نەبی و براکانی لە گوندی دارەبەن، لەگەڵ خۆی و برایەکانی و کوڕە جوتیاری زەحمەتکێش ـ حەمەدکانەبی و مستەفای حاجی خدر و مام حەمەد دارەبەتی بوومە ئاشنا و بۆ کارکردن لەگەڵ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە هانمدان. پاشان بۆ چەندان جار بە نامە گۆڕینەوە یەکترمان بەسەرکردبووەوە. هەر لە ڕێگای تەزکیەکردنی منەوە بۆ یەکەمجار لەو ناوچەیەدا، مستەفای حاجی خدری بۆ یەکەم کۆنفرانسی کۆمەڵە بانگ کرا.

## دۆڵەڕەقە و کاری ڕێکخراوەیی

دوا بەدوای گوندی وەرتێ، بە هاوڕێتی قادر خەبات و مام هێدی و فەقێ محمد ـ مەلا کاوە ـ جەولەیەکی دۆڵەڕەقەمان کرد. لە پێشەوە ئێمەی ڕێکخستن، سەردانی بنەماڵەی حەمەدکانەبیمان کرد. کە هەنوکەش لەبەر چاومە هاوڕێ حەمەد خۆی بە تاکە گاجۆتەکەیان ئەو لەتە زەوییە بەردەڵانەی پشت ماڵەوەی خۆیانی دەکێڵا. پاش نان و دۆ خواردنێکی هەژارانە، باسوخواسەکانی ڕێکخراوەیی خۆمان لەگەڵ ئەو هاوڕێیە تەواو کرد. بەرەو گوندەکەی ماڵی مستەفای حاجی خدر، لە بناری ماخۆبزانان، بەڕێکەوتین. مستەفا خۆی بۆ شەوەکەی لە ماڵ نەبوو، بەلام بنەماڵەکەیان زۆریان ڕیزلێگرتین و بۆ

شەویش لە لای ئەوانماینەوە. بەیانی مستەفا هاتەوە و بەیەکەوە تاووتوێی کارەکانمان کرد و ئەویش بەڵێنی خۆی نوێ کردەوە. ئیتر بۆ پاشنیوەڕۆ بە هاوڕێتی مستەفا هاتینەوە گوندەکانی دۆڵەڕەقە و سەردانی ماڵی کوێخوا هەمزە و لەوێ لەگەڵ ئەرسەلانی کوڕی بە یەکتری شاد بووینەوە، کە ئەو دەمە لە شاری رانیە بوو. ئیتر لەگەڵ ئەو هاوڕێیانە سەرەتای بازنەیەکی رێکخستنمان لەو دۆڵە هۆنییەوە و ناوەندی کۆمەڵەمان لێ ئاگادار کردەوە. لێرەدا نابێ ئەوەم لە بیر بچێت، لەو سەروبەندە هەبوونی هاوڕێیانی وەک عبدالرحیم سەنگەسەری، فەقێ بابیز کە دوو هاوڕێی ماندوونەناسی کۆمەڵە بوون. شان بەشانی عەلی نەبی لەو ناوچەیە هەبوون. بەر لە ئێمە کۆششیان لەو بوارەوە بە کەس ناشاردرێتەوە و پاشان بە پشتیوانی و هاوکاری ئەوانیش، وجوودی برایمی کوێخا و محمدی کاک هەمزە، فەزای ئەو چالاکییە رێکخراوەییە لەو ناوچە پڕ کێشە کۆمەڵایەتی و زاڵبوونی هزر و پراکتیکی عەشیرەتگەری و غەدری ئاغا ملۆزمەکان رێچکەی گرتووە. بێگومان سەربازی نەناسراوی دیکەش هەبوونە کە لە دەرەوەی پێزانینی ئەزن. بە کورتی ئەو سەرەتایەی ئێمە و هاوڕێیانی دیکەی ئێرە و ئەوێ کە من نەمناسیون، بۆ دواتر مایەی دروستبوونی کەرتی رێکخستنی رانیەی لێ کەوتەوە. دیسانەوە نابێ لەوێ دەرفەتدا، هەوڵ و کۆششی سەربازی رۆژانی تەنگانەی کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٧٦_١٩٧٨ ی ناوشاری هەولێر، مەلاغەفور لە بیر بکەم. لەو ناوچەشەوە هەم لە ناو گوندی وەرتێ و هەمیش لە دۆڵی پڵنگان، شان بە شانی ئێمە، کە خۆی ئەو دەم ئەندامی ناوچەی _ی ن ک_ ی لقی هەولێر بوو. مەلا غەفور وەک هاوڕێیەکی جەربەزەی کۆمەڵە، پشت و پەنای رێکخستنەکانی ناو خەڵکی زەحمەتکێشی ئەو ناوچانە بوو. بە تایبەت لە دۆڵی شاورێ و سەرکەپکان و لەناویشیان چەندان دۆستی وەک کێخوا هەمزەی بە ئێمە ناساند. کە بۆ دواتر وەک بنکەیەکی باوەڕپێکراوی کۆمەڵەیان لێهات و لە ناویان ئەرسەلانی مام کێخوا هەمزە، کادر و رۆڵەیەکی بە هیمەتی خەباتی کۆمەڵەی ئەو ناوچەیەی لێ دەرچوبوو.

ئەو چەند رۆژەی لە دۆڵەڕەقەدا ئێرە و ئەوێمان دەکرد. بارانی بەخوڕ هەموو کونج و کەلەبەرێکی وڵاتی گرتبوەوە. رۆژەکانمان بە سەردانی و کۆبوونەوەی چروپڕ لە پەنا

سۆبەی قشپل و دار دەگوزەراند. هاوڕێیان بە گیانێکی زیندووی بێپەروا، خۆیان بە بڵاوکردنەوەی دەنگوڕەنگی کۆمەڵە خەریک کردبوو.

دوا بەدوای سەردانی دۆڵی شاوڕێ. بەرەبەیانێکی زوو کە هەموومان لە ماڵەکەی علی نەبی ژوورێکمان بۆ تەرخانکرابوو. بە قۆستنەوەی وەستانی تەوژمی بارانەکە، لەگەڵ عەلی خۆی و مەفرەزەیەک لە پێشمەرگەکانی دەوروبەری، بە زینێی ئەستێرۆکان بەرەو وەرتێ گەڕاینەوە.

مەلا کاوە کە کادرێکی ناو خەڵکی بوو، پەیوەندییەکی پڕ لە ریز و خۆشەویستی بە جەماوەرەوە هەبوو. لە شانی ئەودا، سەردانێکی بنەماڵەی تەیب وەرتی _مان لە ماڵەکانی گەڕەکی خوارێی وەرتێ دا کرد و شەوێک لە لایان ماینەوە. تەیب لەناو هەندێ خەڵکەوە بە دۆستی پارتی قیادە مووەقەتە دەخوێندرایەوە. خۆی مرۆڤێکی تا بڵێی گران و سەنگین و قسەزان بوو. بۆ لەمەودوا دۆستایەتییەکی گەرموگوڕی لەگەڵ ئێمە بەست و هەتا بۆ هێنان و بردنی پۆستە و نامە لەگەڵ هاوڕێیانی هەندێ شوێنی پارێزگای هەولێر سوودمان لێ وەرگرت.

هەر لەو یەکەم هەنگاوەوە وەک ترادیشونێکی شۆڕشگێڕانە، بەرنامەی کارمان بەوە ڕێچکەی گرت. کە لە نێوان پێشمەرگە و کادر و ئەندام کەرت و مەسول جیاوازی نەبوو. هەموو وەک یەک شانەی دەست هەڵسوکەوتمان دەکرد و بە یەکەوە لە یەک شوێن دەخەوتین. ئەوجا چ ژووری مزگەوت یاخود پەیداکردنی هۆدەیەکی لاچەپ بوایە. هەتا بۆ لەمەودوا هەرکاتێک جێگایەکی لاچەپەمان دەست بکەوتایە، بۆ خۆمان و بە دەستی خۆمان بە دەستەجەمعی خواردنمان ئامادەدەکرد و قاپوقاچاغەکەمان بە شوراوی بۆ ئەو بنەماڵەیە دەگەڕاندەوە کە لێمان بە قەرز وەرگرتبوون. لەپێناوی ئەوەی ئەو سوخەتە دزێوە بەدناوەی کادر و مەسولەکان لە کۆن و نوێدا، لە بەرچاوی خەڵک کاڵ بکەینەوە. کە ئەوانە هەمیشە بەوە ڕاهاتبوون، دەبی خەڵک بە شەو و بە ڕۆژ لە خزمەتکردنییان دەستەوەستان بن!

# دۆڵی خانەقا و دەرگەڵەی مەکۆی شۆڕشگێڕی

بە هاوکاری مەلاکاوە و مام هێدی، بۆ چەندان ڕۆژ لە دۆڵی خانەقا، بە گوندەکانی بەردگرتکە و خانەقا، سەرنەوس و ڕەژووکەریان، کەلێتە و دەرگەڵە سوڕاینەوە.

لەو گەڕان و سوڕانەماندا، هاوڕێیان حاجی ئەکرەم، مەسعود عەقاری، وریا، ڕەوا، کاروان، کاردۆ، عزالدین هاودەم و بەشدار بوون. کە یەکەم نۆبەرەی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە بوون بۆ ناوچەکانی دەرەوەی سەنتەری پارێزگای هەولێر.

زەمەنێکی کورت نەبوو گوندی دەرگەڵە، یەکێک لەو گوندە تاکوتەرایانەی بناری شاخەکانی باشووری کوردستان بوو، کە بنکە و مەڵبەندی خەڵکانی خاوەن بیری چەپ و شۆڕشگێڕی بوو. بە تایبەت لە سەرەتای شەستەکانەوە، بە هۆی بنەماڵە خانەدانەکانی گوندەکەوە، وەک وەکرێکی نهێنی و ئاشکرای حشع بوو. دەنگوڕەنگی دەرگەڵە لە ناو جەرگەی ڕووداوەکان هەبووە و دواییش لە پەراوێزی بزاڤی چەکداری و شۆڕشی ئەیلوولەوە، ناو و ناوبانگی دەرکردووە و بنەماڵە دەستڕۆیشتوەکانی دەرگەڵە، زۆرتر بە لای پارتی و سەرکردایەتی بارزانی مەیلیان پەیدا کردووە. بەڵام لەگەڵ هەستانەوەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی مارکسی _ لینینی کوردستانی عیراق بەدوای ساڵانی ١٩٧٥ _ەوە و هەبوونی تێکۆشەرانی وەک، م. یوسف دەرگەڵەیی لە ریزەکانی ئەو ڕێکخستنەدا، کۆمەڵە بە پشتیوانی تێکۆشەری کۆچکردوو، جەلال بەگی دەرگەڵەیی و کوڕە دڵسۆز و خەباتگێڕەکانی بنەماڵەی مام وەسمانی زەحمەتکێش م. عومەر و خەبات _ی جوانەمەرگی نەمر و دایکەکەیان، م. خەلیل و ماڵی مام حەسەنی دووکاندار و مەلا واحید و چەندانی دیکە، دیسان جێگە و پێگەی خۆی هەبووە.

دەرگەڵە لە ساڵی ١٩٨٠ ەوە بنکەیەکی پاڵپشتی نهێنی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵ بووە لەو دەڤەرەدا. دیارە دواتر کوڕانی وەک فەیلی و ئازاد جوندیانی لەو ناوچەیە ئەندامێکی دیاری کۆمەڵە بوون. بێگومان ئەو کەرتەی پێشمەرگەکانی شارۆچکەی گەلاڵەی وێران کراو، کە زۆربەی هەرە زۆریان ئەندام و هەواداری کۆمەڵە بوون. ئەوەش زۆرتر بە هۆی بوونی کەسانی هەڵسوڕاوی وەک حەسەن کوێستانی و دوو برایەکانی، حاجی و حەمەرەش، هەر سێ برا یەک لەدوای یەکدا، لە مەیدانی ململانێکانی شەڕی بێهودەی کوردکوژی نێوان یەکێتی و پارتی بوونە قوربانی. هەروەها جەلال حاجی و ئیسماعیل گەلاڵەیی و شێخ شەماڵ و چەندانی دیکە کە ناوەکانیانم لە بیر نەماون

لەگەڵ بوونی قادر خەبات، ڕەحمان سەیدەی برای شەهید مەحمودسەیدەی بەناو و دەنگی ناوچەکە، وەک هەڵسوڕاوێکی کۆمەڵە، چ وەک مەسولێکی عەسکەری یەکێتی لە ناوچەکە، پێکەوە هەموویان پەرژینێکی چالاکی کۆمەڵە و گەشەکردنی ڕێکخستنەکان بوون. بۆیە ناوهێنان و یادکردنەوەیان لەو لاپەڕانەدا، دەرخستنی ڕاستییەکانی خەباتی بێوچانی خەڵکی ناوچەکەن کە لە ڕیزەکانی کۆمەڵە ژمارەیەکی دیار بوون.

ئێمە لە پێشەوە لە گوندی دەرگەلە، بە هۆی ناسیاوی کۆنینە و هاوکاری م. یوسف دەرگەلەیی، سەرەتای ڕێکخستنمان لە ناو هەژارترین خێزانی گوندەکە پێکەوە نا، کە بریتی بوون لە مام وەسمان، م. عومەر، خەبات کە دولیی بووە پێشمەرگە و شەهید بوو. هەروەها هاوڕێیان مام هێدی و مەلاکاوە لە ڕێگای مەلا واحیدی گوندی، ڕۆڵێکی بەرچاویان لە بڵاوبوونەوەی دەنگی کۆمەڵە لەو گوندانەی دەوروبەری شاخی هندرێن هەبوو

## هاوکاری دەستەیەک پێشمەرگەی جەربەزە

دەستەیەک لەو پێشمەرگانەی باڵەیی بناری قەندیل کە لە دەوروبەری مام هێدی بوون و هەموویان هاوڕێی کۆمەڵە بوون. لە نموونەی ئاسۆ، هەڵمەت، هەژار، ئاوارە، ڕەنجە، هیوا، قادر، بێستون و هتد... بۆ پشتگیری کردنمان و هاتنیان بۆ ناوچەکانی دەوروبەری ڕواندز و خۆشناوەتی لە شانی ئێمەدا. بە گیانی هاوڕێیانە بوونە پشت و پەنامان لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانمان. بە جۆرێک لەگەڵ سەرەتای ناخۆشییەکان هاوڕێ و هاوڕێکامانبوون. لە پاراستن و بەدەنگەوە هاتنمان هێز و ورەیەکی لەبن نەهاتوی زیادەیان پێمان بەخشی. وەک دەستپێک لە پیادەبوونی ئەرکی ڕێکخراوەیی بێسڵەمینەوە پشتیوانمان بوون.

ڕۆژێکی بەفراوی کە دنیای ئەو گوندانە بە بەفر دەستی بەسەردا گرتبوو. لە گوندی دەرگەلەوە بەرەو گەرووی گوندی سەلان، بۆ سەر لاپاڵێکی چیای هەندرێن دەسرازەمان بەست. لە شانی مام هێدی دەستەیەک پێشمەرگەی چەکداری گورجوگۆڵ ئەو بنارەمان بڕی و سەرەوهەوراز کێل بووینەوە. کە ئەو ڕۆژە هەموو بست و بنارێکی دەڤەرەکە یەک پژدێن بەفر سپی ئاوداماڵ بوو. بە چەشنێک کێو لەبن چەتر و تارای سپی دەستی کێوێکی دیکەی گرتبوو. ترسی تێکەڵ بە ڕەشەبای هەڵکردووی بە چرپ و هۆڕی

جەندرمەکان، بۆسە و تەپکەی سوپای داگیرکەر و رەوە جاشی خۆماڵی سەریار بوو. کە ئەو رۆژە دۆندی هەموو لووتکە و بەرزایی سەر شێو و دۆڵەکانیان مۆڵدابوو. کەچی پێشمەرگە بێمنەت لەو هێزەی دوژمن، بەدوای سەردانی گوندەکانی گەرۆیان و گەرۆیان لە حەوزی رەواندز پەڕینەوە. بە ملەشاخی کۆرەک بەسەر گوندەکانی بلەی ژوور و بلەی ژێری داکەوتین و بە تێکەڵبوون بە خەڵکەکەی چەند رۆژێکمان گوزەراند. پاشان لە جغزی جەربەزەیی پێشمەرگایەتیدا و چاونەترسی هاورێ کاکەمین، کە لە گوندی دەرگەلەوە بە خۆی و تفەنگە _ئار بی کە_ کەی گەیشتەوە کاروانەکەمان و لە شانی مام هێدیی پارتیزانی بە حەوسەلە و بەرچاوڕوونی مەفرەزەکەمان وەک بەرپرسی سەریازیمان، لە ناو تەمتومانی هەوری ئێوارەیەکی درەنگ، بەدوای یەکترییەوە قەف قەف زنجیرەمان بەستبوو. لەگەڵ تاریکایی ئێوارەی ئەو رۆژە و بە پەنا یەکترییەوە هەموو خۆمان گەیاندە دەوروبەری گوندی ئالانەی نزیک بە ناحیەی خەلیفان لە بناری شاخی کۆرەکدا. بەدوای گەیشتن و گردبوونەوەی گشت پێشمەرگەکان، مەفرەزەکەمان بە دوو قۆڵەوە دابەش بوون. لە پاش دانانی نهێنی شەو و دیاریکردنی کەمینی بەرەبەیان لە هەردوو قۆڵەوە. هاورێیان حاجی ئەکرەم و مەسعودعەقاری و کاکەمین و چەندان پێشمەرگەی دیکە بۆ ناو گوندی ئالانە شۆڕبوونەوە. ئەوانی دیکەش بەسەرپەرشتی بەرپرسە عەسکەرییەکەمان، مام هێدی و هاورێیان وریا قادر و دکتۆر وەلی و ئەز و چەند پێشمەرگەی دیکە، روومان لەو تاقەماڵەی دەرەوەی گوندی کرد کە ساڵی پار بە هاورێتی سەید کەریم و کۆمەڵێک پێشمەرگە شەوێکی لێی مابووینەوە. کوڕی بنەماڵەکە _سلێمان تەقیەدین _ وەک دۆستێکی کۆمەڵە، ئەو دەم قسەمان لەگەڵ کردبوو. سلێمان و دایکە میهرەبانەکەی بەو پەڕی دڵسۆزی، بە پەرۆشەوە پێشوازییان لێ کردین و دەرگای دیوەخانی بەسەرپشتدا واڵا کردەوە.

ئەو رۆژە بۆ ئێمە، دۆستایەتیی گەرموگوڕی ژنێکی لاچەکبەسەری کوردەواری، لە شانی جگەرگۆشە خورتەکەی، نیشانەیەکی پڕ لە ریز و خۆشەویستی بۆ پێشمەرگە و بەرانگژبوونەوەی رژێمی بگرویکوژی بەعس بوو. کە لە هەمێزی هەست و نەستی یەکەیەکەمان و یەک بە قەدەر باڵای خۆمان، چرۆی سەربڵندی لە دڵ و دەروونمان بەگوڕتر کرد.

شەوەکەمان مینا لەگەڵ سلێمان و دایکی، کە پڕ بوو لە لە یەکتر تێگەیشتن و گفتوگۆی هاوڕێیانەی ئەوێ ڕۆژان. ئەوان بەتایبەت دایکە دڵسۆزەکەی سلێمان کە هەموو گیانی، لێوان لێو بوو لە خۆشەویستی وڵات و نەتەوەکەی. لەو ئەزموونەی لە هەگبەی ئەو بێوەژنە کۆستکەوتووە هەبوو. گەلێک لە دەرس و ئامۆژگارییەکانی، بۆ ئێمە سەرمەشقی ئەو هەوڵدانە دژوارەبوو، کە بە سادەیی باوەشمان لێوەرهێنابوو. بەو نیازەی لە ئەنجامدا بەو هەموو سەختی و دژوارییانە دەوێرین..! بۆ مێژوو سلێمان یەکەم هاوڕێی کۆمەڵە بوو، بۆ یەکەمجار لە دۆڵی ئاڵانە بە فەرمی لە ڕیزەکانی کۆمەڵە ڕێکخرا. بەیانییەکەی ئێمەش لەگەڵ هاوڕێیانی دیکە، حاجی ئەکرەم و ئەوانی تر لەسەر جادەی بەرەو خەلیفان یەکترمان گرتەوە. ئەوان بۆ شەوەکەی سەردانی مامۆستاکانی ئەو گوندەیان کردبوو کە لە ناویان، دڵشاد خۆشناو، نەجیبە، سائیرەی دیان هەبوو. هەرسێکیان دۆستی ئێمە بوون و هەر لەوێ ڕۆژەوە بە هۆی حاجی ئەکرەمەوە، پەیوەندییەکی خۆشەویستی لەنێوان ئەز و نەجیبە قەتارەی بەست. کە پێشتر دوور بە دوور یەکترمان دەناسی و ماڵەکەیان لە ناو شاری هەولێردا، بەرانبەر ماڵی حاجی ئەکرەم و دەستەخوشکی ژنەکەی بوو. لێرەدا ئەز لەگەڵ خۆم و ڕەوتی خەباتی ڕێکخراوەیی و پێشمەرگایەتی هەرەتی تەمەنم، بەبێ هیچ پێچ و پەنایەک، چیرۆکی خۆشەویستی نێوان خۆم و نەجیبەخان وەک بووە، دەیگێڕمەوە و باسی دەکەم. بەڵام لەلایەن کەسێکی ویژدان پوتی دەم بەسەرهاتەکان م .ئا، ئەو گێڕانەوەی من سەبارەت بە هاوڕێ نەجیبە کە دوایی بووینە هاوژینی یەکتریی. مایەی پرتەوبۆڵە بووە و گوایە ئەوەندەی من باسی نەجیبەم کردووە، ئەوەندە باسی کۆمەڵە و ئاڵای شۆڕشم نەکردووە..! لێرەشەوە بەو کەسە بێچاوڕووە دەبێژم، تەبیعی هاوڕێ نەجیبە وەک کچ و ژنێکی بێماندوبوونی پاکانەپڕکردنەوە، بێ دووجار تەسلیم بوونەوەی لە دوای یەک بە ڕژێمی بەعس. نەجیبە وەک هاوڕێیەکی کۆمەڵە و ئاڵای شۆڕش، لە کەسی تەنیا زۆربڵێی دیکە، بۆ کۆمەڵە و ئاڵای شۆڕش ماندوو بووە و قوربانیدانی نەجیبە بە یەکەم کۆرپەی لە دەمی لەدایکبوونی ئاڵای شۆڕش، دەبوو تۆی بێچاوڕوو دەمی هەڵنەپچڕی و زاتی ئەو زماندرێژییەی پەنا و پەسیوان نەکات..! من بۆیەش ئەو چەند وشەیەم نووسیوە، تاکو بە بەڵگە پێتانی بڵێم، هێشتا لەناو کاروانی ترەکەڵەکی حیزبی کوردی باشوور، باسکردنی ژنی تێکۆشەر و خاوەن قوربانی بڤەیە و ڕاستی باسکردنی چیرۆکی خۆشەویستی پاک و بە

ئەنجامگەیشتنی سەربڵندانە، لە لای پیاوی کوردی عوتورلی خاوەن چەند ژنی بەستەزمان لە یەک کاتدا نا خوات.

من وەک سەرمەشقێکی پراکتیکی لە چیراوکەی عەشقی خۆمدا، سەربڵندانە لە پاڵ رەوشتی کەسایەتیم بووەتە شوورەیەکی پۆلایین لەوەی، لەوێ رۆژانیش لە سێبەری تفەنگی شانم، جورئەتی پرکێشیکردنە سەر سەروەری ناموس و شەرەفی (روکەشی کوردەواری) هیچ ژن و کچێک نەکەم و بەوپەڕی سەربڵندی هەردووڵامانەوە (نەجیبە و خۆم) خێزانێکی سەرکەوتووی خاوەن چوار کیژۆڵەی ناسک و نازداری لێ کەوتووتەوە کە هەرچواریان لە سایەی وڵاتی سویدی سەرکەش پێگەیشتوون. خاوەن بڕوانامە و کاری بەرچاون و لەسەر پێی خۆیانن. هەر لێرەوەش لە پەراوێزی ئەوەندە دەسەڵاتەی هەمانبووە، بە هاوکاری بەشی زۆری هاوڕێیانی رێکخستنەکانی کۆمەڵەوە، لە سنووری چالاکی و هەڵسوڕانی رێکخراوەییماندا، ئەوەندەی ئاومان لەدوو بێرێ هاتبێت، ئەو جۆرە سەرەتایەمان بە ئاشکرا و بە گفتوگۆی هاوڕێیانە پیادە کردووە. چونکە من هەر لەسەرەتاوە بە هاوڕێیانم گوتووە، سەرپشک بن لەوەی، ئەگەر هەر لادان و زێدەڕۆییەکیان لە من بە دی کرد. راشکاوانە بمخەنە ژێر پرسیار و قبووڵی نەکەن، چونکە خۆم لە هیچ کەس و مەسیولێکی گەورە و بچوکم قبووڵ نەکردووە و نایکەم. بۆ ئەو بەدەنگەوە هاتنەشم، بە تایبەت بە رووی مەسولە عەسکەرییەکان، کە هیچ کەسێک رووبەڕوو بۆ شەرواڵ پیسییەکانیان و بازنەدان بەسەر هەر فرسەتێک بۆ پرکێشی کردنی زۆردارانە بۆ سەر سەروەرییەکانی ژن و کچەکان، کەس لە گوڵ شیرینتری پێ نەگوتوون، بەڵام ئەز بۆ بەرانگژبوونەوەی شەخسی ئەو کەسانە و ئاگادارکردنەوەی ناوەندی کۆمەڵە، گومرگی زۆرم داوە و بەسەرم کەوتووە و لەو پێناوەدا چەندان جار لە قورگی مەرگ گەڕاومەتەوە. کە هەنوکەش پێی سەرفراز و ئاسوودەم. بەڵام هەنوکە بیرکردنەوە و دنیای هۆش و بیرم جۆر و شێوازیکی فێربوونی چەند سەرەواوێکی وڵاتی سویدی لە هەمێز گرتووە و پێکەنینم بە عەقلی لەوجۆرە دێت.

ئیتر لە رێگای مامۆستایان، نەجیبە و سائیرەوە لە لایەک و سلێمان تەقییەدین لە لایەکی دیکەوە، گوندی ئاڵانەی بناری شاخی کۆڕەک بووە بنکەیەکی بڵاوبوونەوەی دەنگوڕەنگی رێکخستنەکانی کۆمەڵە. ئێمە تێکڕای هاوڕێیانی کەرتی رێکخستنی شەقڵاوە هەر ئەو رۆژە بە رێگای قەدبڕەوە خۆمان گەیاندە گوندی بناوی پێش گوندی خەتێ، کە

گەورەترین گوندی دۆڵەکە بوو. لەوێش لە پێشەوە برادەرێکمان هەبوو، کە فەراشی قوتابخانەی گوندەکە بوو، ناوی غەفور بوو. لە دەمی دابەشبوونی پێشمەرگەکان، من لەگەڵ کاردۆ و کاروان بەیەکەوە چووینە ماڵی غەفور و هێشتا لە قوتابخانە نەهاتبووەوە. ئێمە بۆ ئەوەی بە تەنیا لە ماڵەکەی دانەنیشین و هەرسێکمان روومان لە قوتابخانەکە کرد. کە خەریک بوو دەوامی ئەو رۆژە تەواو دەبوو. پاش دیدەنی غەفور و ناساندنی بە کاردۆ وەک کادری رێکخراوەیی لەو ناوچەیەدا، سەرێکمان لەو دوو مامۆستایەدا کە لە ژووری خۆیان بوون، کوڕەکەیان قەیسی ناوبوو، مرۆڤێکی هەست ناسک و بەرێز بوو، زۆر دۆستانە بەخێرهێنانی کردین و دیار بوو لە هەولێرەوە خۆمی دەناسی، چونکە خۆی دەستی هونەری وێنەکێشان و خۆشنووس بوو. هەتا ئێمە لەو ناوچەیە دەسوڕاینەوە، وەک دۆستێکی راستگۆ هاوکاری کردین. مامۆستاکەی دیکە، کچێکی خەڵکی گەڕەکی تەعجیلی هەولێر بوو، بە ناوی سورەیا کە دەزگیرانی دڵشاد مەولوودی هاوڕێی خۆمان بوو. ئەویش بۆ پشتگیریکردنمان لەو دەڤەرە درێغی نەکرد. دەبێ ئەوەش بڵێم من کە پێشتر لەگەڵ دکتۆر مەجید عەولا و سەیدکەریم و دەستەیەک پێشمەرگە بەو ناوچەیە سوڕاومەتەوە و تارادەیەکی باش، ئاگاداری بارودۆخی ناوچەکە بووم، کە هەتا ئەو رۆژانەش هێزی حسک لەو ناوچەیەش زۆربە بوون و لەو گوندە بە تایبەت ناتەبایی دوژمنکارانە لە نێوان چەند بنەماڵەیەکی دەستڕۆیشتوو هەبوو. کە لە هەردوو لایان چەکدارییان لەگەڵ حسک هەبوو. رێکخستنەکانی کۆمەڵە و هەڵسوڕانی رێکخراوەیی لەو دەڤەرەدا، تای تەرازوی هێزەکان کەوتبووە دەمی ئاڵوگۆڕی. بە جۆرێک لە زۆربەی ئەو گوندانەدا، رێکخستنی کۆمەڵە جێگای خۆی لەناو رێزەکانی خەڵکەکە کردبووەوە. یەکێک لە کارەکانی ناو خەڵک، لەوان رۆژاندا ئێمە بچووینایە هەر گوندێکەوە، کامە جوتیار هەژار و بەلەنگاز بوو، هەر کار و ئیشێکی هەبوایە، هەموومان بە کاری هەرەوەز هەر ئەو رۆژە بۆمان بۆ تەواو دەکرد. ئەوجا چ جۆگەلەی ئاو پاککردنەوە، خانووکردن، بەروبۆم بەناوهێنان، کەپرکردن، درووێنە، پاککردنەوەی زەوی و بژار، سەربان کوتانەوە لەدەمی دڵۆپەکردن، یان پاکوخاوێنکردنەوەی مزگەوت و قوتابخانە... هتد.

ئەو کار و کردەوانەمان تارادەیەکی باش سەرنجی هەتا نەیار و لایەنگرانی حیزبە چەکبەدەستەکانی دیکەشی راکێشابوو. هەروەها لە کارە دیارەکانی دیکەی کەرتی رێکخستن، لە رێگای هاوڕێی رۆژانی تەنگانە، دکتۆر رەوا _ وەلی حاجی قادر _ نیمچە

بیمارخانەیەکی گەڕۆکمان هەبوو، لە هەر کوێیەک و بنەماڵەیەک نەخۆش و پەککەوتەیەک هەبوایە، دکتۆر رەوا چ وەک پزیشکێک و یاخود کادرێکی هەڵسوڕاوی کۆمەڵە، بە هاوکاری هاوڕێیانی دیکەوە، رۆڵی جوامێرانەی هەبوو بۆ پەرەسەندنی رێز و خۆشەویستی خەڵکەکە بۆ رێکخستنەکانی کۆمەڵە. دیارە نابێ ئەوەم لە بیر بچێت، هاوڕێیەکی پەرستیاری ژن هەبوو، کە لەو بنکەی تەندروستی خەلیفان کاری دەکرد، بۆ داو و دەرمان ناردن درێخی نەدەکرد، ناوەکەیم لە بیر نەماوە.

پاش چەند رۆژێک سوڕانەوە بە ناو گوندەکانی ئەو بنارەی هەروتییان، بە تایبەت گوندی بناوی و خەتێ، توتمە و ئەشکەوتە، هەروتەکەوێ، تارینا، بەنەبناوی، زینێی بناری شاخی زینەتیرێی ئەڵقەی نێوان زنجیرەی بەنی هەریر و زنجیرەی هەورێ. هەر لەو گوندەی دواییدا، هاوڕێیانی جووتە برا، وریا و رەوا، ژوانی دیداریان لەگەڵ ماڵی باوکیان دانابوو. کە مام حاجی قادری سەریلَند، بە بێ گوێدانە هەر مەترسییەکی لێپێچینەوەی دامودەزگاکانی رژێم، بە سواری جێبێک، بەرەبەری نیوەڕۆ بوو، گەیشتە شوێنی دیاری کراو. ئەوان یەک کەلەش ئاژەڵی سەربڕاو و کۆمەڵێک خواردنی هەمە چەشنەیان بۆ ئێمە پێبوو. ئیتر ئەو رۆژە بەخۆشی دیداری ئەو بنەماڵەیە کاتمان بەسەربرد و بۆ گەڕانەوەشیان، ئامۆژگاریمان کردن بَۀ لای سەروچاوەی دەروازەی رانیەدا بگەڕێنەوە، نەوەک تووشی گێچەڵی زیاتری سەیتەرەکەی خەلیفان ببنەوە.

لێرەدا بۆ ئەوەی لە بیرم نەچێتەوە. سەبارەت بە هەردوو هاوڕێ برا __ وریا و رەوا__ کوڕانی حاجی قادری، لە شانی سەرجەمی هاوڕێیەکانی دیکەوە، لە ژیانی شاخ و رێکخراوەییدا، نمونەی ئینسانی راستگۆی بە وەفای ئەو کاروانی خەباتە بوون. چ وەک ئەندام و کادرێکی میرخاسی ریزەکانی کۆمەڵە لە شار و شاخ دا، دواتر وەک هەڵسوڕاوێکی هەتا سەری ئاڵای شۆڕش بێسڵەمینەوە و گیانبازانە بێمنەت بوون. بەشێکی هێجگار زۆری لەدایکبوونی نووسینەوەی ئەو یادەوەرییانە و بڵاوکردنەوەیان بۆ لاوچاکی بە دەگمەنی هاوڕێ وریای حاجی قادر دەگەڕێتەوە. چونکە تاکە سەرچاوەی نووسینەوەیان بۆ ئەو دەفتەرۆکەی گیرفانم بنەگەی داناوە کە بۆ تۆمارکردنی سەرنجەکانم لەسەر لاپەڕەکانی دا و لە دەمی سەفەری ناچاری ئاوارەبوونم. هاوڕێ وریا ئەو دەفتەرە بچکۆڵانەی وەک ئەمانەتێک بۆ هەڵگرتبووم. لەگەڵ یەکەم گەڕانەوەم بۆ کوردستان، لە بنکەکەی ئاڵای شۆڕش لە ناوچەی سۆران لە ساڵی ١٩٩٢ تەسلیمی

کردمەوە کە بە دڵ و گیان بۆی پاراستبووم. هەردەم ئەو جوامێرییەی لە بیر ناکەم و خۆم و ئەو یادەوەرییانە بە قەرزاری گیانی نەمری وریا دەزانم و پێشکەش بەو گیانە بەرزەی دەکەم. وریا بۆ ئاڵای شۆڕش کادرێکی لێهاتوو، پێگەیشتووی دەم دژوارییەکان بوو.

ئێوارەکەی بە شێوەیەکی پێشمەرگانەی رێک و پێک، بنارە و بناری زنجیرە شاخی هەوریێ بۆ درەنگانی شەوێ خۆمان گەیاندە گوندی دەراشی نزیک جادەی بالیسان. ئەوە بوو دوای دانانی نهێنی شەو بۆ لای ماڵە جوتیارەکان دابەش بووین. تاکو لە نزیکەوە تێکەڵیان بین و لە باسوخواس، گوزەرانی ژیانیان بەسەربکەینەوە و ئەوانیش رێکخستن و بیروباوەڕەکانی کۆمەڵە بناسن. بەبێ ئەوەی هیچ یەکێکمان بۆ ئەو ژەمە نان بخۆین. چونکە هێشتا بەو هەموو خواردنەی حاجی قادر ورگمان تێر بوو. کە بە لای جوتیارەکانی گوندەکەوە سەیر بوو. ئێمە زۆرتر قسەمان بۆ کردن، سەبارەت بە خەبات و چینە رەشوڕووتەکان زانیاریمان بۆ گوتن. بەتایبەت کۆمەڵە و تێکۆشانی خەڵکی کورد لە چ دۆخێکدایە. شەوەکەی بۆ خەوتن هۆدەیەکی لاچەپمان لە گوندەکە پەیدا کرد و بە قەرەپەستانێ و دانانی پاسەوان شەوەکەمان بە بەیانی گەیاند. لەگەڵ تاریک و روونی سەرەتای رۆژ، خۆمان گەیاندە ناو گوندی ریالیسان. بە هاوڕێیان شێخ سلێمان، زاهیر خۆشناو، سەباح حاجی تایەری مێرگەسەری، کەمال زێوەیی کە خەڵکی ناوچەکە بوون، بە دیداریان شاد بووینەوە. لە شانی ئەوان بۆ ژەمە نانخواردنی بەیانی بەسەر ماڵەکان دابەش بووین. پاشان هەمووومان لە دەرەوەی گوندی و سەر رێگای گوندی کانیبەرد یەکترمان گرتەوە. پاش کۆبوونەوەکی سەرپێی، بەرنامەی کاری خۆمان بۆ ئەو چەند رۆژە دیاری کرد و بە چاکمان زانی هەموو کەرتەکە لە پێشەوە، هەر لە گوندی بالیسانەوە هەتا گوندی هەرتەل لە بناری بێتواتە و شاخی ماکۆک و دەرەدار جەولەیەک بکەین. لەبەرەوە سەردانی ئەو هاوڕێیانەمان کرد، کە هەر لە گوندی کانیبەرد، لە بنکەیەکی نهێنی سەریان بەیەکەوە نابوو، کە بریتی بوون لە وەرزێر، دڵشاد، شیرکۆ، دلێر، نەوزاد عزیز و چەندانی دیکە کە بە لێبوردنەوە ناوەکانیانم لە بیر نەماوە. ئەوان بە هیمەتی خۆیان لەو گوندە بە تایبەت باریکە رێچکەی پەیوەندی رێکخراوەییان لە چوونە ناو خەڵکە زەحمەتکێشەکەی گوندی کانیبەرد سازدابوو. ئەو برادەرانە پێشتر نوێنەرێکیان سەردانی ناوەندی کۆمەڵەی لە خڕی ناوزەنگ کردبوو. ناوەندی کۆمەڵە

رایسپاردبوون هەر لە شوێنی خۆیان چاوەڕوانی هاتنەخوارەوەی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە بن. لەو پێکەوە گردبوونەوەیەدا، ئەوەمان پێڕاگەیاندن کە وەرزێر وەک ئەندامی کەرتی ڕێکخستن دەست بە کار دەبێت. ئەوێ ڕۆژێ وەرزێر کوڕە هەژارێکی خوێنگەرم و هێجگار بە دەستوقام بوو. نموونەی کادری بە عەزیمەت و پڕ چالاکی بوو، مرۆڤێکی خاکی و خاوەن هوشیارییەکی چینایەتی. لە هەڵسوراندنی کاروباری ڕیکخراوەیی بە سەلیقە و دەستڕۆیشتوو بوو. ئەو ڕۆژە دەربارەی بیری مارکیسزمی کۆمەڵە گفتوگۆیەکی گەرممان ئەنجامدا و بیرکردنەوەکانمان بە یەکتری ئاوێتە بوون.

ئەوانەی لە دەوروبەری وەرزێر کۆببوونەوە، هەموو ئەویان بە مەسولی خۆیانیان دەزانی. دەمودەست لەگەڵ وریا حاجی قادر و دڵشاد و بە هاوکاری هاوڕێیەکانی دیکەوە پۆلێکمان بۆ کاروباری ڕێکخراوەیی ناوچەی بەڕانەتی پێکهێنا. زۆربەیان شارەزا و هەندێکیان کوڕی ناوچەکە بوون. بەڵام ئەوانیش گرفتی بێچەکییان هەبوو. دەبوو لە پێشەوە مشوری چەکداربوونیان بخۆین. چونکە بۆ یەکەمجار بوو، مەفرەزەیەکی ڕێکخستنی کۆمەڵە بگاتە ئەو ناوچە دوورە دەستەی هێزەکانی یەکێتی، واتە ناوچەکانی بەڕانەتی و خەیلانییان و زرارەتی. مەسعود عەقاری وەک بەرپرسی کاروباری دارایی کەرتەکە دانرابوو. ڕەوا و حاجی ئەکرەم و بەندە هاوکاری و دەستباریمان دەکرد. ئەوەندەی لە بیرم نەچوویێت، هاوڕێیان مەسعود عەقاری، وریا و ڕەوای حاجی قادر لەسەر گیرفانی ماڵەوەیان، بە هاوکاری کەمال زێوەیی و ماڵی حاجی تایەری مێرگرسەری سەر و تفەنگی کلاشینکۆفیان بۆخۆیان کڕی. هەروەها حاجی ئەکرەم و خۆشم لەو کۆمەکەی لە ماڵەوە بەدەستمان گەیشت، ژمارەیەک تفەنگمان بۆ چەند هاوڕێیەکی بێچەک کڕی. بۆ شەوی دواتر هەوارمان بردە گوندی شێخوەسانانی بناری دەرەداری شاخی شیرێ. لەوێش لە ڕێگای هاوڕێ شێخ سلێمانەوە، توانیمان سەرەتای شیرازەیەکی نوێی هەوادار بۆ کۆمەڵە ساز بدەین. ئەو شێخ سلێمانەی ساڵی ١٩٧٩ لە دەورەیەکی پێگەیاندنی کادرانی کۆمەڵە بەشداری کردبوو، ڕۆڵەیەکی هێجگار بە تۆلەرانس و هێمن و بەرچاو گەش بوو. سەرباری ئەوەی لە باوەشی خێزانێکی ئایینی گەورە ببوو، بڕوایەکی پتەوی بە کۆمەڵە و بیروباوەڕە م_ل یەکەی هەبوو. بە هەڵسوکەوتەکانی خۆشەویستی ناو خەڵک و هاوڕێیان بوو. بەدوای دوورخستنەوەی بەندە لە ناوچەکە و کاروباری ڕێکخراوەییدا، شێخ سلێمان لە ڕووداوێکی نامۆمژاویدا، لە دەمی

پەڕینەوەی لەگەڵ مەفرەزەیەک لە چەندان پێشمەرگە، لە سەرجادەی کۆڕێ _ ئارمەواندا، بە دەستێکی رەش، تەنیا دەستڕێژ لەو دەکرێ و بەوپەڕی نامەردی و بێکەسی شەهید دەکرێ. بەبێ ئەوەی یەکێکی مەسول بەدواداچوون بۆ شەهیدکردنەکەی بکات ..!

هەر لە گوندی شێخوەسانان کەسوکاری مەسعود عەقاری بە یەک جەواڵ خۆراک بەسەریان کردینەوە. نورەدینی برای مەسعود خۆی لەگەڵیان هاتبوو. وەک هاوڕێیەکی بەدەستوبرد بۆ راپەڕاندنی کارەکانمان بەردەوام لە هاوکاریکردنمان مێرخاس بوو. نیوەڕۆیەکەی تێکڕای هاوڕێیانی کەرتەکە بە کۆمەڵ لەسەر سفرەی ئەو خواردنە جۆراوجۆرە گردبووینەوە. ژەمە خوانێکی پڕ چێژ و تێکەڵ بە گفتوگۆمان بەسەر برد و هاوڕێیەکیشیان بۆ پێشمەرگایەتی لەگەڵ خۆ هێنابوو کە دواتر بە برایم برنۆ ناسرا. بەدوای بەڕێکردنی کەسوکاری مەسعود خۆشمان بەدوای یەکترییەوە روو لە گوندی بێراوە زنجیرەمان بەست. من پێشتر بەوە ئاگادار بووم کە دوو هاوڕێی شاری لەو گوندەن. کە هاوڕێیان تەلعەت خدر و شەوقی عباس بوون. سەرەتای پێشمەرگەکان لەناو گوندەکە یەک لە دوای یەکەوە، پرسیان کرد کە لەگەڵ مەلا غەفور لە گوندی شێخوەسانانەوە بە ئێمە گەیشتبوو، بەدەم قسەکردنەوە لە دواوەی هەمووان دەڕۆیشتین. منیش رامسپاردن تەنیا چەند پێشمەرگەیەک لەگەڵ حاجی ...ئەکرەم بمێننەوە و ئەوانەی دیکە بە سەرپەرشتی مام هێدی و شێخ سلێمان بچنە گوندی شیرێی سەروو. لەوێ بە وریایی دابمەزرێن و چاوەڕوانی ئێمە بکەن. هەرکە گەیشتینە ناو گوند. سەیرم کرد شەوقی و تەلعەت لەگەڵ رێباز بە یەکەوە لەسەر بانێک پیاسە دەکەن. شەوقی کە چاوی بە من کەوت و یەکسەر بە پێشوازیمانەوە هات. لەگەڵ هەرسێکیان بە یەکتری شاد بووینەوە. ناسیاوی من و شەوقی لە باو و باپیرانەوە بوو. باپیرمان، باوکمان، خۆشمان هەر برادەری یەکدی بووین. بەدوای هەندێک پێکەوە وەستان. لەگەڵ شەوقی بە چاو یەکترمان خوێندەوە. مەلا غەفور لەتەک تەلعەت و رێباز _ رەفعەت عبدوڵڵا _ مانەوە. منیش بە بیانوی دەست بە ئاو گەیاندن، لەگەڵ شەوقی جیا بووینەوە. دیار بوو شەوقی تەزکیەی رێکخستنەکانی شاری بۆ ناوەندی کۆمەڵە پێ بوو. من قسەی ئەوەم لەگەڵ کرد، با بە ئارەزووی خۆی بکات. چ لەوەی سەفەری چوونە ناوەندی کۆمەڵە یاخود هەر لێرەوە بەگەر ئێمە دەکەوێت. جێگای خۆی وەک کادری کەرتی رێکخستن دەگرێ. ئەوە

بوو خۆی پێی خۆش بوو، لێرە بمێنێتەوە و دوای ناردنەوەی ژن و منداڵەکەی بۆ لای کەسوکاری لە شاری. هەر بە پارەی گیرفانی خۆی چەکدار کرد و ڕۆژی دواتر پەیوەندی پێمانەوە کرد. شەوقی عەباس یەکێک بوو لەو ئەندامانەی کۆمەڵە، هەر لە یەکەم ڕۆژەوە پێوەی دیار بوو. کادرێکی هوشیار و خاوەن کەسایەتییەکی بەرچاو بوو. تا بڵێی ورد و بە سەلیقە و خوێندنەوەیەکی زیرەکانەی هەبوو. سەبارەت بە کۆمەڵە و لە لای من ئەوەی نە دەشاردەوە، کە ئەو ڕێکخستنە خاوەن خەڵک و زەخیرەیەکی باشە. بەڵام سەرکردایەتییەکەی لە ئاست ئەرک و خواستەکانی فەلسەفەی خەباتی زەحمەتکێشان زۆر لە دواوەیە. هەر ئەو ڕۆژە ئەو کادرە، هەندێ لەو سەرکردانەی بە نەرجسی و خۆویست و مەکرۆ و فێڵباز لەناو ڕێکخستنەکە هەڵسەنگاند کە وەک نەخشی سەر بەرد بۆچوونەکانی ڕاست دەرچوون.

ئێمە ئەو کۆمەڵە برادەرە، بەبێ هەر جۆرە بیرکردنەوەیەکی پێشینە و تەنیا خۆرسک کە لە ڕیزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵەوە، دەتگووت بە چرا یەکتریمان دۆزیوەتەوە. تەنیا و تەنیا ڕەفتارەکانمان مینای بیرکردنەوەکانم بوو. کە بوو بە هۆی فشار بۆ هێنانمان لە لایەن بەشێکی بەرپرسە دەستڕۆیشتووەکانی کۆمەڵە و بەتایبەت مەسولە عەسکەرییەکانی ناو هێزی پێشمەرگە و ناچارییان کردین، ئەوانەی هاوڕاو بە بۆچوونێکی تەواوکەری یەکتری و شان بە شان بجوڵێینەوە. بە تۆبزی بۆ خۆپاراستن فێری پشتوپەنای یەکترییان کردین. بە جۆرێک هەر لە سەرەتاوە بەو پەڕی بڕوا بە خۆ بوون، خەون و خۆزگەی گەورەمان هەبوو لە کەوتنە سەرپێیانی کۆمەڵە_یەکی مارکسی لینینی ئاشکرا.

لە هەموو بگرە و بەردەیەک بێمنەت هەنگاومان هەڵگرتبوو. لە دژواری و ڕووبەڕووبوونەوەی ناخۆشییەکانی ڕۆژانە بێپەروا، سەرمان لە دوو شەوەزەنگی دەورووبەرمان نابوو. لە دژی تاریکایی ئەنگوستەچاو ململانێمان بوو. بەڵام بەبێ ئەوەی پێی بزانین هەر چواردەورمان بە مینی دەستکردی ئێرە و ئەوێ تەنرابوو. چونکو بۆ خۆم پاش دەیان ساڵ لەو ڕاستییە گەیشتم. قەدەری کوردان لەبن و بۆتکەوە لە مەیدانی بزاڤی چەکداری لە باشووردا، لەگەڵ پاکی، ڕاستگۆیی، جوامێری، سەربڵندی، چاوتێری، پشت بە یەکتر بەستن، تەبایی ڕاستگۆیانەی بێفڕوفێڵ جمکانە نەهاتووتەوە و نایەتەوە

.دەنا بۆچی لە بەریەرەکانیکردنی ئەو خەڵکە بوێر و سەربڵندە ماندوو نەناسە، مەسولە سەرەکییەکان بێ سڵەمینەوە بوون..!

ئێوارە بوو، لەگەڵ ئەو کۆمەڵە پێشمەرگەیە بەرەو گوندی شیرێی سەروو، ملی باریکە رێگای قەدپاڵانمان گرت. هاوڕێیەکانی دیکەش لەوێ بوون. هەموو لە سەریانێکی درێژۆکانی گرد ببوونەوە. چاوەڕوانی بانگی مەلا و نوێژی ئێوارەی خەڵکەکەمان کرد. تاکو لەگەڵ جوتیارەکان دابەش ببین. لەو دەمەیدا لە دوورەوە، بە هاتنی مەهدی کاوانی لەگەڵ یەک دوو پێشمەرگەی تر ئاگادارکرامەوە. مەهدی لە دۆڵی هیران و نازەنینەوە، بە هاواری ئێمەوە هاتبوو. تفەنگێکی کلاشینکۆفی لە شان بوو، کڵاو و جەمەدانییەکی قیت و قۆزی کاوانیانی بەستبوو. ئەو دەمە تابڵێی خورت و گورجوگۆڵ بوو. ناسیاری و هاوڕێتی مەهدی و من بۆ دەیان ساڵی رابردوو دەگەڕایەوە، چ لە ریزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان ــ باڵی جەلالی ــ ئەوجا ئەڵقە رۆشنبیرییە سەرەتاییەکانی قۆناغی یەکەمی دروستبوونی کۆمەڵە. یەکێک بوو لەو خوێندکارانەی زانکۆی مستنسریە لە بەغداد، لە ریزەکانی کۆمەڵە لەناو رێکخستنەکانی بەغداد جێگای هەبوو. دوای ماچوموچی مەهدی لەگەڵ یەکە بە یەکەمان. خەڵکەکەش لە نوێژ بەربوون، هەر جوتیارە و دوو پێشمەرگەی بەگەر خۆیدا. من و مەهدی و دوو هاوڕێی دیکە مابووینەوە. لێرەدا مەهدی گوتی.. خۆ ــ رەهبەر جەلال ــی هونەرمەندی هاوڕێمان لێرە مامۆستای قوتابخانەی گوندییە. با ئێمەش بۆ ماڵەکەی ئەو بچین و ئەگەر خۆیشی لێرە نەبێت. خۆ ماڵێکی سەفەری داناوە، هەموو زەخیرەیەکی هەیە.

لەو دەمیدا کە ئێمە نزیک بە ماڵەکە بووینەوە، رەهبەریش وەک ئێمە، بەرەو ماڵەوە بوو. دیار بوو بۆ پیاسە چوو بووە بناری شاخی دەرەشیر. کە چاوی پێمان کەوت، لە دوورەوە ئێمەی ناسییەوە. لەبەرخۆیەوە روو لە ئێمە دەیگوت، من لە ئاسمانانم دەویستی، ئەوە لەسەر عەردی دەستم کەوتی. پێشوازییەکی گەرموگوڕی لێ کردین. پاش بەخێرهێنان و دانیشتن. رەهبەر بە هاوکاری مەهدی خواردنێکی برنج و شلەی فاسولیای بۆ ئامادە کردین. دۆستایەتی من و رەهبەر لە رێگای هاوڕێی هەر دوولامان سەباح عەبدوڵلا کۆییەوە بوو. لەوان ساڵان رەهبەر و سەباح هەردووکیان، دوو رەسامی دەسترەنگینی هەولێر بوون. رەهبەر کە خۆی لە بنەماڵەیەکی کوردپەروەری دڵ و دەروون پاکی سەربڵند بوو. لەناو شاریشەوە شانبەشانی کۆمەڵێک رۆڵەی وڵاتپارێز،

بازنەیەکی فیکری مارکسی _ لینینی یان هەبوو. وەک مرۆڤێکی خوێن شیرین و خاکی ئاشنای ببووم. نێوانمان هاوڕێیانە بوو، چونکە لە ڕۆژانی خوێندنی زانکۆش، هاموشۆی یەکترمان دەکرد. بە یەکەوە بەردەوام گفتوگۆمان هەبوو، بڕوای تەواومان بە یەکتری بوو و ئەدەبیاتی دەستنووس و چاپکراومان لەگەڵ یەکتری دەگۆڕییەوە. ئەو شەوەش ئەو هاوڕێیەتیەمان نوێ بووەوە و هەتا بەرەبەری بەیانی دیباتێکی دووروودرێژمان بەیەکەوە ساز کرد. لەوێ ڕۆژیش من حەزم دەکرد، ڕەهبەر وەک هونەرمەندێکی بەرەی گەل کار بکات، زۆرتر خەریکی هونەرەکەی بێت. چونکە بەهرە و خولیایەکی هونەری بە بڕشت و زەنگینی پێبوو. دڵنیا بووم ئەگەر تەمەن ڕێگای بدایە، مرۆڤێکی گەورەی لێ دەردەچوو. ئیتر ڕەهبەر لەو دەمی هەتا ئەو لەو گوندە بوو، سەرچاوەیەکی بە سوود بوو لەنێوان ئێمە و دۆست و برادەرانی شار. بەردەوام بە کتێب و گۆڤاری کوردی و عارەبی بەسەری دەکردینەوە. هەروەها ماڵەکەشی وەک بنکەیەکی نهێنی، لە خزمەتی هاوڕێیانی کۆمەڵەدا بوو. زۆر جاران بە شەو و نیوەشەوان، ڕەهبەر خۆی لەوێ بوایە و نەبوایە، بۆ حەسانەوە و ژەمەخواردنێکی گەرموگوڕ، سودمان لێ وەردەگرت. ئەوەی لە بیرم بێت، ئەوجارە دوو شەو و دوو ڕۆژان، لە هەردوو گوندی شیرێی سەرێ و شیرێی خوارێمان بەسەربرد، من و مەهدی بۆ شەوەکەی هەر لە لای ڕەهبەری دەماینەوە.

سبەینییەکی زوو بۆ گوندی مێرگەسەری سەرجادەی بالیسان گڵۆر بووینەوە. لەو گوندەبوو ئەندام کەرتێکی دیکەی کەرتی ڕێکخستن، کە لەلایەن ناوەندی کۆمەڵەوە ناردرابوو، بە ناوی شێخ قادر پەیوەندی پێمانەوە کرد. ناوبراو یەکێک لەو برادەرانەی لە ساڵی ١٩٧٧ بەر شاڵاوی گرتنی ڕژێمی بەعس کەوتبوو. دوای چەندان ساڵی زیندان، ئەویش وەک تێکڕای برادەرەکانی دیکە، بەر لێبووردنی گشتی کەوتبوو. دیار بوو بۆ ئەوە ڕەوانەی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە کرابوو، کە ئەوەندەی بۆی دەکرێ. ڕاپۆرتمان لەسەر بنووسی و بۆ توخمەکانی زیندانی بنێرێ. بە داخەوە سەریەشەی زۆری بۆمان دروست کرد. کە ئەو ناز ڕاگرتنەی ئێمەی وەک هاوڕێیەکی زیندانی قۆستەوە و لە ئازاردانمان درێخی نەکرد. بەبێ ئەوەی خۆی پلەوپایەیەکی دەست بکەوێ..! ئەندام کەرتێکی دیکەش بە ناوی نەوشیر سالح بە نووسراوی ناوەندی لەوان ڕۆژانی دواتر پەیوەندی پێمانەوە کرد. ئەویش هەر لە زیندانی ڕژێمەوە بە لێبووردنی گشتی بەربوو. کوڕێکی تا بڵێی گران و کەمدوو بوو. لێرەدا ستافی ڕەسمی کەرت تەواو ببوو، لە پاش

حەسانەوەی شەو و رۆژێک، کۆبوونەوەی کەرتمان بردە گوندی چیوەی سەرێ. بەرنامەی کۆبوونەوەکە بریتی بوو، لە دانانی نەخشەرێگای چالاکی رێکخراوەیی، دابەشکردنی شوێن و کاروبارەکان، پلانی پەیداکردنی دەسکەوت و بودجە بۆ چەککڕین بۆ پێشمەرگە و کادرە بێچەکەکان. کۆبوونەوەکە بە گوێرەی بەرنامەی خوازراوی ئەو رۆژە، کارەکانی راپەڕاند و تەئکید لەسەر ئەوخاڵانە کرایەوە، دەبێ کەرتی رێکخستن و هاوڕێ پێشمەرگەکانی، گفت و کرداریان لە ناو خەڵک تەواوکەری یەکتری بن، هیچ کەسێکمان مافی ئەوەی نییە، لە سێبەری چەکی شانمان، دەست بۆ سەر کەرامەت و سەروەری خەڵک درێژ بکەین، دەبێ خۆمان بە بەشێک لەوان بزانین، ئەوان بە پەرژینی گەشەکردن و پەرەپێدانی رێکخستنەکانی کۆمەڵە بخوێنینەوە. هەر لەو کۆبوونەوەدا، کارەکان بەم جۆرەی خوارەوە دابەش کران..

_ وەرزێر وەک ئەندامی کەرت و بەرپرسی پۆلی ناوچەی بەڕانەتی و زرارەتی و دەوروبەری کەلەک. لەگەڵ هاوڕێیانی لێهاتوی وەک دڵشاد محمد و وریا قادر و ژمارەیەک کادری گورجوگۆڵی وەک شیرکۆ و نەوزاد و چەندان پێشمەرگەی دیکە.

_ شێخ قادر ئەندامی کەرت و بەرپرسی پۆلی دۆڵی بالیسان و حەوزی خەلیفان، کە هاوڕێیانی ماندوونەناس، شێخ سلێمان و زاهیر خۆشناو و کاردۆ ئەندام پۆل بوون، لە شانی چەندان کادر و پێشمەرگەی تر..

_ نەوشیر ئەندام کەرت و لێپسراوی پۆلی دۆڵی هیران و نازەنین و دەوروبەری شەقڵاوە کە سالح سولاوکی و مەهدی کاوانی و دواتر فەرهاد کاوانی و کاروانی گەورە ئەندامانی پۆل بوون و چەندان پێشمەرگەی دیکە

_ حاجی ئەکرەم ئەندام کەرت و بەرپرسی پۆلی دۆڵی سماقولی و بناری سەفین و بەستۆرە. کە رەهبەری مام قلنج و فوئاد سوسەیی و کەمال گراوی ئەندام پۆل بوون، لەگەڵ مەفرەزەیەکی پێشمەرگە لە نموونەی فوئاد قەشقە و کاوە حاجی سادق و عزالدین دیبەگەیی و لووتعەبدوڵڵا هەنارەیی و یەک دوانێکی تر

_ سدیق سالح گۆران ئەندام کەرت و بەرپرسی پۆلی دەشتی هەولێر، کە پۆلەکە بریتی بوون لە هوشیار عبدالکریم، شەماڵ و ئاشتی سابیر مورتکەیی، چەندان پێشمەرگە و کادری وەک قاسم کرێکار و مەریوان و رۆستەم و هیوا.

به تەواوبوونی کۆبوونەوەکان، نەوشیر و شێخ قادر و حاجی ئەکرەم و وەرزێر و هاوڕێیەکانیان لێمان جیا بوونەوە و بە دوو کاری خۆیان کەوتن. ئێمە وەک ڕێکخستن بەدواداچوونمان بۆ دەکردن. بەیانی زوو هەر مەفرەزەیە و ڕێگای خۆی گرت. ئەز و مام هێدی و مەلاغەفور، لە تەک دەستەیەک پێشمەرگەی وەک کاکەمین و علی پونگینە، بە بەشداری شێخ سلێمان و زاهیر خۆشناو، هەتا نیوەڕۆکەی لە گوندی چیوەی سەروو ئۆقرەمان گرت. بۆ دابەشبوون لەسەر پێشنیاری مەلا غەفور هەردووکمان بەیەکەوە بۆ ماڵی حاجی سەلام بە ڕێکەوتین. هاوڕێیانی دیکەش دوو دوو بەسەر ماڵەکانی گوندەکە دابەش بوون. حاجی سەلام خۆی وەک جوتیارێک برا گەورەی گوندەکە بوو. خاوەن بەرو دیوەخان بوو، ئەو ڕۆژە دانوی لەگەڵ هێزی یەکێتی نە دەکولا بەلام من بە هۆی دۆستایەتیم لەگەڵ جەلالی ئەندازیاری کشتوکاڵ کە خوارزای حاجی سەلام بوو، ڕێزم لێ دەگرت و ببوومە قەڵغانی پاسکردنی..

نایەتەوە بیرم، مەلا غەفور چۆن و لەبەرچی، پێشنیاری چوونە ئەو ماڵەی بۆ کردم! چونکە کە ئێمە بە ژوور کەوتین. ئەوان ئاگاداری ئێمە نەبوون و حاجی سەلام لەدیوەخانەکەی دوو نەفەری لەلا بوو. بە ژوور کەوتنی ئێمە، خاوەن ماڵ و دوو نەفەرەکەی تووشی شلەژان و شۆک کرد. حاجی خۆی پرکێشی ئەوەی کرد ئێمە بۆ ژوورێکی دیکە ببات. بەلام ئێمە فرسەتمان نەدان و بە هێما هەردووکمان چوینە ئەو دیو و ئەم دیوی میوانەکان و دانیشتین. کە ئەو ڕۆژە هەردووکیان کادری حسک بوون. لەگەڵ بە ژوورکەوتنمان هەرئەوەندەیان بۆ کرا بە جەمەدانییەکانیان سەروگوێلاکی خۆیان دەمامک بدەن. تاکو ئێمە نەیانناسینەوە. ئێمە خۆمان زۆرمان ڕق لە شەڕی قێزەوەنی کوردکوژی ناوخۆ دەبووەوە و لە بەراییی بە ئاسایی شتەکەمان وەرگرت.

ئەو دوو کادرەی حسک ئەو هێمنییەی ئێمەیان قۆستەوە و لە لووتبەرزی خۆیانەوە بەدوای هەندێ باسوخواسەوە کەوتنە خۆهەڵکێشان و بە لەخۆرادیتنێکی بێتام کەوتنە گاڵتەکردن بە ناوی مەلا و حاجی. کە گوایە بە خۆڕایی ناوی مەلا و حاجیمان لە خۆ ناوە و فرمان بەسەر ئەو ناوانەوە نییە..! هەر بە فشەپێکردنەوە زیاتر لە خۆی پێی لێ ڕاکێشا و بە تانەیەکی گاڵتەپێکردنەوە، لە حاجی سەلامی پرسی.. ئەرێ لە گوندەکەی ئێوەش ئەو مارکسییانە بە پێوە میز بە دیواری مزگەوتدا دەکەن و شەڕ بە مالی خودا دەفرۆشن ..! خەریک بوو بە هۆنینەوەی پەیڤە بوختاناوییەکانیان ناخۆشیان دەکرد.

سەرەتا مەلاغەفور دەنگی لێ هەڵبڕین، بە ئەسپایی گوتم لێگەڕێ و هاتمە دەنگ.. ڕوو بە ڕوو پێمگوت.. من ناوی تۆی بە ناو کادری هەنوکەی حسک و دوێنیی مەسول ناوچەی پارتی لە شۆڕشی ڕابردوو دەزانم.. دڵنیام بۆ سبەینێش لەسەر سفرەی چ بۆرە پیاوێکی جاش و حیزبێکی دیکەوە پارووی چەور دەخۆی... دەزانم ئەگەر ئێمە وەک دەمی جەنابی عالی و لووتبەرزتان دەیژەنێ.. گوایە ئێمەی مارکسی بەو جۆرەی ناو دڵ و دەروونە ڕقاوییەکەت بەرخورد دەکەین..! دەمەوێ لە بەرچاوی خۆمان، جارێ حاجی سەلامی خانەخوێ، ڕاستگۆیانە وەڵام بداتەوە.. حاجی سەلام بەکزی دەمی کردەوە و گوتی.. ئێمە ئەو شتانەمان لەوانە نەدیتوە.

پاشان دیتم ئەو دەمامک دارەی دووەم، هەر خۆی دەهێنا و دەبرد و دەستی بۆ بەرپشتی دەکێشا. بە هێواشی هەردووکمان تفەنگەکانمان کە هەتا ئەو قسانە بە دیوارەوە هەڵپساردبوو، کردە ناوگۆلم و ئەمانەتەکەمان کردەوە و لەسەر چۆکی خۆمان دانا. ئەوجا لەسەری ڕۆیشتم و گوتم.. با ئەوەشتان پێ بڵێم.. یان خۆتان زۆر بێئاگان و لە مەغروورییی ڕابردووتان کەم نەکردووتەوە و هەنوکەش وا دەزانی مەسول ناوچەی هەولێری حەفتاکانی و خەڵک دەبێ بەر لە چوونە سەر پێشاو و نانخواردن، مەسێنەت بۆ هەڵگرن و ئاو بە دەستت دابکەن. یاخود هێشتا وەک ڕابردوو ئێمە هەر بە دەست و پێوەند دەخوێنییەوە و لەو گۆڕەوە، بە ختوخۆڕایی دەتەوێ، بە تۆمەتە ناڕاستەکانت چاو بەراوژێرمان بکەی..! ئێمە تۆ دەناسین کە جەنابت ـع. ر ـ ی، لەگەڵ ئەو برادەرەت هەردووکتان ئێستا کادری ـحسک ـ ن، کە لە لامان زۆر ئاساییە و لەسەر قسە ناڕاستەکانتان لە گوڵ شیرینترت پێنابێژین. ئێمە بای ئەوەندە ڕەوشت و ڕێزمان بۆ هەموو خەڵک هەیە، کە ڕووبەڕوو ڕەخنەمان لەسەر کاری خراپ لێ بگری، بەڵام هەرگیز لە کەس زیدەڕۆیی و قەشمەرییپێکردن قبووڵ ناکەین. ئەگەر بە تانە و گاڵتەکردنەوە نەبوایە، ئەو قسەیەشتم وەردەگرت، کە ئەو ناوی مەلا و حاجی بۆ ئێمە لە جێی خۆیدا نییە..!

ئیتر هەر ئەوەندە مایەوە، حاجی سەلام بکەوێتە نێوانەوە، کە ئەوان هەردووکیان ڕەنگیان پێوە نەمابوو، دەمیان ببوو بە تەڵەی تەقیو. چاوەڕوانی ئەوە بوون، داماڵەخاسیان بکەین و وەک دەستکەوت بە دیلی بیانگرین و ڕادەستی پیاوکوژەکانیان

بکەین! هەر مەلا غەفور بە حاجی سەلامی گوت، با لەو خۆراکەی بۆ ئەو دوو نەفەرەت کردووە، ئێمەش پارویێ بخۆین و کاری زۆرمان لەو دەوروبەرە هەیە.

بەدوای پراڤینەکەمانەوە، ئەوان لە بەرچاوی ئێمە شتێکی ئەوتۆیان نەخوارد. دیسانەوە مەلا غەفور رووی لە حاجی سەلام کرد و گوتی.. برادەری ئازیز حەق وایە، ئاورێک لەو هەڵوێستانەی خۆت بدەیتەوە، ماڵەکەت بە شەو و بە رۆژ نەکەیتە سەنگەری گاڵتەکردن بە یەکێتی و کۆمەڵە ! یەکسەر هەستاینە سەرپێیان و پێمگوتن.. ئەگەر هەر پێویستییەکتان هەیە، ئێمە یارمەتیشیان دەدەین. کەچی ئەوەندە پەشۆکاو و ناکەسبەچە بوون، دەمیان هەڵنەپچڕی. کە ئەو دەمە سەری ئەو جۆرە کەسانە بۆ بازرگانەکانی شەڕی خۆکوژی کوردان زۆر بە هەرمێن بوو. ئێمە لەسەر ئەو جۆرە هەڵوێستانەمان لە شەڕ نەفرۆشتن بە کادر و کەسانی حیزبەکانی دیکەوە، باجی زۆرمان داوە و هەمیشە بۆی سەربەرزین.

گەیشتبووینەوە ناو پێشمەرگەکان و پاسەوانی سەربەرزایی کەناری گوندی ئاگاداری کردینەوە، کە دوو چەکداری سەروگوێلاک دەمامکدراو لە گوندی دەرچوون و رێگای سکتانیان گرتووە. دەنگی ئەو هاورێیەی خۆمانمان دا، کە وازیان لێ بهێنێ و بێتە خوارەوە.

دوو دوو بە مەودا بەرەو گوندی مێرگەسەر بە رێ کەوتین، کە پێشتر گفتمان لەگەڵ کەمال زێوەیی، سەباح مێرگەسەری لە ماڵی حاجی تایەر هەبوو. پێشمەرگەکان بە رێکوپێکی لەسەر جادەکە و سەرگردەکان دامەزران. مەلا غەفور و شێخ سلێمان و من و زاهیرخۆشناو و مام هێدی چوینە ماڵەکەی حاجی تایەر. ئەو کەڵە پیاوەی لە تۆپبارانکردنێکی هێزەکانی رژێمی بەعس، چەندان لە ژن و منداڵ، لە بنەماڵەکەی شەهید ببوون. خانووبەرەکەشی وێران ببوو. خۆیشی بۆ چەندان ساڵ زیندانی کرابوو. ئەو لە دڵ و دەروونەوە کۆمەڵەی خۆش دەویست و بۆ لەمەودوا هەتا ئێمە لەو ناوچەیە دەسوڕاینەوە، ئەو ماڵە وەکرێکی ئاشکرا و نهێنی کۆمەڵە بوو. بە کورتی حاجی تایەر و کوڕەکانی کە لە دەمی بوردومانەکە بە رێکەوت لە ماڵ نەببوون. وەک هەر مرۆڤێکی سەربڵند، وڵاتپارێزی و نەتەوەپەروەری کاروانی خەباتی نەتەوەکەیان هەڵبژاردبوو. دوژمنی زۆرداری و چەساندنەوە بوون. لە کێشە و ململانێیەکانی ناو کۆمەڵە، بێسڵەمینەوە لایەنگری خەڵکی زەحمەتکێش و شۆڕشگێڕ بوون. حاجی تایەر یەکەم

جوتیاری دەڤەرەکە بوو، لە سەرەتای کەوتنە سەرپێیانی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە لەو دەڤەرەدا، مەردانە هەندێ پارەوپولی هەبوو، بە قەرز پێمانی دا و دوایی کە پارەمان هاتەوە دەست بە زۆرەملی لێمانی وەرگرتەوە. هەر بەو پارەیەش بوو چەند تفەنگمان بۆ هاوڕێیانی بێچەک کڕی. لە پاش نانخواردنی نیوەڕۆ لەگەڵ ئەو هاوڕێیانە ڕێکەوتین. کە بە یەکەوە جەولەیەکی گوندەکانی هەرمک، وەرێ، زێوە و هەرتەل بکەین. کە تارادەیەک ئاقاری ئەو گوندانە زۆرتر سنووری پاسکراوی دەسەڵاتگێرییەکەی ماڵی ئەنوەربەگی بێتواتە بوو. چەندان پێشمەرگە و مەفرەزەی بچوکیان تیرۆر کردبوو. مەبەستی ئێمە هەم سامشکاندنی ترس و تۆقاندنەکانی ئەو بنەماڵەیە بوو بەسەر کۆمەڵانی خەڵکی دەڤەرەکەوە، هەم ناساندن و بڵاوکردنەوەی دەنگوڕەنگی کۆمەڵە بوو. هەروەها گەرەکمان بوو لە گوندی هەرتەلەوە مام هێدی و هاوڕێیانی هەرێمی حەوت بەرێبکەینەوە، کە ئەو ماوەیە وەک هاوکار و پشتوپەنامان، زۆرمان ماندوو کردبوون و لەسەرەتای هەنگاوهەڵگرتنمانەوە بە تەنگمانەوە هاتبوون.

لە گوندی هەرمک، هاوڕێیان شێخ سلیمان و زاهیر خۆشناو لەگەڵ مەفرەزەکەی مام هێدی چوونە گوندی وەرێ. دەمی یەکتر گرتنەوەمان لە ناو باخچەکانی نێوان لووتکەکانی شیشار و گوندی هەرتەل دانا- خۆشمان بەیانی لەگەڵ کەمال زێوەیی بەرەو گوندی زێوە بەڕێ کەوتین. لەگەل لە یەکتر جیابوونەوەمان نیشانە و نهێنی نێوانمانی بۆ هاتنە پێشەوەی هەر ڕووداوێکی نەخوازراو هەبوو، تاکو فریای یەکترکەوتن بکەوین.

ئەوە جاری دووەم بوو. لەگەڵ کێخوا حەسەنی زێوە، باوکی کەمال و عومەر و ئازاد..هتد بە خزمەت بگەم. ئەو پیاوە سەرگەڤارە لە ژیاندا تەنیا خۆی بە قەرزاری وڵات و نەتەوەکەی دەزانی. لەگەڵ پێشمەرگە و خەبات و کۆڵنەدان دەهاتەوە و لە دوژمنان و قوربانیدان بێمنەت بوو. زۆری بەخێرهاتن کردین و ڕێگای نەدا هەتا یەک پێشمەرگەش بۆ هیچ ماڵێکی دیکە دابەش بێت. هەمووومان لە دیوەخانەکەیان بۆ شەویش ماینەوە، بەڵام بە حەرەسیات و کەمین دەرکردن.

کێخوا حەسەن چ کێخوایەک.. هەر بە خۆی زەحمەتکێشی ناو ڕەز و باغات بە ناوهێنان بوو. مشورخۆری سەرەکی بەخێوکردنی خێزانەکەیان بوو. مرۆڤێکی دنیادیتەی خاوەن ئەزموون، تا بڵێی هێمن و بە حەوسەلە، تا قسەکانی ئێمەی نەبیستایە، خۆی قسانی نەدەکرد. کە قسەشی دەکرد زۆر بە پوختی مەبەستی خۆی بە کۆنکرێت

دەردەبڕی. من کە گەیشتمە سوید و بە هەڵسوکەوتی خەڵکەکەی تۆزێک ناسیار بووم. بەو ئاکارە دروستەی مرۆڤ ئاشنا بووم و هەروەها هەتا نەهاتبوومە شاخ و ئەوەندە تامەزرۆی گوێ بیستنی، کێخوا و براگەورە و ئاغا و لەم جۆرە مرۆڤانەم خۆش لێ نەدەهات. بەڵام کە تێکەڵی پیاوی لە جۆری کێخوا حەسەن بووم و تێفکریم و تێگەیشتم، لەو بارەوە لە گوێی گادا نووستبووم.

بەشێک لەو جۆرە مرۆڤانە زەخیرەیەکی هێجگار پڕ دەرس و حیکمەت بوون. راستە بەشێکی زۆریان، بەرخوردیان بەرانبەر وڵات و نەتەوەکەیان لە کاروانی خەبات و بزاڤی چەکداریی کوردان، ئەوەندە سەربڵند و بە قامەت نین، کە مرۆڤ پێیاندا هەڵبڵێ. بەڵام لە ئاست نموونەکانی ئێرە و ئەوێی وەک کێخوا حەسەنی زێوە و باسکردنی وەک خۆی، نووسینکەم دەخەملێنن و بە رەونەقی دەخەن کە رووی راستییەکانم تاووتوێ کردووە.

لەو گوندە شانەیەکی رێکخستنی کۆمەڵەمان بە سەرپەرشتی عومەر زێوەیی پێکەوە ناو و رۆژی دواتر هەر بە هاورێیەتی کەمال زێوەیی کە دەمامکی خۆی دابوو، لەگەڵ هاورێیانی لە بەر گوندی هەرتەل یەکترمان گرتەوە. هەتا دەمەدەمی نیوەرۆ، بەدوای نوێژکردنی هەینی، بە هەمان دەستووری خۆمان، پێشمەرگەکان بە هەموو لایەکی گوندەکە دابەش ببوون. وشەی نهێنی بۆ هاتنە پێشەوەی هەر رووداوێک دابەش کرا بوو. لێرەوەش بە پێی ئەو نەخشەیەی هەمان بوو، بە هاوکاری کەمال زێوەیی، لەگەڵ کۆمەڵێک لەو گەنجانەی گوندەکە، بە تایبەت ژمارەیەکیان لە شاری رانیە و بێتواتە خوێندکار بوون. کۆبوونەوەیەکی چڕوپڕمان کرد و رێووشوێنی کاری رێکخراوەییمان بۆ دەستنیشان کردن. کارەکانیانمان جارێ بۆ پەیوەندییان بە کەمال زێوەیی هێشتەوە. شەوەکەشی خەڵکی گوندی لە مزگەوتەکە کۆبوونەوە و مەلا غەفور وەک کادری ینک، سەبارەت بە خەبات و بارودۆخی یەکێتی قسەی بۆ کردن. کە تا درەنگانی شەومان بە دەمەتەقێ و گفتوگۆی دۆستانە بەسەربرد. بەرەبەیانی رۆژی دواتر لەگەڵ دەرچوونی کەمین بۆ دەرەوەی گوندی. مام هێدی و مەفرەزەکەیمان تا بەردەمی دەرەهەرتەل بە رێ کرد. بەو هیوایەی سەرکەوتووانە بگەنەوە شوێنی خۆیان.

لەگەڵ نانخواردنی بەیانی خۆمان و مەفرەزەکەی مەلا غەفور هاتینەوە گوندی مێرگەسەر. دیار بوو کێشەیەکی کۆمەڵایەتی لە نێوان دوو خێزان قەومابوو. سەیرم کرد هەندێک نەیاری کۆمەڵە بە ئانقەست گەرەکیانە کۆمەڵەی تێوەبگلێنن. یەکسەر هەتا

نەمانهێشت مەلاغەفوریش تێکەڵاوی چارەسەرکردن و مەسلەتییەکە ببێت. بەڵکو مەلا غەفور بۆ کارێکی دیکە بۆ گوندی زیخان چوو. خۆم لەگەڵ ڕێبواری قسەم کرد کە ئەو ئەو کارە بکات. کە ئەویش ئەندام ناوچەی یەکێتی بوو، بە رەسمی سەر بە ڕێکخستنەکانی بزووتنەوە بوو. بەڵام دۆستی بیروکردەوەکانمان و مرۆڤێکی جوامێر و سەرکەوتوو بوو. لەوەش خاترجەمم کرد، کە ئێمەی کۆمەڵە هەموو پشتیوانییەکی دەکەین و تێکڕای ڕێکخستنەکانمان لەو بارەوە ڕێنمایی کرد.

لێرەدا جێگای خۆیەتی ئەو سەربردەیەی ماڵی حاجی تایەری مێرگەسەر (یادی بەخێر) لە بیر نەکەم. من بەوە ئاگادار نەبووم، سۆران (عبدالمسیح) ی دیان لەگەڵ مامۆستایان سائیرە و نەجیبە ڕێکەوتبوو، کە ئەو شەوە بە یەکەوە بێنە ماڵی ماڵی حاجی تایەر. دەمە دەمی ئێوارە بوو. خەریک بوو لەگەڵ هاوڕێیان بەڕێبکەوین بەرەو گوندی دەراش. لە ناکاو سۆران_مان لێ پەیدا بوو، گوتی دوو میوانی ئازیزت هاتوون، وا لە ماڵی مام حاجی تایەر چاوەڕوانت دەکەن. منیش بە زۆری بۆ ئەوە چووم، گوتم رەنگبێ دایکم و چیای جگەرگۆشەم هاتبن. کە ماوەیەک بوو نەمدیتبوون. ئەوەبوو لەگەڵ هاوڕێیان پلانەکەمان گۆڕی. زۆربەی پێشمەرگەکان لەگەڵ شێخ سلێمان بۆ شەوەکەی چوونە گوندی بالیسان و یەکترگرتنەوەمان بۆ بەیانی خستە سەرجادەی بەرانبەر گوندی دەراش. خۆم لەگەڵ سۆران و کاکەمین و مەلاغەفور و مەفرەزەکەی لە گوندی مێرگەسەر ماینەوە. من و سۆران لە پێشەوە بۆ ماڵی مام حاجی تایەر ڕێگامان گرت. برادەرانی دیکەش لە گوندەکە دابەش بوون. ئێمە هێشتا نە گەیشتبووینە بەرکۆسپی ماڵەکە و حاجی تایەر خۆی لە پەناوە، وەک ئەوەی لە ئێمە لە کەمیندا بێت، هاواری لێ کردین. حاجی مەمۆ میوانەکانت زۆر خۆشەویستن، دوو دەستە کیژۆڵەی ناسک و نازدارن. _ من لە قسەکانی زاریی موچڕکم پێدا هات_، یەکێکیان کوردەواری خۆمانە و چەپکە گوڵی تۆیە. بەڵام ئەوەی دووەمیان لە دیانەکانە و دەمەوێ پێشکەشی منی بکەن و دەبێ هەر خۆشت داخوازییەکەم بۆ بکەی..! من هەر واقێکم لە خۆم وڕما و ڕووم لە سۆران کرد و بە ئەسپایی پێم گوت.. ئەوە تۆ ئەو بەزمەت ناوەتەوە و هەر خۆت وەڵامی مام حاجی بدەوە. سۆرانش نەیهێنا و نەیبرد و گوتی.. ئەوەی دیانەکە ئامۆزای منە و ئەگەر بە خۆی رازی بێت، من پێشکەشتی دەکەم..! حاجی تایەر پێشمان کەوت و ئێمەش بەدوایدا بە ژوور کەوتین. بەراستی خۆ ئەوە مامۆستایان سائیرە و نەجیبەن! دوای

چاکوچۆنی و دۆقەکردن  هەموومان پێکەوە دانیشتین. ئەوان بۆ چەند ژەمێک خۆراکی هەمەجۆریان لەگەڵ خۆیان هێنابوو. بەدوای مەلا غەفور و ئەوانەی دیکەشمان دانارد و سفرە راخرا. بە یەکەوە لەگەڵ مام حاجی تایەر و کوڕەکانی برسێتی خۆمان رەواندەوە. شەویش تادرەنگان هەر بەیەکەوە گفتوگۆمان کرد. لێرەدا نەجیبەخان بە چرپە پێی گوتم، فلانە مەسول عەسکەریتان (ک. س) لە رێگای فلانەوە (ب. م) ی ناکەسبەچە کە گوایە پێشمەرگە و کادرە. وەک گەفلێکردن پەیامی بۆ ناردوم و قاسیدەکە ئامۆژگاری کردووم.. ئەگەر مێرد دەکەی وەرە بەو مەسول عەسکەری ناوچەکە مێرد بکە، نەوەک بە حاجی مەمۆ! من زۆر دڵتەنگ بووم، یەکسەر لە ناو هاوڕێیان مەلاغەفور هەستی بە پەشۆکاوییەکەم کرد. شەو تا بەیانی خەو نەچووە چاوانم، هەر گۆزە گۆزم بوو، بیرم بۆ کردەوەی جڕناوفڕنا دەچوو. مەلا غەفور کە لەتەکمەوە بوو زۆری لەگەڵ گوتم و هیچم پێ نەگوت. بەیانی  پێش ئەوەی هەردوو میوانەکە بەرێ بکەین کە بە لای رانیەوە بۆ هەولێر گەڕانەوە. نەجیبەخانم جیا کردەوە و بە هێمنی پێمگوت.. ئەوان با بۆ خۆیان شەکر بشکێنن، بریار بە دەست تۆوەیە. ئەویش مەردانە وەڵامی دامەوە و گوتی.. مەبەستی من لە کارکردنم لە ریزەکانی کۆمەڵە و بەردەوامیم، زۆرتر بۆ خۆشەویستی نێوانمان دەگەرێتەوە و هێز نییە بتوانی دڵم بگۆڕی. ئیتر بە گەرمی دەستەکانی نەجیبەم کوشی و بەرێمان کردن.

لەو بارەوە ئەوەی ماوە بیڵێم، هەنوکە بۆ ئەوێ رۆژێی دەگێڕمەوە. ئێمە ئەو کۆمەڵە برادەرانەی کۆمەڵە لە لای خۆمانەوە، لێرە و لەوێ لە جیهانێکی پەپولە ئاسای ناو باغ و باغاتێکی پڕ لە گوڵزاری خەیاڵاوی بە ناو خەباتکردن بۆ بزاڤە رەوایەکەمان دەخولاینەوە. نەوەک هەر کۆمەڵێک پێشمەرگەی سەپانی پوشێی قرشەی خەرمانی حیزبایەتی کوردان، بگرە لەلایەن بۆرە پیاوە عەقل قوندەکان بەوپەڕی نا مرۆڤانە شەڕمان پێ دەفرۆشرا. دواتر بە تەواوی تێبگەیشتم، دوو جیهانبینی، واتە دوو بەرخوردی پراکتیکی، هەموو سەرەداوەکانی لەیەکخشان و هەڵشاخان، بۆ ئەو سەرچاوە ئاڵۆزکاوییە پەلکێشی دەکردین، کە پادشای لێزانی دارستان بۆ ئەو مەبەستەی خۆی گەرەکی بوو رەنگی دەکردن. ئەگەر ئێمە رۆژێک لە رۆژان، سەرەگلۆڵەیەکی ریسی خەباتی حەفتاکان و هەشتاکانیش بووبین. ئەوە سەرە بەنێکی خاو و خلێچ و بێ بەرنامە بووین..! چونکە بە ئاوەزی پێویست بیرمان نەدەکردەوە و لاسارانە دەجولاینەوە.

# سەرەتاتكێی گەنگەشەكان

ئەو بەیانییە كزەبایەكی سارد و سڕ سەر و گوێلاكمانی دەكوتایەوە. دیسانەوە دوو دوو بەدوای یەكترییەوە دەسرازەمان بەست. پێش ئەوەی بگەینە ئەو گردەی نێوان گوندی دەراش و سەرجادەی بالیسان. لەگەڵ هاوڕێیەكانی خۆمان كە بە ڕێگای گوندی بالیسانەوە بوون یەكترمان گرتەوە. لەولاتری ئێمەوە دیار بوو برادەرانی قووەتی خۆشناوەتی لەسەر جادەكە سەیتەرەیان دانابووەوە. لە دوورەوە كە ئێمەیان بە دی كرد و بەبێ ئەوەی بماننناسن، كشانەوە و پێشمەرگەكان زۆرتر بۆ سەرگردەكە چوون. من و كاكەمین لە پێشەوە گەیشتینە ئەو شوێنەی بازگەكەیان لێ دانابوو. سەیارەكی قەمارەی ژمارە هەولێری لێ ڕاگیرابوو. سەیارەكە كەسێكی تێدا نەبوو، بەڵام ئەوەی پێوە دیار بوو كە پشكنینی بۆ كراوە و ناوەخنەكەی هەڵگێڕ و وەرگێڕ كرابوو. یەكێك لەو پێشمەرگانەی كە بەندەی ناسیبووەوە، لێمان نزیك بوەوە و دوای چاكوچۆنی، ئاگاداری كردینەوە. كە برادەران لەو سەیارە ئەفندییەكی شارییان گرتووە و بۆ ئەو پەناگردەیان بردوە. منیش كاكەمینم ڕەوان كردە ئەوێ، تاكو بزانی چ لە گۆڕێیە! لەو دەمەدا هەموو هاوڕێیانی كەرتی ڕێكخستن گەیشتنە دەوروبەری ئەو شوێنەوە و دامەزران و بە ڕێكوپێكی دابەش بوون.

ملازم خولە و ڕێباز بە یەكەوە بۆ لای ئێمە هاتن. بەدوای ئەوانیشەوە، سەیرم كرد ئەوە ئەكرەم مەنتكە، كە لە شار و ڕیزەكانی یەكێتی قوتابیانی كوردستان لە هەولێر و بەغداد ناسیاویمان هەبوو. لە پاش تەواوكردنی خوێندنی زانكۆ، ئاوقاتی دەكرد. گیراوەكە ئەوە و هەر كە منی بە دی كرد، چەندی پێشمەرگەكانی پاسەوانی خۆیان هێناویرد، هەر بۆ لای من هات و منیش بە پێشوازییەوە چووم. چاكوخۆشییەكی گەرممان كرد و بە كڵۆڵی ڕووی تێ كردم و تكای لێ كردم.. كە فریای بكەوم و لە دەست پێشمەرگەكان دەربازی بكەم. ئەگەر گلیشی بدەنەوە، وا بكەم لە لای پێشمەرگەكانی ئێمە بێت. هەرچەندە نە دەبوو ئێمەی ڕێكخستن، دەست بخەینە كاروباری هێزی پێشمەرگەوە. بەڵام بە ڕاستی دڵم بەرایی نەدا، خۆم لە گرتنی ئەو برادەرە تێكەڵ نەكەم. لێرەدا ملازم خولە پێیگوت، ئەتۆ كە بەو شێوەیە لە حاجی مەمۆ دەناوڕێیتەوە، ئەوە ئەو پسولە ڕەسمییانەی لەناو سەیارەكەت پێت گیراوە، شایەتی

پاکی و ناپاکیت دەسەلمێنن. هەرچەندە ئێمەش دەتناسین کە چماڵێکی.! بەڵام کە برادەری ئەو کادرەی کۆمەڵەی و ئێمەش گوێی لێدەگرین.

گوتم بابزانم.. ئەو پسولانەی پێی گیراوە چین. سەیرم کرد یەکێکیان پسولەی ئەوەیە کە گوژمەیەک پارەی بۆ قادسیەی جەلاد پێشکەش کردووە. ئەو دەم هەموو کارمەند و یەکێکی زەنگین، دەبوو ئەو کارە بکات. پسولەکەی دووەم، وەرەقەی عدم تەعەروزی ماڵی ئەنوەر بەگی بێتواتە بوو. بۆ ئەوەی لەسەیتەرەکانی رژێم کارئاسانی بۆ بکەن.

ناچار ملازم خولەم جودا کردەوە و پێم گوت.. من دڵنیام ئەکرەم سەر بە تەنزیمی برادەرانی پارتییە و با ئێمە وەک دەرخستنێکی بەرچاو بەری بدەین و وەک پەیامێک بۆیان دەربخەین کە دەتوانین هەر شتێکی لەگەڵ بکەین. بەڵام چونکو ئەویش و حیزبەکەی بە کورد دەزانین، نامانەوێ بەرخوردی نا کوردانەی لەگەڵ بکەین. ملازم خولە نەیهێنا و نەیبرد، بەسەرگرانی بەمنی گوت.. ئەگەر لەسەر مەسولیەتی خۆت وەریدەگری و خۆت بەرپرسیاری لەوەی ئازادی دەکەی..!

بەبێ یەک و دوو گوتم.. خەمی ئەوەت نەبێ و راپۆرتی خۆت لەو بارەوە بنووسە. ئیتر من لە کۆبوونەوەیەکی سەرپێیی نێوان خۆم و ملازم خولە و مەلاغەفور و رێبازدا، ئەو مەسەلەم بۆیان دووپات کردەوە و بڕیاری خۆم پێگوتن. لێرەدا کەس بەزار ناڕازی نەبوو. ئەوە یەکێک بوو لەو خاڵانەی تەوشیروان لە دانیشتنێکی بەر لە کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە، رووبەڕوو بە چاوی داداماییەوە و بە گران بەسەرمدا کەوت. کەچی بۆ قەناعەتی خۆم بۆی دەربەست نەبووم. ئەکرەمم بەو کەلوپەلانەی لێیان سەندبوو، لەو برادەرانە وەرگرتەوە، بە خۆم هەتا سواری سەیارەکەشی بوو، لەگەڵی چووم و بەرێم کرد.

رۆژان هاتن و رۆیشتن، لە دەمی گەرمەی شەڕی نێوان پارتی و یەکێتی لە ساڵی ١٩٩٦ دا. ئەکرەم مەنتک وەک نوێنەری پارتی، پارێزگاری هەولێر بوو. سەیارەی هاندیکاپی جەلال تاهیری مەعەوقی هاورێی منیان بە ناوی کۆنەجەلالی و موستەفید دەست بەسەردا گرتبوو. ئەو دەمە من بە رێکەوت بە هۆی نەخۆشی باوکم بە سەفەر لە سوید بۆ هەولێر گەڕابوومەوە. تەنیا نامەیەکی چەند خەتیم بۆ ئەکرەم رەوان کرد و ئەو گیرانەی گۆڕین و بەرەڵلاکردنەکەیم بە بیر هێنایەوە. کە وەک قەرەبوو حەق وایە سەیارەکەی جەلالە شەل بداتەوە، کە کاتی خۆی حکومەت وەک بەخشش بە کەمئەندامەکانی داوە و چ پەیوەندییەکی بە کەسی دیکەوە نییە.

ئێمە لەو برادەرانەی قووەتەکەی خۆشناوەتی جیا بووینەوە و لە دەرەوەی گوندی دەراش کۆبوونەوەیەکی خێرامان ئەنجامدا. برادەران شێخ سلێمان و شێخ قادر و کاردۆ و زاهیرخۆشناو و چەند پێشمەرگەیەک لە دۆڵی بالیسان مانەوە و کات و شوێنی کۆبوونەوەی رێکخستنمان لە دەوروبەری گوندی نازەنین بۆ پاش چەند هەفتەیەکی تر لەگەڵ دانان. ئەوانی دیکەمان لەگەڵ مەفرەزەکەی مەلا غەفور بە بناری کلاوقاسمدا کێل بووینەوە و بە گوندەکانی سەردۆر و کەوەرتییاندا چووینە خوارەوە. ئێوارەیەکی درەنگ لە ماڵە جوتیارەکان دابەش بووین. بۆ شەوەکەی رێگای گوندی بەرەکەمان گرت، کە مەهدی و تەحسین و یاسین و فەرهاد کاوانی و سامانی مەلا گچکە و چەندانی دیکە لەو گوندە بوون. لە رێگای بنەماڵەی جەلیل بەرەکەیی و براکانی، سەرەتای بنکەیەکی رێکخستن ساز بوو. هەر لەوێش لەگەڵ کەرتەکەی تەحسین کاوانی یەکمان گرتەوە کە هەموویان هاورێی کۆمەڵە بوون. بەدوای حەرسیات دانان و کەمین بۆ دەوروبەری گوندەکە و نهێنی شەو دیاریکرا. لە دوو شوێن جێگامان گرت. لێرەدا رۆڵەی رۆژە سەختەکان سامانی مەلاگچکەی شەقڵاوە و بنەماڵەکەی بە خوشک و براکانییەوە، لە ناو گەنجەکانی شەقڵاوە بە تایبەت، بناغەی شیرازەیەکی توکمەمان دامەزراند کە ئەوشیر وەک ئەندام کەرت و لێپسراوی رێکخستنەکان بە شێوەیەکی سەرەکی ئەو کارەی خرابووە ئەستۆ.

## بڵاوکردنەوەی هەواڵی شەهیدبوونمان

رۆژی دواتر لەگەڵ کەرتەکەی تەحسین کاوانی و مەفرەزەکەی مەلاغەفور لە یەکتری جیا بووینەوە. ئەوان بەرەو دەوروبەری بناری سەفین بە رێ کەوتن و ئێمەش ئەو مەفرەزەیەی رێکخستن کە مابووینەوە، بەدوای هەندێ گفتوگۆکردن و پرسیار و سۆراخ، پەیداکردنی رێبەرێکی شارەزا لە ناوچەکە. رێکخستن کە نزیکەی یازدە پێشمەرگەیەک مابووینەوە و کاکەمین مەسئول عەسکەری مەفرەزەکەمان بوو، حاجی ئەکرەم - یش بەخۆی و مەفرەزەکەیەوە گەیشتبووە لامان. کاکەمین مرۆڤێکی وریا و بە دەستوبرد بوو، تابڵێی ئازا و چاونەترس بوو، بۆ راپەڕاندنی کاروبار و رێکخستن لە هیچ مەترسییەک نەدەگەڕایەوە. ئەوەندەش میهرەبان و قسەخۆش و دەم بە پێکەنین و قۆشمە بوو، لەگەڵ هەمووان لە پەیوەندییەکی گیانی بەگیانی دابوو. لە ناو خەڵکیش نموونەی

هاوکاری و بەدەنگەوەهاتن بوو بۆ کۆمەک کردنی خەڵکی هەژار   ئەو یەکێک لەو کادرە سەربازییانە بوو، کە خاوەن دیسپلینی پێشمەرگەیی و پارتیزانێکی لێهاتووی لێدەرچوو بوو، لە هاتنە پێشەوەی هەر رووداوێک مایەی پشت پێ بەستن بوو.

بەرەبەیان لە سەرەتادا روومان لە بەرەو سەرکەوتنی شاخەکە کرد کە بە زنجیرە شاخی بەنی هەریر تێکەڵی یەکتری دەبنەوە. چێشتەنگاو لەبەر هەڵهاتنی گزنگی خۆرەتاودا لە یەکتری گردبووینەوە. ئەو نانەی بۆ قاوەڵتی بەیانی هەڵمان گرتبوو، لە شانی یەکدی خواردمان. هەتا بەرەبەری ئێوارەیەکی درەنگ هەر یەکەمان، بۆ خۆی لە پەنا تاشە بەردێکی گەورەوە خەریکی خوێندنەوە و نووستن و کات بەسەربردن بوو. پاشان بۆ کۆبوونەوە لە یەکتری گردبووینەوە.  هەندێ قسەم بۆ کردن.. ئێمە وەک دەستەیەک پێشمەرگەی رێکخستنەکانی کۆمەڵە، جەولەیەکی کتوپڕی ئەو گوندانەی بەری هەریر دەکەین. دیارە هەموو بەوە ئاگادارن لە ناوچەیەکی پڕ مەترسین، دەبێ هەموو چاوکراوە و ئاگاداری یەکتری بین، لە دەمی لێقەومان و تووشی شەڕبوون، هیچ پێشمەرگەیەکمان ئەوەی دیکە بە جێ ناهێڵی و گیانمان بۆ یەکتری فیدا دەکەین و لە کاتی رووداني رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمندا. ئەوەی دەست نەکاتەوە و تەنیا لە خەمی دەربازبوونی خۆی بێت و هاوڕێیەکانی لە تەنگانە  بەجێ بهێڵی، لە کەرتی رێکخستن سزای قورس دەدرێ و ئەوەش لە خۆی رانابینی و ئامادەی ئەو جەولەیەی نییە، با هەر لە هەنوکەوە بگەڕێتەوە و لە گوڵ شیرین تری پێ ناگوترێ.

ئەوە بوو هەموومان بە تەواوی ئامادەبوونەوە دەنگمان هەڵبڕی و ئەوجا کاکەمینی بەرپرسی سەربازیمان، مەفرەزەکەمانی کرد بەسێ بەشەوە. کە لە شەو و دەمی هەر رووداوێک، پێشمەرگەکانی هەر بەشە بە یەکتری دەزانن و لە یەکتری دانابڕێن. دوایی وشەی نهێنیمان بۆ دەمی لێقەومان دانا. ئەوەندەی بزانم ئەوە یەکەمجار بوو، مەفرەزە و کۆمەڵێک لە کادرەکانی رێکخستنی کۆمەڵە، جەسارەتی ئەوە بکەن. گیانفیداکارانە بەو گوندانەدا جەولە بکەن کە بە هێزی سەربازی مشە و جاشی خۆماڵی سیخناخ بوو.

حاجی ئەکرەم لە هەمووان بۆ ئەو کارە رشتتر بوو. هەندێ لە خەڵکی ئەو ناوچەیەی بە هۆی فەرمانبەری لە کۆمەڵە هەرەوەزییەکانی جوتیاران دەناسی، گەرەکی بوو بەسەریان بکاتەوە. بنارە و بناری چیای بەنی هەریر باریکە رێگامان گرت. لە پاش دونیا تاریکبوون و لە دەمی سەرەتای تاریکایی شەودا، لە ناو دوو شەوان چەند

گوندێکمان هەتا سیساوە و باسەڕە کرد. خەڵکەکە لەگەڵمان دەستکراوە و بەرێز بوون. پێشتر ئەوەندە بەبیستنی ناوی کۆمەڵە ئاشنا نەبیوون. ئەوەی حاجی ئەکرەمی دەناسییەوە، بەبێ ترس لێمان دەهاتە پێش و گەرمتر پێشوازی لێ دەکردین. ئێمە لەو ناوچەیە زۆرتر مەبەستمان ناساندنی کۆمەڵە و کارێکتەری ڕێکخستن بوو. ئەوەندەی بۆمان کرا لە بڵاوکردنەوەی دەنگوڕەنگی کۆمەڵە، ئامانجی خۆمان پێکا و خەڵکمان هاندا کە بە دوو نوێنەرە راستەقینەکانی خزمەتکردن بە چینە هەژار و زەحمەتکێشەکانەوە بکەون.

بۆ دوای نیوەی شەوێ بۆ ئەو شوێنەی لە بناری شاخەکە و نزیک ئەو ڕێگایەی ئاودیو دەگەڕاینەوە، کە ساڵی هەشتا و مانگی دوازدە لەگەڵ مەفرەزەیەکی یەکێتی، پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر پێیدا ڕۆیشتبووم. لە بیرمە شەوی گەڕانەوەمان ئەگەرچی هەموو زۆر هیلاک بوون، بەبێ کەمتەرخەمیکردن هەتا ناو ئەو گاشەبەردانەی سەرووی ئاقاری هەردوو گەرەوان و گەرەوان لە بناری شاخەکە خۆمان گیر نەکرد. بۆ بەرەبەیانێکی زوو گەیشتینە شوێنی مەبەست. بەدوای دانانی حەرەسیات، هەر یەکە لە پەنا گاشە بەردێکەوە بۆی کەوتینە گەرمە خەوێکی دوای ماندووبوونەوە.

دەمی پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ کاکەمین ئاگاداری کردمەوە، کە تازە لە نۆرە حەرەسیاتی خۆیدا لەسەر بڵندترین شوێن هاتبووە خوارەوە و پێی ڕاگەیاندم، کە لە دەشتی هەریرەوە، رەوە کۆپتەرێک بەسەر ئەو گوندانەوەن کە ئێمە شەو لێی گەڕاوینەتەوە و کۆپتەرەکان لە ئاسمانی ئەو گوندانە دەسوڕێنەوە. هێشتا کاکەمین قسەکانی تەواو نەکردبوو، حەرەس ئاگاداری کردینەوە کە ئەوە چوار کۆپتەر روویان کردوتە سەر ئاسمانی ئەو پانتاییەوە کە ئێمە مۆڵمان تێدا گرتووە و چی بکەین..! یەکسەر کاکەمین بە دەستوبرد هەمووانی بەسەرکردەوە، لە سێ شوێنی کەناری یەکترییەوە دامەزراین. بە هۆی بەرخوردی چەند جارێکی دیکەی پێشهاتی لەم جۆرە، بە پێشمەرگەکان گوترا.. هەر کەسە و لە شوێنی خۆی بەبێ جولە، لە پەنا گاشە بەردەکان خۆی گرمۆڵە بکات. تفەنگ و شتە بریقەدارەکان دیارنەبن.

کۆپتەرەکان وەک داڵاش بەسەر کەلاکەوە سوور بخواتەوە. نزیکەی یەک سعات زیاتر چەند جەولەیەکیان بەسەرمانەوە کرد. هەتا لەسەر تۆقەرەی شاخەکە زۆر نەوی دەبوونەوە و سێبەریان بەسەر لووتکە و تیشەکانەوە دەخستەوە. کۆپتەرەکان هەر

چواریان بەدوای یەکترییەوە بوون. ئێمە هەموومان چاوەڕوانی پەلاماری ئانوساتمان دەکرد و روحمان لەناو دەستمان بوو. لەو تاوەدا لەشکری گاوگۆلکی گاڕانی گوندەکانی دەوروبەر بەسەرمانەوە وەربوون. ئەوانیش زۆر سەیر گوێچکەکانی خۆیان قوچ کردبوو. لە ناکاو وەک ئەوەی جاڕی ئاشتی درابێت. کاکەمینی جەربەزە کە خۆی گەیاندبووە تەک شوێنی حەرەس و تفەنگە ئاربیکەی لەناو گۆلمەوە بوو، هاواری کرد.. کۆپتەرەکان لە پەلاماری گاڕانەکە رەوینەوە و دەڤەرەکەیان بە جێ هێشت. هەموومان هەناسەیەکی دڵنیاییمان هەڵکێشا و بە تیلەی چاو لەجیاتی دڵداریکردن، خەنیخۆشی دەربازبوونمان لە یەکتری پیرۆز کرد. لەوەی ئەمجارەش بە سەلامەتی لە کارەساتی پەلاماری کۆپتەر رزگار دەبین. چونکە لەوان رۆژاندا، کۆپتەرەکانی سوپای عیراق، لە پەلاماردانی مەفرەزەکانی پێشمەرگەدا، دەستی خۆیان دەوەشاند و چەندان پۆڵە پێشمەرگەیان لێرە و لەوێ بە بتوونی شەهید کرد..

بەدوای دڵنیابوون لە یەکتری گردبووینەوە و بەرێکی بۆ ناوماڵەکانی گوندی گەرەوان و گەرەوان رێچکەمان گرت. لە بیرمە خەڵکەکە بە واقوڕماوی بە خێر هاتنیان دەکردین. چاویان باوەڕی نەدەکرد، ئێمە لەو ناوە لە لایەن ئەو رەوە کۆپتەرە بە دی نەکراوین! بلەز سەرو لوقمەیەک نانمان لەو چەند ماڵانە نۆش کرد. رێگا و ریگای بناری شاخ هەتا گوندی فریزی لاپاڵی چیای هەورێ و بەرانبەر شارۆچکەی هیران قۆشمەمان بوو. لەبەر تەوژمی سەرما خۆمان بۆ نەگیرا و ناچار ئەو جوتیارانەی گوندی فریزمان لە خەوی شیرین بێدار کردەوە، سەرو لێفەشرەمان لێ وەرگرتن لە پەنا کانی و ئاوی ناو گوندی تۆقرەمان پێ گرت. رۆژی دوایی بەو ئاقارەدا خۆمان گەیاندە ناو چەمەکەی بەرگوندی نازەنین. پەلەکردنەکەمان زۆرتر بۆ حەسانەوە و وەرگرتنی پۆستی ناوەندی کۆمەڵە بوو. کە لە رێگای ئەو قاچاخچییانەی خەڵکی گوندی چیوە، لەناویان دۆستێکی کۆمەڵە هەبوو، بەو پۆستی خۆمان ناردبوو.

من لەگەڵ دوو پێشمەرگەی دیکە لە بەرایی گەیشتینە ناو باخچەکانی سەر رێگای بەرەو ناحیەی هیران بووم. لە پێشەوەی گوندی نازەنین خاڵە کاکە نازەنینی لەگەڵ وەستا عەلی و حاجی ئەحمەد _یادیان بەخێر_ و چەند ناسیاوێکی دیکەی گوندی کە لە ناو باخچەکانی وەستا عەلی بۆ ماڵ دەچوونەوە. هەر کە چاویان پێمان کەوت. بە حەپەساوی و دڵخۆشی بە پیرمانەوە هاتن و بە هاواری خۆشی.. کورە ئەوە ئێوە ماون

و به سەر پێوە دەڕۆن! ئەوان لەو قسانەدا بوون، بەدوای ئێمەوە حاجی ئەکرەم و پێشمەرگەیەکی دیکەش دەرکەوتن. خۆ ئەوە حاجی ئەکرەم و حاجی مەمۆن ..! توخوا هەمووتان ساغن ! ئێمەش بە سەرسوڕمانەوە پرسیمان.. بۆ چی بووە و چیتان بیستوە..! ئەوەندە بە گەرموگوڕی باوەشیان پێدا دەکردین، وەک ئەوەی جگەرگۆشەکانی خۆیان، لە کارەساتێکی گەورە بە ساغی هاتبنەوە باوەشیان. خاڵە کاکە دەنگی هەڵبڕی.. وەستا عەلی، حاجی ئەحمەد نەمگوت.. باوەڕ ناکەم ئەو پێشمەرگانەی کۆمەڵە، وا بە خڕی لە پەلاماری کۆپتەرەکانی رژێم نەمابن.. دڵم باوەڕی بەو قسانەی بەرپرسی لقی یەکێتی و بزووتنەوەی ناو یەکێتی ئاوی نەدەخواردەوە. کە هەتا بەجیهازی بێتەلیش، ئەو هەواڵە ناخۆشەی بە سەرکردایەتی گەیاند..! کە گوایە کەرتی رێکخستنی شەقڵاوە لە دەشتی هەریرێ دا، کەوتوونەتە بەر پەلاماردانی کۆپتەری سەربازی رژێم، هەموویان شەهیدن و تەنیا حاجی مەمۆ و حاجی ئەکرەم بە برینداری و بە دیلی لەلایەن کۆپتەرەکانەوە بردراون..!

هەموو برادەران بەسەر ئەو هەواڵە ناراستەدا گەیشتن. بە هێمنی هەواڵی جەولە سەرکەوتووەکەی خۆمان بۆ باس کردن، گوتمان راستە چوار کۆپتەر، لە بناری هەریر هاتنە ئاسمانی ئەو ناوچەیەی کە ئێمەی لێی دەحەسایینەوە، بەڵام نە ئەوان ئێمەیان بە دی کرد و نە ئێمەش خۆمان گورگە کرد. هەموومان ئەوە بە ساغوسەلامەتی دەمانبینن. ئێمە لەگەڵ ئەو دۆستانە لە پێشەوە بۆ ناو گوندی رۆیشتین. خەڵکەکە بە واقوڕمایی پیرۆزبایی سەلامەتییان لێ کردین. لەگەڵ گەیشتنی ئێمە بۆ ناو گوندی، مەفرەزەکەی لقی هەولێری ینک بەرەو گوندەکانی سناوە و جەلی رۆیشتن.

لێرەدا دەمودەست نامەیەکی بە پەلەمان بۆ عبدالرزاق لە گوندی چیوەی حاجی بەدیعی نارد کە بە زووترین کات، نامەیەکی پێچراومان لەگەڵ دانابوو، تاکو بە کاروانی قاچاخچییەکان رەوانەی ناوەندی کۆمەڵەی بکات. کە تێیدا ئەو هەواڵەمان بە درۆ خستبوەوە. لە بیرمە دواتر هەر لەگەڵ وەڵامی ناوەندی کۆمەڵە، هاوڕێی سەربڵند، ملازم عومەر نامەیەکی پڕ لە وشەی ناسک و پاراوی هەست و نەستی هاوڕێیانەی بۆمان نووسیبوو، کە لە پێشەوە خۆشحاڵی خۆیان لە ساغ و سەلامەتیمان دەربڕیبوو. ملازم عومەر ئامۆژگاری کردبووین، وریای خۆمان بین. دەنگۆی ئەو گەشەکردنە دڵخۆشکەرانەمان، بووەتە جێگای باس و مقۆمقۆی هەتا نەیارەکانی دەوروبەرمان.

کۆمەڵە بەرگەی ئەو هەموو شەهیدبوونەی بە کۆمەڵ و پۆل پۆلی هاوڕێیەکانی ناگری. دەبێ وەک ڕێکخستن خۆتان لە ناوچە مەترسیدار و خەڵکی گومانلێکراو بەدوور بگرن.

پاشنیوەڕۆی ڕۆژی دوایی، هاوڕێیانی دۆڵی بالیسان گەیشتن کە پۆستی هاتووی ناوەندی کۆمەڵەشیان لەگەڵ بوو. بەدوای گەیشتنی ستافی ڕێکخستن و دانانی حەرەسیات لە چەند شوێنێکی بڵندی دەوروبەری گوندەکەوە، کۆبوونەوەی کەرتمان لە ژووری مزگەوت دەست پێکرد و کۆبوونەوەی ئەو جارەمان زۆرتر پێداچوونەوە بوو بە کاروکردەوەکانی ئەو ماوەیەی بەسەرچوو. ئەرکەکانمان و بەوپەڕی ئازادانە خاڵ بەخاڵ تاووتوێ کرد. هەر لە ڕەخنە و ڕەخنە لە خۆ گرتنی یەکە یەکەمان سەبارەت بەو کەموکوڕییانەی پێمانەوە دیار بووە. هەتا دەگاتە کاروباری دارایی کەرت، کە زۆر بە روونی لەلایەن بەرپرسی دارایی کەرت تیشکی خراوەتە سەر و سەرلەبەری داهات و خەرجی بۆ بەردەم هاوڕێیان باسی لێوە کراوە. هەروەها خوێندنەوەی بابەتە فیکرییەکانی مارکسیزم _ لینینیزم پاتە کراوەتەوە و ئەو سیپارە و کتێبانەی لەو بارەوە، لە کۆڵەپشتەکانمان بوو لەگەڵ یەکتری دەستاودەستی پێ کراوە.

لەسەر بەجێگەیاندنی بەرنامەی کاری خۆمان بەشێکی دیاری پۆڵەکان بۆ دەڤەری چالاکییانبەرێکەوتن. ئێمەش ئەوەی مابووینەوە بۆ ڕۆژی دوایی بەرەو گوندی جەلی ملی ڕێگامان گرت. ئەو ڕۆژە زۆرمان مەبەست چوونە سەر ئاوەکەی جەلی بوو. بۆ خۆشوشتن و پاککردنەوەی جلوبەرگەکانمان. ئاوی ڕووبارەکەی جەلی بەردەوام گەرم بوو، هەڵمی لێ هەڵدەستا. چونکە لەو چەمە ئاوی کبریتاو هەڵدەقوڵا. بەرەبەری نیوەڕۆ گەیشتینە سەر ئاوەکە و لەناو گوندی لامان نەدا و ژەمە نانی خۆمان پێبوو. بەدوای گەرماوکردن و شوشتنی جلوبەرگەکانی بەرمان و هیشکبوونەوەی بەرهەتاو. پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ بۆ ناو گوندی کێل بووینەوە. دیار بوو مەفرەزەکەی لقی یەکێتی بەرەو گوندی سناوە بە ڕێ دەکەوتن. بێجگە لە مەلا غەفور و مەفرەزەکەی کە شەوی پێشوو بۆ کۆبوونەوەی لق لە دۆڵی سماقولییەوە هاتبوو. بەدوای کۆبوونەوەکەیان لەوان جیا بووە و تێکەڵی ئێمە بوون. مەلا غەفور کوڕێکی بەژن کورتیلەی بێچەکی لەگەڵ بوو. ئەو کوڕە سەلاح شینەی ناوبوو کە تازە بۆ پێشمەرگایەتی هاتبوو. سەرەتا پەیوەندی بەو مەفرەزەیەی لقەوە کردبوو. لە پڕ ئاگادار کراینەوە کە ( ن) ی ئەندام کەرتی ڕێکخستن لەگەڵ جوتیارێکی گوندەکە بەرەنگاری یەکتر بوونەتەوە. خێرا بە سەر داگەیشتین، خەریک بوو بە یەک

دووەكیان، زێدەڕۆییان بەسەر فەتاحەشێتدا دەكرد. ڕێگامان لێگرتن و فەتاحمان لەبەر چنگیان دەرهێنا و ئەو كارە ناشیرینە بۆ ئەندامێكی كەرتی ڕێكخستن ناشیاو بوو. یەكسەر كۆبوونەوەیەكی بەپەلەمان كرد و (ن) مان لەسەر كارێكی دیكە و ئەوەی ئێرە لە ئەندامێتی كەرت هەڵپەسارد و بە ڕاپۆرتێكەوە ڕەوانەی ناوەندیمان كرد.

بۆ ڕۆژی دواتر تاریک و روونی بەیانی، لە مەفرەزەكەی مەلا غەفور جیا بووینەوە و بەناو گەلی كلكەی چیای ئاوەگرد، ڕێگای گوندی سماقولی گەلی و دۆڵی سماقولیمان گرت.

ئێمە لە ناو ئەو قۆپەنە دارەی بناری ئاوەگرد و پشت گوندی سماقولی گەری چاوەڕوانی خۆرهەڵاتنمان دەكرد. تاكو دنیا ڕووناک بیتەوە و بۆ نانخواردنی بەیانی لە گوندەكە دابەش بین. لەگەڵ تەمتومانی جیهانی سەر گوندەكە، سەگوەڕی ناو گوندی هەستمانی بزواند كە لە چەند لایەكەوە چەكداری زۆر لە ناو گوندن. دووربینێكی شەومان هەبوو، تەماشای ناو گوندمان كرد. زانیمان ئەوانە پێشمەرگەن و زۆر بە شپرێوی خەریكی هات و چوونن.

پانتاییەک لە زەوی بە تاڵ لە ناوەندی گوندەكە هەبوو. دركمان بە قەڵەبالغی هەبوون كرد و كاكەمین لە پێشەوە بەرپەنادزە خۆی گەیاندە دەورووبەرەكەوە. نیازمان بوو بە هۆی هەبوونی ئەو هەموو پێشمەرگەوە لەو گوندە بۆ گوندی سماقولی سێنان بچین. بەڵام ڕێگاكە هەر دەچووەوە بەردەمی گوندی. كاكەمین خیرا گەڕایەوە و هەواڵی ئەوەی پێبوو، بەشێكی پێشمەرگەكان ئەوانەی ناوچەی كۆیەن و شەهریار بەرپرسیانە. لەو گۆڕەپانەی ناوەندی گوند بازنەیان بە دەوری ش _ ع و ژمارەیەک لە پێشمەرگەی هەولێر داگرتووە و داوای چەكدانان لەو مەسولە دەكەن !

زۆرمان لا سەیر بوو، كە پێشمەرگەی یەكێتی هەوڵی چەككردنی پێشمەرگەی هێزەكەی خۆی بدات! ئێمەش بە ناچاری و بە بازنەیەكی فراوانتر دەورەمان گرتن. كە من گەیشتمە پێشی پێشەوە و كاكەمین گەیشتبووە سەر ئەو بانەی بەسەر پانتاییەكەی دەڕوانی و بەسەر سەری منەوە بوو. شەهرە كە چاوی بە ئێمە كەوت و ڕووی لە من كرد و گوتی.. حاجی مەمۆ تكایە تەداخل مەكەن، ئەو جەنابە زێدەڕۆیی كۆمەڵایەتی لەماڵە جوتیارێكی خزمم كردووە. دەبێ من لە بەرچاوی هەمووان هەمان شتی لەگەڵ بكەم..! ئێمەش غیرەتمان ڕێگای نەداین كە ئەندامێكی كۆمەڵە، لە بەرچاوی خەڵكەوە و بەبێ

بەڵگە و لەژێر هەڕەشە سوک بکرێ. برادەری گەمارۆدراو لە ژێر گەفی شەهرە، هەتا تفەنگەکەی لەسەر عەردەکە دانابوو. دوای هەندێ پەیڤی هێورکردنەوە. شەهرە سەری نەدەهینا بەرێ و خەریک بوو ناخۆشی دەقەوما. ناچار ئێمەش بە هەمان شێوازی هەڕەشەوە، کەوتینە دەمەقاڵی توندوتیژ. کاکەمینش لە سەریانەکەوە، شوێنی لە هەمووان بڵندتر بوو. دەنگی هەڵبڕی و بووە تفەنگ راکێشانی دەیان پێشمەرگەی هەردوو لا لە یەکتری. لێرەدا هەرگیز هەڵوێستی جەوهەری عومەری عەلی گۆجی کۆییم لە بیر ناچێ. کە لەناو هێزەکەی کۆییەکاندا ئەو هاوڕێی کۆمەڵە بوو. بە هاوارکردنەوە گوتی.. ئەوە چی دەکەن، دەتانەوێ یەکتری بکوژین..! ئەوەی تەقە لە ڕێکخستنی کۆمەڵە بکات، من تەقەی لێ دەکەم. ئەوە بوو ئەوجا شەهرە سەری هێنا بەرێ و لەسەر ئەوە رێکەوتین. هەر لایە و راپۆرتی خۆی بۆ سەرکردایەتی بنووسی، بڕیار بە دەست ئەوانەوە بێت. هەر لایە و بە لایەکدا پەرتەمان کرد. ئێمە ئەو برادەرە و مەفرەزەکەیمان لەگەڵ خۆ بەرەو سماقولی سێنان برد و بە ڕێکوپێکی ئەو ناومان جێهێلا.

## پاسۆک و کەوتنە داو و چۆنیەتی دەربازبوونیان

ئێوارەیەک لەگەڵ هێزەکەی خۆشناوەتی بۆ هەندێ کاروباری ڕێکخراوەیی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە لە گوندی سماقوڵی سەروچاو کۆبوونەوەمان هەبوو. کە ئەو هێزەی خۆشناوەتی یەکێتی تازە لە دەوروبەری سەری ڕەش گەڕابوونەوە. لە ڕێگای پێشمەرگەی ئازا و شارەزای مەسیف و سەری ڕەش عەلی مەسیفی کە ماوەیەکی زۆر نەبوو لەناو ئەو مەفرەزەیەی تۆفیق بیرێژی هاتبووە ریزی کۆمەڵەوە، چالاکییەکی پێشمەرگانەیان ئەنجام دابوو.

هەتا بەرەبەری شەو درەنگانێ، شیرازەکانی ڕێکخستنمان لەناو هاوڕێیانی کۆمەڵە لەو هێزەدا ڕێکخست. مەهدی کاوانی وەک کادرێکی کۆمەڵە بە بەرپرسی پۆلی ناو ئەو هێزە دەستنیشان کرا و ڕێکخستنی رووبەڕوو کرایەوە.

بۆ خەوتنی شەو ئێمە لە خوارەوەی گوندی و لە ماڵەکەی حەمەی کوڕی کێخوا عەزیز جێگامان گرت. کە ماڵومنداڵەکانی لەوێ نەبوون. هێزەکەی خۆشناوەتی لە مزگەوتی گوندی مانەوە. شەو درەنگانێ لەلایەن پاسەوانێکی شەو بێدارکرامەوە، کە

ملازم خوله لەبەر دەرگاکە چاوەڕوان بوو. جارێ بە تەنیا لەگەڵ خۆم هەواڵی ئەوەی پێڕاگەیاندم. کە لەلایەن باوەڕپێکراوێکەوە ئاگادار کراوەتەوە. ئەو مەفرەزەیەی پاسۆکی ناوچەکانی سلێمانی کە لە ئەنجامی راوەدوونانیان لەلایەن هێزەکانی یەکێتییەوە، بە یارمەتی حسک و حشع لە ناوچەکە دەسوڕانەوە. ئەوانە لەگەڵ مەفرەزەیەکی حسک، وان لە گوندی سماقوڵی گرتک و لە مزگەوتەکە جێگایان گرتووە. منیش پرسیم.. ئەوجا لەو باسوخواسەدا مەبەستتان چییە..! ملازم خوله گوتی.. دەمانەوێ بە هەموو لایەکمان لەناو مزگەوتەکە پەلاماریان بدەین. کە لێدانیان بە فەرمانی سەرکردایەتی و نامەیەکی لەو بارەوە پیشاندام. لێرەدا من پێشنیاری ئەوەم کرد با هەموو لایەک لە فەرماندەی کەرتەکان و مەسول ناوچەی یەکێتی و بە سەرپەرشتی خۆتان کۆبوونەوەیەک بکەین. لەوێ ئێمە وەک رێکخستن سەربارى ئەوەی هیچ نامەیەکی لەو جۆرەمان بۆ نەهاتووە و رای خۆمانتان پێ دەڵێم..

ئەوە بوو هەر دەمودەست لە سەربانی مزگەوتەکە، ملازم خوله، تەحسین کاوانی، مەلا غەفور، رێباز، مامۆستا بەکر، من کۆبوونەوە. سعات دەوری دووی شەو بوو. دەکرا بە دەستوبرد و بە نیوسعاتێک پێشمەرگە بگاتە گوندەکە و مزگەوتەکە گەمارۆ بدرێ. لێرەدا بۆ مێژوو دەیگێڕمەوە، رێباز بەر لە هەموومان، ئەو کارەی بە باش نەزانی و بە سەرەتای دەستپێکردنی شەڕێکی دیکەی خۆکوژی لە ناوچەکە گێڕایەوە. منیش خێرا رایەکەیم پەسند کرد. بە ئاشکرا پێم گوتن.. ئێمە وەک رێکخستن، ئەوە بە کاری خۆمان نازانین و بە راشکاوی لە دژی ئەو شەڕە قێزەوەنە قسەکانی خۆم کرد و بە کوشتدانی کوڕی خەڵک لەگەڵ یەکتری، تەنیا بە زیان بۆ خەباتەکەمان تەواو بووە و دەبێت. لەگەڵ ئەوەی هەموو کارە نەخوازراوەکانی ئەو مەفرەزەیەی پاسۆک لە ناوچەکانی سلێمانی لە قاو دەدەین. بەڵام ئایا درێژەپێدانی ئەو تراژیدیایە مەرگەساتە، بە قازانجی کێ دەگەڕێتەوە! ئەمڕۆ بێت یاخود سبەینێ، هەر دەبێ بە یەکەوە ئاشت بینەوە. تەنیا کوژراوەکانی هەموو لایەک دەبنە قوربانی بێهودە و مایەپوچ دەمێننەوە. ئەوجا پەلاماردانی ئەوانە لەناو مزگەوت کارەساتێکمان بۆ دەهۆنرێتەوە کە سەرەوبنی نەبێتەوە. ئەو قسەوقسەلۆکانەی لەسەرمان هەیە کە کۆمەڵە رێزی مزگەوت ناگرێ، باشتر و فراوانتر بالۆرەی بۆ لێدەدرێ.

ڕێباز بە ڕاشکاوی ڕایەکانی منی وەرگرتەوە و ئەوەشی خستە سەر، کە ئەوانە هەر بە تەنیا نین، مەفرەزەیەکی _حسک _ یشیان لەگەڵ دایە. واتە سەرلەنوێ جاڕی هەڵگیرسانەوەی شەڕ لەگەڵ ئەوانیش نوێ دەکەینەوە. بە تایبەت ئەو ڕۆژە هێزەکانی حسک هێشتا لە ناوچەکانی هەولێر دەستڕۆیشتوو بوون.

ئەو دەمی زۆربەی بەشداربووەکانی کۆبوونەوەکە لەگەڵ ئەوە بوون. هەر چۆنێک بووە دەبێ پەلاماری ئەوانەی پاسۆک بدەین. لێرەدا ڕێباز و ئەز وەک بیرکردنەوەیەکی مامناوەندی قەناعەتمان بە برادەران کرد. کە وا باشترە لە دوای دابەشبوونی نانخواردنی بەیانی ئەو برادەرانەی پاسۆک و حسک لە مزگەت دەردەچن. ئێمە دەچینە ناو مزگەتەکەوە و کە ئەوانەی پاسۆک گەڕانەوە بەردەم مزگەوت، بە دەستە جەمعی دەستیان لێ دەوەشێنین

ئەوەندەی بۆمان کرا لە شانی ڕێباز بە پلەی یەکەم، دوایی هەڵوێستی نەرمونیانی مامۆستا بەکر و مەلا غەفور تای تەرازوی بڕیارەکەمان گۆڕی بۆ خۆلادان لەو جۆرە شەڕە، بووە مایەی ئەوەی پلانی پەلاماردانەکە تا بڵێی بە کرچ و کاڵ بچێتە واری جێبەجێکردنەوە. ئێمە مەفرەزەیەکی ڕێکخستن لەگەڵ ڕێباز و ملازم خولە، یەکەم دەستە بوو خۆمان گەیاندە بەردەمی مزگەوتەکە. کە ئەوانەی پاسۆک و زۆربەی مەفرەزەکەی حسک بەسەر ماڵەکان دابەش ببوون. تەنیا دوو پێشمەرگەی نەخۆشی بێچەکی حسک مابوونەوە. بە کورتی ئەو پێشمەرگانەی خۆشمان کە لەسەر زۆربەی ڕێگاکان دانرابوون، تەنیا ڕێگای خوارەوە نەبێت، بەبێ مۆڵەت ئەوانیش بەسەر ماڵەکان دابەش ببوون. بەو جۆرە پێشمەرگەکانی پاسۆک لە خۆیان گەیشتبوون و نەهاتنەوە بەردەمی مزگەوت. هەموویان بە ڕێگای خوارەوە ڕێچکەی خۆ دەربازکردنیان گرت. کە بەراستی بە هیمەتی بەشێکمان ئەو دەست لە قورگی یەکترنانە ڕووی نەدا.

ئێمە بەشێکی زۆرمان بۆی ئاسوودە و سەربڵندانە هەناسەمان هەڵکێشا. لە گەڕانەوەدا بۆ گوندی سماقوڵی سەروچاو، ڕێباز دەستخۆشی لە بەندە کرد کە بووینە مایەی نەقەومانی هیچ جۆرە کارەساتێک. دوایی لە کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە بۆم دەرکەوت کە لەو بارەوە، ڕاپۆرتی سەیر و سەمەرەم لەسەر بەرزکراوەتەوە و جەمال تاهیر لەسەر ئەمری سکرتێری کۆمەڵە بە ڕاشکاوی ئەوەی بەزەقی بە ڕوو دادامەوە.

دەبوو هەر ئەو رۆژە من واز لەو کۆمەڵە و پێشمەرگایەتییە بهێنم. بە ئامۆژگاری کەسانی وەک مەلا بەختیار، ئیستقالەکردنەکەم نەکێشمەوە و سەری خۆم هەڵگرم. چونکە ئەو دەم لەوە گەیشتم کە ئەو سەرکردایەتی و دامودەزگا حیزبییە، تەنیا مرۆڤی دڵسۆز و هەڵسوڕاوی بێفڕوفێڵیان گەرەک نییە. بەڵام دیسانەوە چی دەکەی لەگەڵ کاڵفامی و نەبوونی جەسارەتی بڕیاردانی یەکجارەکی..!

بێگومان وەک پێویست عەقڵم بە کارەکاندا نەشکاوە. تەنیا لە سێبەری دەروێشییەکی لاساری بیروباوەڕە سادە و ساکارەکانم گاڵتەم بەو تۆمەتانە هاتەوە و پێی سەرفراز بووم. چونکو بابایەکی ئەوێ رۆژێی وەک من و دەیانی دیکە، لە خەیاڵێک و ئاشەوان و جامبازەکانی بواری سیاسەت لە خەیاڵی تری مەیدانی سازدان و پیادەکردنی خەون و خەیاڵی رەنگاوڕەنگی بەهاری چەند زەردێنەی خۆیاندا بوون، هەر ئەوانیش بردیانەوە و کەسانی بێپشتیوان بۆ کەسانی سووک و گەندەڵکاران کرانە پێخۆری رێگای قورخکردنی پلەوپایەکان.

## جەولەی بەرەو دەشتی هەولێر

هاوینی ساڵی ١٩٨١ بوو، هەردوو مەفرەزەکەی قوەتی هەولێر و کەرتی رێکخستن، خۆیان لە چل پێشمەرگە دەدا. شاخەوان کە ئامر قوەت بوو، زۆری پێ خۆش بوو بۆ گەڕانەوە دەڤەری بەستی شەرغە ئەوانەی رێکخستنی لە تەک بێت. کە حسک لەو دەڤەری هێشتا دەستیان دەڕۆیشت. ئێمەش هەر خۆمان بەرنامەکەمان ئەوە بوو بەدوای جەولەیەکی دۆڵی سماقوڵی و یەکگرتنەوەمان لەگەڵ مەفرەزەکەی پۆلی دۆڵی سماقولی، بۆ ئەو خوارەوە بچین.

ئێوارەیەک بە زوویی خۆمان گەیاندە سەر تیشەکانی چیای باوەجی سەر رێگای هەولێر _ کۆیە و لە گوندی کرۆژ کە تەنیا چەند ماڵێک بوون بەرێککەوت تووشی خەسرەوی کوڕی هادی شێرە هاتین، زۆر بە گەرموگوڕی پێشوازی لێ کردین و گفتی دا کە لەناو جوتیارە زەحمەتکێشەکانی ئەو چەندە ماڵە بە ناوی رێکخستنەکانی یەکێتی چالاکی بنوێنی.

بەدەم تاریکبوون بۆ سەر سەرجادەکە شۆڕبووینەوە و ئەو پێشمەرگانەی هێزەکەی هەولێر و ئەوانەی کەرتی ڕێکخستن، هەر یەکەمان بە تەنیا لە شوێنێکی جیا و لە دووری یەکتری بە سەلامەتی پەڕینەوە. درەنگی شەوێ لە گوندی گۆپتەپە یەکترمان گرتەوە. بەدوای نانخواردنێکی سەرپێیی و وەرگرتنی ژەمەنانی بەیانی و نیوەڕۆ، بۆ باوەشی هەرەت و پەلەتەکانی گوندی سماقە ڕێگامان گرت. ئێمە لەو جەولەیەی دەڤەرەکە (کەراست تر وایە بە بەری ڕۆژئاوای وڵاتی کۆیە و بەستی شەرغە و دەوروبەری دیدەوان ناوی ببەین، چونکە لەوێ ڕۆژان و ساڵدا، پێشمەرگەی یەکێتی بە مەفرەزەی بچوک بچوک و تاریکایی شەو، دکاری هاتوچۆی گوندەکانی دەڤەرەکە بکات. بەراستی دەشتی هەولێر، هەردوو بەری جادەی هەولێر _ شارۆچکەی ئاڵتون کۆپری دەگرێتەوە کە بە مولکییە و سەنییەش ناو دەهێنرین، کەچی لە تەسمییەی گشتی دەشتی هەولێر هەتا کەندێناوە و قەراج و شەمامک و بەڕانەتی دەگرێتەوە) لەو جەولەماندا، وەک مەفرەزەکەی ڕێکخستن بەو ناوچانەدا، زۆرتر ناساندن و رادەستکردنی ئەو هاوڕێ و دۆستانەی کۆمەڵە بوو کە لە جەولەکانی پێشوتر، لێرە و لەوێ ڕێکخرابوون، بە پۆلی ڕێکخستن کە وەک پێشتر باسم کردووە، م. سدیق سالح گۆران بەرپرس بوو. پاش یەک دوو شەو ئەو پۆلەمان لەگەڵ کەرتەکەی ئەحمەد قەمبەری لە گوندی قەمبەر گرتەوە. کە پێشمەرگەکانی ئەو کەرتە هەموو هاوڕێی کۆمەڵە بوون.. ئەو دەمی سەفینی مەلا قەرەش لەو کەرتە بوو، وەک کادرێکی هەڵسوڕاوی کۆمەڵە و پێشمەرگە، جێگایەکی دیاری هەبوو. زۆربەی ڕۆژ و شەوەکان لەو ناوچەیەی بەستی شەرغە و دیدەوان و دەوری بەری ڕووباری کۆیە و زێی بچوک بەیەکەوە دەسوڕاینەوە، بەتایبەت سەفین لەگەڵ حاجی ئەکرەم شەو و ڕۆژ بەیەکەوە بوون. ئەو پۆلەی ڕێکخستن لەو ماوەیەدا، لەناو خەڵکە زەحمەتکێشەکاندا، بە هاوکاری بەشێک لە هاوڕێیە پێشمەرگەکان، جێپەنجەیان دیار بوو. لە زۆربەی گوندەکاندا، دۆست و لایەنگر و هەوادارییان بۆ کۆمەڵە ڕێکخستبوو، مامۆستا سدیق و کادر و هاوڕێیانی پۆلەکە، ببوونە جێگای ڕەزامەدی خەڵکی گوندەکان و لە زۆربەی کاروبارەکانیان پرسیان پێ دەکردن، چونکە ئەو هاوڕێیانە بە پراکتیک خاکی و سادە بوون، لە درشت و وردی کاری جوتیارەکان، دەستبار و هاوکاری خەڵکەکە بوون. بە جۆرێک لای هەندێک لە بەرپرسی پێشمەرگەی یەکێتی، هەزم نەدەکرا و چاویان بە کارێکتێری کرۆکی ڕێکخستن و کەسایەتی کادرەکان هەڵنەدەهات. لێرەوە بە زەقی

درکمان به هەندێ رەفتاری مەسولە عەسکەرییەکانی ئەو هێزە کرد، کە سەرباری ئەوەی زۆربەی هەرە زۆریان، بە ناو کۆمەڵە بوون و هەتا لە کۆنفرانسەکان ئەندام بوون. کەچی لەگەڵ دروستبوونی کەرتی رێکخستن بە گشتی، رێکخستنی پێشمەرگەکانی هەوادار بە کۆمەڵە لەناو شانە و شیرازەی رێکخراوەیی لە لایان نامۆ بوو. بگرە رێکخستن لە ناو هێزەکەدا ئەو مەسولە سەربازییانەی تەنگەتاو کردبوو. کە بە ئاشکرا بە ئەزیان گوت، کە ئەوان دەبێ لە دانانی مەسول پۆل و ئەندامەکانی و هەتا کادرەکان، قسە و رای بریاردەریان هەبێت، کە لەلایەن ستافی رێکخستنەوە رەتکرایەوە و پێمان گوتن کە کەرتی رێکخستن وەک چۆن رێگا نادات، هیچ مەسول و کادرێکی رێکخستن دەست بخاتە کاروباری سەربازی هێزەکە و کار و چالاکییەکانی ئیدارەدانی ناوچەکە و هتد. بە هەمان رەنگ تەنیا بە پرسکردن و گوێگرتن لە پێشنیاری گونجاوی ئەو مەسولانە، بۆ ئەنجامدانی مەسەلە رێکخراوەییەکان، دەنا وەکی دیکە، رێگا بە هیچ مەسولێکی عەسکەری نادرێت، بە ئارەزووی خۆی چی ئەو بیەوێ، ئەوە بکەین. شاخەوان بەرپرسی سەربازی ئەو هێزەی پێشمەرگەی دەشتی هەولێر، بە چاولێکەری مەسولی لە خۆی گەورەتر کە لە بەرچاوی دەیان کادر و پێشمەرگەی یەکێتی، لە گوندی سەرنەوسی دۆڵی خانەقا، بە جوێن و قسەی ناشیرین، ئیهانەی خۆی و چەندان کادری تری کرد، کە لە ناوچەکانی خوارەوە ترسنۆک و پیاوکوژنین..! ئەویش و هاوکوفەکانی گەرەکیان بوو بە هەمان بەرخورد لاسایی گەورەکانیان بکەنەوە. زێدەرۆیی ناجۆر بەرانبەر هاورێ پێشمەرگە مولتەزیمەکانی رێکخستن بکەن، کە تەنیا بۆ کارێکتێری تەنزیم گوێرایەل بوون. نەوەک بۆ پیاو پیاوانێ و ملکەچی لە بەردەم مەسولە ملهورە ملۆزمەکان. پاشان هەر لەو ناوچەیەوە، درکمان بەوەش کرد کە ئەو مەسولە عەسکەرییانە، نەوەک هەر بە رەخنە و پێشنیاری هاورێیانی رێکخستن قوشقی دەبن، لە بەرێوەبردنی ناوچەکە و کۆکردنەوەی باج و دەستکەوتی مشە و زێدەرۆییکردنە سەر سەروەرییەکانی کۆمەڵانی خەڵک، بگرە ئەوەندەی بۆیان کرابێت، هاورێیە چالاکەکانی هەتا ناو هێزەکەی بەردەستی خۆیان و ئەوانەی رێکخستن، لە بەرچاوی خەڵک و پێشمەرگەی دیکە شکاندوون و بیانویان پێ گرتوون. لەپاڵ ئەو دیاردە ناهەموارانەشدا، هاورێیانی رێکخستن لە چالاکی سەربازیی مەترسیداری ناوچە دوورەدەستەکان، بە شداری شێلگیرانەیان کردووە. هەر بۆ نموونە، لەو ماوەیەی مەفرەزەکەی کەرتی رێکخستن لە ناوچەکە بوو. بۆ یەکەمجار

مەفرەزەیەکی یەکێتی بە مەسولیەتی کاوە مەخموری، جەولەیەکی خێرای بۆ ناوچەکانی کەندێناوە و قەراج و خودی مەخمور کرد، کادیرێکی هەڵسوڕاوی کۆمەڵە، مەسعود عەقاری و دوو پێشمەرگەی کەرتی ڕێکخستن، ڕۆستەم و عزالدین بەشدارییان کرد و سەرکەتوانەش گەڕانەوە.

## شەهیدبوونی سێ هاوڕێی پێشمەرگەی ئازای کەموێنە

ئێمە بەدەم ڕێگاوە، ناوچەی بەستی شەرغەمان جێ دەهێلا، کە تێکڕای پێشمەرگە و کادر و هەتا هاوڕێیەکانی پۆلەکەی دەشتی هەولێری گرتبوەوە. دەمانویست بۆ ماوەیەک لەو ناوچەیە دوور بکەونەوە. گرژییەکانیان لەگەڵ مەسولە عەسکەرییەکان فراوان تر نەبێ. ئەوجا بۆ کۆبوونەوە و چوونە ناوچەی دۆڵی سماقولی و پشوو وەرگرتن، هەمووەمان ملمان لە ڕێچکەی کەندولەندان نابوو. شەو بوو لە گوندی بایزاغا، هەواڵی کارەساتی شەهیدبوونی سێ لە پێشمەرگە هەرە جەربەزە و هاوڕێیە هەڵسوڕاوەکانی کۆمەڵەمان بیست. _ وریا شەمامکی (عوسمان)، ڕێباز (ئەحسین ئەحمەد) و هوشیار ئیلنجاغی، کە لە ڕێگای چالاکییەکی پێشمەرگەیی گەڕابوونەوە و لە کەلی قەشقە لەلایەن کۆپتەرەکانی ڕژێمەوە پەلامار دراون و لە ناو سەیارەکەیان شەهید کراون. ئەو دەستە پێشمەرگە گورجوگۆڵە لەوێ ڕۆژاندا، بۆ پشتیوانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە ناوچەکانی هەولێر و هێزی پێشمەرگەی یەکێتی، زۆر پێویست بوو. چونکو لەوێ زەماندا ئەو ڕۆڵە هەڵکەوتووانە، وەک سێ گەنجی بە بیروباوەڕی کۆڕی خەبات، بۆ کۆمەڵە لە ناوچەکانی هەولێر زۆری بوون. یەکەم مەفرەزەی یەکێتی بوون لە ناوچەی شەمامک و دەوروبەری هەولێر، دەست و چاوی پێشمەرگەیان کردبووەوە بۆ چالاکی نواندن. ئەوان بە ئازایەتی و دەستوەشاندنی خۆیان، زەمینە و ڕێگایان بۆ دەیان پێشمەرگە و مەفرەزەی وەک خۆیان خستە سەرپشت. داخەکەم تەمەنی پێشمەرگایەتییان کورت بوو، دڵ و دەروونی هاوڕێیە دڵسۆزەکانیان تەزاند. لە بیرمە لەگەڵ ئەوەی ڕێگای پەڕینەوەمان بە جادەی کۆیە و بڕینی چیای باواجی لەپێش بوو. هەمووەمان بۆ شەهیدبوونی ئەو پۆلە پێشمەرگەیە تاسابووین و هەر ئەوەتە هەنگاومان بۆ دەنرا. شەهیدان وریا شەمامکی و ڕێباز لە شارەوە لەو هێڵەی هاوڕێ وەرزێر بوون، بۆ

ماوەیەکیش لە هەرێمی حەفت پێشمەرگەیەتییان کردبوو. دواتر بە هۆی ناسیاوییان لەگەڵ هاورێ وریا حاجی قادر لەگەڵ دامەزراندنی کەرتی رێکخستنی شەقڵاوە بۆ ناوچەکانی دەوروبەری هەولێر گەڕابوونەوە. شەهید هوشیاریش هەر لە شارەوە پەیوەندی بە ریزەکانی کۆمەڵەوە کردبوو. ئەو خورتە شۆڕشگێڕانە کە لە ژیاندا بوون نزیکەی دوو هەفتەیەک لەگەڵ مەفرەزەکەی رێکخستن تێکەڵ بوون و لە دانیشتن و بەیەکەوە جەولەکردن، خاوەنی چەندان پرسیاری سەرنج راکێش بوون. سەبارەت بە دۆزی کۆمەڵە و فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیای (مارکسیزم _ لینینیزم) و ئاسۆی دوارۆژ پرسیاریان گرنگیان هەبوو. بە دڵسۆزییەکی بەرچاو لە خەمی گەشەکردنی چلۆنایەتی رێکخستن بوون. تامەزرۆی سەرکەوتنی بەردەوامی چالاکی پێشمەرگانە بوون. لەگەڵ خەڵکی کرێکار و زەحمەتکێشان سادە و پڕ لە کۆمەک و هاوکاری بوون. زۆر دڵخۆش بوون بۆ لەسەرپێبوونی کارێکتێری رێکخستن، سەرباری چەکبەدەستەوەبوون و چالاکوانێکی کەم نمونەی دەستوەشاندنی پێشمەرگانە لە دوژمنانی داگیرکەر و هێزەکانی رژێم و نۆکەرەکانیان، پشت و پەنای بێ پەروا و پیادەکاری پرنسیب و سەرەتا شۆڕشگێڕییەکانی رێکخراوەیی بیروکردار، نەیاری سەرسەختی مەسولە عەسکەرییە غەدارەکان و لە جێی خۆیدا بەرپەرچییان دەدانەوە و فشەیان لێ قبووڵ نەدەکردن. هەر بۆ نمونە لەسەر پێشنیاری ئەوان، لە بیرمە بەسەرپەرشتی هاورێ کاکەمینی بەرپرسی سەربازی کەرتی رێکخستن، لەگەڵ ئەو هاورێ پێشمەرگە جەسورانەدا، بە هێزێکی هاوبەشی ناو دوو سەیارەی مەدەنی، بۆ یەکەمجار لە تاریکایی شەو و پەلامارێکی کتوپڕی سەیتەرەکەی هەولێری سەر رێگای بەرەو قوشتەپە درا و گورزێکی کوشندە لە دامودەزگا و جەندرمەکانی سەیتەرەکە وەشاند کە بە رۆژ ئازاری خەڵکی هاتوچۆکەریان دەدا.

# گوندی عەلیاوەی فەخری بەگ و گەمارۆدانمان

لە شەوێکی ئازاراوی بەرۆکی شەهیدبوونی هاوڕێیەکانمان، بۆ دۆڵی سماقولی خۆشناوەتی بەجادەی کۆیە_ هەولێردا پەڕینەوە. لەسەر پێشنیاری حاجی ئەکرەم ڕێگامان بووە هەڵگەڕان بەو تیشانەی باواجی، کە بەسەر دێگەلەوەی دەڕوانی. بەیانییەکەی جێشتەنگاوێ خۆمان گەیاندە سەر ئاوی ئەو چەمەی کە بە بەردەمی گوندی عەلیاوە بۆ بن پردەکەی دێگەرە شۆڕدەبوەوە. حاجی ئەکرەم دۆستێکی گیانی بەگیانی فەخری بەگی بوو. کە بە مرۆڤێکی خانەدان و چاوتێر ناسرا بوو.

بەو مەبەستەی لەسەر ئاوی چەمەکە خۆمان بشۆین و جلەکانمان پاک بکەینەوە. چەند هەفتە دەبوو لەناو دڕوونی و فرکەفرکی ئەسپێ بەسەر جەستەمانەوە ئۆقرەمان لەبەر برابوو. حاجی ئەکرەم بە خۆی و چەند پێشمەرگەیەک بۆ گوندی چوون. لەماڵەکان هەندێ مەنجەڵ بە سابون و تایدەوەیان هێنا. هەرچەند هەوڵیان دابوو کە بۆ نیوەڕۆ کوشتییەک و هەندێ برنج و ساوار بکڕن، تاکو بەدوای کۆرکردن، بەخۆمان خۆراکی نیوەڕۆ سازبکەین. بەڵام فەخری بەگ ڕێگای ئەوەی نەدابوون و گوتبووی بە خۆم و خزمانی گوندی خواردن بۆ هەمووتان ئامادە دەکەین.

ئێمە کە ماندووبوونمان لێدەتکایەوە، تۆز و خۆڵی دەشتی هەولێر سەروپۆتەلاکی یەکە بە یەکەمانی داپۆشیبوو، خەمباری بۆ هاوڕێیە شەهیدەکانمانیش _ وریا و ڕێباز و هوشیار _ سەربار بوو. زۆربەمان بە دڵنیاکردنەوەمان لەلایەن حاجی ئەکرەم، کە لە پەنای گوندی فەخری بەگ هیچ مەترسییەکمان نەبێت. هەر یەکە لە پەنا سێبەری ئەو دارویارەی چەمەکە لێی پاڵکەوتن. بەڵام خۆم هەر دڵم بەرایی نەدا و لەنەک کاکەمین لەسەر گردێکی سەر چەمەکە پاسەوانیمان گرت.. هەر چەند هاوڕێیەک بە یەکەوە، لە پەنا چەپەرە دارێکەوە کەوتنە کۆری خۆیان. ئێمەش بە نۆرە سەرخەوێکمان شکاند. ئەوە بوو دوای مەودایەک، حاجی ئەکرەم و پێشمەرگەیەکی دیکە، هاتنە شوێنەکەمان کە هێشتا جلەکانیان بە تەواوی وشک نەببوونەوە، گوتیان لەبەر خۆرەتاوەکە وشک دەبنەوە. ئێمەش یاغر یاغر بۆ لای چەمەکە شۆڕبووینەوە. هێشتا من لە شوشتنی جلەکانم نەببوومەوە، لە پڕ لە دەنگی هاوارە هاواری پاسەوانی خۆمان و دەنگی لایدە، سەرمان ڕاستکردەوە.. دیتمان سەرگردۆڵکەکانی دەووبەرمان لێ گیراوە..! ناچار بە پەلەپروسکێ جلەکانم لەبەر کرد. کاکەمین لە بەندە چاپوک تر هاتە دەست و لەپێش

هەموانەوە، بە خۆیو تفەنگی ئارییکەکەیەوە، لە بەرانبەردا و لەشانی پێشمەرگەکانی خۆمان سەنگەری گرت. لە دوورەوە گوێم لە دەنگیان بوو، کە داوای خۆ تەسلیم کردنی ئێمەیان دەکرد. منیش بانگم کردن.. ئێوە ئەگەر پێشمەرگەن، بۆ ئەو داوایە دەکەن..! لەو بینە و بەردەیەدا سەیرم کرد، ئەوان بەسەر شوێنەکانی ئێمەوە زاڵن. ئەگەر هەر تەقەیەک روو بدات، رەنگبێ زیانی هەرە گەورەمان بەرکەوێت و کەسمان بە ساغی دەرنەچێت.

دیار بوو ئەوانەی بازنەیان لەسەر گردۆلکەکانەوە بە دەوروبەرمانەوە بەستبوو، بە پلەی یەکەم ئەو مەفرەزەی پاسۆک بوون کە بۆ حەوانەوە و دەربازبوون لە مەترسی هێزەکانی ینک هاتبوونە ئەو ناوچەیەوە. بە ناوی بەرەی جود لەگەڵ هێزێکی حسک بە یەکەوە بوون. هێزەکەی حسک لە هەندێ کۆنە کۆمەڵە و یەکێتی بە مەسولیەتی ئازاد خۆشناو و مەفرەزەیەکی تەحسینە شەل و مەفرەزەیەکی مام قادر شۆڕش وەک مەسولی هێزەکەی حسک پێک هاتبوو. هەر لە دوورەوە ئەوانەی پاسۆک بە گەف و هەڕەشە قسەیان دەکرد، ئەوانەی _حسک _ یش بە تایبەت ئازاد خۆشناو و مام قادر شۆڕش کە زانییان ئێمە کەرتی رێکخستنین، حاجی مەمۆ و حاجی ئەکرەمیان لەگەڵ دایە، هێمن تر و بێ پتک و پلار بوون. لەو دەمیدا فەخری بەگیش سەرەتا گەیشتە لای ئێمە و داوامان لێ کرد وەک راسپاردە، لەشانی حاجی ئەکرەم قسەکانمان بۆ ئەوانەی حسک ببات. بە تایبەت بۆ لای مام قادر شۆڕش و ئازاد خۆشناو. قسەمان ئەوە بوو کە لە شەڕ پێفرۆشتن و پەلاماردان بێمنەتین و تەنیا بەسەر لاشەمان، چەکەکانمان دەستکەوتیان دەبێت. فەخری بەگ زۆر نیگەران و بە پەرۆش بوو، دیتی ئەوانن وا بەخۆڕایی گەمارۆیان داوین و شەڕمان پێدەفرۆشن، گوتی.. ئەگەر هێرشتان بۆ بهێنن، تەرمی منیش لە تەک ئێوەوە دەبێت و هەڵوێستێکی مەردانە بوو. ئەوەبوو ئەوەشمان پێ گوت.. ئەگەر برادەرانی حسک نیازیان خراپ نییە، با خۆیان لەوانەی پاسۆک جیا بکەنەوە و لێگەڕێن با پاسۆک پەلامارمان بدەن..!

فەخری بەگ کە لەگەڵ حاجی ئەکرەم گەڕانەوە و پەیامی ئازاد و مام قادر ئەوە بوو، بەدوای سڵاو.. ئەوان داوای بوردن دەکەن، کە نەیانزانیوە کە کەرتی رێکخستنی کۆمەڵەین، بەڵام ناکرێ ئەوانەی پاسۆک بەجێبهێڵن، ئەوان بەبێ حسک ناتوانن پەلامارتان بدەن. ئەوە بوو لەسەر را و پێشنیاری فەخری بەگیش، ئێمە خۆمان

کۆکردەوە و بە بەرچاویانەوە دوو دوو و مسافەیەکی باش، ڕێگای گوندی _ونکە_مان گرت کە هەر نیوسەعاتێک دوور بوو. گفتیشمان بە فەخری بەگ دا، کە بۆ سبەینێ بۆلایان بگەڕێینەوە. مام قادر و ئازاد نامەیەکی هاوبەشیان ناردبوو، کە سوپاسی هەڵوێستی ئێمەیان کرد، لەوەی ڕێگامان بە کارەساتێکی دیکەی شەڕی خۆکوژی گرتووە و ئاواتەخوازبوون کە ئەو هەڵوێستە بۆ هەموو لایەک ببێتە نمونە و لە شەڕی خۆکوژی برایەکان دەربازمان ببێت.

ئێمە کە ئەو شوێنەمان بە جێ هێشت. مانەوەی شەویشمان لە گوندی عەلیاوە بۆ دوو شەوی دیکە دواخست. هۆکارەکەی لە تەواوی بیروبۆچوونی خۆمان بوو کە باوەڕمان بە شەڕی خۆکوژی ناوخۆ نەبوو. بە پراکتیک ئەوەمان بۆ روون ببوەوە، ئەوە شەڕێکی بێهودەی خۆکوژییە و تەنیا خەڵکی کورد و زەحمەتکێشان دۆڕاوی سەرەکین. بۆیە زۆرمان پێ ئاسایی بوو، نەچینە ژێرباری گەف و هەڕەشەی نەیارەکانمان، چونکو ئارادەیەکی باش ئەو هەڵوێستەمان چ بۆ شەڕ و چ بۆ پەیوەندی دۆستانەمان لەگەڵ کەسایەتییە میانڕەوەکانی حیزبە چەکبەدەستەکانی شاخ لە لایەک و هاوکاری و پەیوەندی کوردانەمان لەگەڵ هەموو ئەو خەڵکانەی لە گوندەکان و ناوچەی چالاکی کە سەر بەو حیزبانە بوون، نمونەگەلێکی بەرچاو بوون نەدەشاردرانەوە. بەڵام ئەو هەڵوێستەمان لە لایەن مەسولە سەرەکییەکانی کۆمەڵە و یەکێتی بیانوی زۆرمان پێ گیراوە و دەردەسەری زیادمان بۆ خوڵقێنراوە و بەبێ ئەوەی باکمان پێی بێت، گومرکمان داوە. ئەو برادەرانەی حسک لەو رووداوە و چەندان شتی دیکەوە، دەستی دۆستانەیان بۆ مەفرەزەکانی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە درێژ دەکرد. بگرە ئەوە زۆرتر بۆ ئەو فاکتەیە گەڕاوەتەوە، کە ئێمە بە مەیدانی هەڵوێستەکانمان ئاشکرا و بێ فرۆفێڵ بوو. کارنامەی ئێمە دوور لە موزایەدە و بە فیعلی لەگەڵ دەنگی خەڵک بۆ دژایەتیکردنی ئەو شەڕە قێزەوەنە یەک هاتبووەوە و لەپێشەوە بە قازانجی خودی کۆمەڵە و یەکێتی و تێکڕای حیزبەکان لەوێ ڕۆژان دەگەڕایەوە. بەڵام نەوەک بەو مانایەی دەنگی ئێمە لە مەیدانەکە، بڕیادەر و دەنگی زاڵ بێت. نەخێر زۆرتر دەنگ و رەنگێکی ئێرە و ئەوێی خۆمان بوو..! بە داخەوە دەڵێم کە دەنگی زۆربە و خاوەن بڕیار لەگەڵ شەڕ و درێژەپێدان و قوڵکردنەوەی ناکۆکییە لاوەکییە ناوخۆییەکان بوو، بەبێ ئەوەی ئەو حیزب و ئەم حیزبی

لێ دەربکەین. بگرە پرۆشکی ئەو مەسولیەتە هەموو لایەکی گرتبوەوە، بەڵام کەروێشک و کیسەڵ هەر یەکەیان بەشی خۆیان بەرکەوتبوو.

ئێوارە بوو گەیشتینە گوندی ونکە و لە مێژ بوو، هێزێکی کۆمەڵە و یەکێتی بەو ژمارەیە سەردانی ئەو بنارەیان نەکردبوو. بۆیە زۆر بە وریایی لەگەڵ خەڵکەکە تێکەڵ بووین، بەوپەڕی رێز و هێمنی قسەمان بۆ کردن. کادر و هاورێییەکان پشوودرێژانە، گوێیان لە قسەو راو بۆچوونەکانی ئەو جوتیارە زەحمەتکێشانە گرت، کە بووە مایەی ئەوەی لەو شەو و رۆژەی لەو گوندە ماینەوە، بەردەوام دەوروبەری کادرەکان بەو خەڵکە تەنرابوو. پرسیاری زۆریان دەکرد، بە ڕاشکاوی قسەکانی ناو دڵی خۆیان دەگوت. شەوەکەی دوو شوێنی ئەو سەر و ئەمسەری گوندەکەمان پەیدا کرد و بە دانانی کەمین و پاسەوانییەکی رێک ماینەوە. سبەینەکەی بەسەر ماڵەکان دابەش بووین و نانی بەیانیمان لە لایان خوارد. بۆ نیوەڕۆش مەسعود عەقاری کە بەرپرسی دارایی کەرت بوو، لەسەر بودجەی بەردەستی بۆ هەر گرووپێکمان قەلێکی کڕی. دوای پەیداکردنی قاپوقاچاخ لە ماڵە جوتیارەکان، لە خوارەوەی گوند خوانی نیوەڕۆی بۆ رازاندینەوە. بۆ شەوی دوایی چووینە گوندی کێشکێ، شەوێکیشمان لەوێ بەسەر برد کە بەشێکی خەڵکەکە هەواداری حسک بوون، بە هۆی ئەوەی کادری ناسراوی ئەو حیزبە، سەلیم کێشکەیی، خەڵکی ئەو گوندە بوو. خەڵکەکە دۆستانە لەگەڵمان جولانەوە و بە رێزەوە مامەڵەیان لەتەک کردین. لەو دوو گوندە کۆمەڵێ دۆستمان بۆ کۆمەڵە و یەکێتی دۆزییەوە. بەیانی رێ و رێ بۆ گوندی عەلیاوە گەڕاینەوە، بۆ ئەوەی سەری فەخری بەگ بدەینەوە. نیوەڕۆ لەو ماڵە خواردنیان بۆ هەموومان دروست کرد. رۆژی دواتر بەسەر هەورازەکانی زنجیرەی گردۆڵکەکانی بەنەباوی، ئاودیوی گوندی سماقوڵی سەروچاو بووین و کۆبوونەوەی کەرتی رێکخستنمان بردە مزگەتەکەی گوندی سماقوڵی گرتک، ناوەڕۆکی کۆبوونەوەکانمان لە خاڵی راپۆرتی هاتووی ناوەندی کۆمەڵەوە دەستی پێ دەکرد و بە خاڵەکانی چالاکیی یەک بەیەکی ئەندام کەرت و پۆلەکان، گەشەکردنی شیرازەی رێکخستنەکان، راو و پێشنیارەکان، گفتوگۆ لەسەر گرفتەکانمان و چۆنیەتی چارەسەریان، پرسیار و وەڵام، ئابوونەوە و مەسەلەی دارایی و دەسکەوت و بودجەی هەبووی کەرت هتد تاوتوێ کرد.

هاورێیانی بەڕانەتی و پۆلی دۆڵی سماقوڵی و دەوروبەری سەری ڕەش و بەستۆڕە بۆ شەوەکەی چوونە گوندی سوسێ. تاکو هەتا بناری سەری ڕەش و بەستۆڕە بەیەکەوە

بن و دواتر له یەکدی جیا ببنەوە. ئێمەش بەدوای گەڕانەوەی پۆلی دۆڵی بالیسان و هیران و نازەنین، ئەوانەی مابوینەوە لەگەڵ مەفرەزەکەی پۆلی دەشتی هەولێر، ئەو ڕۆژە چووینە گوندی سماقولی سێنان.

بەدوای هەندێ مرومۆکردن لەگەڵ کوڕە گەنجەکانی ئەو چەند ماڵەی گوندی سماقولی سێنان، نانی نیوەڕۆمان بردەوە سماقولی گرتک. خەڵکی ئەو گوندە بە شێوەیەکی سەرەکی، خەریکی مەڕداری و ئاژەڵ بەخێوکردن بوون، چەندان بنەماڵەیان خاوەن مێگەلە مەڕ و بزن بوون، هەمووشیان خزم و کەسوکاری یەکتری، سەریان بەیەکەوە نابوو. بە جۆرێک بە یەکێک لەو گوندانەی دۆڵەکە دەژمێردرا، بێقڕە و بێ بینەوبەردەی گیروگرفتی ناوخۆیی بوون. بە زۆری بەدەم ژیانەوە، کاسب و لەشانی یەکترییەوە کۆک بوون. گوندەکەش تارادەیەک بۆ هاتوچۆی کاروانی پێشمەرگە لە نێوان ناوچەکانی جەولەکردنی پێشمەرگەی ناوچەکان لاچەپ بوو. ئەگەر بە مەبەست نەبوایە، زۆر کەم پێشمەرگە ڕێگای خۆیان دەبردەوە ئەوێ، بە تایبەت لە بناری چیای سەفین، کەوتبووە پەنای گوندی سماقولی سەروچاوەوە. بەڵام ئەو ڕۆژە کۆمەڵێک خەڵکی ڕاکردووی سەربازی قادسیەی سەدامی تێکەوتبوو. سەیرمان کرد یەکێک لەناو ئەو ڕاکردووانەدا ، (ز. ع) بوو کە لە ناوشاری هەولێردا، یەکێک لە هەوادارانی بەعس بووە، پەیوەندی بەخودی پیاوی ئەوێ ڕۆژێی بەعسەوە (حەمید مەرمەرچی) هەبووە. بۆیە ئێمەش هەندێ بەدواداچوونمان لەگەڵ کرد، خۆی دانی بە هەڵەکانی خۆی دانا و پەشیمانی خۆی دەربڕی، ئێمەش بە کەفالەتی یەکێک لەو جوتیارانەی گوندەکە ئازادمان کرد و خۆیشی گفتی ئەوەی دا، تفەنگێک بۆ پێشمەرگەیەکی بێچەک بکڕی و لەمەودوا وەک هەوادارێکی کۆمەڵە لە گوندەکە دانیشت..

ڕێگا و ڕێگا بە تەنکێشی لووتکەی ئاوەگرد کە لەگەڵ زنجیرەی چیای سەفین تێکەڵ دەبێتەوە. ئەو چیای سەفینەی، مایەی سەربڵندی بۆ دانیشتوانی بەشێکی زۆری خەڵکی خۆشناوەتی و کورد بە میرات هێشتوتەوە. ڕێچکەمان بەدوای یەکترییەوە بەست. ڕێگاکەمان بردەوە سەرەوەی گوندی سماقولی سەروچاو کە یەکێکە لەو گوندانەی لەگەڵ تەمەنی بزاڤی چەکداری کوردان، هەردەم بنکەی موقاوەمەت بووە. یەکەمجار لاماندایە ئەو تاقە ماڵەی جەلالە شەلی ڕاوچی، کە ئەو دەمە هەر خۆی و تاقە کیژۆڵە بەلەنگازەکەی لە ماڵ بوون. جەلالە شەلی ڕاوچی یەکێک بوو لەو جوتیارە خۆشناوانەی

له رووی گوزەرانەوە، مرۆڤێکی هەژار و بەلەنگاز بوو، بەڵام تابلێی سەربڵند و لە بوەرەکانی ژیان بێمنەت بوو. نازانم و لە بیرم نەماوە بە چ هۆیەکەوە شەلە ببوو، بە گۆچان بەرێدا دەرۆیشت. لە ژیانی خۆیدا پیاوێکی چاوتێری قسە لەڕوو بوو، بە گەرمی وەرمانیگرتەوە و بە گەشانەوەیەکی پڕ لە دڵخۆشی، رووی لێمان کرد و گوتی.. رێگاکەتان هێناوەتەوە بەر ئەو تاقە ماڵەی من، دیارە لە ماڵە هەژارەکانەوە هەنگاو دەنێن، وەک ئەوانی دیکە، جارێ لە پێشەوە سەری دیوەخانی کێخواکانتان نەداوە...!

ئیتر بۆمان روون کردەوە، کە ئێمە هەنوکە وەک رێکخستنی کۆمەڵە کار دەکەین، گەرەکمان بوو رێگای چوونە گوندی بە لای قۆناغەکەی ئەتۆی سەرکەشەوە دەست پێبکەین، ئەو هاوڕێیانەی کۆمەڵە، لەپێناوی خزمەتکردن بە خەڵکانی رەشوڕووتی وەک تۆوە چەکمان لە شان کردووە.

هەر لەو دەمیشدا، کە خۆی خەریکی چاککردنی پەرژینی حەوشەی ماڵەکەی بوو، یەکسەر هەمووومان بە هەرەوەزی، لە ماوەی چەند سەعاتێکدا، کارەکەمان لەگەڵ تەواو کرد.

خەریک بوو خۆمان کۆ دەکردەوە، کێخوا عەزیز لەو ناوە پەیدا بوو. کێخوا پیاوێکی چوارشانەی کەلەش گەورە و کەڵەگەت بوو، تابڵێی قسەزان و مرۆڤێکی کوردپەروەر بوو، بەڵام لەگەڵ زۆربەی کادر و مەسولەکانی یەنک، دانوی بە باشی نەدەکوڵا و نێوانی لەگەڵ حسک گەرمتر بوو. لەو گوندە ماڵی کێخوا عەبدەش هەبوو، کە زۆرتر دۆستی هێزەکانی یەکێتی بوو، ئەویش مرۆڤێکی ئێسکسووکی خاوەن قسەی خۆش بوو، وڵات و نەتەوەکەی خۆشدەویست. هەردوو بنەماڵە لە گوندەکە خاوەن دیوەخان و ناندەربوون، سەرباری ئەوەی خزم و هاوگوندی یەکتری بوون، ئەو دەمە لەگەڵ یەکتری ناتەبابوون. بەشێکی زۆری مەسولەکانی حیزبە چەکبەدەستەکانی شاخ لەو بارەیەوە بێسوچ نەبوون. بە کورتی ئەوەی لە بیرم بێت، لەناو کادرەکانی یەکێتی بە پلەی یەک رێباز رەفعەت، مەلاغەفور، بەندە نێوانمان لەگەڵ هەردوو کێخوا وەک یەک خۆش بوو، بە زۆری لەو گوندە سەرمان لە کێخوا عەزیز دەدا. من هەتا لەگەڵ حەمەسووری کوڕی مام کێخوا عەزیز نێوانم خۆش بوو، ئەودەم ئەویش وەک دۆستێکی کۆمەڵە هاوکاری دەکردین..

کێخوا عەزیز بەم جۆرە قسانە رووی لێمان کرد.. زۆرم پێ خۆشە بەو جۆرە هاوکاری خەڵکی هەژار و بێدەرەتان دەکەن. دیارە ئێوە لەگەڵ گفت و قسەکانتان، بۆ

خزمەتکردن بە نەدارەکان راستگۆن، ئاواتەخوازم سەرکەوتوو بن، لەگەڵ ئەو کاروان و ئامانجانە بەردەوامی پێبدەن. هەر بۆیەش هاتووم بۆ لاتان، کە ئەو لاوچاکییەم لێ بە دی کردوون، هاتووم بۆ نانی نیوەڕۆ، بۆ ماڵی خۆمان داوەتتان بکەم. ئیتر ئێمەش بە سوپاسەوە قبووڵمان کرد، چونکو مەبەستمان بوو، لە نزیکەوە لە بارەی نەهێشتنی ئەو ساردییەی نێوانیان لەگەڵ بنەماڵەی کێخوا عەبدە، پەیامی خۆمانی بۆ روون بکەینەوە و ئەرکی نانخواردن نەخەینە سەر ماڵەکەی جەلالە شەلی زەحمەتکێش. یەکێک لەو ئاراستانەیش کارمان لەسەر دەکرد و بۆ ناو خەڵکی گوندەکان لەسەری سوور بووین. بە پێچەوانەی کەس و لایەنی چەکداری ئێرە و ئەوێ، ئێمە وەک رێکخستنەکانی کۆمەڵەی ئەودەمی، لە هەموو گوندێکدا، بانگەشەمان بۆ تەبایی و خۆشەویستی و رێزلەیەکگرتن نێوان خەڵکەکە دەکرد. هەرگیز رێگای ئەوەمان بە خۆ نەدەدا، ناتەبایی حیزبی و شەخسی لەو پەیامە ساردمان بکاتەوە. ئارادەیەکی بەرچاویش لە زۆر گوندی ناوچە جیاجیاکان لەو بارەوە رۆڵی باشمان بووە. ئەوەبوو جەلالە شەلیشمان لەگەڵ خۆ برد، بە یەکەوە ژەمە خواردنیکی گەرموگوڕمان خوارد. لەگەڵ مام کێخوا دەربارەی شۆڕش و یەکێتی، بەربەرەکانی شەڕی خۆکوژی ناوخۆ، کار و چالاکییەکانی رێکخراوەیی خۆمان، وەک رێکخستنەکانی کۆمەڵە، هەتا دەربارەی پەیوەندی نێوان هەردوو بنەماڵە، گفتوگۆیەکی دۆستانەمان کرد. کێخوا لە زۆربەی سەرەداوی کێشەوگرفتەکان، بە تایبەت بینەوبەردەی ناو خۆیان، رایەکانی نەرم و دۆستانە، بە لای هاوکاری کردنەوە بوو. ئەوەبوو دواتر لە رێگای مەلاغەفور ئەو پەیامەمان بە کێخوا عەبدەش گەیاند. بۆ لەمەودوا گوندەکە زۆرتر لە هێمنی و ژیانێکی ئاسایی دابوو.

# پەڕینەوە بەسەر تۆقەرەی چیای سەفین و تینوێتی

ئەوەی لە بیرم بێت، وەرزی هاوینێکی درەنگی ساڵی ١٩٨١ بوو. دەمی ئێوارەیەک لەگەڵ مەفرەزەیەکی ناوچەی خۆشناوەتی یەکێتی، کە لەناویاندا مەلاغەفور، ڕێبواری وەستا سەلام، عەلی پونگینە لەگەڵ چەندان پێشمەرگەی دیکە هەبوون. بە یەکەوە لەگەڵ کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە لە گوندی کەوەرتیبیانەوە، بەرەو بناری سەفین بە بەری شەقڵاوە بە ڕێکەوتین. شەودرەنگ ببوو، بە پەنادزە نزیکەی بیست پێشمەرگە، خۆمان کرد بە گوندی سپیگرەی بەردەم شەقڵاوەی ئەو دیوی بانەتۆکان. ئێمە لە بەردەمی قوتابخانەی گوندەکە، لەگەڵ هەندێ کوڕوکاڵ یەکانگیرهاتین، کە ئەوان بۆ خۆیان خەریکی گەمەی بوون. کە چاویان بە ئێمە کەوت، بە ڕوویەکی پڕ لە گەشانەوە، پێشوازییان لێ کردین و دۆقەیان لەگەڵ یەکەیەکەمان کرد و هەرکە زانیشیان ئێمە، هاوڕێیانی کۆمەڵە و یەکێتین، زیاتر بە پەرۆشەوە لێمان کۆبوونەوە. ئەوەبوو لەسەر داوای خۆیان، مەلا غەفور نەدوەیەکی لە مزگەوت بۆ کردن کە زیاتر لە بیست جوتیاری گوندەکە بەشدار بوون. هاوڕێیانی کۆمەڵەش لەگەڵ گەنجەکان دەربارەی کۆمەڵە و ڕێکخستن و چالاکییەکانی خۆمان، قسەوباسی زۆرمان بۆ کردن. لە جۆری پێشوازیکردنەکەیانەوە، بە تامەزرۆیی گوێیان لە قسەکانمان گرت. لەو گوندە چەندان ڕێچکەی ڕێکخستن هۆنرابەوە و هاوڕێیان سامانی مەلا گچکە، مەلا غەفور، تەحسین کاوانی و مام دارا، مشیر گەرۆتەیی، بە هۆی ناسیاوی و جەربەزەییان، ڕۆڵی بەرچاویان لەو بارەوە هەبوو. ئەوەی جێگای نیشانەی خۆشەویستی و پەرۆشی خەڵکی ئەو گوندە بوو، بۆ ئەو مەفرەزەیەی پێشمەرگە کە لە نزیکە دەستی هێزەکانی ڕژێم، بەو شەوە درەنگە، لە هەموو ئەو ماڵانەی بەسەریان دابەش کراین، یەک ژەمە خواردنی گەرموگوڕی تێر گۆشت و خۆراکی هەمە چەشنەیان پێشکەش کردین. لە ماڵەکانیش هەتا ژن و منداڵە هەراشەکان تا نیوەی شەو بە دیارمان مابوونەوە. دواتر بەو چەشنەی پێشتر پلانمان هەبوو، هاوڕێ کاکەمینی بەرپرسی عەسکەریمان، کەمینەکانی سەر هەر دووڵای ڕێگاکەی بانگکردەوە شوێنی دیاریکراو و بەوپەڕی ڕێز و سوپاسەوە، خەڵکی گوندەکەمان بە جێ هێشت و بە باریکە ڕێ و ڕێ، بۆ گوندی بەرەکەی بناری شاخی هەورێ گەڕاینەوە. مەلا غەفور لەو بنارە شوێنی حەسانەوەی بۆ دۆزینەوە، هەتا بەرەبەری نیوەڕۆ ئیسراحەتێکی باشمان کرد. پاشان بە کۆمەڵ لە دەوری یەکتری کۆ

بووینەوە، هەر یەکە پرێسکەی نان و پێخۆری خۆی کردەوە و لەشانی یەکترییەوە، نانی نیوەڕۆمان لەبەر هەتاو و لە پەنا گاشەبەردان خوارد. دواتر هەر مەلا غەفور چایەکی یەکرەنگی بۆمان دێم کرد، بە بنە مەتارەکانی ئاو خواردنەوەمان، سەروچای لەگەڵ یەک دوو کڵۆ شەکر پێشکەش کردین و ئەوجا بە ئەسپایی کەوتە چرینی ئەو حەیرانەی لە ئەزبەری بوو. دواتر بەرەبەری عەسر لەگەڵ مشیر و مەلا غەفور و کاکەمین، بەرنامەی کاری چوونە گوندی گەرۆتەی سەرێمان دانا کە هاوڕێ مشیر لەو ناوە، کون بە کون شارەزا و ڕێپیشاندەرمان بوو، بەڵام بۆ سەرکەوتنە سەری سەفین و شۆڕبوونەوە بۆ دۆڵی زیارەت و سولاوکێ، مەلا غەفور رابەر و شارەزای کاروانەکەمان بوو.

ئێوارە وەک دەستووری ئاسایی خۆمان، بە ریز و دوو دوو، رێچکەی دوای یەکترمان گرت، لەگەڵ بانگی نوێژی عیشایی بەناو گوندی وەربووین و هەر مشیر خۆی هەموومانی بۆ ماڵەکان دابەش کرد، من و مەلا غەفور و مشیر بەر ماڵی عەبدوڵڵا کەوتین، کە یەکێک لە پێشمەرگە دێرینەکانی شۆڕشی ئەیلوول و باڵی ـ م. س ـ ی جەلالی بوو. بەداخەوە بە هۆی بریندارىبوونییەوە کەوتبووە سەرکورسی و کەمئەندام ببوو، زۆر دۆستانە وەریگرتینەوە و لەگەڵ مەلا غەفوریش ناسیاوی کۆنینەیان هەبوو. ئەو هەر باسی مام جەلال و لاوچاکی ئەوی دەکرد، ئێمەش بە لای کۆمەڵە و رێکخستنی نوێ و خەڵکی زەحمەتکێش دەمانشکاندەوە. بەو شەوە زۆریان خزمەت کردین، بۆ سبەی بەیانی و نیوەڕۆکەش، سەر و ژەمە خۆراکی هەمەجۆری لە جامیلکەیەک ماست و پەنیر و دوو مریشکی کوڵاویان بۆ ئامادەکردبووین. عەبدوڵڵا وەک مرۆڤێک خاوەن ئەزموونی تاڵ و تفتی پێشمەرگایەتی شەستەکان، زۆری دڵ پێمانەوە خۆش بوو، گەلێکی تاندایین و بۆ کاری خزمەتکردن بە خەڵکی هەزار ئامۆژگاری کردین. بەداخەوە هەر ئەوجارە ئەو پیاوە بە هیمەتەم دیت.

لە نیوەی شەودا، کە ئاسمان شین و رووناک بوو، کزەبایەکی فێنکی هەڵکردبوو، خۆمان کۆکردەوە و لەو شوێنەی پێشتر، لەسەری دەمژمێری دیاریکراو لە یەکدی گردبووینەوە. مشیر لە پێشەوە هەتا ناوقەدی چیای سەفین لە پێشمانەوە بوو. ئێمەی گەیاندە بن ئەو لووتکەوە، کە رەبایەی سوپای عیراقی لێ بوو، کانییەکی ئەو ناوە بەژێر دەسەڵاتی ئەوانەوە بوو. دەبوو ئەو ئاوەی لەناو مەتارەکانمدا هەبوو، هەتا شۆڕبوونەوە ئەو دیو بە چۆڕە چۆڕ بمانخواردایەوە. دوای گەڕانەوەی مشیر، مەلا غەفور لەگەڵ

کاکەمین پێشکەوتن، بەندە و ڕێبوار لە دواوە، سەرە و هەوراز، ملمان لە ملی لووتکەکانی سەفین نابوو. ڕێگاکە تابڵێی ڕک و بە پوش و پەلاشی دڕکاوی وشکەوە بوو بوو، ئەو دڕکانە لەناو ئارەقە و تێنوێتی، زێتر تەنگاوی کردین، وەک دەرزی لە گوشتمان ڕابچی، ئەوەها چزەی لە نەرمەی بەلەکمان دەهێنا. لەگەڵ ئەوەش چیای سەفین لەبەر چاومان بەرز و بەرز تر دەبوەوە. دەبوو پێش دونیا ڕووناکبوونەوە، بەسەر تۆقەرەی لووتکەکانی ئاودیو بووینایە. مەلا غەفور ناوناوە، پشوویەکی وەردەگرت و دەبوایە، هەر یەکەمان لە شوێنی خۆی دانیشی و پشووی مەلا غەفورانە وەرگرین. ئەو شەوە هەر ئەوەندەمان خۆش بوو، کە گەیشتینە سەر تۆقەرەی چیای سەفینی، ئیتر زۆربەمان ئاوی مەتارەکەی خۆی چک بڕیبوو. بەدوای پشوویەکی ناچاری، کە هەر هەموومان وەک پۆلە چۆلەکەیەکی لە پەلوپۆکەوتوو، لە پەنای یەکترییەوە خۆمان گرمۆڵە کردبوو. چونکو ئەو بایەی سەری شاخەکە، دەموچاومانی مارنج دەدا، ئارەقەی جلوبەرگو ڕوخسارمانی ڕەق و تەق دەکردەوە. لە ناکاو مەلا غەفور بە چرپە فرمانی خۆی گەیاندە یەکەبەیەکەمان، کە ئەو هەوڵ دەدات، بە باریکە ڕێگای قەدبڕ، بمانباتەوە بەر گوندی سولاوکێ. بەڵام چ باریکە ڕێگایەک، چ قەدبڕێک..! لە زۆر شوێنی دەبوو، بە قونەخشکە، بە چەنگەپڕە خۆمان شۆڕبکەینەوە و یەکتری بگرینەوە. بەڕاستی شەوێک بوو مەلاغەفور و چیای سەفینەکەی تاڵاوی ڕێگای هاتونەهاتیان بە قوڕگمانەوە کرد. هەر یەکەمان لە خشخشۆکی سەر دڕکی ئەو پوش و پەلاشانەی دەتگوت، وەک مرۆڤی چاوچنۆک، ماوەیەکە عەوداڵی گازگرتنن لە گۆشت، بە جۆرێک تاکە تاکەمان بەبێ مەبەست، هاوارمان بۆ مەلا غەفوری سەرێڵند دەنارد و ئەویش لەگەڵ بیستنی توانج و پلارەکانمان، فشەی سمێلانی دەهاتێ و جارویار دەیگوت.. کوڕانی شاری دەستەبرای کوڕانی دەشتەکی، وادەزانن ڕێگای گەرماوی بەرەبەیان و سەر ڕووباری خازریان گرتووە، داوای ڕێگای نەرمونۆڵ دەکەن..! زەحمەتی زۆرمان کێشا، لە بەرەبەیاندا خۆمان لەناو ڕەزە ترێیەکی بە ووشوی سپی دیتەوە. من بە خۆم نەوەستام، لەگەڵ ئەوەی زۆرم تێنوو بوو، هاوارم لە پێشمەرگەکانی پێشەوە کرد، کە نەمدەزانی کێ و کێن، گوتم.. کەستان بۆتان نییە لەناو ئەو ڕەزە ترێیە پاڵ بدەنەوە، یاخود هەر یەکە بۆ خۆی و بە ئارەزووی خۆی بکەویتە ترێ ڕنینەوە. ئەوە بوو هەموومان بە پاڵکەوتنەوە، لەسەر ئەو لاتە نەرمانەی دەورووبەری ڕەزەکەوە، بە زەقەزەق و تامەزرۆیی سەیری هێشوە ترێیەکانمان دەکرد.

دوای هەندێ پشوو هاتنەوە بەرمان، ڕێبواری وەستا سەلاممان ڕاسپارد، کە بە ژمارەی پێشمەرگەکان، سەر و هێشوە ترێیەک برنی، تاکو هەر هیچ نەبێت، تێنوێتی خۆمانی پێ بشکێنین. ڕێبوار هەنوکەش ناو ناوە ئەو ڕووداوە دەگێڕێتەوە. مەبەستەکەم ئەوەیە کە پێشمەرگە و هاوڕێیانی قۆناخی یەکەمی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە، بەو ڕەنگە مولتەزیم بوون. دواتر کە چوینە ناو گوندەکەوە، خاوەنی ڕەزەکەمان دیتەوە، هەندێک پارەمان لەجیاتی ئەو ترێیەی خواردبومان بۆ وێر کرد. بەڵام ئەوەندە پیاو بوو، چەندی کردمان پارەکەی وەرنەگرت، چونکە مەلا غەفوری دەناسی.

## بەکر خۆشناو و گوندی خۆران و یاری بالە

دوای ئەوەی لە گوندی زیارەت لە مەفرەزەکەی ناوچەی خۆشناوەتی یەکێتی جیا بووینەوە. مەفرەزەکەی ڕێکخستن بەرەو گوندی خۆرانی بناری سەفین ڕۆیشتین. ئەو دەمە گوندی خۆران بێجگە لە چەند ماڵباتێکی جوتیاری ڕەشوڕووت و ڕوخساری وێرانەی بەردەستی دووبەرەکی خەڵکی گوندەکە. واتە خۆران هەر لە کەلاوەی وێرانە و رووخاو، ڕوازێکی ناخۆشی بە جێ هێشتبوو. منداڵی ئەو خێزانە بەلەنگازانەی لە گوندەکە مابوونەوە، ڕۆژانە بە زستان و هاوینە بۆ چوونە قوتابخانە، بە پێ ڕێگای هاتووچۆی گوندی زیارەتیان دەکوتایەوە.

مەبەستی سەرەکی سەردانی ئێمە بۆ گوندەکە، بە پلەی یەکەم بە سەرکردنەوەی هاوڕێیەکی دەیان ساڵی شار و شاخ، کە ماوەیەک لە دەزگای ئیعلامی یەکێتی لە کوێستانی توژەڵەی سەر سنووردا، هاوشان و هاوڕێی ئەز بوو. بەکر خۆشناو وەک مرۆڤێکی شۆڕشگێڕ کە پێشتر خوێندکاری زانکۆ بوو، پەیوەندییەکی ڕێکخراوەیی بە کۆمەڵەوە هەبوو. بەڵام ئەو هەستونەستە شێلگیرانەیەی، بۆ شۆڕش و خەباتکردنی شۆڕشگێرانە، لە بەرانبەر دەسەڵاتی بەعسدا، بە تەواوی ئارەزووی خۆیەوە وازی لە خوێندنی زانکۆ هێناو و لە قامەتی تامەزرۆیی بۆ بیروباوەڕەکانی ـــ ئارام ـــ ی نەمر و لووتکە. لە ڕێگای ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە لە شاری سلێمانی و لە ساڵی ١٩٧٩ دا چوونەشاخی هەڵبژاردبوو. بەڵام دیارە وەک ڕۆڵەیەکی بێفرووفێڵی کۆڕی خەباتی شۆڕشگێڕانە، هەر زوو لەگەڵ ململانێکان ڕووبەڕوو بووەتەوە و بە تایبەت لەگەڵ مەسول

و کادره خۆ بەزلزان و موزایەدەکارەکان ناکۆک کەوتووتەوە. پاش ماوەدایەک دیسانەوە بە تەواوی سەلیقەی خۆیەوە، دەستی لە خەباتی پێشمەرگایەتی ناو دەزگای ئیعلام هەلگرت و وەک ئینسانێکی ئازاد و سەربەخۆی خاوەن هەلوێست، دانیشتنی ئەو کوێرە گوندەکەی مەفتەنی خۆیانی _ خۆرانی _ لە بناری چیای سەفینی هەلبژارد بوو.

خۆشناو بەشەو و رۆژ بەدەم راپەراندنی کارەکانی گوزەرانی ژیانی گوندی، خەریکی خوێندنەوە و نووسین و وەرگێران بوو. بە دارەتێک لەو ماڵە سارد و سرەی گوندی خۆران، نیمچە کتێبخانەیەکی پر لە کتێبی هەمەجۆری زمانەکانی کوردی و عارەبی، فارسی، ئینگلیزی قەلەندەرخانەکەی گەرمکردبوەوە. ئەو مرۆڤێکی خوێندەواری خاوەن مەعریفە بوو، تا بلێی خاکی و بێناز بوو. ژیان لە لای ئەو لە هەوارگەیەکی بێ زاقوزریق دەستلەملانێ بوو. لە بەرانبەر هەموو یەکێک، کەسایەتییەکی بێرتوش و سورەتەکانی پر لە راستگۆیی دەنواند.

ب. خۆشناو سەرباری هەر جۆرە بیروراپەکی، لەبەرانبەر بزاڤی چەکداری شاخەکان و حیزبە چەکبەدەستەکانی بەرەی دژ بە بەعس، ئەوێ دەمیش نەیدەویست بە ئاسانی پێخۆری سیاسەت و قسەی گەورەی ئەم و ئەو بێت. ئەو لە بەرمەیدانی پراکتیکیدا تشتەکانی دەخوێندەوە، رووداوە ناخۆشەکانی بە چاوی خۆی دەبینی. کەچی ناڕەزایی خۆی و هەلوێست وەرگرتنی کردبووە، قەلایەکی لە رووخان نەهاتووی کۆلنەدان و دەست بە خۆدا شۆرنەکردنەوە. بە پێچەوانەی ئەو دەنگە ناسازانەی ماوەک لە شاخ، شایی خۆبادان و ناز و فیزی شۆرشگێرییان دەگێرا و هەلوێستیان بە خەلک دەفرۆشت. بەلام کە سەختی و ناخۆشییەکان نزیکیان دەبووەوە، یەکسەر ئالای سپییان بۆ رژێم بەرز دەکردەوە و بە وەرگرتنی ناسنامەی جاش خەفیفە سەری خۆیان کزدەکرد. زۆرن لەو جۆرە نمونەیە کە لەسەر خەرمانی چەمبەری هەمیشەیی خۆیان و لە سێبەری ئەو حیزبە دەسەلاتدارانەی ئەمرۆی کوردستانی باشووردا، لەسەر کەیف و هۆری خۆیان شا بە سەپانی خۆیان ناخوێننەوە. بەلێ بەکر خۆشناوی ولاتپارێز لەوێ رۆژاندا، وەک سەربازێکی نەناسراو بە پێچەوانەی ئەو بۆرە پیاوانەوە، سەرەداوەکانی هەلوێستی شۆرشگێرانەی بە یەکەوە گرێدابوو و هەرگیز سەری بۆ رژێم نەوی نەکرد. ژیانێکی پر گێرە و کێشەی مەسولە خراپەکانی ئەو حیزبە چەکدارانەی شاخ لەلاوە سەربلندانەتر

بوو. وەک مەلۆیەکی تەنیا، ژیانی تەنیاباری گوندی خۆرانی بۆ گرتنی کونجی قەناعەت لە لا پیرۆز بوو.

لە بیرمە کە خۆشناو لە دوورەوە چاوی پێمان کەوت، لەگەڵ کاکەمینی پێشمەرگە و بەرپرسی سەربازیمان، سۆراخی ماڵەکەی دەکەین. ئەو برادەرە بە روویەکی گەشەوە بە پیرمانەوە هات و بە گەرمی هەمێزمان لە یەکتری گرت. لێرەش بە دیداری یەکدی شادبووینەوە. ئەو رۆژە و رۆژێکی دیکەش لەو گوندەماینەوە، چونکو کەرتەکەی تیپی سەفین کە تێکڕایان هاوڕێی کۆمەڵە بوون، بۆ یەکتر دیتن و کۆبوونەوەی رێکخراوەیی هاتبوونە لامان. ئەو دوو رۆژە، هەندێ دەمی نووستن و کۆبوونەوەی لێ دەرچێت، دەنا بەردەوام لەگەڵ خۆشناو بە یەکەوەمان بەسەربرد و چی لە دڵ و دەروونمان بوو، بۆ یەکتریمان راڤە کرد. تارادەیەک تێنوێتی ئەو رێبازەی بیرکردنەوەمان لەوێ رۆژاندا شکاند کە ــ ئارام ــ ی رچەشکێن، بە بیر و هۆشێکی نوێ سەرەتای دەست پێ کردبوو..!

بەکر خۆشناو لەو گوندەدا هەتا ئاوڕی لە وەرزش و بەسەربردنی کاتێک بۆ مەشقی وەرزشی تەرخان کردبوو. ئەویش بە هۆی ئەو چەند کوڕە گەنجەی گوندەکەوە، هاوکاری تێکڕای پێشمەرگەکانی کۆمەڵە لەو دەڤەرەدا، بە تایبەت سامانی مەلاگچکەی سەریڵند، گۆڕەپانێکی لە دەرەوەی گوندێ بۆ یاری باڵە چێکردبوو. ناردبووی لە شار تۆڕەکەیان بۆ هێنابوو، دوو کاریتەی ساغیشی لە ناوەندی ئەو گۆڕەپانە چەقاندبوو، لە دەمی گەمەکردن هەر بە خۆی تۆڕەکەی لێ قایم دەکردن. ئەو دوو رۆژە و چەندانی دیکە، کە رێگامان دەکەوتە ئەو گوندەوە، لەگەڵ تیپە سادەکەی بەکر خۆشناو، یاری باڵەمان دەکرد، زۆربەی جاریش پێشمەرگەکان دەیان بردەوە. ئیتر هەتا بەندە لەشانی کەرتی رێکخستنی شەقڵاوەی کۆمەڵە بووم، گوندی خۆران و ماڵە قەلەندەرخانەکەی بەکر خۆشناو، بنکەیەکی ئاشکرای سەرجەمی کادر و هاوڕێیەکانی کۆمەڵە بوو. بە تایبەت ئەوانەی دەشتی هەولێر و بەرانەتی کە بۆ حەسانەوە، بۆ ناوچەکانی بناری سەفین دەپەڕینەوە، هەموو خۆیان لەو گوندە دەدیتەوە، بگرە زۆر جارانیش کۆبوونەوەکانی کەرتی رێکخستنمان لەو شوێنە ئەنجام دەدا.

رۆژان هاتن و رۆیشتن، لە سەروحەدی دروستبوونی ئەڵقە رۆشنبیرییەکانی ئاڵای شۆڕشدا. بەکر خۆشناو دوور و نزیک بەو چالاکییە ئاگادار بوو، زۆرمان هەوڵ دابوو کە ناوبراو خۆی بۆ کاتی پێویست بپارێزی و تێکەڵی ناو ئەو ئەڵقە رۆشنبیرییانەی ناو

ریزەکانی هاوڕێیانی شاخ نەبێت. چونکو بە هۆی هەندێ هاوکارەوە، ئاگاداری ئەوەمان هەبوو، کە لەلایەن مەسولەکانی یەنک بە وردی چاودێری دەکرێ. هەر چەند بۆ ئەوەی نەبێتە لوقمەیەکی ئاسان بۆ شەڕپێفرۆشتن و ئازاردانی، بریار بوو لەگەڵ حاجی مەمۆ و هەندێ هاوڕێی دیکەوە، بەرەو ئاقاری ناوچەی خواکورک و سنوورەکان بە ڕێبکەوێن. بەڵام خەبەردانە بەکر و بە پەلەبوونی ئەز، بەکر خۆشناو لەو گوندە مایەوە. تاکو لە پەراوێزی هەڵکوتانە سەر ئەو هاوڕێ و دۆستانەی ئاڵای شۆڕش کە جێی گومانی دەسەڵاتدارانی یەکێتی بوون لە دەڤەرەکە. ڕۆژێکیان هێزێکی چەکداری یەنک، زۆر بێشەرمانە پەلاماری ئەو تاکە مرۆڤە بێچەکەیان لە ماڵەکەی خۆی داوە و دوای ئازار و ئەشکەنجەیەکی جەستەیی و روحی، بە کەفالەتی باوکی، بەکر خۆشناو ناچار کراوە کە ئەو گوندە بە جێ بهێڵی و ژیانی ئیختفای شار ببێنتەوە.

بەکر خۆشناو بەوپەڕی بێمنەتی و بڕیارێکی شۆڕشگێرانە خۆی لە شار مەلاس دابوو و هەرکە فرسەتی گونجاوی بۆ رەخسا، کورتە نامەیەکی بە هۆی هاوڕێیانی شار ناردبوو، بە ڕێکەوت ئەو دەمیش من و وریا قادر بە نهێنی لەناو شاری هەولێر و لە شارەگوندی بەحرەکە لەسەر دەرچوون بووین. وەڵاممان بۆ نارد کە بۆ دوو شەوی تر خۆی بگەیەنیتە گوندی ئارمەوان و لە ماڵی پورێکی خۆی پەیوەندی پێوە دەکەین. ئەوە بوو هاوڕێ سامانی مەلا گچکەو مام دارا و مەفرەزەیەک بۆ کاتی دیاریکراو چوونە ئەو شوێنە و بە سەلامەتی وەریانگرتەوە. ئەو ماوەیەی لە شانی بەکر خۆشناو و هاوڕێ پێشمەرگەکانی ئاڵای شۆڕش بۆ بنکەی شەهید مەناف گەڕاینەوە. بە جووتە بەیاننامەکمان لەسەر ڕووداوی شەهید بوونی هاوڕێ مەناف زاری نووسی و بڵاومان کردەوە. بەکر لەو بنکەیەش لەگەڵ پێشمەرگەکان هاوکار و هاودەم بوو، هەتا بۆ دارشکاندن و خانوو دروستکردن و ئیدارەدانی بنکە، هەمیشە بە شەو و رۆژان لەسەرپێ بوو. لە بوونی ئەو ماوەیەی بەکر خۆشناودا، بنکەکەمان ببووە مەنزڵگای سازدانی کۆڕ و کۆبوونەوەی شەوانە و جێگای گفتوگۆ هاوڕێیانە. نێوانی دۆستانەی بەکر خۆشناو لەگەڵ کادرەکانی حشع، پارتی، حیزبی گەل، ئیتجاهی شۆڕشگێری جیا بووەوە لە حسک، مایەی نێوان خۆشییەکی دۆستانەی لەبیرنەکراو بوو.

جارێکیان لە گەڕانەوەمان لە ناوچەی کافێی بناری هەردوو زنجیرە شاخی گارا و مەتینادا، لە گوندێکی بارزانییە ئاوارەکان _ گوندی سەیدان _ کە بەکر و کاکەسوورم

لەشان بوون، لە چاوتروکانێک کەوتینە ناو بەشێکی ئەو هێزەی ینک کە بۆ بادینان دەچوون. ئەگەر هەڵوێستی جوانمەردی خەڵکی ئەو گوندە نەبووایە، بە تایبەت سەلیم و خزمەکانی، کە بوونە سوپەرمان، دەنا کەسانێکی ناو هێزەکەی ینک کە ئێمەیان ناسیبووەوە، خۆیان راستوچەپ کردبوو، کە شەڕمان پێ بفرۆشن. هەڵوێستی هاووڵاتی سەلیم بارزانی و هاوڕێ سوورەی خۆمان نەبووایە، کە هەر ئەو لە هەرسێکمان چەکدار بوو، دڵنیام کارەساتێکی ناخۆش بە ئەنجام دەهات.

لە زستانی کۆتایی ساڵی ۱۹۸٦، بەکر خۆشناو و بەندە بە هاوڕێیەتی سامانی مەلاگچکە و مەفرەزەکەی، بەرەو سنوورەکان بە چیای برادۆست سەرکەوتین و دوای چەند شەو و رۆژێکی بەردەوامی رۆیشتن لە تۆردوگای زێوەی مەرگەوەڕی رۆژهەلاتی کوردستان، لە بنکەکەی ئالای شۆڕش بە هاوڕێیان شاد بووینەوە، کە زۆرتر وەک بنکەی لیژنەی سەرپەرشتی ـــئا. شـــ بوو.

بەکر خۆشناو لە پێشەوە بەدوای حەسانەوە، کاری سەرپەرشتیکردنی بەرنامەکانی هەفتانەی ئێزگەی ئالای لە ئەستۆ گرت. دواتر لە شانی هاوڕێیان هەمیشە لەولەبی پێکەوە گونجان و بەستنی کۆڕ و کۆبوونەوە بوو. لەژێر جەمەلۆنەکانی ئەو تۆردوگایەدا، وەک پێشمەرگەیەکی ئاسایی هەڵسوکەوتی دەکرد. هەروەها لە ئەستۆگرتنی دەرکردنی ژمارەیەکی دیکەی گۆڤاری هەڵوێستی ئۆرگانی ئالای وەرگرت..

هەتا ئەو دەمەیش لە ریزەکانی ئالای شۆڕش لە شاخ بووم، بەکر خۆشناو هاوڕێ و هاودەمی رۆژانە، بیر و خۆزگە و خەونەکانمان تەواوکەری یەکتری بوون. بە کورتی لە دوا کۆبوونەوەی هاوڕێیانی ئالا لە ناوچەی خواکورکدا، کە وەک دوا کۆبوونەوەی ئالا تێیدا بەشدار بووم، بەکر خۆشناو وەک ئەندامێکی کارای بەرێوەبردنی ئالای شۆڕش هەڵبژێردرا. بەکر لەو ماوەیەدا لەپاڵ کاروباری رێکخراوەییدا، هەڵسوراوێکی گورجوگۆڵی بواری ئەدەبی و رۆژنامەگەری کوردی بوو.

# چوونە ناو شەقڵاوە و کارێکی شۆڕشگێڕانە

هەر لە گوندی خۆرانەوە بە هاوکاری و هاوڕێتی کەرتێکی تیپی سەفین و مەفرەزەکەی ناوچەی ێنک بەجەولەیەکی هاوبەش بە یەکەیەکەی گوندەکانی بناری سەفین و سەری ڕەشدا کرد کە گوندەکانی قەڵاسنجی سەرێ و قەڵاسنجی خوارێ، حاجی ئەحمەد، سارتک و قیرژەی گرتەوە بە تایبەت گوندی قەڵاسنجی سەرێمان کردبووە شوێنی گەڕانەوەی شەوانە. چونکو هەم شوێنەکەی عاسێ بوو، هەمیش لەناو خەڵکەکەی هەواداری کۆمەڵە هەبوون و ئێمەیان خۆش دەویست، بەتایبەت لە ساڵی ١٩٧٩دا، هێزێکی بچووکی پێشمەرگەی کۆمەڵە بە مەسولیەتی سەیدکەریم، لەناو ئەو گوندە و لەو ئاقارەدا، لە شەڕێکی دەستەویەخەدا، نەبەردیێکی کەموێنەیان تۆمار کردبوو. کە دەیان جاشی خۆفرۆش، کوژراو و دیل بوون و بەراتی ئەو نەبەردییە بە خوێنی دوو هاوڕێی نەمر؛ مامۆستا کاوە، ئەو هاوڕێیە یەکێک لەو مرۆڤە تاکوتەرایانەی ئەوێ ڕۆژانێی کۆمەڵەکانی هەولێر بوو، کە لە دەمی لێقەومانی کۆمەڵە ١٩٧٥_١٩٧٦ نموونەی خۆراگری و درێژەپێدەری کار و چالاکی کۆمەڵە بوو. وەک هەڵسوڕاوێکی بوێر ڕۆڵی جوامێرانەی هەبوو لەوەی لەوەی سەرلەنوێ شیرازەکانی ڕێکخستن لە ناو هەولێر و دەوروبەری بە سەر پێیان بکەویتەوە. لەگەڵ پێشمەرگەیەکی دیکەی خەڵکی سلێمانی بە ناوی ئەنوەر تۆمار کرابوو. لە ناو خەڵکی گوندی قەڵاسنجی سەرێدا، چەندان خوێندکاری هەراشیان لە ریزی کۆمەڵە ڕێکخراو بوون.

لە سەردانی ئەو گوندانە بە تایبەت سارتک و قیرژەدا، هاوڕێ و پێشمەرگەی کۆمەڵە، ئەحمەد جەمیل کە ئەو دەمی، جێگری ئامر کەرت بوو، هاوکاری و کارئاسانی بۆ کردین لە پەیوەندی کردنی خەڵکی زەحمەتکێش بە ریزەکانی کۆمەڵە. تەحسین کاوانی وەک کادرێکی پێشمەرگەیی بەردەوام دنەی دەداین، بەڵکو بە یەکەوە مەفرەزەیەکی ناو شەقڵاوە بکەین، ڕەنگبی دەستکەوتمان ببێت. چونکێ هێشتا کادر و پێشمەرگەی کەرتی ڕێکخستنمان هەر بێچەک بوون. بەردەوام ئەو قسانەی بۆمان دووبارە دەکردەوە و هەندێ لە هاوڕێیانی ڕێکخستنیش پێیان خۆش بوو، ئەو مەفرەزەیە بکەین. تاکو لەو دەستکەوتەی دەبێت، ئەو پێشمەرگە بێچەکانە لە کەرتی ڕێکخستن چەکدار بکرێن. ئەوە بوو هەمووومان قسەمان کرد بەوەی ئەگەر هەر ئەو شەوە بەرەو شەقڵاوە

بەرێبکەوین و بۆ شەوی دواتر کە گەڕاینەوە، بە یەکەوە جەولەیەکی گوندەکانی دەوروبەری کۆڕێ دەکەین.

ڕۆژەکەی هەر لە پاش نیوەڕۆیەکی درەنگەوە، هەر سێ مەفرەزەی کەرتی ڕێکخستن، کەرتەکەی تیپی سەفین، مەفرەزەی ناوچەی خۆشناوەتی یەکێتی ئامادە بوون. سەرجەمی ڕاپەڕاندنی کارەکەش، خرایە ئەستۆی تەحسین و حاجی مەمۆ و سامانی مەلاگچکە و مام دارا و هاوڕێیەکی ناو ڕێکخستنە نهێنییەکانی شەقڵاوە، کە ئەویش وەستا فەتاح کاوانی بوو. بۆ دنیا تاریک بوون، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک هەر بە بناری کلکەی چیای سەفینەوە، گەیشتینە دەوروبەری حوجران. ئەوە بوو مەهدی و فەرهاد کاوانی بە پەنادزە چوونە ماڵێکی دۆست و یەکێکیان لەگەڵ خۆیان هێنا. کە شارەزای داروبەردی ئەو بنارەبوو، ناوبراو هەتا گوندی کاوانیانی بەردەم گەڕەکی سەرمەیدانی شەقڵاوە، بەناو ئەو هەموو ڕەبییەی عەسکەری ڕژێم لەسەر تیشەکانی چیای سەفین، بە سەلامەتی ئێمەی گەیاند و بۆ گەڕانەوەش چاوەڕوانمان بوو. لە گوندی کاوانییان، هەندێ پێشمەرگە بۆ ئەنجامدانی کارەکە دیاری کرا کە ئەو هاوڕێیانەی لە بیرم ماون.. تەحسین کاوانی، سامانی مەلا گچکە، پێشەوا، ئازاد کاوانی، حاجی مەمۆ، کاکەمین، عەبدوڵڵا کاوانی، مەلا غەفور، مەهدی کاوانی، ڕۆستەم،عەلی پونگینە، عزالدین، سەفین، لادێ، هاوار... هتد هەبوو. هەروەها هاوڕێ وەستا فەتاح کە دەمامکی خۆی دابوو، هەنگاو بە هەنگاو لەشانمان بوو. تەحسین هەموو مەفرەزەکەی بۆ چوار قۆڵ دابەش کرد و دوای دانانی نهێنی شەو، هەر گروپە و ڕێگای خۆی گرت. بۆ نزیکی سعات دوازدەی شەو لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی ئەو یانە_مان دا کە ئامانجی کارەکەمان بوو. لە بیرمە تەحسین کاوانی خۆی گەیاندە لای ئێمەوە و ئاگاداری کردینەوە، کە قوات خاسەیەکی هێزی کۆماندۆی زۆری ڕژێم لەناو یانەکەن. لە ژوورەوە دەنگە دەنگێکی زۆر هەیە، چەند ناقیلەیەک لەسەر جادەکە و مودەرەعەیەک و جێب قیادەیەک لە بەردەمی یانەکە مۆلیان گرتووە. لە ڕای ئێمەی پرسی کە هاوڕێ وەستا فەتاحیشی لەتەک بوو. مەلا غەفور یەکسەر هاتە دەنگ و گوتی با لە هەموو لایەکەوە لێیان بدەین..! کاکەمینیش لە ڕای منی پرسی، بەبێ یەک و دوو گوتم.. ئێمە پەلاماردانی سەربازی و دەستوەشاندنی کتوپڕمان مەبەست نەبووە، وا باشە هەندێ ئۆقرە بگرین، خۆمان گورگە نەکەین و چەکی دەستمان تەنیا کلاشینکۆفە و ئەگەر

دەستیش بوەشێنین و بە سەلامەتیش خۆمان رزگارمان بێت، ئەدی چی لە خەڵکی ئەو گەڕەکە بێسوچە دەکەن. کە سبەینێ هێزە دڕندەکانی رژێم چیان بەسەر دەهێنن. ئێمە لەو فسکە فسکەدا بووین، هاوڕێیان سامان و پێشەوا گەیشتنە لامان و پێیان گوتین، کە هێزە سەربازییەکە ئەو ناوەیان بە جێ هێشت. ئەوەبوو تەحسین بڕیاری ئەوەی پێگوتین، کە بۆ هەر لایەک وەک یەدەک، دوو پێشمەرگە بە جێ بهێڵین، خۆی و بەندە و مەلاغەفور و سامان و پێشەوا، زۆر بە گورجی من و تەحسین لە دەرگای پشتەوەی یانەکە و سامان و ئەوانی دیکە لە دەرگای پێشەوە چوینە ژوورەوە. هەر زوو پاسەوانەکانی بەردەرگەیان داماڵەخاس کردبوو، دەرگەی هۆڵەکەمان کردەوە، کۆمەڵە پیاوێک لە دەوری مێزێکی بازنەیی، خەریکی قوماركردن بوون، کە چاویان بە ئێمە کەوت، هەموویان ئەبلەق بوون و باوەڕیان بە چاوی خۆیان نەدەکرد کە پێشمەرگە بەم دەستوبردە، هەر بەدوای رۆیشتنی قوات خاسەکان گەیشتونەتە سەریان. لەناو ئەوانەدا یەکێکیان دەمانچەیەکی پێبوو. پێشمەرگە بە ژوورەکاندا گەڕان، کۆمەڵێ کەسی دیکەیان هێنایە هۆڵەکەوە، کە لە ناویان خەوسە هیرانی هەبوو کە چاوی بە تەحسین کەوت، کەوتە پاڕانەوە و هەر بەناوی خۆی بانگی دەکرد.ناچار منیش بە توڕەیی دەنگمدا.. بێدەنگ بە، ناوی کەسانی پێشمەرگە مەهێنە و جەنابت ئەندام کۆنگرەی حیزبی سۆسیالیست نەبووی..! کە وای پێ گوترا بەبێ دەنگی لە تەحسین دوورکەوتەوە و کڕ بوو. هەروەها لەوانەی ژوورەکان _ ش ج _ ی کۆییش هەبوو. قوماربازەکان زۆرتر لەوە واقیان وڕمابوو، لەسەر ئەو مێزەی بەردەمیانەوە، یەک چەردە پارەی کاغز کۆ ببوەوە، وایان دەزانی ئێمە بۆ ئەو پارەیە پەلاماری یانەکەمان داوە. بەڵام مەبەستی تەواوی ئێمە، ئەوە بوو کە لەو شوێنە چەند پیاوێکی موخابراتی رژێم بۆ قومار لەوێ ببوون، کەچی بۆ بەختی ئێمە لەناو خۆیان بەشەڕ هاتبوون، ئەو هێزەی رژێم فریایان کەوتبوو، ئەوانیان لەگەڵ خۆ بردبوو، ئەوەی بۆ ئێمە مابوەوە چەند خاپەرۆکێکی وەک موختار و پیاوی ئەو دەمی بەعسییەکانی شەقڵاوە بوو. بە گورجوگۆڵی چوار لەوانەمان پەلبەست کرد و بەپێش خۆمان دان و بەبێ ئەوەی کەسێک دەست بۆ یەک دیناری سەر مێزەکە ببات. تەنیا بە خێرایی هەندێ قسەمان بۆ کردن، کە ئێمە پێشمەرگەی کۆمەڵە خاوەن رەوشت و دەست پاکین، چەکمان بۆ راووڕوت لە شان نەکردووە، هەرگیز بۆ پارەوپول،

سەربڵندی خەباتگێڕی خۆمان لەکەدار ناکەین، ئەو چەردە پارەیەش هەر پیرۆزی خۆتان بێت و لەگەڵ قوماربازان نابینە شەریک..!

بە خێرایی ئەو ناوەمان جێهێڵا و هەموو بەدوای یەکەوە روومان لە بناری سۆرکی کرد و دوایی بە کەناری باریکە رێگای کەندولەندان بە بەردەمی گوندی کاوانیان رێگای خۆمان گرتەوە. لە رێگای وەستا فەتاحەوە، ئەو پێشمەرگانەی لە گوندی کاوانییان مابوونەوە، لەگەڵ کۆمەڵێک خواردنی هەمە جۆرە، لە بناری سەفین بە یەک گەیشتینەوە. رێگا و رێگا بە پشتی حوجرانەوە و بە یارمەتی رێپیشاندەرەکەمان، هەتا سەر مەزارگەی شێرەسوار رانەوەستاین. ئەوەی جێی تێرامانە، کە من بە هۆی هیلاکی و برسیبوونی زۆرەوە، کەتبوومە رەتلی هەرە دواوە. سەیرم کرد ئەوە پانترۆن لەبەرێکی پێخاوسمان لەگەڵ دایە، بە زمانی عەرەبی میسری هەر پرتە و بۆڵەی بوو. کە لەبەر ئازاری پێیەکانی و لە رێگا ئەو نەعلەی بەسەر پێیەوە بوو، لێی بە جێ مابوو، هەر زریکوهۆڕی بوو. منیش پرسیم ئەوە هەر خۆی بەگەرمان کەوتووە..! گوتیان نەخێر ئەوە عارەبە و خۆمان هێناومانە. دوای هەندێ حەسانەوە، سەیرم کرد بەرەبەیانە و مەلا غەفور بەدەم چاخواردنەوە خەریکی جگەرەکێشانە، کابرای میسریش هەر ناڵەناڵیەتی..!

ناچار کە خۆمان کۆکردەوە بۆ رۆیشتن و ئاودیو بوونەوە بناری سەفین. لەو پێشمەرگانەی ئەو کرێکارە میسرییەیان هێنابوو، گورەوییەکانیانم پێ لە پێ کردنەوە و دامە کابرای عارەب و وەک دەڵێن، دوای روونکردنەوەی رێبازی شۆڕش، ئیزنماندا و پێمان گوت رێگا و رێگا بڕوات، هەتا دەگاتە سەر جادەی قیرتاو. سبەینەکەیمان لە مزگەوتی گوندی قەڵاسنجی سەرێ خۆ بە عەردی دادا. بەڵام دوای دانانی پاسەوان لە دەرەوەی گوندی کەوتینە ئیسراحەت و خەوێ.

# ئەبەردەکەی شارەدێی کۆڕێ و کەرتی ڕێکخستن

لەو یەک دوو ڕۆژانەی لە ڕۆژئاوای بناری سەفین دەسوڕاینەوە، حاجی ئەکرەم و مەفرەزەکەی بە ئێمە گەیشتن.

هەموومان لەگەڵ کەرتەکەی سەفین و مەفرەزەکەی ناوچەی خۆشناوەتیی بە یەکەوە ئێوارە درەنگانێک لە گوندی قەلاسنجی سەروو، بەرەو گوندی گۆڕەشێر و کۆڕێ بە ڕێ کەوتین. هەتا سەعات دەی شەو لە گوندی گۆڕەشێرمان بەسەربرد. لە ناو گەنجەکان چەند هەوادارێکمان بۆ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، لە ڕێگای هاوڕێ کاوانییەکان ساز دا. لە ناویاندا ناوی خەلیلم هەر لە بیر ماوە

هەر لەگەڵ ڕاشکانی شەو، وەک پێشتر نەخشەمان بۆ دانابوو. دەبوو بە کاری ڕێکخراوەیی سەردانی کەسێک بە ناوی مام ڕەحمان لە کۆڕێ بکەین کە لە ڕێگای هاوڕێ فەقێ محمەدی دۆڵی باڵەیی وەک ڕێکخستنی کۆمەڵە پێمان ناسرابوو. لە پاڵ ئەوەش ئەگەر بکرێ، ئەو مەفرەزەیەی پێشمەرگەکانی قوەتەکەی سەفین، لەسەر جادەی کۆڕێ کەمین دابنێینەوە و کارێکی شۆڕشگێڕانە ئەنجام بدەن. یاخود ئەگەر کرا وەزیرێکی ئەو دەمی حکومەتی عیراق، ماڵەکەی لە کۆڕێ بوو. بە بارمتە بگرین. بەدوای هەندێ مرومۆی نێوان ئەز و تەحسین کاوانی و مەلاغەفور، هێزەکەمان کردە چەند مەفرەزەیەک. وەک یەدەک و پشت قایمکردن بۆ دەمی لێقەومان، مەلا غەفور و حاجی ئەکرەم و چەند پێشمەرگەیەک، هەر لەو گوندە مانەوە. ئەوانەی تر کە بە ڕێگای پیشاندەرێکی باوەڕپێکراوەوە، ئەوەی لە بیرم ماون.. ئەو پێشمەرگانە بوون، تەحسین کاوانی، ڕێبواری وەستا سەلام، سامان مەلاگچکە، لادێ، هاوار، کاکەمین، وریا گەورە، عەلی پونگینە، موزەفەر کەریم، مەسعود عەقاری، ئازاد کاوانی، فەرهاد کاوانی، حاجی مەمۆ، مام دارا، عزالدین ئەحمەد، بەکر ، برایم بڕنۆ و چەندانی دیکە کە ناوەکانیانم بیر نەماوە. سەعات یازدەی شەو بوو، گەیشتینە سەر ئەو چەمەی نێوان ماڵەکانی پێشەوەی جادە و بەینی هەردوو لای گەڕەکەکانی کۆڕێ. لەوێ تەحسین کەمینێکی بە جێ هێشت، کە ئەوەی لە بیرم ماوە یەکێکیان موزەفەر کەریمی ڕێکخستن بوو. حاجی مەمۆ و فەرهاد کاوانی و ئازاد کاوانیش شان بەشانی ئەو برادەرەی گوندی کە ماڵەکەی مام ڕەحمانی پێدەزانی، لێیان جیا بوونەوە. بۆ ئەوەی ئەو کارە ڕێکخراوەییەی خۆمان جێبەجێ بکەین و ئەو برادەرە بە فەرهاد کاوانی بناسێنین. پاشان تەحسین کاوانی بۆ ئەو بەری جادەش

کەمینێکی دیکەی چەند پێشمەرگەیی دانابوو. خۆشیان ئەوەی مابوونەوە، کە لە بیر من ماون.. تەحسین کاوانی، رێبوار وەستا سەلام، کاکەمین، سامانی مەلا گچکە، مام دارا، مەسعود عەقاری، وریا گەورە، عەلی پونگینەو عزەدین... هتد. ئەوە بوو هەر یەکە ئەرکی خۆی زانی، حاجی مەمۆ و تەحسین کاوانی لەسەر ئەوە رێکەوتین، هەتا من نەگەمە لایان، نەچنە سەر ماڵی ئەو وەزیرە. ئیتر هەر لایەمان بەدوای کاری خۆی لە یەکتری جیا بووینەوە.

مام رەحمان کە لەبەر دەرگا گوێی لەو نهێنییە بوو کە پێمان گوت، بە ئاسانی دەرگای بۆ کردینەوە و بەگەرمی بەخێرهاتنی کردین. لەو کاتە ئێمە باسوخواسەکانی پێویستمان تاووتوێ دەکرد، ئەو ماڵە خواردنێکی گەرموگوڕیان لە بەردەممان ریزکرد. لە بیرمە ئێمە بەدوای تەواوبوونی کارەکانمان و دەستمان بۆ خواردن برد و نەبرد، دەستڕێژی چەندان رێژنە گولله بووە چەخماخەی ئاگریارانی هەموو جۆرە چەکێک، کە هەموو دەوروبەری کۆیێ بە تەپکە و رەبایەی سەربازی رژێم تەنرابوو. بەراستی ئەو ئاگربارانە هەموومانی شلەژاند.

لە چاوتروکانێک خۆمان لە دەرەوەی حەوشەی ماڵەکە دیتەوە. ئەو ئاگربارانەی هەموو لایەکی سەرجادەی کەرخی هاوڕێیانمان بە دی کرد. خۆمان گەیاندە بەردەمی کەمینی یەکەم کە تەنیا موزەفەر کەریم بە تەنیا لە جێگای خۆی مابوەوە، دوو پێشمەرگەکەی دیکە قوچاندبوویان. یەکێک لەو پێشمەرگانەی لەشانی منەوە بوو، لە لای موزەفەرمان بە جێ هێشت. کە بۆ هاتنەپێشەوەی هەر رووداوێک، رێگای گەڕانەوەمان بە ئاسانی لێ نەگیرێ. من و ئازاد کاوانی گەیشتینە ئەو بەری سەر پردی سەر چەمەکە، کەمینی دووەم مابوونەوە. ئێمە بە کورە کوڕ و بە لێواری جادەکە بەرەو سەرەوە هەڵکشاین. گولله وەک برێشکە بەر جادەکە دەکەوتەوە و بۆ ئاسمان هەڵدەبەزییەوە. لە ناکاو لەناو رولکەکانی سەرجادەکەوە، توشمان بە تووشی تارمایی چەند چەکدارێکەوە بوو. لە دەنگدانی یەکتری و تفەنگ راکێشان، زوو دەنگی حاجی مەمۆیان ناسییەوە. مەسعود عەقاری و پێشمەرگەیەکی دیکە کە بە هەردووکیان ئەولا و ئەملا بن قۆڵی پێشمەرگەیەکی بریندارایان گرتبوو، وریا گەورەی رێکخستن بوو. ئەوانمان تەسلیمی کەمینی سەر پردەکە کرد کە بۆ پەڕینەوەی ئەو بەری هاوکاریان بکەن. خۆشمان دووبارە بەرەو شوێنی شەڕگەکە ملمان نا. لەو نێوانەدا توشمان بوو بە تووشی رێبواری

وەستا سەلام کە بەتاو بۆ لای کەمینەکە دەهات. هەواڵی برینداربوونی تەحسین کاوانی بە چرپە بە خۆم گەیاند. بە تەنگاوی لەگەڵ ئێمە بۆ ناو جەرگەی گولله بارانەکە گەڕایەوە. نیوەی شەو بوو، مانگ وەک پاشماوەی ئاگردانێک دەدرەوشایەوە. ئەگەر ئەو پەنادیوار و چەمە نەبوایە، هەموومان یەکە یەکە دەپێکراین. هەتا ئێمە گەیشتینە شوێنی شەڕە دەستەویەخەکەی نێوان دوو سەیارەی پڕاوپڕی جیش شەعبی رژێم و پێشمەرگەکان، کە لەسەر جادەی ناوەندی کۆڕێ بۆسەیان دانابوەوە. سامان و یەکێکیتر خەریکی لە کۆڵکردنی تەحسین کاوانی بریندار بوون. گولله بەر قەفەسی سینگی کەوتبوو. لەولاشەوە کاکەمین و پێشمەرگەکانی تر لە پڕکێشی ئەوەدا بوون کە هەڵکوتنە سەر سەیارەکان و دەستکەوتەکان بهێنن، من لە دوورەوە دەمدیت لە دەوروبەری جادەکە جولەی زەلام هەیە، تومەز وەک دوایی بۆیان باس کردم، هەندێک لەو جەیش شەعبییانە لە سەرەمەرگدا بوونە، لەحەژمەتان بە هەموو لایەک جولەجولیان بووە. خێرا دەنگی ئەو هاوڕێیانەی خۆمانم دا، کە نابێ بچنە سەر تەرمی ئەو کوژرانەوە و بۆ دەستکەوت قوربانی دیکە بدەن. ئەوانیش بە دەستوبرد هاتنە تەکمانەوە و بەیەکەوە تەحسین کاوانیمان گەیاندە شوێنی کەمینی یەکەم. ئەو برادەرە رێپیشاندەرەی لەگەڵمان بوو کە لە لای کەمینەکەی یەکەم مابووەوە. بە خێرایی لەگەڵ پێشمەرگەیەک ناردمان، دوو گوێدرێژی بۆ پەیداکردین، کە تەحسین دۆخی باش نەبوو. بە زەحمەت قسەی پێ دەکرا و خوێنی زۆری لەبەر رۆیشتبووە ناو هەناوی. سواری پشتی کەرەکە کراو و هاوڕێیان لەملاو لەولا دا دەستیان پێوە گرتبوو. بەڵام هێشتا تەقوهۆڕی هەموو جۆرە چەکێکی رەبایەی سەرگردۆڵکەکانی ئەو ناوە نەوەستابوو. گرەوی خۆیان لە دەنگی سەگوەڕی گوندەکانی ئەو ناوە بردبووەوە. لەو تاوەدا مەفرەزەکەمان، سەرباری ئەوەی مەسولە سەربازییەکەی لەتەک کادرێک بەسەختی بریندار ببوون. هەموو بە هیمەت و خۆڕاگربوون، لە دەمی کشانەوە بۆ گوندی گۆڕەشێر، بە ئیلتزامێکی پێشمەرگانەی توندوتۆڵ، دوو دوو و بە مەودا کەوتینە رێگاوە و ئەو پێشمەرگانەش کە لەو گوندە بە جێ مابوون، مەودایەکی باش بۆ وەرگرتنەوەمان هاتبوونە پێشەوە. لە گوندیش بەبێ ئەوەی خۆمان بگرخێنین، دوو وڵاخە بەرزەمان بۆ تەحسین و وریا بە کرێ گرت. بۆ ئەزیەت نەدانی بریندارەکان، هەر هێسترە و بە دوو فەردە کا، پشتی وڵاخەکەمان وەک دۆشەک لێ کرد و بریندارەکانمان لەسەر درێژ کرد. هەر لەوێ بە تەتەرێک نامەیەک بۆ

فەرهادە شەل نوسی کە بەیانی هاوڕێیەکی پزیشکی خۆبەخش لەگەل خۆی بۆ فلانە گوند بهێنی.

بەرەبەیانێکی زوو گەیشتینەوە گوندی قەلاسنجی سەرێ .لەو سەروبەندەدا، چەند خاڵێک دەبێ قامکی لەسەر دابنێم، یەکێکیان گەیشتنی ئەو پزیشکە دۆستانەی ناوشاری هەولێرە، کە لەلایەن رۆلەی تێکۆشەر فەرهادە شەل لە دەمی پێویست گەیەنرانە گوندی قەلاسنجی سەروو. تەندروستی تەحسین کاوانی بەرەو خراپی بوو. پزیشکەکان دوکتۆر ـف و دوکتۆر س، وەک دوو مرۆڤی سەربڵندی کوردەواری، زۆر لە خۆبوردوانە بۆ ئەوێ رۆژگار، بەپیر خواستەکەمانەوە هاتن و بوونە فریشتەی رزگارکردنی تەحسین کاوانی و وریا گەورە لەوێ رۆژدا. دوای تەداویکردن و پێچانەوەی برینەکەیان، یەکسەر هەستمان بە بەرەو بوژانەوەی تەحسین کرد و بۆ تەداویکردنی برینەکەی وریا گەورەش، کە گوللەکە تەنیا شلکەی رانی گرتبوو، دوکتۆرەکان هیمەتی خۆیان کرد. بەدوای عەسرێکی زوو دوکتۆرەکان کە لە بەرچاوی خەڵکەکە دەمامکی خۆیان دابوو، بە هەمان رێگای خۆیان گەڕانەوە.

خاڵی دووەم، دەبوو ئەو دوو برینداره، بە زووترین کات لەو شوێنەوە بۆ جێگایەکی دیکەی ئەمینتر و دوورە دەستی هێزەکانی رژێم بگوازرێنەوە.

ئەوەبوو بەدوای بیرکردنەوەمە، لە دوو عەبدوڵڵا هەنارەییمان نارد، کە خۆی و قەلابەکەی بگاتە گوندی قەلاسنجی سەرێ. لەو ناوە کانە بەرد هەبوو، رۆژانە چەندان قەلابە هاتوچۆیان دەکرد. بەیانی زوو، عەبدوڵڵا جوانمەردانە لەو شوێنە ئامادە بوو، بە دەستوبرد هەردوو بریندارمان لەناو دوو دارە مەیت درێژکرد و لەپشتەوەی قەلابەکەمان بارکردن، لەگەڵ چەندان پێشمەرگەی جەربەزەی بوێر، بە خۆیان و ئارپیجییەک و تفەنگەکانی دەستیان، ئەز و حاجی ئەکرەمیش، سەرچڵانە هەردووک لە بەرگی کرێکاری بەردهەڵکەن لە پێشەوە سواربووین. بە بەردەمی دەمی ئەو رەبایە و سەیتەرەیەی دەربەندی گۆمەسپانی رژێم، بەیانییەکی زوو بە سەلامەتی تێپەڕین، بەبێ ئەوەی قەلابەکە رابگرن. ئێمە بڕیاری خۆمان دابوو، لە هەر جۆرە رووداوێکی نەخوازراودا، بە هەموومان دەستبکەینەوە. پێشمەرگەکانی بەجێماویش هاتبوونە نزیکی ئەو شوێنەوە، تاکو لە کاتی لێقەومان فریامان بکەون. هاورێ بریندارەکانمان بە سەلامەتی گەیاندە دۆڵی نازەنین و لە هەموو مەترسییەک دەربازبوون. بەراستی کارێکی منداڵکارانەی

بێسەروبەر بوو، بەڵام رزگارکردنی گیانی تەحسین و وریا لە لامانەوە زۆر گرنگتر بوو، ئێمە ئەو کۆمەڵە هاورێیە بەو دڵسۆزییە، ئامادەی قوربانیدان دەبووینەوە..

خاڵی سێیەم لەو دەمەی هەموو پێشمەرگەکان لە مزگەوتەکەی قەڵاسنجەوە، بە هەڵەداوان و تەنگاوی خەریکی تاووتوێکردنی کاروبارەکان بوون. برادەرێکی _ غەریب _ رۆژانی مێرمنداڵیم، کە لەو گوندە فیراری عەسکەری بوو، لەگەڵ خەڵکە بەوەفایەکەی گوندی، هاتبوونە دەرەوەی گوند بۆ کۆمەک پێکردنمان. لەوێ غەریب هەر بەناوی خۆم - عباس - چاکوخۆشی لەگەڵ کردبووم. بەڵام دوایی سەیری کردبوو، هەموو خەڵک و پێشمەرگاکان هەر بە ناوی حاجی مەمۆ بانگی ئەو عباسە دەکەن. غەریب لە خۆی کەوتبووە گومان و لێم نزیک کەوتەوە و داوای بووردنی لێ کردم کە ئەو بە برادەریکی منداڵی خۆیم تێگەیشتووە و بە ناوی عباس قسەی لەگەڵ کردوم. منیش بە چرپە پێم گوت کورە ئەوەی تۆ راستە و داوای بوردن مەکە..!

خاڵی چوارەم، ئێمە بەسواری قەلابەکە و لەگەڵ بریندارەکان، مەودای مەترسیمان بڕیبوو، تومەز ئەو چەند پێشمەرگەیەی بە ئارپیجی و تفەنگەکانیان لە تەک بریندارەکانەوە لە پشتەوەی قەلابەکە بوون. هەموویان لەناو بۆدی قەلابەکە راستببوونەوە. ئێمەش لەو دەمی گەیشتبوٚینە بەردەمی گردۆڵکەکانی پێش ئەو پێچەی گوندی زیارەت، دیارە لەو کاتیش هەندێ پێشمەرگەی حسک بەسەرپەرشتی تەحسینە شەلی خوارزای عەریف عەلی لەو بنارە خۆراکی گەرموگوڕی شار و خواردنەوەی مشەیان بۆ هاتبوو، لە دەوروبەری گردببوونەوە. کەچی دەرکەوتنی قەلابێک بە چەندان چەکداری دیارەوە، ئەو گەعدەیەی لێ تێکدان و سەیرمان کرد، هەر چەکدارە بەو هەورازە رکەدا پێی غارێی پێوەناوە و خۆی دەرباز دەکات..! ئێمە و ئەو برادەرانەی سەرەوەی قەلابەکە گەلێکمان هاوار لێ کردن، بەڵام ئەوان نەوەک هەر باوەڕیان بەو هاوارانە نەکرد، بگرە لە بەرچاوی ئێمەوە لەگردەکەش ئاودیو بوون. پێشمەرگەکانی سەرەوەی قەلابەکە کە چوونە ئەو شوێنەوە، بەزموڕەزمەکەیان بەسەرکردەوە، ئەوجا تێگەیشتین ئەوان، ئێمەیان بە چەکداری رژێم خوێندوتەوە و لە ترسی پەلاماردان، جێبەجێبوونی حەزی نەوسی لەکیس داون..

# هه‌ڵبژاردنی نوێنه‌رانی دووه‌م کۆنفرانسی کۆمه‌ڵه

پێش ئه‌وه‌ی بچمه ناو یاده‌وه‌رییه‌کانمه‌وه و بۆ هه‌ندێ له یه‌کتر حاڵیبوون، په‌یوه‌ندی و ناسیاوی من و مه‌لابه‌ختیار بۆ راسپارده‌ی خودی ئارام له کۆتایی ساڵی ۱۹۷۷ ده‌گه‌ڕێته‌وه. دوای ده‌رچوونی هاوڕێیان مامۆستا عه‌زیز و جه‌ماله ره‌ش بۆ شاخ، له دواجاری دیده‌نی ئه‌ز له‌گه‌ڵ خودی ئارامدا، له ده‌وروبه‌ری گوندی سه‌رزه‌ل ــی ناوچه‌ی قه‌ره‌داغ. ئارام باسی چه‌ند هاوڕێیه‌کی بۆ کردم که ئه‌و رۆژه له دیدی ئه‌ودا نمونه‌ی هاوڕێی به‌رچاوی کۆمه‌ڵه بوون. یه‌کێکیان مه‌لا به‌ختیار بوو که له به‌هاری ساڵی ۱۹۷۷ به نهێنی بۆ به‌سه‌رکردنه‌وه‌ی هێڵێکی پاشماوه‌ی، کۆمیته‌ی رێکخستنی له‌به‌ریه‌ک هه‌ڵوه‌شاوه‌ی هه‌ولێر هاتبووه ناو شاری هه‌ولێر و له‌لایه‌ن سه‌عدی خه‌لیل و مه‌لا غه‌فور ئاگادار کرامه‌وه، که ناوبراو گه‌ره‌کیه‌تی چاوی به من بکه‌وێ. به‌ڵام ئه‌وێ رۆژێ من به‌بێ نامه و نهێنی ئارام که پێشتر له‌سه‌ری رێککه‌وتبووین، هه‌موو په‌یوه‌ندییه‌کی ئه‌وانه‌م ره‌تده‌کرده‌وه و ئاماده‌ی ئه‌و دیداره نه‌بووم. دواتر ئارام ئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ باس کردم که له‌مه‌ودوا به ئاگاداری خۆی، مه‌لابه‌ختیار له فرسه‌تی گونجاو له رێگای کۆمیته‌ی هه‌ڵمه‌تی ناوچه‌کانی سلێمانی په‌یوه‌ندیم پێوه ده‌کات. ئیتر ئه‌وه ده‌روازه‌ی رێچکه‌گرتنی په‌یوه‌ندی هاوڕێیانه‌ی نێوان مه‌لا به‌ختیار و ئه‌ز بوو...

چه‌ند رۆژێک بوو به‌شێکی زۆری پێشمه‌رگه‌کانی که‌رتی رێکخستن، له‌گه‌ڵ ئه‌و هێزه‌ی یه‌کێتی له دۆڵی سماقولی به یه‌که‌وه ده‌خولاینه‌وه. سه‌ره‌تای ساردی په‌یوه‌ندی نێوان سه‌یدکه‌ریم و ئه‌ز ده‌رکه‌وتبوو. به‌ڵام به‌شی زۆری هاوڕێیانی که‌رتی رێکخستن به‌وه خۆمان راهێنابوو، که هه‌میشه په‌یوه‌ندییه شه‌خسییه‌کان، ملکه‌چی به‌رژه‌وه‌ندی کۆمه‌ڵه بخوێننه‌وه. به‌بێ گوێدانه دردۆنگی ئه‌وانه‌مسولانه‌ی ناو هێزی پێشمه‌رگه‌وه که هه‌میشه یه‌کێک له حه‌زه‌کانیان بیانو دۆزینه‌وه بوو، بۆ به‌رمه‌یدانبوونی ناته‌بایی له‌گه‌ڵ رێکخستن و ئه‌و کادره‌ی که‌سایه‌تی رێکخستنی مه‌به‌ست بوو. یاخود ئه‌و هاوڕێیه‌ی که بۆ به‌رجه‌سته‌بوونی کاره‌کته‌ری شیرازه‌ی رێکخستن به‌سه‌ر پێیانه‌وه بوو. له به‌رچاو و بۆ به‌رژه‌وه‌ندی مشه‌خۆری و شه‌ڵواڕپیسی ئه‌و جۆره مه‌سوله عه‌سکه‌رییانه خۆشه‌ویست نه‌بوون. هه‌ر بۆیه‌ش به‌شێکی هه‌ره زۆری کادره رێکخراوه‌ییه‌کانی شاخ ئه‌و ده‌م له ناوچه‌کانی هه‌ولێردا، ته‌نیا گوێڕایه‌ڵی پرینسیپه‌کانی چوارچێوه‌ی ته‌نزیم بوون. رۆژێکیان

کورتە نامەیەکی مەلا بەختیارمان بەدەست گەیشت، کە ئەو وەک نوێنەری ناوەندی کۆمەڵە، لەو ڕۆژانە دەگاتە دۆڵی بالیسان و گەرەکیەتی لەو دۆڵە لەگەڵ ستاف و کادرەکانی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە کۆبێتەوە و بە یەکەوە جەولەیەکی ناوچەکانی دەوروبەری هەولێر بکەن. ئەوجا بەستنی کۆنفرانسی ناوخۆیی هەڵبژاردنی نوێنەرانی دووەم کۆنفرانسی کۆمەڵە کە لە خڕی ناوزەنگ دەبەسترێ. لەپێشەوە لەگەڵ سەید کەریم بۆ ئەو کارە قسەم کرد. ئەو ئامادە نەبوو لەگەڵ ئێمە بێتە دۆڵی بالیسان و بەڵکو گەرەکی بوو هەردوولامان بە یەکەوە بۆ شەو پەلاماری ڕەبایەکانی سەری ڕەش و مەسیف بدەین. بەڕاستی ئەو ماوەیە پێشمەرگەکانی کەرتی ڕێکخستن بە کادر و ئەندامەکانییەوە، بە هۆی جەولەی ئێرە و ئەوێی بەردەوام و بەشداریکردنمان لە کارە شۆڕشگێڕانەکەی ناو شاری شەقڵاوە و داستانەکەی ناو شارۆچکەی کۆیێ، ماندووبوون و هیلاکیمان پێوە دیار بوو. ئەو داوایەی مەلابەختیارمان بە فرسەت زانی بۆ هەندێک پشوو بدەین لەو ناوچەیە دوور بکەوینەوە.

ئەوەبوو مەفرەزەکانی کەرتی ڕێکخستن، ئەوانەی لە دۆڵی سماقولی بوون خۆمان کۆکردەوە و بە ڕێ کەوتین. جوابمان بۆ ئەوانەی دیکەش نارد، کە بۆ کاتی دیاریکراو بگەنە دۆڵی بالیسان. بەدوای یەکترگرتنەوەمان لەگەڵ مەلابەختیار و ئەو هێزەی لەشانیدا بوو، کە هەتا مەسول لقی هەولێری یەکێتی نیشتمانی _نازم عەمەر _ی لەگەڵ بوو.

لەوان ڕۆژاندا مەفرەزەیەکی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە بە بەشداری هاوڕێیان شێخ سلێمان، زاهیرخۆشناو، و چەند پێشمەرگەیەکی دیکە، لەسەر جادەی بالیسان پاسێکی ئەفرهەڵگریان ڕاگرتبوو. بەدوای پشکنین و پرسینی ناسنامەی نەفەرەکان، بۆیان دەرکەوتبوو کە خاوەنەکەی بە خۆی لە ناو پاسەکە بووە. کابرا پسولەی پیتاکدانی دەهەزار دیناری بۆ -قادسییەی سەدام- ی پێ گیرابوو. پێشمەرگەکان پێشنیاری ئەوەی بۆ دەکەن کە نیوەی ئەو پیتاکەش بە پێشمەرگەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵەی وەک پیتاک ببەخشی. کابرای خوڵاپێداو زۆر سەربەستانە وەڵامێکی ڕەقی دابوونەوە، کە پیتاک بە ڕێگر و چەتەی سەرجادەی رووتکردنی خەڵک نادات. ئەوانیش خۆی و پاسەکەیان هێنایە گوندی چیوەی حاجی سەلام، کە هێزەکان هەموو بە نیازی ئەوەی بەرەو دۆڵی هیران و نازەنین لەوێ کۆببوونەوە. ئەو خاوەن پاسە کە چاوی بە تێکڕای پێشمەرگەکان کەوت و

نەکەوت، وەک ئەوەی دوژمنی باوککوژەی خۆی ببینی، ئاوا سەیرمانی کرد و لێمان دەهری بوو. هەر دەیگوت من کۆمەڵە و مۆمەڵە ناناسم، من کۆمەک بە هیچ چەتەیەکی رێگر ناکەم. زۆرمان بە هێمنی لەگەڵ گوت، ئەو کەمی بیست. بەڵام بە خشکەیی هانای بۆ فلان مەسول و فیسار کێخوای گوندەکان برد، هیچ دادی نەدا. هەتا لەو چەند رۆژەی لەو گوندانەی دۆڵی بالیسان لەلامان دەستبەسەر بوو، بە هەر شێوەیەک بوو، لە رێگای مەسول لقی هەولێری یەکێتی، نامەیەکی دەستخەتی هێنابوو، کە گوایە نامەی مام جەلالە، بەڵام دیار بوو یەکێک لە خۆیەوە بە ناوی مام جەلال نامەکەی نووسی بوو. بەبێ ئەوەی مام جەلال ئاگای لێ بێت، چونکە ئێمە دەستخەتی ئەومان دەناسی و هەتا بۆ مێژوو بە مەلابەختیار ـــ یشمان نیشاندا، کە ئەویش گوتی.. ئەوە دەستخەتی مام جەلال نییە. ئەز بە راشکاوی بە ناوی رێکخستنەوە بە کابرام گوت.. ئێمە لەبەر خاتری ناوی مام جەلال، ئەو پیتاکەی لێتمان داوا کردووە، بە نیوەی دەکەین. کەچی کابرا هەر بەبێ منەتی قسەی گەورەی دەکرد. ناچار دواجار بە توندی قسەمان لەگەڵ کرد و پێمان گوت.. ئێمە لەسەر داوای ئەو واسیتانەی کردوتە، خۆت ئازاد دەکەین و پاسەکەت گلدەدەینەوە، بە دڵنیاییی ماوەیەک بە دەست پێشمەرگەوە دەبێت. کابرا سەری نەهێنا بەرێ و پاش چەند رۆژێک هاتبوەوە و بە پرتە و بۆڵەیەکی زۆرەوە، دوو تفەنگی بۆ پێشمەرگە بێچەکەکانی کەرتێ رێکخستن لە گوندی مێرگەسەر کڕی و سەیارەکەی وەرگرتەوە. سەری خۆی و چەنە لێدانەکەی دای لەبەرد.

لە رۆژێکی خۆرەتاوی بەهاردا، لە تەنکێشی گوندی چیوەی حاجی بەدیع -دا، نزیکەی چل ئەندامی کۆمەڵەی ناو رێکخستنەکانی پێشمەرگە، بە سەرپەرشتی مەلا بەختیار کۆبوونەوە، لەوێ نوێنەرانی کۆنفرانس بە دەنگدانی ئاشکرا دیاری کران کە بریتی بوون لە: حاجی ئەکرەم، مەهدی کاوانی، مەلا غەفور، حاجی مەمۆ، سدیق رەنجبەر و وەرزێر دەستنیشان کران. کەچی ناوەندی کۆمەڵە لە لای خۆیەوە و بە مجێزی شەخسی خۆیان، بە ناوی کادری سەربازی چەندان کەسیان لەو ناوچەیە بۆ کۆنفرانسەکە پاڵاوتبوو کە هەیانبوو نەوەک هەر باوەڕی بە کارەکتێری رێکخستن نەبوو، بگرە نەیدەزانی کۆمەڵە چییە و ئاسۆی بیروباوەڕەکەی بەرەو کوێ هەڵدیت و رۆژێک لە رۆژان کۆمەڵە نەبووە..! تەنیا بە مەبەستی شاراوەی کەوی بوونیان بۆ داهاتووی داماڵەخاسکردن و لەباربردنی چوارچێوەی پرۆسەی رێکخستن، کردنی کۆمەڵە بە

بۆنییەکی بۆشی مەسولە پاوانخوازە دەستڕۆیشتووە خاوەن پلان و بەرنامەی پێشینە، لە دروستکردنی لەشکرێکی گوێڕایەڵ بە دەوروبەری خۆیانەوە کران بە ئەندامی کۆنفرانس. دیارە خەباتی چەکداریی شاخەکان، پێکهاتەکەی زۆربەی زەخیرەی کۆمەڵەی ناو هەناوی کۆمەڵی کوردی، زۆرتر لەگەڵ ئەو جۆرە پراکتیکە سیاسییە سەقەتە هاتووتەوە و خەڵکە شۆڕشگێڕەکە ئەرێ وەی بابەی بۆ دەچڕی. هەتا هەنوکەش لوجیکی ڕێکخراوەیی لە بەردەمی مەسولی سەرەکی، هەنگاوێکی هەڵخەڵەتێنرانەی دەمی زەمەنە، لەگەڵ پەیداکردنی دەسەڵات و سێبەری خۆیان، چێشتی مجەوری ڕێکخستن ساردکراوەتەوە، کە لە حەقیقەتدا بۆ ناو و موزایەدە بە کار هێنراوە و دەهێنرێ و سەمای بڕۆ بدە بەرێی لەبەر دەکرێ

## ڕۆڵی هاوڕێیانی ڕێکخستنی لەناو خەڵکدا

یەکێک لەو کارە بەرچاوانەی کادر و ئەندامانی کۆمەڵە لە ریزەکانی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە_ لە دەستپێکدا_ پێی ئاشنابوون. هەر کادر و پێشمەرگەیەک لەو ناوچانەی تێیدا هەڵسوڕانیان هەبوو. بە بێ گەڕانەوە ناو خەڵک و پرس پێکردنیان لەو کاروبارانەی ڕۆژانە ڕووبەڕوویان دەبوەوە، هەنگاوێکمان نە دەهاوێشت. بە یەکلایەنی بڕیارێکمان بەسەر کەسەوە نە دەسەپاند. ئەوەندەی کرا ڕێکخستن هەتا لەناو هێزە چەکدارەکانی یەکێتی، وەرگرتنی هەموو جۆرە_ بێجگە لە پەناوپەسێوی گەندەڵکاران _هەر جۆرە باجێکی بەسەر خەڵکی زەحمەتکێشی گوندەکان رەتکردبوەوە. ئەوەندەش ئاومان لە دوو بێرێ هات و بۆمان جێبەجێ بوو، پاراستنی ژینگەی کوردستان لە رووی دار و دارستانەوە بەلاوە گرنگ بوو. بەڵام بەداخەوە بە هۆی بۆڕبۆڕینی نادروستی نێوان هێزە چەک بە دەستەکانی گوڕەپانەکەوە، لەو بارەوە سەرکەوتنێکی ئەوتۆمان بەدەست نەهێنا. هاوڕێیانی ڕێکخستنی ئەودەم لە روانگەی دابین بوونی مافی ئازادی بۆ هەموو تاکێکی خەڵکی کورد، ئەو خەڵکەی لە سنووری قەڵەمڕەوی پێشمەرگەوە دەژیان، بە مەرجی سەرەکی سەرکەوتن بۆ گەیشتنە ئامانجەکانمان دەخوێندەوە. ڕێکخستنی کۆمەڵە لەوان ڕۆژاندا قەڵغانی پاراستنی ژیانی چەندان کادر و هاواداری حیزبە نە یارەکانی یەکێتی بووین. لەو بارەوە چەند نموونەکی ئەو کارانە وەک مشتێک لە خەرواریک دەگێڕمەوە. جارێکیان سەری ساڵی ١٩٨٢ بوو، ڕێگامان کەوتە گوندی ئالانەی حەوزی

خەلیفانەوە، لەو گوندە چەند خێزانیک هەبوون، کە بە ئاشکرا لەسەر حسک ناسرابوون.
ئێمە بەوە ئاگادار بووین، کە یەکێک لەو قوتابییە زیرەکانەی قوتابخانەی گوندەکە، رۆڵەی هەرە زیرەکی یەکیک لەو بنەماڵانە بوو. لەو سەردانەماندا باسی ئەوەیان بۆ کردین لەلایەن بەڕێوەبەری قوتابخانەکەوە دەستکاری نمرەکانی ئەو قوتابییە زیرەکەی هەواداری حسک کراوە، یەکێکی دیکەی سەر بە یەکێتی لەناو قوتابییەکانی گوندەکە بە یەکەم ناوزەدکراوە. ئێمە زۆر بە جدی کەوتینە بەدواداچوونی ئەو پرسەوە. دوای دەرکەوتنی راستییەکە، مامۆستای ناوبراومان لە ریزەکانی کۆمەڵە هەڵپەسارد و مافی ئەو قوتابییە زیرەکەشمان بۆ خۆی گێڕایەوە. مامۆستای ناوبراویش لە شەرمان خۆی لەو گوندە گواستەوە.

لە گەرمەی جەولەیەکی شەڕی کوردکوژی ناوخۆی ناوچەکەدا. مەفرەزەیەک بە بەشداری مەلاغەفور، سۆرانی مەسیحی، عەلی پونگینە، کاکەمین و چەند پێشمەرگەیەکی تر و خۆم. بە راگوزاری رێگایان کەوتە گوندی توتمەی دۆڵی تەکەورێ لە دۆڵی بالیسان. سەیر دەکەن مەفرەزەیەکی ئەو هێزانەی دەرەوەی ناوچەکانی هەولێر، بە بەشداری ج خەلیلی کادری سیاسی، گەمارۆی ماڵی بەکرە کەچەڵی کادری سەربازی _حسک_ یان داوە. کە ماڵ و منداڵەکانی لەو گوندە نیشتەجێ بوون. ئێمە بەسەر ئەو رووداوەدا کەوتین، قیژوهۆڕی ژن و منداڵی نابراو ئێمەیان راچڵەکاند. دیتمان ئەو چەک بەدەستانە بە رێنمایی خەلیل گەرەکیانە ئەو ژنە خاوەن منداڵە کە لانکی منداڵی ساوای بە شانەوە بوو، لەناو ماڵەکە دەربکەن. بۆ ئەوەی خانوو و بەرەکەیان ئاگر بدەن. ئەوە بوو بەرۆکی ئەو پێشمەرگانەمان گرت، سەرەتا ویستمان بە قسەی خۆش لەو کارەیان دەست هەڵگرن. بەڵام ئەوان بە هێزی مەسولی هەرە گەورەیان دەخوڕی و خەریک بوو ناخۆشیان دەکرد. ناچار بە هەڕەشە و هەتا تفەنگ لە یەکتری راکێشان، ئەو ژنە و منداڵی ساوای ناو لانکەکەمان لە دەست دەرهێنان و پێمان گوتن.. بڕۆن لە لای کامە مەسولی گەورەتانە، راپۆرتی خۆتان لەسەر بەتایبەت حاجی مەمۆ و مەلاغەفور بنووسن، کە ئێمە رێگامان نەداون ئەو خانووە بسووتێنن و ئەو خانەوادەیە دەربەدەر بکەن. ئەگەر ئێوە ئەوەندە رەشیدن، بڕۆن رووبەڕووی چەکدارەکانی حسک ببنەوە، نەوەک پڕ بدەنە ژن و منداڵی بێدەرەتان و بێ سوچ..! لێرەدا کە خەڵکی گوندەکە بە چاوی خۆیان ئەو لەسەرکردنەوەی ئێمەیان بە دی کرد، لە دەورووبەرمان کۆبوونەوە و بە یەکەوە ژن و

منداڵەکانی بەکرە کەچەڵمان بۆ ناو خانووەکەی خۆیان گەڕاندەوە و لە گیرفانی خۆشمانەوە کۆمەکمان پێ کردن.

هەروەها لە گوندی نازەنین، کادری ناسراوی حشع، حەسەن کاکە بە خۆی و ژن و منداڵەکەی لە قوتابخانەی گوندەکە جێگیر ببوون، کە وەرزی هاوین بوو، قوتابخانە داخرابوو. لەناو مزگەتی گوندەکە، کادرێکی ڕێکخستن، گوێی لە قسەی دەمی مەسولی یەکەمی هێزی پێشمەرگەی خۆشناوەتی ــ م. خ ــ دەبێت، کە مەفرەزەیەک ڕادەسپێری لە شەو بچنە سەریان و لەو شوێنە دەریان پەڕێنن. ئەگەر دەستیشی کردەوە، دەستی لێ نەپارێزن. ئەوەبوو یەکسەر لەگەڵ مەسولی ناوبراو دانیشتین. هەواڵی ڕاستی و ناراستی ئەو قسەیەمان لێ کرد، ڕاستگۆیانە نکوڵی لێ نەکرد. بەڵام ئێمە ئاگادارمان کردەوە کە هەتا کەرتی ڕێکخستنی کۆمەڵە لەو ناوە بێت، پێشمەرگەیەک بۆی نییە دەست بۆ ئەو کادرەی حشع ببات و ئێمە خۆمان ئاگاداری دەکەینەوە، کە لەگەڵ کرانەوەی دەوامی قوتابخانە، دەبی باڵاخانەکە چۆڵ بکات. ناوبراویشمان ئاگادارکردەوە، کە ئەگەر ئەوە فرمانی سەرەوەی خۆیەتی، ڕاپۆرت لەسەر مەسولی کەرتی ڕێکخستن بنووسی، کە ئەو ڕێگای دەستدرێژیکردنە سەر کادری ناوبراوی نەداون. ئەوەبوو خۆشمان بۆ دڵنیایی و لە دەمی نەبوونی ئێمە لەو ناوە، نەوەک دەستی لێ بوەشێنن، بە زمانێکی خۆش بە بەشداری کادری پێشمەرگە م .بەکر، حەسەن کاکەمان ئاگادارکردەوە کە ئەو شوێنە چۆڵ بکات. ماڵی ئاوا بێت، ئەویش بەبێ ئەوەی دڵگران بێت، لەوێی گواستەوە.

ڕاستە ئەوانە و زۆر کاری دیکە لە داکۆکیکردن لە خەڵک، ڕێگاگرتن لە زێدەڕۆیی پێشمەرگە، گەلەکۆیکردن لێرەولەوێ بەسەر ئەم و ئەوەوە، ئەرکی سەرشانی خۆمان بوو، بەڵام بۆ بەرچاوی مەسولە عەسکەری و کادرە چەمبەرییەکان، زیانی بۆ پەزەکانی سەرجەم شۆڕش و قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیانەوە هەبوو. لەوەش ڕاستتر لەو پێناوەدا خۆمان گومرگەکەیمان دا و ئازاری ئەو سەریەشەی بۆیان دروست دەکردین، چەشت و خۆمان بە سەربڵند دەخوێندەوە

# دەستکردنەوەی ووشەکانم

لە باوەشی ئەو پەیڤانەی لێرە دەیخوێننەوە، بە چەند سەرەقەڵەمانەیەکی هەڵسەنگاندنی خۆمەوە، ئەو کاروانەی کۆشش و هەوڵی بێوچانی هاوڕێیانی رەتلی یەکەمی کەرتی رێکخستنی بۆ بەرچاوی خوێنەر هەڵدەخەم. تاکو ئازادانە بە بەرچاوڕوونی قوربانیدانەکانی ئەو کۆمەڵە هاوڕێیەی سەرەتای دروستبوونی کارەکتێری کەسایەتی رێکخستن لە ناوچەکانی هەولێری بەر شمڕی تفەنگ ببینن و بە گیانی فیداکارییەکانیان ئاشنا بن.

ئەو رۆژە دەیان هاوڕێی کۆمەڵە، بەو پەڕی بێمنەتی لە بەربەستەکان و ئەو باوەڕ بوونە دەروێش ئاساییەمان بە رێبازی مارکسیزم _ لینینیزم. دڵنیابوون و پشت ئەستووری بە خۆ و خەرمانی دڵسۆزی، پەرۆشی، هۆگری بۆ داکۆکیکردن لە وڵات و خەڵکی ستەمدیدەوە بوو. دەنا کۆمەڵێک رۆڵەی پێشمەرگەی دەست و پێ سپی، رووتەڵەی کوڕی شاری و دوور لە فەزای شەڕوشۆڕدا، ئەو رێگا سەخت و پڕ ململانێیمان گرتبوو. وەک چۆلەکەیەکی ناشارەزای ناو تەمتومانی دار و دەوەنی دارستانی بزاڤی چەکداری، بۆنسۆی چرە دوکەڵی ئەجندای سیاسەتچییەکانی سەر گوفەکدانی کوردایەتی، بێ ئاگا لە بەرانبەر فروفێڵی مەکرۆیانەی فەنتازیای ترەکەڵەکی بەر پەرێزی پەرتوبڵاوی وەستایەکانی حیزبی شاخ، وەک رەنجبەری دروێنەی دەشتی کاکی بە کاکی گورگان خواردودا تەلاشمان کرد.

لەو روانگەوە تەنیا و تەنیا هزر و مەزەندەی خۆمان لە تەمەنێکی گەنجی ناو هەست و حەزەکان بەدەمەوە گرتبوو. بەبێ ئەوەی ئەو حەز و هەستانەمان، سەرچاوەیان لە هەر جۆرە ئەزموون و خوازیاری هەر چەشنە بەرنامەیەکی نابەجێ راوکەی هەبێت. ئیتر نازانم چۆن چۆنییەک بەرگەمان گرت..! ئەو کەشوهەوایەی بەدوای ئەزموونێکی سەر بە گۆبەند، ئێمەی ماندو و شەقی ئەو کاروانە، هەندێکمان بە هەزار دەردی سەری، بە سەقەتی و نائومێدی، بە دەستی بەتاڵ و جەستەی کوتراو، تێیدا رزگارمان بووە و ئەوجا بەندە تێیگەیشتم کە ئێمە بە هەڵەداوان لە رێچکەی هەوڵدانی بێوچانی هەمیشە، تارادەیەکی زۆر ئاسنی ساردمان کوتاوەتەوە. بە ئەنجام سەپانی پوشێی بەرسێبەری بەرژەوەندی خەڵکانێکی بێویژدانی بێوەفا، سپلە و بەرژەوەندی خۆپارێز، فرسەتتەلەبی

خۆشی و تەنگەژەکان خولاوینەتەوە، هەر وەک ئەنجامەکەی بە ڕۆژی ئاشکرا دەبینین کە چۆن بەشێکی زۆرمانی لە شانی خەڵکەوە داغان داغان کردووە.

ڕاستە ژیانی خەڵکی سەربڵند، خاوەن قوربانی، بەردەوام و بە زۆری لە دێرزەمانەوە پێخۆری دەم گۆڕانکارییەکانی ڕۆژگاربووە. ڕاستە هەموومان، بەبێ ئەوەی پێی بزانین، وەک گەردەلوولی دەم ڕەشەبا، خوومان دابووە بەر ڕەوتی تێکهەڵشێڵانی ڕووداوەکان، خاوەن ئەو هۆشە خۆپەرستییەمان لە بەرۆکدا نەبوو، بەڵکو کەرەسەیەکی شیرتێن، چاکوخراپی خۆمان و خەڵکمان بە شێوەیەکی کۆنکرێت لە یەک جیا نەدەکردەوە.

ڕاستە مرۆڤی خاوەن هەڵوێست و کوڕی ڕۆژی تەنگانەی سەرەتای سەر جەنجەڕی کوتانی خەرمانی ڕۆژە دژوارەکان، ملمان لە چەقۆ دەسوی. ڕۆژانێک بە چەنگەڕێ بەربەرەکانیمان خولقاند. بەڵام تابڵێی کاڵفام و ساویلکە، بێ ئەزمون هەنگاومان هەڵگرتبوو، زۆر بە ئاسانی کڵاوی ڕەنگاوڕەنگی سیاسەتچییەکان بە سەرسەرمانەوە جرت و فرتی بوو. بەشێکی زۆری هاوڕێیانی کۆمەڵە، کە بە دڵ و بەگیان لە خزمەتکردنی کۆمەڵە و کوردایەتیدا بوون، بە نیازێکی پاکی کەموێنە، دڵسۆزییەکی بێپەروای کاروانی تێکۆشانی کوردان، باسکی خەباتمان لێهەڵماڵیبوو. ئەو هاوڕێیانە لە بەراییدا لەناو بازنەکانی خەباتی ڕێکخراوەیی شارەکاندا، بوێرانە ڕووبەڕووی جەبەروتی دەسەڵاتی بەعس ببوونەوە، سەرباری بە ژمارە کەمییان لەچاو گەورەیی شارەکاندا، کەچی شێلگیرانە بە خۆیان و دەسرازەی کەسوکارەکانیان و بەشەو و بەڕۆژ بە موقاوەمەت، نوچنەدان، بەردەوامی لە کاری دار و دیوار نووسین و بڵاوکردنەوەی بەیاننامە و هەتا ئەنجامدانی کاری شۆڕشگێڕانەی ناوشارەکان، هاوکاریکردنی مەفرەزە تاکوتەرایەکانی پێشمەرگەی شاخەکان، دامودەزگا دڕندەکانی دەسەڵاتی بەعسییان تەنگەتاو کردبوو. ئەو هاوڕێیانە کە لە بەرگی پێشمەرگەش لە شاخەکاندا خۆیان دەدیتەوە، سەرباری نەبوونی هەر جۆرە ئەزمونێکی شەڕی پێشمەرگایەتی، بێ هەر جۆرە مەشقێکی بەکارهێنانی چەک و کاری سەربازی، سەرباری ژیانی دژواری ئەوێ ڕۆژانی شاخ و هەر چەشنە خۆئامادەکارییەکی پێشینە، ئەو ڕۆڵە چاونەترسانەی کۆمەڵە، لە سەنگەرەکانی نەبەردی بوێرانە و پەلاماردان و بەرمەیدانبوونەوەدا، نمونەی ئازایەتی و قوربانیدان بوون. دەیان و سەدان کوڕی ناسکونازداری خەڵکی کورد لە بەرگی ئەندامێتی و پێشمەرگەیی کۆمەڵەدا، بوونە

قۆچی قوربانی ئەو خەونە ئاڵوسوورانەی، فەلسەفەی خەباتی چینایەتی و هەمێزی شەهیدبوون بۆ وڵات و خەڵکەکەی، خەیاڵی دەموساتیان بوو..

لێرەدا یادەوەرییەکانم لەوێ دۆخی تەنگەژاویدا، لە شانی خەبات و ماندووبوونی ئەو دەیان هاوڕێیەی ناوچەکانی هەولێر بە گشتی، لە زەمان و زەمینی هەنگاوەکانی دەستپێکی دروستکردنی کەرتی رێکخستنی شەقڵاوەدا، لەناو یەک چەردە وێنەگەلی ئەو مێژووە جەنجاڵەدا، وەک نمونەیەک دەهێنمەوە کە خودی خۆم هەنگاو بە هەنگاو لە ناویان ژیاوم، لە تەک دەیان هاوڕێی دیکەی نەمر و زیندوو، لە جەنگەڵی تەونی کوێرەوەرییەکان، ئەو کۆرپەی حەزی خەونەکانمان بە گاگۆڵە خست. ئەو چەپکە هاوڕێیەی کۆمەڵە، بەبێ چەک و تفاقی پێویستی پێشمەرگایەتی، بەبێ بودجە و پشتیوانی و کۆمەکی دارایی بگرە هەتا کۆمەکی بێنەملا و ئەو لای ناوەندی کۆمەڵە. بەبێ هەر جۆرە راوپرووتێک، ئەو دەستە هاوڕێیە بۆ ناوچەیەکی پڕ کێشەی چەکداری و کۆمەڵایەتی و ژیاری لە لایەک، لێوان لێو تژی لە ناکۆکی لاوەکی و ڕقەبەری ناڕەوای گرووپە چەکبەدەستە رەنگاوڕەنگەکانی شاخ لە لایەکی دیکەوە، کە قەڵەمڕەوی دەسەلاتی بگر و بکوژی دەمودەزگای سەربازی مشە و رەوەجاشی سەر بە رژێمی بەعس تێیدا سەریار بوو. لە ناوچەیەکی لەو جۆرەدا، هاوڕێیانی کۆمەڵە بە گشتی و ئەوانەی رێکخستن لە پێشەوە، بەو هەوڵدان و کۆششە بە دەگمەنەی نواندیان، دەتوانم بە راشکاوی بڵێم، بوونە مایەی وەرچەرخانێکی چاوەڕوان نەکراوی بەلانسی هێز لە نێوان ئەو گرووپە چەکدارانەوە، کە بە حەق هەتا ئەوێ رۆژان، هێزی حسک بەبێ رکابەر، هێزی چەکداری زاڵی ناوچەکانی هەولێر بوو. بە هۆی رەگوڕیشەی باکگراوندی شۆڕشی ئەیلوولیشەوە، هێشتا هێزی مەعنەوی ناو کۆمەڵانی خەڵک لە ناوچەکەدا، بە ئاشکرا لە تای تەرازوی هاوسۆزی پارتی دیموکراتی کوردستان و حسک بوو. دەیان کادری پێشمەرگەیی بە ئەزموون و ئازای وەک سەید سەلیم و شینەی بۆڵی و عەولابۆر و قادرمستەفا و سەیدکاکە و سەعدی گچکە لە مەسولە سەرەتاییەکانی بزووتنەوەی ناو یەکێتی و دواتر زۆربەیان حسک بوون و شارەزا و کوڕی ناوچەکە بوون و کەسایەتییەکی چەکداری دیار بوون. لەو بارودۆخەدا هاوڕێیەکانی کۆمەڵە کە خۆیان دابووە بەر راپەڕاندنی ئەرکێکی قورس و پڕ مەترسی شەو و رۆژی بێوچان. بە چەشنێک تەنیا لە ماوەی ساڵ و نیوێکدا، لە بەرگی پێشمەرگەی رێکخستنەکانی کۆمەڵەدا سەرانسەری

سنوری پارێزگای هەولێر مەیدانی چالاکی رێکخراوەیی ئەوێ رۆژانی کادر و هاورێیە گیان لەسەردەستەکانی رێکخستنی کۆمەڵە بوون. کە بە چالاکی و هەڵسوڕاوی بێ ماندووبوون، شیرازەیەکی رێکخراوەیی فراوانی ئەوتۆیان لەناو خەڵک ساز دا کە ئەو کەرتە لە ئەنجامی گەشەکردنی بەرچاوی، پێنج کەرتی دیکەی لە پەنا دروست کرا.. لە برێتی ئەوە و شاباشکردنی قوربانی و ماندوبوونەکانی ئەو کۆمەڵە هاورێیە، بە جۆرێک پێکهاتەی کەرتی شەقلاوە، لەلایەن ناوەندی کۆمەڵە و لەسەر داخوازی مەسولە عەسکەرییەکان بەتایبەتی سەروگوێ کرا کە زەمینەی گۆڕانکاری بۆ بەرقەراربوونی رێکخستن لەباربرد.

بەڵێ لە پاداشتی پەیوەندیکردنی دەیان رۆڵەی شار و گوندەکانی ناوچەکە بە ریزەکانی هێزی پێشمەرگەی یەکێتی، و رواڵی ئەو هێزەیان لە هێزێکی بچوکەوە، بۆ هێزێکی گەشەکردووی ناو ناکۆکی و کێشەکان بۆ یەکێتی خستە ناو چەقی مەیدان. بەڵام لەسەر تیلەی تێڕوانینی بەرژەوەندی عەقلی قوندە، هاورێیە جەریەزەکانی شارەزا و خەڵکی ناوچەکە، لە مەسولیەتی رێکخراوەیی دەڤەرەکە داماڵەخاس کران.

دروست بەدوای کۆنفرانسی دووی کۆمەڵەوە، رەوتی رووداوەکان روخساری ئاشکرا و خێراتری وەرگرت. سەرکردایەتی زاڵی ناوەندیی کۆمەڵە بە سەرپەرشتی سکرتێرەکەیەوە، بۆ مسۆگەرکردنی داڵدەدانی عەسکەرتاری لە رەوتی بەرێوەبردنی کۆمەڵەدا. بە شێوەیەکی زیرەکانە و لەژێر پەردەی لە باوەشگرتنی پەرەسەندنی شیرازەی رێکخستنەکانی کۆمەڵەوە، لە سەرجەمی ناوچەکانی ژێر سێبەری تفەنگدا، بۆ تێکڕای ناوچەکان مۆدەی رێکخراو دروستکردنیان هێنا پێشەوە و قیتکردنەوەی چوار رێکخراویان بریار لێ دا. یەکێک لەو رێکخراوانە بۆ ناوچەکانی هەولێر بوو. بەڵام بە چاو هەڵنەهاتن بۆ سەرکەوتوویی کادرە لێهاتووە هەڵسوڕاوەکانی ناو کاری رێکخراوەیی لەو ناوچەیەدا، بەس لەبەر ئەوەی بەگوێی مامۆستایان نەدەکرد، ئامادەی گوێڕایەڵی دەروێشانە و راپۆرتنووس نەبوون. بەڵکو ئەودەم بە یەکسانی و یەکگرتوویی، هاورێتی هەموو ئەندامانی ناوەندی کۆمەڵەیان وەک یەک دەکرد. لە بەرانبەر کاری نامەسولانەی هەندێ لە کادرە سەربازییەکانی ناو پێشمەرگەی یەکێتی، دەهاتنە دەنگ و رووبەڕوو رەخنەیان لێ دەگرتن و بێ دەنگ نەدەبوون، پاشەگەردانییەکانیان بۆ نەدەشاردنەوە. دەبوو ئەو جۆرە کادرە بەلاوە بنرێ، دەنگی ئاشکرای گەشەکردنی شیرەزاکانی رێکخستن لە

سێبەری پرینسیپەکانی ڕێکخراوەیی سروشتی بنووسێنن. هەر بۆ نموونە یەکێکی نە شارەزای ناو کاری ڕێکخراوەیی و خەڵکی ناوچە و شارێکی دوور لەو ناوچەکانی هەولێریان کردە مەسولی کەرتی چۆمان کە لە ناوچەکەی پێشویدا، لەناو یەک چەردە کێشە و گرفتی کەسی، هەتا لەگەڵ پێشمەرگەی پارتیزانی مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە، جەمال عەلی باپیر نقوم ببوو. یەکێکی دیکەیان بۆ مەسولی ڕێکخراوی ناوچەکانی هەولێر کە هەرگیز سەروسوکوتی لەگەڵ شارەزایی کاری ڕێکخراوەیی کۆمەڵە نەهاتووتەوە. تەنیا لەپێناوی مسۆگەربوونی گوێڕایەڵی بێئەملا و ئەولای دەسەڵاتدارەکانی ناو سەرکردایەتی کۆمەڵە و دەمکوتکردنی هەردەنگێک لەبەرانبەر پەرێزبەربڵاوی گەندەڵی هەڵسوکەوتی مەسولە عەسکەرییەکانی ناوچەکە لە لایەکی دیکەوە، بۆ ئەوەی لە کەناری ڕێکخستنەکانەوە، خاترجەم بن لەو جۆرە پراکتیکە ناشیرینەی بەرانبەر کۆمەڵانی خەڵکی و ڕاوڕووتی مشەخۆرانەی دەمی پەیدابوونی دەستکەوتی نەبەردەکان دەست کراوە بن و کەس لە گوڵ شیرین تریان پێ نەڵێ. کەچی ئەز و یەک بە یەکی زۆربەی کادرەکانی دیکە، ڕووبەڕوو، بەرانبەر کەسانی مەسولی هەرە گەورەی عەسکەری و هاوکوفەکانی، لە دژی پڕدانە سەروەرییەکانی مرۆڤ لەسەر پێ بووینە.

لێرەدا قامک لەسەر ئەوەش دادەنێم، ئەو دەم ئاستی بیرکردنەوە، جەسارەتی هەنگاوهەڵگرتنمان هەر ئەوەندەی لەبار بوو، بە پرتەوبۆڵەی پەنا دیواران، مل بدەینە خۆگونجاندن لەگەڵ ئەو هەڵسوکەوتانە. بەڵام بۆ مێژوو دەیگێڕمەوە دەنگی دلێری ئەوتۆش هەبوون، کە بە جورئەتەوە بانگیان دەکردین، با بەو غەدر و ناحەقییانە ڕازی نەبین، هەڵوێست وەرگرین..!

ڕاستە تێگەیشتنی پرسیار و گەنگەشەی گرێکوێرەکان، لەسەرەوەی تەمەن و تێگەیشتنی ئێمەوە بوون. وەلی ئێمەی کاڵفام، ئەو کۆمەڵە هاوڕێیەی بەرکەژاوەی دەردەسەرییەکان، گەرەکمان بوو شرۆڤەکردنیان بێ وەڵام نەهێڵینەوە. سەرباری ئەوەش خاوەن سەرێکی هەڵکەوتووی ناو ناکۆکییەکانی وەک ئارامی نەمر لە مەیدان نەبوو. کە ئێمە ڕاست و دروست بۆ بەجێگەیاندنی پەیامە پیرۆزەکانی ئەوان ڕۆژان بەڕێوە ببات.

ڕاستە سەربردەی چیرۆکی ئێمە، ناوکی هەوڵدانەکانمان، وەک پرۆشکە پرۆشکی نمەبارانی پاییزان، هەندێ جاران سەر و پۆتەڵاکی خەون و خەیاڵی هیشکوبرینگی ڕووخساری کۆششمانی نەرم و فێنک دەکردەوە. هیوای ئومێدی لەگەڵ قرچەی گەرمای

ململانێیەکان دەڕژاندە سەر ترۆپکی سەبر و ئارامیمان، بۆ ئەوەی درێژە بەو جۆرە خەباتە پڕ لە دڕدۆنگییە بدەین..!

ئەوان نەیارەکانی هەڵسوکەوتی شۆڕشگێڕانەی کادرە بێ پشتوپەناکانی کۆمەڵە، لەوێ ڕۆژانی خەباتی شاخەکانیشدا، لە ئێمە بە فامتر بوون، فامی شەیتانییانەی بەرۆکی فروفێڵاوی، بۆ پاراستنی بەرژەوەندی کەسایەتی خۆیان لەسەر پێ بوون، مەکرۆیانە زەمینەی کەویکردنی ئێمەیان خۆش دەکرد، لە داڵدەدانی کوڕە ئازاکان بە بیانوی خەباتی چەکداری و بارودۆخی ناهەموار خاترجەم بوون. تاکو بەو زیرەکییە ئیبلیسییەی بەرێوەبەرەکانیان، لە کاروانی بۆڕبۆڕێنەکانی رابردوو پەیدایان کردبوو، دەرەقەتی کاڵفامی دڵسۆزانەی بێ پەروای ئێمەبێن، بەخشکەیی دەستبەتاڵیان کردین، شانەوشان مەیدانی کۆمەڵەیان قورخ کرد و لە فرسەتی چاوەڕوانکراوی دیدی خۆیاندا، بەخشکەیی و توندی باوەشیان لە بەروبۆمی خەبات و قوربانی کاروانی تێکۆشەرەکانی کۆمەڵە وەرهێنا، بەشێکی بەرچاوی سوارە ماندونەناسەکانیان بەلاوە ناو، چەندان خەڵکی ماستاوچی و مەدەلایی کەری بۆرەپیاوی، فرستەلەبیان لە شوێنەکانیان چاند و قیت کردەوە..

هەر بۆ نمونە ئەو لەشکرەی _ کۆ ڕەک پلاری چاو پێهەڵنەهاتن بەبیانوی لەشکری سوور شەڕیان پێدەفرۆشتین_ کەرتی رێکخستن لە ناوچەکانی دەرەوەی شاری هەولێر پێکەوەی نابوو. لە ئەنجامی هەوڵ و خەباتی یەکە یەکەی هاوڕێیانی کەرتەکە بوو. کە لە لایەن کەسانی دەستڕۆیشتووی خودی کۆمەڵە و بەو بیانوەوە و بەبێ هیچ شەرعەیەتێک کادرە دیارەکانیان پەرتەوازە کرد. دروست سەردەرکردنی جۆزەرەی بارودۆخێکی سەرلەنوێی رێکخراوەیی هەمێزی بیروباڕە شۆڕشگێڕانەکەی _ ئارام _ ی نەمریان بەسەروگوێ کراوەیی لەبار برد. بەڵام ئێمەش لەو کەشوهەوایەدا، بەخۆمان کەم سوچ نەبووین. لە پێشەوە لە هەنگاو هەڵگرتنمان بۆ رووبەڕووبوونەوە، کاڵ و کرچ، دەمچەفت و خەمسارد، بەردمان لە شوێنی بەرد نەگرت، وەڵامی شالاوی رقوقینە_مان، بەبێ دەنگی و سەرکزکردنی بەردەستی سەوداکردنی هەندێ کەواسووری بەرتۆردوی دەستکەوتی شەخسی لاواز مردار کردەوە. چونکە خەباتی راستەقینە لە کۆششی پاککردنەوەی ناخ دەست پێدەکات. ئێمە لەجیاتی ئەوەی لەپێشەوە بۆ لای خۆمان بگەڕێینەوە، هەنگاوی یەکەم بە شەڕی لەناوبردنی تابوریی دڵەڕاوکێ و دەرهێنانی

رەگوڕیشەی ئاژاوەگێڕی خۆپەرستی دەست پێ بکەین، لە نۆرەی ئەوەی لە بەرانبەر چاویەیەک هەڵنەهاتن، ئێرەیی نێوان هاوڕێ پێشمەرگەکان، خۆمان تاو بدەین. تۆوی دوویەرەکی، رقوقینەی قێزەوەن، بەسەر مەبەستەکانمانەوە لەنجەی دەکرد. مێژووی خەباتی کوردان بەوە تژییە، کە هەموو سوارەکان بە رووکەش دەبابە خۆرن، هەر یەکێکمان بگری، بۆ خۆی کەرکەدەنێکە و دەکاری ملی یەکتری بشکێنی، زۆربە مێرخاسیمان بۆ خۆ کردووە بە سەپان..!

لەراستیدا کۆششی راستەقینە لە خەباتکردندا، زاڵبوونە بەسەر ناخی خۆتدا. هەر لێرەوەش جلەوی ئازایەتی، جوامێری ئاقاری خۆی دەبینێتەوە. ئێمە ئەو کۆمەڵە هاوڕێیە، لە تراویلکەی شۆڕشگێڕێتی بیروباوەڕی ئارامدا، بە خۆمان کڵاوی رەنگاوڕەنگی موزایەدەکردنی خۆبادانمان لەسەر نرابوو، بەبێ ئەوەی پێی بزانین، خۆمان کردبووە کۆیلەی گوێڕایەڵی حەز و هەستی لەخشتەبردن. بەوەی فلان و فیسارە کەسمان، شۆڕشگێڕی بیستوچوار عەیارە..! بە جۆرێک هەر لەو گۆڕەی، خۆمان کردبووە گیانفیدای ئەوانە، بەبێ ئەوەی خودی ئەوانە، لە مەودای پراکتیکی رۆژانەیاندا، ئەو خۆ بەقوربانی کردنەی هاوڕێیەکانیان بە پولێکی سووتاو کڕیبێت. بەڵکو وەک لە سەودای بازرگانی مشەخۆرانەی بازاری جامبازەکاندا باوە، ئێمەی وابەستەی هەندێ مەسول وەک کوتاڵ، کڕین و فرۆتنمان پێ کراوە. دروست لە پەراوێزی ئەو چارەڕەشییەماندا، چی بەسەر ئەو رووبارەی قوربانیدان، ئەو هەڵمەتە بێشومارە ماندووپڕوکێنەی سەدان سەربازی نەناسراو هات و دێ..! هەنوکەش بەبێ ئەوەی بە خۆمانی بزانین و ئاوڕ بدەینەوە، ئەوان لە رابردوو و ئێستا و سبەینێش، هەر دەسەڵاتدار و خاوەن بەروبۆمی تێکۆشانی خەڵکی سادە و نەفامی وەک ئێمەن، ئێمەش بە خۆمان هەر پێخۆر و گوێڕایەڵ لە بنی بیرێ تەپەمان دێت. ئەوان لە رابردوودا بۆ بەرژەوەندی خۆیان، ئاگری ناکۆکی و ناتەباییەکانیان دەتەقاندەوە، ئێمەش بە سادە و ساکاری تەراتێنمان لەبەر دەکرد و لە ئەنجامدا ئەوان سەرسەلامەت و خۆشمان سووتەمەنی و سەقەتبوون و لەناوچوونمان دوورییەوە.

ئێمە بابایەک، دروست پێش ئەوەی بەیانییان، گزنگی خۆر لەو دیو کەلەوە، سەرەدیقانێی راونانی یەکجارەکی شەو بکات، بە تیراژە تیژە زێڕینەکانی جەرگی ئاسمانی بێدادی لەو وڵاتە ببڕێت. بەو رەنگە بەرانپیلی بێوەژن کۆشێمان بۆ خەبات و قوربانیدان

لەشان گرێدابوو. بە خەشیمی _ یاغنیش _ بەرهەمەکانمان لە باوەشی کەسانی خۆپەرستی مەکرۆ روو کرد. راستە لەپێناو کورد و چینە رەشوپووتەکان چیمان لە دەست هاتبێت، دریخیمان نەکردووە. ئاسوودەیی کۆمەڵانی خەڵکمان بە لاوە گرنگتر بووە لە رازیکردنی دڵی مەسولە عەسکەرییە غەدارەکان. سەریازە نەناسراوەکان لە سێبەری تفەنگەوە، سەرە رمی قەمەکانیان لە کەلەکەی خەڵک گیرنەکردووە، بەڵکو دەنگی رەخنەی خۆیان بە رووی کردەوەی ناشیرینی بازرگانە هەمەرەنگەکانی جەنگی قێزەوەنی کوردکوژی بەرز کردبووەوە.

بانگی ئەو هاورێیانە لەپێشی پێشەوە بۆ یەکرِیزی خەڵکی کورد، توێژە چەکدارەکانی شاخ بوو، چونکە ئەو هاورێیانە ئەوەیان لە لا ساغ ببوەوە، کە هەتا دوویەرەکی، خۆکوژی ناوخۆی بێهودە، لە ریزەکانی خەباتی شاخ هەبێت. هەتا غەدرکردن بەناوی درۆزنانەی خەڵک لە خەڵکی خۆمان بمێنی، دیارە کاڵبونەوە لە کورد و چینە چەوساوەکانی درێژە دەکێشن، ژێردەستەیی خەڵک، هەموو قسەیەکی گەورەی موزایەدەکارانە دەنووسێنێ.

راستە لەو گۆرەپانەدا، تێکۆشەرە ئازا و بە تواناکان هەمیشە لە کەسانی ترسنۆک و دەستەپاچەی چەمبەری و لاواز جیا بوون، بەڵام دەبوو هەر ئەو کادرە ئازایە گیان لەسەردەستانە، سنگی خۆیان بدەنە بەر قوربانیدان و سەدان کادر و هاورێی لەم جۆرە شەهید یاخود سەقەت و کەلاکەوتوو بوون. سوپای پەنادیواران و مشەخۆرەکان مەیدانیان قورخ کرد و دەستکەوتی سەرکەوتنیان بۆ خۆیان و کەسوکاریان دوورییەوە..

هاورێیانی ئێمە گەرەکیان بوو، وەک تیشکی خۆر، لە هەمبەر شەوەزەنگدا. رەو بە تاریکی ژیانی چەوساوەکان بدەن، مومی رووناکییان بۆ پێبکەن. ئەو رووناکییەی لێرە و لەوێ بە شەوارەی هەوری نگریسی چەوسێنەران شاردراوەتەوە. بەڵام داخی گرانم لەلایەن بارەگای بەرێوەبردنی ئەزموونەکان، چرای تاقیکردنەوەکانی ئێمە کز و کز کرایەوە و گلۆپی سەوز و سوور بۆ رەوەندی برۆبدەبەرێی بەرچەناگەی بەرژەوەندی چاوچنۆکانە پێکرا و بریقایەوە...

من گەواهی ئەوەش دەدەم، گەورەترین هۆکاری پاشەکشە و رەوینەوەی ئەستێرەی گەشی تێکۆشەران بریتی بوو.. لەوەی ئەو کاروانە بەدرێژایی مێژوو، دڵەراوکێ سەربار و بن بار بووە، نەبوونی سەقامگیری هەتاسەر لە بیرکردنەوە و کاردا پشتی شکاندوون.

هەر رەوت و لایەنێک لە بەرخوردی تاکتیکی و ستراتیژیدا، نەتوانێ پشت لە ترسنۆکی وەرگری و بەسەریدا زاڵ بێت، ئەوە هەردەم ترس و گومان و دڵەڕاوکێ سەری لێ وەردەگری، لە خرتۆکێی وەردەدا. لێرەدا ترس لە بیروباوەڕ بە هێزتر کەوتەوە. لەوێ زەماندا شەوارەی دەسەڵاتی سەرتڕەکەڵەک، هەر بە هەڕەشەکانی چۆکانی هێنابووە لەرزین، دەست بە خۆدا شۆڕکردنەوەی بەرسێبەری ساغنەبوونەوەی یەکجارەکی کردبووە سەرمایە.

لەو کاروانەدا ترس و کەسایەتی دەمدەمی، ئەو کەسە چەندە خۆی وەک یەکێکی نەگۆڕاو و بە رووکەش جێگای باوەڕپێکردن بێت، بەردەوام کۆیلەی قازانجی کەسی خۆی و سەرگەردانی بەرژەوەندی خۆی بووە. زۆر لەوانە لەسەر دەستکەوتی گیرفانی خۆیان و منداڵەکانیان، شەڕی کێویان کردووە، یاخود لەسەر تاقمە قەنەفەی باشوخراپ، جەنگی فیکریی مان و نەمانیان بەرپا کردووە..! من بەم دواییە لەوە گەیشتم، کە راستییەکان لێفەیان پێدادراوە، بەڵکو هەموومان تەنیا شتی لاوەکیمان دەدیت، وێڵی حەیرانی کیژۆڵەی چاوبەخاڵی قولەی قافی تراویلکەی بیرکردنەوە سەرخۆشی کردبووین.

بەراستی ئێمەی یاغنیشی پەیڕەوکارانی، ژیانی راست و دروست، لە گوێی گادا بالۆرەمان دەگوتەوە. هەموو پلەوپەیایەکمان بەلاوە گرنگ نەبوو، پشتگوێمان خستبوو. بەڵام نەیارەکانمان لە ئێمە باشتر لەوە حاڵی ببوون کە ژیان هەمووی فڕوفێڵە، سەرکەوتن و دەسەڵات بەدەست قورخکردنی درۆ، ناراستی و پلەوپایەی کەلەکچییانەوەیە. ئەوەی چاوی لە جوامێری، پیاوی مەردبوون بێت، راستی و دروستی ژیان بێت، وەکو ئێمە دەبێ ئاو بهێنی و بە دەستانیدا بکات..!

لێرەدا دان بەوەش دەنیم، ئێمە لە ژیانی سیاسی بەتایبەت و ژیان بە تێکڕایی، هەرگیز بیرمان بە لای دەسەڵاتدارییەوە نەبووە. نەوشیروان ئەوێ رۆژان باش تێمانگەیشتبوو، لەو بارەوە قسەیەکی جوانی هەبوو، چەند جاریک بەخۆمی گوتووە... کە ئێمە کەسانێکین بەبێ ئەوەی لە خۆمان بگەین، زۆرتر تامەزرۆی کارکردنی ناو جغزی بچوک و سنووردارین، کەس فێری دەولەتداری و بەڕێوەبردنی شتی گەورەی نەکردووین، بگرە دەقمان بە تەقە تەقی فارگۆنی کۆتایی شەمەندەفەرەکەوە گرتووە...! لەپاڵ ئەوەشەوە ئێمەمانان، زۆربەی زۆرمان لە بواری زانست و مەعریفییەوە ئەوەندە بە تێری بەرمان لە فێربوون نەگرتبوو. لەبرێتی ئەوە خەیاڵپڵاوی ئەندێشە، داستان و ئەفسانە

پەرستی رەشماڵی بەجێماو قۆشمەمان دەکرد و لەو گۆرە و بەخۆڕایی سەری هارومارمان لە خۆمان کۆ کردبووەوە.

بەکورتی هاوڕێ گەلێک بە هەموو وزەیەکی بیر و جەستەمان، خواستی دادوەری لە ئەرک و مافدا، نەهێشتنی ستەم لە ژیاندا. ئەوجا باروبۆخێکی تەندروستی کۆمەڵایەتی لە رووی گوزەران و تەندروستی و نەهێشتنی نەخۆشی و نەخوێندەواری، چاکسازی و نوێبوونەوە لە بنیادناندا، رەتکردنەوەی خراپەکاری بەرێوەبردن وێردی سەرزمانمان بووە، بەبێ ئەوەی بە عەمەلی لە بەرانبەر خەرمانی دواکەتوویی، نەزانی کۆمەڵ شتێکی ئەوتۆمان پێ کرابێت، بەڵکو سەرمان لە خۆشمان شێواندوە، خۆمان لەناو گێژاوی هەمە جۆرە دیوەتەوە.

دەمینێتەوە سەر ئەوەی، ئەوەش بلێم، ئێمە ئەو کۆمەڵە هاوڕێیەی بەر رەوسەی بەرهەمی کاروانی هەوڵ و کۆششی دروستبوونی کەرتی رێکخستنی شەقڵاوە لە ناوچەکانی هەولێردا، کە لە رووی هەست و نەستی دڵسۆزی هاوڕێیانەی ژێر ساباتی ئایدیۆلۆژی کاڵفامانە، یەکریزی شانبەشانی یەکتریمان هەڵبژاردبوو، لە دەربرینی ئەجندای کار و پراکتیکی رۆژانەماندا، بە پێچەوانەی توخمە مەکرۆ و ئەوانەی پەنا دیواران و راپۆرتنووسەکان، بە پشتبەستن بە جیهانبینی خەباتی رێبازەکەمان و باوەڕبوون بە خۆمان، تابڵێی ئاشکرا و بێ پەناپەسیوان هەنگاومان هەڵگرتبوو. ئەوەی لەناو دڵمان بوو، بێ مانۆڕکردن لەسەر زارمان بوو. بۆیە لە مەیدانی بەربەرەکانی و بۆرپۆرێن کردنماندا، لوقمەیەکی ئاسان و بێ پشت و پەنا بووین، دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵە زۆر بەئاسانی پەراوێزیان خستین وخەبات و ماندووبوونیان بنگۆم کردین..

## بەرەو کۆنفرانسی دووی کۆمەڵەی رەنجدەران

درەنگی پاییزی ساڵی١٩٨٢ بوو، هاورێیانی هەڵبژێردراوی سنووری کەرتی رێکخستنی شەقڵاوە کە نوێنەری کۆنفرانس بوون، بە یەکەوە بەرەو بنکەکانی سەرکردایەتی لە ناوزەنگی سەر سنووری نێوان رۆژهەلات و باشووری کوردستان بە رێ کەوتین. بەدوای چەند رۆژ و شەوان بە شوێنی دیاریکراو گەیشتین. بە هەستێکی دڵپاکانە و دوور لە هەر جۆرە سەرەداوێکی دەستەگەری، ئەو گروپە هاورێیە زۆر سەربەستانە، یەکەمجار لە لای بنکەکەی مەلا بەختیار لاماندا و هەر لە نزیکی ئەوانیشەوە، شرە خێمەیەکمان وەرگرت، بۆ خەوتن بۆی دەگەڕاینەوە و لە لای پێشمەرگەکانی ئەو بنکەیە نانی سێ ژەمەمان دەخوارد. هەرچەندە لەگەڵ گەیشتنمان، زۆر چاکم لە بیرە لە شانی هاورێیان مەلا غەفور، حاجی ئەکرەم، سدیق سالح گۆران لە پێشەوە سەردانی بنکەکەی نەوشیروانمان کرد. لە چۆنیەتی بەخێر هێنانماندا، ساردوسڕییەکی گوماناویمان دەرک پێ کرد و هەتا دەمەدەمی نیوەڕۆ بوو، تەکلیفی فراڤینیشیان لێمان نەکرد. کە هەموو بنکەی سەرکردەکانی کۆمەڵە لە ئەندامانی کۆنفرانس جمەی دەهات. نەوشیروان بەبێ ئەوەی پرسیاری شتێکمان لێ بکات، راستەوخۆ بەدوای دیتنی ئێمەوە، بە دەموچاوێکی ترشاوی بۆ ژوورەکەی خۆی بەجێیهێشتین. دەمە دەمی عەسرەکەی هەر لەگەڵ ئەو هاورێیانەوە، پیاسەیەکی توژەڵەمان کرد. تاکو لە نزیکەوە چاومان بە برادەرە گۆرینەکانمان لە ئیعلام و ئێزگە بکەوێت. کە لەو دەمییەوە ئەرسەلان بایز مەسولی سەرەکی بوو. بەدوای بەسەرکردنەوەی پێشمەرگە و کادرەکانی ئیعلام و ئێزگە لە پێشەوە، بە پێویستمان زانی سەردانی ئەرسەلان خۆی بکەین. کە گەیشتینە بەردەمی خیوەتەکەیان، ئەرسەلان و پەخشان خان و دڵشاد عبداللە، کە دیار بوو تازە پەیوەندی کردبوو، لە بەردەمی خیوەتەکە جێگایان دانابوو. لە بەرمان هەستانەوە و فەرمووی دانیشتنیان لێ کردین. کەچی (ج. ف) و چەند کەسێکی دیکە لەوێ دانیشتبوون، کە ناوەکانیانم لە بیر نەماوە، نەوەک هەر لە شوێنەکەی خۆیان نەجولانەوە، بگرە خۆیان لێمان نەبان کرد، کە بۆ بەندە زۆر قورس بوو. چونکو هیچ یەکێکیان لە هاورێیەکانم لە نزیکەوە پێشتر نابراویان نەناسیبوو، بەرێککەوتیش نەیان دیبوو. لەو چەند خولەکەی لە لایان ماینەوە، منیش رووی قسەم هەر لەگەڵ ئەرسەلان و پەخشان و دڵشاد بوو. لەو دەمەدا سفرەی خواردنی

ئێوارەیان لە ناو خیوەتەکە رادەخست، بە چاو لەگەڵ هاورێیەکانم، یەکێ راستبووینەوە و ئێزنمان لە ئەرسەلان و پەخشان خواست کە ئێمە بە زیادی دەکەین. ئەرسەلان خۆی لە شانمان لەگەڵ دڵشاد چەند هەنگاوێک هەستانەوە سەرپێیان. بەدوای دانیشتنەوەی ئەوان، مل بە مل لە شانی هاورێیان رێگای گەڕانەوەی ناوزەنگمان گرت. لەو دەوروبەرە پێشمەرگەکان هێشتا بە دەرەوە بوون. چەند دانەیەکیان بەری رێگایان لێ گرتین، کە ئێوارەکە لە لای ئەوان بین، بەڵام ئێمە دڵمان ئەوەندە پڕ بوو، نەمانتوانی بۆ یەک چرکەی دیکە لەو هەوارە بمێنێینەوە، بە تایبەت لە دیدی بەندەوە، ئەو رۆژانە لە بەرچاوم دەگوزەران، کە بۆ خاتری هاورێتی رۆژە تەنگەکان، هاتوچۆی زیندانەکانی فوزەیلە و ئەبوغریبم، بۆ دیدەنی ئەرسەلان و جێبەجێکردنی خواستەکانی رێگای نەپساوە بوو. دەبوایە هەر ئەم رۆژە لە واتای وەفاداری و دڵسۆزی نێوان ئەندامانی حیزبی تێبگەم، کە لە دەمی هاتنە گۆڕێی بەرژەوەندی پلەوپایە، هەتا ئەوانەی رۆژانی لێقەمانیش کاڵ دەبیتەوە. کە هەنوکەش لە دەمی دەسەڵاتداری و سەروەت و سامانی مشەی بەر رەوسەی قوربانی دەیانی زیندووی وەک ئەز و دەیانی شەهیدی لەبیرکراو، ئەو وەفاداری و دڵسۆزییەی سەرکاغەز، بەدەیان تەنەکە زبڵ و خۆڵی تژی پڕ کردووە.
دەتوانم هەنوکە ئەو راستییە بڵێم کە ئەو جۆرە هەڵوێستە ناجۆرانە لەوێ رۆژاندا، یەکێک لەو فاکتانە بوو کە بە یەکجاری هەڵوێستی خۆم ساغتر بکەمەوە و سەرەتای رێچکەیەکی جیاواز لە خۆ خوێندنەوە بگرم و، باشتر لە هەمبەر ناوەرۆکی بۆشی کەسایەتییەکان هەڵوەستە بکەم. کە هەنوکەش زۆر پێی ئاسوودە و بەختەوەرم لەو جڕوجامشتە گەیشتووم و ویژدانی زیندووی خۆم بەسەر پێیان کەوتووە و هەرگیز کۆیلەی پلەوپایەی بۆرەپیاوی نەبوومە.

هاورێیەکانم یەک بەدوای یەک بەدەم رێگاوە، سەریان کردە سەرم کە ئێمە لەناو ئەو رێکخراوە خۆمان لایدە دەبینین، دەبێ بە زوویی بە تاکەی خۆمان هەستین و بە جەسارەتەوە بیر لە دواڕۆژی خۆمان بکەینەوە..! بەڵام ئەوە بۆ هەندێکمان هەر قسەی دەمی توڕەیی بوو. ئێمەش کۆمەڵەمان بەماڵی خۆمان دەزانی، وا خۆمان تاودابوو کە کۆمەڵە دەکەینە رێکخراوی بێ ئەملاو ئەو لای کرێکار و زەحمەتکێشانی باشووری کوردستان. بۆ راستە رێگای بیروباوەڕە شۆڕشگێڕانەکەی ئارام ـ ی دەگێڕینەوە کە لەو دەمیدا سەرچاوەی لە فەلسەفەی مارکسیزم ـ لینینیزم گرتبوو. بەڵام دیسانەوە ئاشەوان

لە خەیاڵەکی و ئاش لە هەوارەکی دی ..! ئێمە ئەو جۆرە خەڵکە بە حەقیقەت لە گوێی گادا پرخەی خەوێمان دەهات. ئارام لە ژیاندا نەمابوو، خاوەن سەرکردەیەکی پەرجوی وەک ئەو ئاسامان نەبوو، کەسایەتییەکی سەقامگیری وێنەی ئەو، بە ئیستقامە و هیمەتی لەبن نەهاتووی رۆژانی تەنگانەی وەک ئەو لە گۆڕیدا نەبوو. بەڵکو تەنیا بۆدی کۆمەڵەش بە رووکەش وەک ئەوەی رۆژەکانی ئارام سازی دابوو، نەمابووەوە. ئەو جۆرە سەرکردایەتییەی هەنوکە (ئەو رۆژە) لە پەنا ئەزموونی دێرینەیان نەوشیروان و فەرەیدون و دەورووبەرەکەیان و بە پاڵپشتی راستەوخۆی مام جەلال، نەخشەرێگایەکی زیرەکانەیان بۆ بەرئەنجامدانی چارەنووسی کۆمەڵە مشتوماڵ کردبوو، کە ئێمەمانان نە درکمان پێ دەکرد و بگرە لە پەراوێزەوە تۆزەکەیشمان نەدەشکاند و لە کاروانی تەلاشی بێهودەدا تەقە تەقی سەرمان دەهات..!

بەستنی دووەم کۆنفرانسی کۆمەڵە لە خڕی ناوزەنگدا. زەنگی بردنەوەی ئەو بەرنامەیە بوو کە نەوشیروان بە لێهاتوویی خۆی لەو مەیدانەدا بەرێوەی برد. لە هەندێ شوێنی دیکەی ئەو یادەوەرییانەدا، کەموزۆر قامکم لەسەر ئەوە داناوە، کە لە ئەجندای زاڵبوونی نەخشەی نەوشیروان بەدوای کۆنفرانسی یەکەوە، لە دەستەبەرکردنی پشتگیری کادرە پێشمەرگەییە دێرینەکانی بزافی چەکداری شاخەکاندا، بە ئاشکرا نیشانەی خۆی پێکابوو. لەو کۆنفرانسەی دووەمیشدا، نۆرە هاتبووە سەر پەرێز بژێری ناو لەشکری کادرە سیاسی و رێکخراوەییەکان. هەروەک برادەرانی بەژیان زیندوو، بەدوای کۆنفرانس ــع. د و. ح ــ کە هەردووکیان لەسەر بەدالەی تەلەفۆنی راکێشراوی نێوان بنکەکانی سکرتێری یەکێتی و کۆمەڵە کاریان دەکرد، بۆیان گێڕامەوە.. کە لە هەموو پلان و هەنگاونانەکاندا، بۆ داماڵەخاسکردنی کادرە بزێوەکان ــ کە زۆرتر بە عیراقچی ناوزەد کرابوون ــ نەوشیروان و مام جەلال بەردەوام راوێژیان بە یەکتری کردووە. لە هەموو بڕیارێکی گەورە و بچوکی کۆنفرانسدا پرس و رایان تەواوکەری یەکتری بووە. بەڵام بۆ مێژوو مام جەلال لەو هەنگاوهەڵگرتنانەدا، بۆ پاکتاوکردنی ئەو توخمانەی نیشانەی گومانی نەوشیروان و برادەرانی زیندانی بەدواوە بوو، نەرمونیان تر و بگرە لەوێ دەمیشدا، مایەی هێمن کردنەوەی ئەو برادەرانە بووە لە وەی دەست بەتاڵ نەبن بەدوای پاکتاوکردن و تڕۆکردنی یەکجارەکی توخمە سەرپزێوەکانی کۆنفرانسی دووەم و ئەوانەی دەورووبەریان، ئەوانەی بە کاری دیکە سەرقاڵ کردووە. هەنوکەش لە بیرمە

لەسەر رەخنەگرتن و هاتنەدەنگی چەند ئەندامێکی کۆنفرانس لە نموونەی مەلا بەختیار، سالار، هاوڕێی کۆچکردوو خولەکەشکۆڵ، ئەز. هتد لەلایەن هەواداری نەوشیروان و فەرەیدون گەلەکۆیی کران و کۆنفرانسی تووشی کێشەی لە یەک دابڕان کرد، بەڵام دیسانەوە مام جەلال بوەوە فریادڕەس و کۆمەڵەی بۆ بەردەستی کاکەنەوە بە سەلامەتی قوتار کرد و هەموو لایەکی رازی کرد بەوەی کۆمەڵە بە یەکگرتوویی کاری خۆی بکات.

هەر بۆ نموونە لە یەکێک لەو رۆژانەی لەگەڵ چەندان لە ئەندامانی کۆنفرانس لەسەر بە ئەندامیبوونی کورە ئاغایەک بە ئەندامی کۆنفرانس، تووشی قڕە و دەمەتەقێ هاتبووین.من و مەلاغەفور، مەهدی کاوانی، حاجی ئەکرەم، قاسم کرێکار، وەرزێر... بۆ نارەزایی دەربڕین لە خێمەکە مابوونەوە و ئەو رۆژە بەشداری کۆبوونەوەکانی کۆنفرانسیان نەکرد. مام جەلال کە لە کۆبوونەوە لەگەڵ نەوشیروان لە پەراوێزی کۆنفرانس دەگەڕایەوە، هاتە بەردەمی خێمەکەمان و بانگی دەرەوەی کردین و کەوتە دواندنمان و دڵدانەوەمان و گوتی، کە ئەو پشت و پەنای هەموو کورە تێکۆشەرەکانی رۆژانی تەنگانەی کۆمەڵەیە، بەڵام، بەناو ناوی بەندەی هێناو گوتی؛ حاجی مەمۆ من هەر هەتا سۆسیالیزم لە سەنگەری ئێوەی کۆمەڵەدام، بۆ کۆمۆنیزم لەو کاروانەدا نیم کەچی ئێمە لەوە تێنەگەیشتین، مام جەلال لەوێ رۆژێدا روحی یەکێتی و بزاڤە چەکدارییەکەیە.

لەجیاتی ئەوەی ژیرانە هەوڵی بێلایەنبوونی بدەین لە بۆربۆرینی نێوان رەوتەکانی تازە جۆرەرەی بیرکردنەوە ناتەبایەکانی مەسولەکانی کۆمەڵە، ئێمەمانان لەو بوارەوە، بێمنەتانە بە هەڵسوکەوتی توندڕەوانە و نەخوێندنەوەی ئەو لە بڕیارە چارەنووسسازەکاندا، بە بانگاشەی سەیروسەمەرەی خوردەبورژوای منداڵکارانە، ئەویشمان لەشانی نەوشیروان و رەوتەکەی دابووە بەر تەشەر و شەڕی دۆڕاومان کرد.

به کورتی دووەم کۆنفرانسی کۆمەڵە، وێستگەیەکی دیکەی داماڵینی ئەو رێکخراوە بوو، لە پاشخانە ئایدیۆلۆژییەکانی م.ل کە کاتی خۆی کۆمەڵەی لەسێبەر دامەزرابوو. بە تایبەت لە بواری کادر و ئەندامە هەڵسوراوەکانی رێکخستن، لەگەڵ تەواوبوونی کۆنفرانس ئاڵوگۆڕی بەرچاوی تێدا ئەنجام درا. لەپێناوی دەستەبەری بەرمەیدانبوونی خواستی تەواوی بەڕێوەبەری سەرەکی کۆمەڵە، نەوشیروان لەوەی جلەوی کار و کردەوەکان لەسەرەوە بۆ خوارەوە بە دڵی ئەو بێت..

هەر بۆ نموونە لە یەکەم ڕۆژەکانی تەواوبوونی ئەو کۆنفرانسەوە، بە خێرایی یەکەم هەنگاوی سەروگوێکردنی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە و دوورخستنەوەی هەڵسوڕاوی سەرەکی ئەو ڕێکخراوە لە ناوچەکانی هەولێر جێبەجێ کرا و لە مەیدانی ڕێکخراوەیی کۆمەڵە بە پارەسوان دوورخرایەوە.

ئەوە بوو ئەز بە بەشداری جەمال تاهیری بەرپرسی نوێی مەکتەبی ڕێکخستنی ئەودەمی کۆمەڵە، دەور تەسلیمی کاروبارەکانی ڕێکخراوەییم لەگەڵ برایم سەید غەفور ئەنجام دا، کە بە شێوەیەکی کاتی بۆ سەرپەرشتی کردنی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە دیاری کرابوو.

ئەو دەم تەندروستیم لەو پەڕی شەنگوتاقەتدا بوو، تەنیا چاویلکەی پزیشکی نەبێت، هیچ کەموکوڕییەکم نەبوو، بۆ خەباتکردن و کۆششی ڕێکخراوەیی لە شانی ئەو کۆمەڵە هاوڕێیەی بەدڵ و گیان، لە پەراوێزی ئەو بزاڤە چەکدارییە سەختەدا، دەسرازەی هاوڕێیەتییەکی ڕوحییمان لە پەیوەندی بە یەکترییەوە سازدابوو. بەڵام چ لەگەڵ غەدری مەسول و _بەناو هاوڕێیەکانی _ ئەو کاروانە سەر بە گۆبەندە دەکەی، کە هەڵسوکەتە دەستەگەرییەکانیان مایەی نیگەرانییەکی قوڵ بوون، بە جۆرێک تووشی خۆخواردنەوەیەکی دژواریان کردبووم. دوای لێکدانەوە و گفتوگۆ لە پێشەوە لەگەڵ هاوڕێیەکانی دەوروبەرمەوە، کەوتمە سەر باسوخواسی نووسینی نامەی وازهێنان لە کۆمەڵە و یەکێتی و گرتنەبەری ڕێگای خۆئامادەکردن بۆ سەفەری ئاوارەبوون لە خەبات و بزاڤی چەکداری. چونکو ئەو دەمیش لەو مەزندەیەدا بووم کە ئەو کاروانەی بەرخۆدان بە دەیان ساڵی دیکەش بەردەوام دەبێت. بەدوای خوێندنەوەی نامەی ئیستقالەکردنەکەم بۆ هاوڕێیان حاجی ئەکرەم و مەلاغەفور و وەرزێر و مەهدی کاوانی. وەک ڕێزگرتنێکی گیانی هاوڕێیانە، بردم تەسلیمی مەلا بەختیارم کرد، بەدوای هێنان و بردنی هەندێ بینەبەردەی نێوانمان، لەسەر ئەوە ڕێکەوتین بۆ ماوەیەک سەفەری ناوچەکانی خوارەوە بکەم، هەرکە گەڕامەوە زۆرتر قسەی لە بارەوە دەکەین، بەڵام ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی نامەکە جارێ لە لای خۆی گلبداتەوە و بۆ ناوەندی کۆمەڵە بەرزی نەکاتەوە.

# سەفەرێکی بەپەلە و بڕیاری بلەز

پێش ئەوەی بکەومە تاوتوێکردنی سەروبەندی کارکردنم لە مەڵبەندی سێی یەکێتی لە گوندی وەرتێ. باس لە وردە شتە لاوەکییەکانی خۆم بەدوای کۆنفرانسی دووەوە و سەفەرکردنم بۆ ناوچەکانی خۆشناوەتی، دەشتی هەولێر دەگێڕمەوە. ئەو ماوەیە کە لە بنکەکانی ناوزەنگ مابوومەوە و زۆربەی هاوڕێیە هاوبیرەکانم بۆ ناوچەکانی هەولێر گەڕابوونەوە. لەو دەرفەتەدا بە هۆی ناتەواوی دۆخی ددانەکانی مەلا غەفور، زۆربەی کات سەرمان بە یەکەوە نابوو. بە یەکەوە سەفەرێکی خێرای میراوێی ڕۆژهەڵاتی کوردستانمان کرد. بەفر ڕێگاوبانەکانی گرتبوو، بە پێ ئەو ڕێگایەمان لە چوون و هاتنەوە کوتایەوە. ئەو دەمە من برادەرێکم بە ناوی هوشیار فەتاح، سڵاو لە گیانی، لە گوندی میراوێ بۆ خۆی وەک هاوڵاتییەکی ئاسایی نیشتەجێ بوو. لە باڵاخانەیماڵێکەوە ژوور و هەیوانێکی بە کرێ گرتبوو. چەند ڕۆژ و شەوان لە لای ئەو برادەرەمان بەسەربرد. هەتاکو مەلا غەفور چارەسەرکردنی ددانەکانی تەواو بوو. هەر کە گەیشتینەوە بنکەکانی ینک، بە هۆی سەرماوسۆڵە و هاتنی بەفر بواری لەناو خێمە نەمابوو. بەسەردا منیش کتوپڕ خراپ نەخۆش کەوتم. لە قوژبنێکی بنکەکەی دەستەی پێشمەرگەکانی مەلا بەختیاردا، جێگایەکیان بۆ ڕاخستبووم. هەموو جەستەم لەناو ئازاری دەگەوزی. مەلا غەفور بە هیمەتی خۆی، هەندێ داو و دەرمانی لەو نەخۆشخانەیەی شۆڕش لە قولە هەرمێ بۆ هێنام. بەدوای چەند ڕۆژێک سەرم ڕاستکردەوە و بۆ ئێوارەکەی لە گەرماوەکەی ماڵی مەلا بەختیار خۆم شوشت. بەڵام چ خۆ شوشتنێک کە لە گەرماوە ساردبوەکەوە هاتمە دەرەوە، مەلا بەختیار ڕووبەڕووم دەهات و گوتی.. ئەوە سەروگوێلاکت هەر بەکەفە و چجۆرێک خۆت شوشتوە..! ئێ خۆ پێی ناڵێم، ئاو و گەرماوەکە ساردببوەوە و ئۆقرەم نەگرت. نەوەک دووبارە نەخۆش بکەومەوە، بە بێ دەنگی ڕامکردە سەرەوە و پاڵتۆیەکی گەرمی ئەمریکیم هەبوو کە هەڤاڵ کوێستانی پێشکەشی کردبووم. خێرا لەبەرم کرد و هەتا گەرم بوومەوە، خۆم لەناو پێخەفەکە لوول دا، کە ڕاستبوومەوە و مەبەستم بوو بزانم بۆ ئاو و گەرماوەکە سارد ببوەوە. خۆ بە ڕۆژەکەی پێشمەرگەکان یەک قۆمەتە داریان بۆ داگیرساندنی ئەو گەرماوە کەلەکە کردبوو. یەک دووانێکی پێشمەرگەکان بە چرپە تێیانگەیاندم، دیتمان هاوڕێ __ ر __ دارەکانی لە ژێر ئاگردانی گەرماوەکە کێشایەوە و لە بن بەفرەکەی ڕاکرد و دووکەڵەکەی بەری ئاسمانی گرتبوو.! ئەگەر

گەرەکت بوو جارێکی دیکە لێرە گەرماو بکەی، لەگەڵ ئێمە وەرە سەر چەمەکە و خۆمان ئاوت بۆ گەرم دەکەین. رۆژی دواتریش لەگەڵ مەلا غەفور بە بەردەمی ماڵەکەی مەلابەختیار شۆڕدەبووینەوە بە مەبەستی پیاسەکردنێک بۆ ئەو فرۆشگایەی لە قاسمەڕەش هەبوو. کە نزیکەی سعاتێک لە ناوزەنگ دوور بوو لە ئاقاری رۆژهەڵات. مەلا بەختیار لە بەردەرگای ماڵەوەیان کە چاوی پێمانکەوت بەندە بێچەکم، یەکسەر بانگی کردین کە بۆ کوێ دەچین، بەدوای وەڵام وەرگرتنەوەکەی گوتی.. راوەستن حاجی مەمۆ ئەو دەمانچەی خۆم ببە و با بێچەک نەبێت. چونکو بە راستی تاقەتی تفەنگ هەڵگرتنم نەبوو، لەسەر سووربوونی مەلا غەفور و بۆ کڕینی هەندێ پێداویستی سەفەری چوونە ناوچەکانی خوارەوە، دەبوو بۆ قاسمەڕەش بچین. کە مەبەستم بوو لە رۆیشتنیش خۆم تاقی بکەمەوە. بەرەبەری نیوەڕۆ گەیشتینە شوێنی ناوبراو، کە بریتی بوو لە زنجیرەیەک دوکانی جلوبەرگ و پێڵاوی هەمە جۆرە و کەرەسەی چەک و تەقەمەنی و خواردەمەنی، خواردنەوەی مشە، لەپاڵ چەندان لۆقلتەی گەورە و بچوک، کە زۆربەی خواردنەکانیان ئێرانی بوو. من لە لۆقلتەیەک دانیشتم و مەلا غەفور و چەند پێشمەرگەیەکی دیکە کە لە ئیعلامەوە لەگەڵمان هاتبوون. هەموویان بەناو دووکانەکان وەربوون بۆ کەلوپەل کڕین.

لە بێتاقەتییان پشتم کردەوە و بە ئیزن وەرگرتن لە کابرای خاوەنی لۆقلتەکە، لە سەر تەختەکە بۆی راکشام و بێدەم بووژانەوە بووم، برادەران بێداریان کردمەوە. بە یەکەوە لەسەر گیرفانی مەلا غەفور سەر و نەفەرێک چلوخورشتمان نۆش کرد. بەدوای چای خواردنەوە و وێرکردنی پارەی خواردنەکەمان، من لەو شوێنەی پاڵکەوتبووم، دەمانچەکەم لەژێر سەری خۆم دانابوو. هەر لە بیرم نەمابوو من دەمانچەم بە قەدەوە بووە. بارتەقایەکی چاک دوور کەوتبووینەوە، کاتێک بەدوای دەست بە ئاو گەیاندن، پشتێنەکەم لە پشتێم دەسوڕاندەوە، ئەوجا دەمانچەکەم بیر کەوتەوە و زۆر نیگەران بووم. بە هەر جۆرێک بوو، من و مەلا غەفور بە هەڵەداوان بەرەو لۆقلتەکە گەڕاینەوە. لە رێگا مشتوماڵی ئەوەمان بوو، ئەگەر کابرا نکۆڵی کرد لە بەجێمانی دەمانچەکە، پارەکانی گیرفانمان دەژمارد کە بەڵکو بەشی ئەوە بکات، دەمانچەیەکی دیکە بکڕینەوە. لەگەڵ ئەو بیرکردنەوانەمان، گەیشتینە بەردەم دووکانەکەوە، کەس دیارنەبوو، بەڵام من بە هەناسەبڕکێ یەکسەر بۆ ئەو شوێنە چووم کە لێی پاڵکەوتبووم، تەماشام کرد دەمانچە و رەختەکە بۆ لای پشتەوەی کورسییە درێژۆکانیەکە شۆڕ بوونەتەوە. پڕ بە دەم هاوارم لە

مەلا غەفور کرد، کە بۆ دیتنەوەی خاوەنەکەی دوور کەوتبوەوە. وەک ئەوەی نەبام دیتبی و نەباران، دەمانچەم بەسەر پشتێنەوە بەست و بەدوای مەلا غەفوردا سوڕامەوە، باش بوو لە پێچی یەکەم لە دوورەوە بەدیم کرد، کە هێشتا کابرای لۆقلتەچی نە دۆزیبوەوە. کە دیتی دەمانچەکەم بە کەلەکەوەیە، بۆم پێکەنی و دڵخۆشی خۆی دەربڕی لەوەی ماڵی پاک بە ئاسانی نافەوتێ..! لە گەڕانەوەماندا بە یەکێک لە پێشمەرگەکان دەمانچەکەم لەگەڵ کورتە نامەیەک بۆ مەلابەختیار بە سوپاسەوە ناردەوە. بۆ شەوەکەی بۆ گوندی زەڵێ شۆڕبووینەوە و لە لای خولەکەشکۆڵ و پشکۆ نجمەدین ماینەوە. هەر لە بنکەکانی ئەوێ تووشی سۆرانی مەسیحی بووم. بەدوای چاکوچۆنی باسی ئەوەی بۆ کردم کە بەیانی لەگەڵ مەفرەزەیەکی هەرێمی حەوت بۆ ناوچەکانی خوارەوە دەڕۆن. ئەوەبوو مەلا غەفور و بەندەش لە کات و شوێنی دیاریکراو بە تێکەڵی ئەوان ملی ڕێگامان گرت. سۆران و مەلا غەفور و ئەز بەردەوام بەدوای یەکترییەوە ڕێگامان دەکرد. مەبەستی دیاری من لەو سەفەرە، دەستەبەرکردنی هەندێ پارەوپول بوو لەلایەن کەسوکارەکەم بە نیازی سەفەری دەرەوەی وڵات. ئەوجا ساغکردنەوەی بەڵێنی نێوان خۆم و نەجیبەخان بوو کە هێشتا هەر لە گوندی ئاڵانە لەگەڵ سائیرەی ئامۆزای سۆران وەک مامۆستای قوتابخانەکە مابوون. پاشان وەرگرتنەوەی هەندێ وردە شتی تایبەتی خۆم لەگەڵ ئەرشیفە بچکۆلانەکەم، کە-لە لای خاڵە کاکەی گوندی نازەنین شاردبوومەوە. لە گوندی وەرتێی بناری چیای کارۆخ، چەند شەوێک لە ماڵی تەیب و عەوڵا شێخە و حاجی شێخە و سمایل وەرتیمان بەسەر برد. ئەو ڕۆژەی لە ماڵی حاجی شێخەوە بە ڕێگای کوێستانی مەکیدا سەردەکەوتین، لە نیوەی ڕێگا سۆرانی مەسیحی کتوپڕ تووشی ڕشانەوەیەکی سەیر هات و لەو شوێنەدا وەک تەڕاش بەزەوییەکەوە نووسابوو. بە یەکێک لەو پێشمەرگانەی لەشانمان بوون، کورتە نامەیەکم بۆ دکتۆر زریان کە لە وەرتێ بوو، نووسی و دەربارەی دۆخی سۆران، داوای هاوکاری و بە دەنگەوە هاتنم لێ کردبوو. کەچی خۆی لێ نەبان کردبوو، بەڵام برادەرێکی معاون پزیشکی خۆم لەوێ دەبی کە ناوی جەعفەر بوو، کە ئەو نامەی منی دیتبوو، مەردانە بەهانامانەوە هات و فریای سۆران کەوت. دوای پشکنینی سۆران، دەرزییەکی لێدا. پاش چەندێک سۆران چاوی هەڵهێنا و لە دەست و قاچەکانی کەوتە جولەوە. دکتۆر جەعفەر ڕێنمایی ئەوەی کردین کە سۆران دەبێ بۆ چەند ڕۆژێک بحەسێتەوە و پشکنینی تەندروستی زۆرتری

دەوێ. هەروەها بەڵێنی ئەوەی پێدام کە بەدوای دڵنیابوون لە تەندروستی بۆ دوو ڕۆژی دیکە، خۆیشی دێتە ناوچەکانی خۆشناوەتی و سۆران لەگەڵ خۆی دەهێنێ. ئەوەبوو گوندی مێرگەسەرمان بۆ یەکتر گرتنەوە نیشان کرد و سۆرانمان کردە ئەمانەتی دوکتۆر و خۆمان ملمان بە ڕێگا وەنا. بەراستی هەردووکمان، من و مەلا غەفور بۆ سۆران زۆر بەپەرۆش بووین، ئێمە لە گوندی ناوبراو لە ماڵی حاجی تایەر دوو ڕۆژەکە چاوەڕوانمان کرد، تاکو ڕۆژی سێیەم لە گوندی چیوەی حاجی سەلام پێمان گەیشت.

سۆران گەرەکی بوو بە زووترین کات خۆی بگەیەنێتە گوندی ئالآنە و لە ڕێگای سائیرە خانەوە و نەجیبە لە من هانبدەن، کە بواری سەفەرکردنی دەرەوەم لێ بگرێ. بەڵام من بۆم روون کردەوە، جارێ مامۆستاکان بۆ پشووی نیوەی ساڵ چوونەتەوە شاری و جوابم بۆ نەجیبە ناردوە لەگەڵ سائیرە خان، دوو سبەی لەگەڵ دایکم و چیای کوڕم، بێنە گوندی کاموسەک و لەوێ یەکتری دەبینین. تکا دەکەم خۆت بەوە سەخڵەت مەکە، کە بتوانن کاریگەری بخەنە سەر نەجیبە و ئەو لە سەفەرکردن پەشیمانم بکاتەوە..! شەوەکەی درەنگ خۆمان لە گوندی سکتان گرتەوە، لە ڕێگای دۆستایەتی مەلا غەفور لە هۆدەیەکی لاچەپی خانەخوێکی شەوەکەمان بە ڕۆژ کردەوە. بەیانی زوو بە باریکە ڕێگای بەردەم سۆرکی بەرانبەر گوندی نازەنین، دەمە و چێشتەنگاو لەباخچەکانی سەر ڕێگای سناوە پشوویەکمان وەرگرت. چەند جوتیارێک خەریکی ڕنینی دوا بەرهەمی هەناران بوون. مەلا غەفور و ئەزیان بە چاکی دەناسی. بۆ قاوەڵتیکردنی دانی بەیانی خۆمان کردە هاوبەشیان و ئەوەی بۆمان دانرا، دەستمان نەگێڕایەوە. پاشان لەسەر خەرمانی قۆمەتە هەناران، سەرو دوو هەنارمان هەڵگرت و بەرەو ماڵی خاڵەکاکە بە ڕێ کەوتین. سۆران مەسیحی لەگەڵ خاڵەکاکە سوحبەتیان هەبوو، ئەوانیش هەر لەناو باخچەکەی خۆیان بوون، لاماندایە لایان و یادیان بە خێر سۆران لە دوورەوە بە قسەکردنە توزاوییەکانی، بەو زمانەی دەیزانی، شاراوی بۆ خاڵەکاکە و خۆشناوان برد. خاڵە کاکەش لە وەڵامیدا گوتی.. خودا بە قوربانی حاجی مەمۆ و مەلا غەفورت بکات. هەی گاوری مەلعون، لەبەر ئەوان ناکرێ سەگانت تێبەربدەم..! دوای حەسانەوە و قسەوباسی ئێرە و ئەوێ، خاڵەکاکە لەو هەواڵانەی سەبارەت بە کۆنفرانس بیستبووی، نیگەران بوو، هەر دەیگوت و دەیگوتەوە.. ئەو کۆمەڵە و پێشمەرگایەتی و شۆڕشەشمان

چش... چش. مادام قسەی کوڕە ئاغایەک بەسەر قسەی تێکۆشەرێکی شۆڕشگێڕ سەربکەوێ..!

دروست مەزەندەکەشی هاتە دی و کۆمەڵە کرایە پارووی ناو باینجانان..! من کەمونزۆر هەوڵی هێمنکردنەوەم دەدا، کە گرنگترین شت ئەوەیە کۆڵنەدەین و بە چاولێکەری ئارام کە لە رۆژە تەنگەکان باری کەوتووی کۆمەڵەی راستکردەوە. دەبێ رۆڵە شۆڕشگێڕەکانی هەنوکە، باری لەنگی کۆمەڵە مشتومالّ بکەنەوە. قسەکان زۆر بوون، بەس لەو بارەوە هەموویانم لە بیر نەماون. پاشان فرسەتم وەرگرت و خاڵەکاکەم جیا کردەوە و داوام لێ کرد.. کە ئەو کەلوپەلانەی لەگەڵ ئەرشیفە بچکۆلانەکەم بۆ بگێڕێتەوە. سەیرم کرد خاڵەکاکە رەنگی گۆڕا و بە تورەیی پرسی، بۆ تۆ کەست نەناردوە کە ئەو شتانەی تەسلیم بکەم..! گوتم نەخێر. بۆ کەس بە ناوی منەوە ئەوەی کردووە..! خاڵە کاکە دەمودەست گوتی.. بەڵێ ئەو برادەرانەی کەرتی شەقڵاوە کە لەگەڵ هێزەکەی م خ بوون، یەکێکیان بەناوی م. ب. م بە پرتاوی هاتە لام بە ناوی تۆوە پڕێسکەکانی تۆیان لێ داوا کردم. منیش بێجگە لەوانەی لەناو باخچەکە شاردومانەتەوە، ئەوانەی لە ماڵەوە بوون لە بەردەستم دانان. ئەو کەسە بە خێرایی هەموو پڕێسکەکانی کردەوە و دوو سێ شتی لێ هەڵبژاردن و گوتی.. حاجی مەمۆ داوای ئەوانەی کردووە و بۆی رەوان دەکەین..! لێوی خۆم گەست و لە دەمم دەرچوو.. پەکو نامەردیش بەو جۆرە..!

خاڵە کاکە گوتی... کاکە خەمت نەبێ، خۆم قورگی دەگرم و لێی وەردەگرمەوە. کە تەماشای سەرلەبەری کەلوپەلی ناو پڕێسکەکانی خۆم کردەوە، سەیرم کرد پاسەپۆرتە عیراقییەکەم و نوسخەی ئۆرگینالی بڕوانامەی دەرچوونی زانکۆکەم کە سێ دانە کۆپیکراویشی لەگەڵ بوو، لە شانی دوو لەو دەفتەرانەی سەبارەت بە کار و چالاکی هەڵسورانی کەرتی رێکخستنی شەقڵاوە لەگەڵ دەفتەرێکی سەدپەڕی پڕکراوە لە سەربردە و قسەو بەسەرهاتی هەندێ لە پیاوە جوامێرەکانی ئەو گوندانە بوون، کە شەوانە لەتەکیان گفتوگۆم کردبوو. بە داخەوە ئەوانە دیار نەمابوون. ئیتر وەک ئەوەی ئاوی ساردم پێدا بکەن، لە جێگای خۆم گۆج بووم. خاڵەکاکە بن هەنگلی گرتم و راستی کردمەوە و بە وردە هەنگاوان خۆمان گەیاندەوە، ناو برادەرانی دیکە و ئەو شتانەش مابوون، خاڵەکاکە بە شانی خۆی دادابوو. ئەوانیشمان لە پەنایەکی ناو باغەکەی لەناو تەنەکەیەک شاردەوە کە هەر خۆی و بەندە پێی دەزانی. لەو هاتوچوونەدا قەناعەتم پێ

کرد، کە ئەو جوتیارێکی ئەو گوندەیە، خۆی لەسەر ئەو شتانەی من خراپ نەکات. بەڵام شەوەکەی بۆ من، یەکێکی تر لەو شەوە دۆزەخییانەی ژیانم وێنابوو، سەرتاپای هیواو ئومێدم بۆ کەندەلانی نائومێدی گلۆر بوەوە، بەڵام بەسەرخۆم نەهێنا. بەڵکو لە لای خۆمەوە لەناو دەروونی خۆمدا بڕیاری ئەوەم دا.. کە ئیتر شان بە شانی هاوڕێیەکانم، ئەوانەی دڵ و گیانمان لەگەڵ یەکتری بوون، سەرەتای کاروانێکی نوێ دەست پێ بکەم و سەرلەنوێ تێهەڵبچمەوە. وەک ئارام گوتەنی، نوچدان رەتبکەمەوە.

مەلا غەفور وەک مرۆڤێکی دنیا دیتە لە پەشۆکاوی و ناڕەحەتیم گەیشت، کە کەلوپەلەکانیان بردبووم و زۆری دڵدامەوە. هەتا لەگەڵ سۆران خۆیان بۆ تۆڵەسەندنەوە دەهێناودەبرد، بەڵام خۆم ساردم کردنەوە. نیوەڕۆ بوو ئەو چەند پێشمەرگەیە، بەرەو گوندی کاموسەک دەسرازەمان بەست. کە گەیشتینە سەرجادەکە، هاوڕێ مستەفای زاوای خاڵەکاکە، لە دوورەوە دەستی لێ هەڵدەتەکاندم، کە بچمە ماڵی ئەوان. رۆژێکی سارد و بەفراوی بوو، خۆمان گرمۆڵە کردبوو، لە ماڵە پەڕپوتەکەی فاتانخان و مستەفا داوەراینەوە. میوانەکان.. دایکم بەبێ چیای کوڕم، لەگەڵ سائیرە و نەجیبە دانیشتبوون. بەدوای چاکوچۆنی ئەوان بە پەلەبوون، یەکسەر لەو خواردنانەی لە شارەوە هێنابوویان، سەر سفرەیان قەرەبالغ کرد. بەڵام من فرسەتم هێنا و لەگەڵ نەجیبە لە پەنایەک فسکە فسکی خۆمانمان کرد. بلەز سەرلەبەری باسوخواسەکانم بۆ گێڕایەوە، هەروەها دوا بڕیاری دەروونی خۆشم لەپێش دانا. لە بیرمە پێی گوتم.. من حەزم لەوەیە سەفەری دەرەوە بکەی، من لەسەر گفتی خۆم بە زیندوویی مانەوەت پرچی خۆم لە چاوەڕوانیت سپی دەکەم..! گوتم نەخێر تازە سەفەر ناکەم و وەک چقڵی چاویان دەمێنمەوە. دایکم هەندێک پارەی بۆ پەیدا کردبووم کە دەمزانی لە کێی قەرز کردبوو، پارەکانم لێ وەرنەگرت و بە تەڕ دەستی هەموویانم بە یەکەوە ناردنەوە. لەگەڵ بەرێکردنیان، بۆ شەوەکەی لە ماڵی دۆستی مەلاغەفور، حاجی سمایل ماینەوە. مەلا غەفور یەکێک لەو کادرە بە دەگمەنانە بوو، کە پەیوەندییەکی پەرتوبڵاوی کۆمەڵایەتی بە خەڵکی گوندەکانەوە ساز دابوو. لە هەر ناوچەیەک و بگرە گوندێک بۆ جاری یەکەمیش رێی تێبکەوتایە، پەیوەندییەکی پڕ لە رێز و دۆستایەتی لەگەڵ چەند کەسێکی ئەو گوندە بەجێدەهێشت، مەگەر قادر مستەفای حسک، لە ناوچەکانی هەولێر، لەو جۆرە پەیوەندییە فراوانەی بە خەڵکەوە هەبووبێت..

## وێستگەیەکی تری یادەوەرییەکانم

بەدوای دوورخستنەوەم لە کاروباری ڕێکخراوەیی لە ناوچەکانی هەولێردا، سەرجەلەی یادەوەرییەکانم بۆ ئەزموونێکی دیکەی بواری میدیایی و ڕۆشنبیری هەڵدەکەمەوە. لەو ساڵەش کە بەدەم کۆشش و هەوڵدانیکی بێوچان و هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەک مرۆڤی بیر ڕۆشن و هاوکار، دەستەویەخەی خزمەتکردنێکی پڕ لە سەرێەشەی ئێرە و ئەوێ کارمان کرد و وردە وردە بە گێڕانەوەی ئەوان ڕۆژان دەستتان دەگرم، تاکو لە نزیکەوە بە ماندووبوونەکانمان ناسیاربن

## مەڵبەندی سێی یەکێتی لە گوندی وەرتێ

بەدوای گەڕانەوەم بۆ بنکەکانی سەرکردایەتیی یەکێتی لە کوێستانی خرێی ناوزەنگدا. بۆ ماوەیەک باروبارگەی خۆم لە ژوورێکی مەکتەبی سیاسی یەکێتی خست و خەریکی چەند نووسینێک بووم. جاروباریش لەگەڵ مەلا بەختیار بە جووتە دانیشتین. لە بینە و بەردەی گفتوگۆکانمان بە ڕاشکاوی قسەمان لەگەڵ یەکتری کرد. کە بۆ لەمەودوا بە شێوەیەکی وریا و هێمنانە درێژە بە خەباتی خۆمان بدەین و سەنگەرەکانی کۆمەڵە بۆ کەس چۆڵ نەکەین. هەروەها لەسەر ئەوە پێداگریمان کرد. ئەوەندەی بۆمان دەکرێ لە سێبەری بزافی چەکدارییەوە، گرنگی بە خۆپەروەردەکردنی ئایدیۆلۆژی بدەین و بە نووسین ڕاستی و دروستی هێڵی بیرکردنەوەی خۆمان وەک مەڵگرێکی بیروباوەڕی ئارام ڕوون بکەینەوە. لە ڕووبەڕووبوونەوەی نەیارە فیکرییەکانمان لە ناو کۆمەڵەدا و خۆڕاگر و بە حەوسەلە بین. چونکە ئەوان بە هەموو جۆرێک گەرەکیان بوو، بە کاری دوور لە گیانی هاوڕێیانەی نابەجێ بێزارمان بکەن. بە ئیستفزازەکانی ڕۆژانەیان وەڕس بوونمان دەرخوارد بدەن و مەیدانەکانی خەباتی شۆڕشگێڕانەیان بە ئاسانی بۆ چۆڵ بکەین. دوای ئەوە لەگەڵ مام جەلال دانیشتنم و کارکردنی لە مەڵبەندی سێی یاخود چواری یەکێتیی لە ناوچەکانی هەولێر لەگەڵ باس کردم. منیش بۆ لاتەریکبوون، دوورکەوتنەوە لەناو چەقی ناتەبایی و کێشەکانی ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەیی، بۆ وەرگرتنی هیچ ئەرکێک

ئامادەی چوونە مەڵبەندی چوار نەبووم و بۆ مەڵبەندی سێ و کاروباری ئیعلام دیاریکرام.

زستانی ساڵی ١٩٨٢ بوو. مەفرەزەیەک پێشمەرگە کە لە ناویان عزەدین و عبداللە مەرزانی و گوشاد ئیلنجاخی و مەلا هاوکارم لە بیرە بە چەند فەردە کاغەز ڕێگای گوندی وەرتێمان گرت. کەلوپەلەکانمان لە دوو وڵاغ بارکردبوو. لەوێ لە مەڵبەند لەلایەن خاڵە سەید مەجیدی بەرپرسی مەڵبەندەکە بە گەرمی وەرگیراینەوە. سەرەتا هەر لە ژوورێکی بنکەی مەڵبەند لە ناوەراستی گوندی وەرتێ و لە باڵەخانەیەک کە بۆ قوتابخانە دروست کرابوو، بە شێوەیەکی کاتی جێمان گرت. ئەندامانی مەڵبەند لە سەید مەجید وەک لێپرساوی مەڵبەند، محمد سیاسی بۆ کاروباری سیاسی، ملازم فوئاد وەک مەسولی سەربازی، برایم جەلال وەک بەرپرسی دارایی، عەوڵای حاجی شێخە وەک مەسولی کۆمەڵایەتی، ئەز بۆ ئیعلامی مەڵبەندەکە. بێجگە لە بەرپرسی کۆمەڵایەتی کە ماڵی لە دۆڵەڕەقە بوو، زۆر بەکەمی لە بنکەی مەڵبەند دەمایەوە. دەنا هەموو ئەندامەکانی مەڵبەندەکە، لەو بنکەیەی مەڵبەند جێگیر بوون. بەشی ئیعلام کە لە پاشماوەی ئیعلامی کۆمیتەی هەولێر مابوونەوە. جێگە و ڕێگایەکی دیاریکراومان نەبوو. بە هیمەتی چەند دۆستێکی گەڕەکی بەرۆژ لە وەرتێ، خانووێکی سەربەخۆمان پەیدا کرد و باروبارخانەی ئیعلاممان بۆ ئەوێ گواستەوە. کارمەندی ئیعلام ئەو دەم بریتی بوون لە گوشادی برای شەهید هوشیار ئیلنجاغی، مامۆستا حەمیدی کۆیی، عبداللە مەرزانی. لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی دیکە لەو بنکەیەی گەڕەکی بەرۆژ سەرمان پێکەوە نابوو. بەو شرە کەرەستانەی هەبوون، تایپێکی مامناوەندی، دوایی سەعیدی حەمەزیادی سەرتیپی دوازدەی سۆران، تایپێکی دیکەی پێشکەش کردین. لەگەڵ رۆنیۆیەکی شەقوشڕ کە بەردەوام برادەران، حەمید و گوشاد و عبداللە دەستیان تێدابوو، زوو زوو دەشکا و ئەوان بە هیمەتی خۆیان بەگەڕیان دەخستەوە. تاکو بە هاوکاری چەند برادەرێکی شاری هەولێر پێداویستییەکانیمان پەیدا کرد. دایکە کلۆڵەکەم و رۆستەم بۆیان گەیاندینە دۆڵەڕەقە و کێشەی بەچاپگەیاندنی بەرهەمە بڵاوکراوەکانی بۆ فەراهەم کردین.

دواتر هەر لە نزیکی بنکەکەی مەڵبەند خانووێکی دوو نهۆمی چەند ژووری ڕێکوپێکمان لەسەر چەمەکەی ناوەراستی گوندی، بە هۆی یارمەتی دانی مام حاجی شێخە و عەوڵاشێخە و مەلاتەیب پەیدا کرد. ژوورەکان بەشی هەمووومانی کرد،

بەردەوامیش بنکەکەمان لە میوانی دۆست و لایەنگری جەمەی دەهات. لەناو میوانەکانمان یەکێک لە کادرە مەسولەکانی پکک بەناوی مەحمود ماوەیەک لەلامان بوو، بەبێ ئەوەی بێجگە لە خۆم و خاڵە سەید مەجید کەس بیناسی و پێی بزانی. لەگەڵ ناوبراو گفتوگۆیەکی هاوڕێیانەی بەردەواممان هەبوو، بەداخێکی زۆرەوە لە دەمی قەومانی رووداوە نەخوازراوەکانی قرناقاوپشت ئاشان لە سەرەتای ئایاری ساڵی ۱۹۸۳ دا، چەند هەڤاڵێکی خۆی لەشانی مەفرەزەیەکی حشع بەشەو هاتن، ناوبراو ماڵئاوایی لێ کردین و جارێکی دیکە نەماندیتەوە. چونکو هەر چەند رۆژێک بوو، لە رووداوەکانی قرناقا و پشت ئاشاندا، هەواڵی شەهید بوونی هەڤاڵ مەحمود و هەڤاڵێکی دیکەی ئەو حیزبەمان بیست کە کەوتبوونە بۆسەیەکی نێوان پێشمەرگە شەرکەرەکانی یەکێتی و حشع.

بنکەکەمان وەک خانەیەکی رۆشنبیری هەموو دەنگێکی موقاوەمەتی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی کوردی لێهاتبوو، هەتا دەنگە جیاوازەکانی ئێرە و ئەوێ روویان لێ دەکرد و لە پەراوێزی سەردانکردنمان، مانەوەیان بە چەندان رۆژ و هەفتە، پشوویەکی پڕ لە هەناسەدانیان وەردەگرت و زۆرجاران لە دانیشتنەکانی رۆژانەماندا، کۆڕی موناقەشەی گەرموگوڕ دەخوڵقا و یەکترمان ماندوو دەکرد. دیسانەوە زۆرتر بە هۆی مەریوان وریا قانیعەوە، بەردەوام گەمەی شەترەنج لەسەر سفرەی ئەوان گفتوگۆ هەمیشە ئامادە بوو. مەریوان لەو بوارەش لەپاڵ توانای دیکەی رۆشنبیری و زمان و مرۆڤێکی بە حەوسەلە و بەردەوام بەرچاوڕوون و دەم بە پێکەنین، شەترەنج زانێکی بە بەهرە بوو. کەسمان لە گەمەی شەترەنج دەرەقەتی نە دەهاتین. هەندێ لە برادەری ناسیاری کۆنینەی شاری هەولێری خۆم، کە لە ئیعلامی حشع کاریان دەکرد، جاروبار دوور لە چاوی نەیارەکانی ناوخۆمان، بە پەنادزە ئاوڕیان لێمان دەدایەوە، پەیوەندی دۆستانەی لە مێژینەمان بەردەوام بوو. هەر بۆ نموونە جارێکیان لە رێگای شەماڵ حەوێزی، بە کورتە نامەیەک خوازیاری ئەوە بوون کە ئەگەر دەتوانین، بە پارەی خۆیان هەندێک بەندە کاغەزی سپی و مەرەکەبی رۆنیۆ و دەرزی فۆتۆستێنسل هاوکارییان بکەین. ئێمەش ماوەیەک بوو لە چەند لایەنێکەوە کاغەزێکی هێجگار زیاد لەپێویستمان لە لا کۆ ببوەوە، بە هاوڕێی خۆیان کە بۆ حەسانەوە شەوێک لە لامان مابوونەوە، ئەوەی هەبوو بە بارێک بۆمان ناردن کە لەپێشەوە حەقەکەیان بە زیادەوە وێرکردبوو. ئەو کارە لەلایەن پێشمەرگەیەکی لای خۆمان بەناوی _ ش _ کە وەک راپۆرتنووس لە بنکەکەمان بوو. ئەو هەواڵەی بۆ

لای ئەندام مەڵبەند ــ ب ، ج ــ دزەی پێ کردبوو. ئەویش وەک برێشکەی سەرسێلێ قۆستبویەوە و بۆ هەموو لایەکی مەسول بە راپۆرتی بوختاناوی بۆمانی تێکوشیبوو. لێرەدا تەنیا ئەو راپۆرتەی وەک نمونە دەیگێڕمەوە کە بۆ خودی مام جەلالی نووسیبوو، کە لە سەردانەکەی بۆ وەرتێ بە چاوی داداماوە.

سەرەتای بەهاری ساڵی ١٩٨٣ بوو، بەفر و بەستەڵەکی کوچە و کۆڵانەکانی گوندی وەرتێ تاوابوەوە، سەوزایی خەریکی داپۆشینی عەردویانی دەڤەرەکە بوو. لەناو ماڵانەوە سەرت هەڵدەبڕی، یەکە بە یەکەی دۆندی لوتکەکانی دەوروبەری گوند، هێشتا مەندیلیان بەسەرەوە بوو.

لە سەروبەندی کێشەکانی ناو مەڵبەندی سێدا، بەندە ئەگەر محمد سیاسی ئەندام مەڵبەند و بەرپرسی کاروباری سیاسی مەڵبەند نەبووایە، کەموزۆر خۆم لە گەنگەشەکانی مەڵبەند هەڵنەدەقورتاند، تەنیا ئەوە نەبێ بۆ پەیوەندییەکی دۆستانەم لەگەڵ هەموو کەسێک لەو مەڵبەندە لەسەر پێ بووم. بە تایبەت خالە سەید مەجیدی بەرپرسی مەڵبەند کە نێوانمان دۆستانە و مایەی خوێندنەوەی گەرموگوڕی یەکتری بوو. بە جۆرێک ماڵی ئاوابێت ئەویش کە بە هەڵوێستی دۆستانەم ئاشنا بوو، لە هەموو گەورە و بچوکێکەوە ئاگاداری دەکردمەوە و لە بڕیارەکاندا پرسی پێ دەکردم. بە تایبەت لە مامەلەکردنی پڕ لە رێزگرتن و هاوکاریکردنی ئەو دیلانەی حشع کە لەشەڕی قرناقا و پشت ئاشان کەوتبوونە زیندانی مەڵبەندەوە. لێرەدا سەرەداوی یەکێک لە کێشەکانی مەڵبەند باس دەکەم کە لەگەڵ مەلای مزگەوتی ناوەراستی گوندی بوو. ئەو مەلا چەمبەرییەی چوار ژنی لەژێر نیکاحی خۆی ریز کردبوو. لە هەمێزی دوا ژنی کە لە تەمەنی کچەکانی خۆی و، لە ژنەکانی پێشوتری گچکەتر بوو. بە جۆرێک ژنەی بەستەزمان کە ژن بە ژنی پێ کرابوو، بە هۆی مانەوەی بە کچێتی ژێر نیکاحی مەلا تۆقرەی نەگرتبوو. لە سێبەری پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ پێشمەرگەیەکی جەربەزەی زۆر ئازا — یادی بەخێر ــ ک ــ سکی پڕ ببوو. مەلای خاوەن ژنیش دڵنیابوو کە ئەو منداڵ کەوتنە سکی ئەو ژنەیەوە لە خۆی نییە و بەبێ ئەوەی شەرم بکات، گومەزەیەکی پڕ لە شەرمەزاری وەک شەرفرۆتن بە مەڵبەند هەڵچنی. بە پێی ئەو شەرعەی خۆی ساغی کردبووەوە، ژنە و کوڕەیان بە مەرگی گوللەباران حوکمدا. گەرەکیان بوو کوڕە پێشمەرگەکە تا ئەودەم لە دادگاییکردنیکی بەرسێبەری شەرعی قسەی مەلای خاوەن

چوار ژنە زیندان کرابوو. دوور لە هەر یاسایەکی مرۆڤانە گەرەکیان بوو ئەو جووتە کچ و کوڕە بە یەکەوە گوللەباران بکەن. دیارە شەوەکەی بۆ بەیانی کە ئەو جێبەجێکردنە قێزەوەنە ئەنجام دەدرا. درەنگانی شەوێ بە هیمەتی مرۆڤدۆستانەی بەرپرسی زیندانەکە، لە تاریکە شەوێکی ئەنگوست لە چاودا، کوڕە پێشمەرگەکە ئازاد کرا و خۆی گەیاندە ناو مەفرەزەکانی دیکەی پێشمەرگەوە لە بناری قەندیل. بەڵام راپۆرتنووسەکان لە لای مام جەلال بە مەبەستی شەڕفرۆتن بە من و سەریەشە دروستکردن بۆم، ئەو مەسەلەیەشیان بە تەنیا لە ملی ئەزی شەتەک دابوو. دواتر لە کۆبوونەوەی نێوان مام جەلال و خۆمدا، زیاتر بۆ باسکردنی ئەو ماجەراتە دەگەڕێمەوە و سەرلەبەریتان بۆ باس دەکەم.

## ئەمران ئەحمەد مەولود و عەزەی داودی

لە ئەزمونی پێشمەرگایەتیمدا. چەپکێک لەو مرۆڤە جوامێرانەی ناسیومن. بە لاوچاکی و ئازایەتی خۆڕسکانەی بەرخوردی سادەیی خۆیان بە دنیایەک لە فەرامۆشی ئاشنایان کردووم. یەک بە خۆم قەیاسەک کاردانەوەی پۆزەتیڤانەی ئاکاری نمونەگەلێکی ئەو تەرزە ئینسانە هەژمونی خۆیان لە هەمێزی کەسایەتیم جێگای هەبووە و بە بوێری زیاتری بێمنەتانەیان راهێناوم.

ئەحمەد مەولود، عەزەی داودی کە هەردووکیان خەڵکی گوندەکانی باڵەیی بناری زنجیرە چیای قەندیل بوون. وەک جووتە کەویاری ئازایەتی کەموێنەی دەمی لێقەومان و تەنگانە بوون. هەر لەسەرەتای ئەو کاروانەی ژیانی من، زوو بە زوو لە ناوچەکە و پێشمەرگەکانی ئەو دەڤەرە بوونە جێی سەرنجم. ئەو دووانە ئینسانی بە وەج و خاوەن دەنگ و رەنگی گران و سەنگینی خۆیان بوون. بەرچاو گەش و بێپەروا بوون لە بەرانگژبوونەوەی ناخۆشییە دەستەویەخەکان. سەبارەت بە ماڵی دنیاش چاوتێر و دەتوانم بڵێم.. سەرپەڕی مرۆڤی بێ فروفێڵ، ئەوەی لەناو دڵیان بوو، لەسەر زمانیان بوو. بە جۆرێک لە بەرانبەر هەر ملۆزمێک و مەسولێکی غەداری خەڵک ئازاردەر، بێدەنگ نەدەمانەوە و بە تایبەت لە دژی هەر جۆرە راوڕووتێکی دەمی فرسەتی دەستکەوت خۆپارێز و سەربڵند بوون. زۆریش لەگەڵ یەکتری و لەشانی کادر و پێشمەرگە جەسورە بوێرەکان، بە قامەت و هاوکار بوون. لە جێگای خۆیدا قسەی خۆیان دەکرد. لێرەدا

نمونەیەکی زیندووی ئەو کەسایەتییە بەرچاوانەی بەرگی پێشمەرگایەتی سەرەتای هەشتاکانی ئەو دوو رۆڵە سەرکەشە دەگێڕمەوە.

راستە ئەحمەد مەولود و عەزەی داودی وەک رێکخستن هاورێی کۆمەڵە نەبوون. بگرە ئەوەی من پێمزانیبی و تارادەیەکی باش لەگەڵیان تێکەڵ بووم و پەیوەندی دۆستانەم لە تەکیان گەرموگوڕ بوو. ئەو زاتانە لە هیچ رێکخستنێک رێکخراو نەبوون. بگرە تەنیا لەپێناوی خەڵکی کورد و خاکی زێدی خۆیان چەکی پێشمەرگایەتییان بە ئارەزووی خۆیانەوە لە شان کردبوو. هەردووکیان بە دڵ و گیان لە دژی شەڕی کوردکوژی ناوخۆی بێهودە بوون. ئەو هەڵوێستەیانم لە مەیدانی بەشداری کردنیان لە چەند شەڕێکی لەو جۆرە بە پراکتیک بۆ دەرکەوتبوو. کە قوچەکی پتەوی دۆستایەتییەکەمانی بڵند کردبووەوە. کەچی بە داخێکی زۆرەوە، ئەحمەد مەولود، ئەو کەڵە پیاوە لە گەرمەی شەڕەکانی بناری قەندیل لە شەڕی لەو جۆرەی ١٩٨٣ گیانی بەخشی و عەزەی داودیش لە رووداوی وەرگەڕانی ترومبێلەکەی بەدوایساڵی ١٩٩٢ گیانی سپاردووە..

رۆژێکی مانگی دووی ساڵی ١٩٨٣ بوو. لەگەڵ خاڵە سەید مەجیدی مەسولی مەڵبەندی سێی بنک لە گوندی وەرتێی بناری شاخی کارۆخدا، لەبەر هەتاو پیاسەمان دەکرد. لە ناکاو ئەحمەد مەولود و عەزەی داودی و چەند پێشمەرگەیەک بە پڕتاو خۆیان کرد بە بنکەی مەڵبەند. لە شانێ سەید مەجید بۆ بەخێرهێنانیان چوونە ژوورەوە.

هەردووکیان بە دەموچاویانەوە، رووداني شتی نائاسایی دەخوێندرایەوە. سەرەتا ئەحمەد بە دەنگێکی نووساوی تژی لە خەمێکی گەورە و بەبێ خۆ تەنگەتاوکردن، بە زمانێکی دۆستانە، بە کورت و کرمانجی رووی لە ئەز و قسەکانی بۆ سەید مەجید کرد و گوتی.. خارە سەید لە نزیکەوە دەیبیرمەوە و هەر هەنوکە دەمەوێ، خۆتان بە بێتەل لەگەڵ مام جەلال قسە بکەن. ئەگەر ئێوەش ناتوانن قسەی لەگەڵ بکەن، دەرفەتم بدەن خۆم قسەی لەگەڵ دەکەم.

ئەو دەمە مەڵبەند جیهازێکی راکالی هەبوو، کە دەتوانرا راستەوخۆ لەگەڵ سەرکردایەتی و مەڵبەندەکان قسە بکرێت. سەید مەجید و ئەز بە جووتە لێمان پرسی سەبارەت بەچی..! گوتی من بۆ بیست و چوار سەعات مۆڵەتتان دەدەمێ و دەبێ بەرپرسی کەرتی رێکخستنی چۆمانی کۆمەڵە دەمودەست ئەو دەڤەرە بەجێبهێڵێ، دەنا خوێنەکەی لە ئەستۆی ئێوەیە.

پرسیمان لەسەرچی و بۆچی..! مرۆڤێکی ئەوەندە نەفس گەورەبوو، بە زۆر لە خۆکردنەوە گوتی.. ئێمە ئەو چەکەمان لە بۆ بەرگری لە خەڵک و میللەتی خۆمان لە شان کردووە. نەوەک بۆ دەستدرێژیکردنە سەر کەرامەت و پیرۆزییەکانی ئەو خەڵکەی بەردەستمان. ئێمە لەو کەسە دەمچەفت و ترسنۆکانەش نین، چاوی خۆمان لە ئاست فلان و فیسارە مەسول شۆڕبکەینەوە کە بە ئارەزووی خۆیان پڕ بدەنە ژن و کیژەکانمان..! ئەوجا ئەو هەموو درێژە بۆ کورتەی ناوێ و بە یارمەتی خۆتان ئەو کارەم بۆ ئاسان بکەن، لەوەی کاردانەوەمان دەمودەست نەبێت.

لێرەدا عەزەی داودی بە تورەبوونێکی سۆربوونەوەی دەموچاوی، هاتە ناو قسەکان و گوتی.. کاک ئەحمەد رێگای گرتووم، کە دەستی خۆم بە خوێنی بەناو پێشمەرگەیەک سۆر نەکەم..! ئەحمەد زیاتر بواری نەدا و گەرەکیان بوو رابنە سەرپێیان و برۆن. سەید مەجید دەستی گرت و گازی شۆڕشی کوری کرد کە لەسەر بێتەلەکە بوو.

ئەوە بوو لەو دەمی مام جەلال دەست نەکەوت. بەڵام لەگەڵ نەوشیروان قسەکرا و لە دۆزەکە و هەڵوێستی ئەو پێشمەرگانە ئاگادار کرایەوە. دوای تاوێک نەوشیروان بە جفرە کورتە نامەیەکی بۆ ئەو مەسولەی رێکخستنی کۆمەڵە نارد کە هەر ئەو ئێوارە ناوچەکە بە جێبهێڵی. ئیتر لە بەرچاوی ئەو پێشمەرگانە، سەید مەجید بروسکەکەی بۆ ئەو مەسولە رەوان کرد. هەتا بەرە بەری نیوەڕۆ ئەحمەد مەولوود و پێشمەرگەکانمان راگیر کرد. بەڵام بۆ نانخواردن لەلامان نەمانەوە و گەڕانەوە سەرجادەی خانەقا. هەر ئەوەندەمان بۆ کرا بەڵێن لە ئەحمەد و هاوڵەکانی وەرگرین، کە دان بە خۆیاندا بگرن و بزانن فەرمانی نەوشیروان لە کاتی خۆیدا، دەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە.

بەر لە گەڕانەوەی ئەوان، مەڵبەند لەسەر پێشنیاری ئەزی هەردوو کەرتی عەلی کۆیلە و نەبی چالاکی بە سەرپەرشتی محمد سیاسی بۆ سەرجادەکە نارد. تاکو لە نزیکەوە چاودێری دەڤەرەکە بکەن بۆ روونەدانی کاری نەخوازراو.

دنیا لە تاریکبوون و نەبوون بوو. کەژاوەی مەسولی کۆمەڵەی ناوبراو، کە خۆی و چەند پێشمەرگەیەک بوون بەناو گوندی وەرتێدا بە تەنکێشی بنکەی مەڵبەند تێپەڕین. بەبێ ئەوەی هەتا چاو و ڕووی هەبێت، سەردانی بنکەی مەڵبەند و ماڵئاوایی بکات. رێگای سەرزینی ئەستێرۆکان و ئاودیو بوونە دۆڵەرەقەیان گرتبوو، بەیەکجارەکی لەو دەڤەرە دوور خرایەوە.

# مام جەلال و کاروبارەکانی مەڵبەند

بە یەک دوو رۆژ پێش ئەوەی مام جەلال بگاتە ناوچەکە. لە دانیشتنێکی مەڵبەندا خاڵە سەید مەجید کێشەی چەک و تفاق شاردنەوەی سەرتیپی دۆڵی شەهیدان ح. ئە _ ب هینایە گۆڕێ. کە لەلایەن دۆستێکی کۆمەڵەوە بە ناوی _ ر _ کە بە نهێنی لەو تیپەدا هەواداری کۆمەڵە بوو کە لە رێگای ماڵی کاکە جوان و هەمزە بۆڵیی کوڕانی پورەعەیشێی لاچەکبەسەر بە بەندە ناسێنرابوو. مەڵبەند لەو کارەی سەرتیپی دۆڵی شەهیدان ئاگادار کرایەوە. هەتا شەوی گواستنەوەی چەک و تفاقەکانیشی دیاری کرابوو. ئەو چەکانەی لە ناو لەشکری ئیسلامی هێنرابوو. سەرتیپی ناوبراو بە نیاز بوو بەر لە گەیشتنی مام جەلال بە فرۆشتنیان حەپەلوشی بکات. بەدوای کۆبونەوەی مەڵبەند، خاڵە سەید پیاسەیەکی لەگەڵ کردم، کە من لە شانی محمد سیاسی ئەو کارە بکەین بەو پێیەی هەردوو کەرتی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە گوێ لە من دەگرن، هاورێتیم لەگەڵ هەردوو کەرتەکە، لە رێگای مام هێدی و فەقێ محمد لەو مەڵبەندە لە هەمووان خۆشتر بوو.

رۆژەکەی سەرلەبەیانی لەگەڵ ئەو دوو کەرتەی پێشمەرگەی مەڵبەند بەیەکەوە وەک لیژنەیەکی پشکنین و بەدواداچوونی دۆزی تیپی ناوبراو بە رێ کەوتین. مەڵبەندیش بۆ رۆژی دوای نیوەرۆکەی بە گەیشتنی میوانەکە مام جەلال دەگەنە بنکەی تیپەکە، کە دروست لە دۆڵی شەهیدان لەسەر جادەکە و کۆنە هەواری گوندی زارگەلی بوو.

ئەو کۆمەڵە پێشمەرگە بە پلان لە هەموو لایەکەوە، سەرە رێگاکانی بارەگای تیپەکەمان گرت. کە هەتا کاتی نانخواردنی نیوەرۆش کەس لەو پێشمەرگانەی تیپی ناوبراو بە هەبوونی پێشمەرگەی سەر رێگاکانیان نەزانی. ئیتر بەوە خۆمان ئاشکرامان کردن کە میوانێکی گرنگ و گەورە بەیانی نیوەرۆ دەگاتە ئێرە.

ئەحمەد _ ب سەرتیپ وەک ئەوەی یەک تەنەکە ئاوی ساردی پێدا بکەن، هەموو گیانی بەسەر ئارەقە کەوت! بە تایبەت کە زانی ئێمە بۆ حەق و حیساب سەردانمان کردووە. شەویش لە دەوروبەری بنکەکەی دەمینێینەوە. بە جارێک رەنگی گۆڕا و بە پچڕ پچڕی وەڵامی پرسیارەکانی ئێمەی دەدایەوە. لە هێنان و بردنی قسەکانی نێوان خۆی و کوڕە گەورەکەی و دوو بە ناو ئامر کەرتی مەوجوودی ئەوێ، ژمارەیەک لە چەک و

تەقەمەنی دانرا و بۆ فرۆشتن لە سەرکردە ماڵ و هەندێکی زیادەشمان رەوانەی مەڵبەند کرد. بەڵام ئەحمەد _ ب حەوسەلەی دانیشتنی تەواوی نەبوو، هەر لەسەر چینچکان هەڵدەتوتکا و بە هەردوو دەستان لە رانی خۆی دەدا و دەیگوت.. چما سەید مەجید ئەوەشی لەگەڵ کردم، کە بەخۆی نا، لەشکری پێشمەرگەی کۆمەڵەی کردوتە سەرم.

لە فرسەتێک برادەرەکەمان _ ر _ دوور لە چاوی (سەرتیپ ) و کورەکانی، ئاگاداری کردینەوە کە هەندێ میوانی دیکە لەو ژوورەی بناری دانیشتوون. لە رێگای پاسەواندانان لە پشت ئەو ژوور و دەرچواندنی کەمینی بەیانی، ئەو میوانانە فرچکیان لەبەر برابوو، کە سەرتیپی ناویراو چۆن قوتاریان بکات..!

سبەینەکەی بە زوویی لەتە کاغەزێک لە مەسولی مەڵبەندەوە بۆ سەرتیپەکە هاتبوو، کە مام جەلال بۆ نیوەڕۆ میوانی ئەوە. ئەوجا بزە کەوتە سەر لیوانی و فرسەتی هێنا بە ترومبێل میوانە شاراوەکانی بە دەست بە تاڵی بە رێ بکات. ئێمەش بۆ زیاتر گورگەنەکردنی خۆمان، دەستمان نەهێنایە بەرێ و بۆ خۆیان بەسەلامەتی بزر بوون..

لە بیرمە لەسەر خوانی سفرەی نانخواردن بوو، من و حەمە سیاسی لەبەرانبەر مام جەلال و هاوڕێیە هاو سەفەرەکانی و خالە سەید مەجید جێگامان گرتبوو. ح بۆلی سەرتیپ و خاوەن داوەت، بوخچەی گلەییەکانی لای مام جەلال هەڵڕشت و گوتی.. مام جەلال ئەتۆ چاک دەزانی من لە ساڵی ١٩٦٥ لە تەک جەنابتەوە جەلالیم، ئێمە یەکێتی نیشتمانیمان دروست کرد، کەچی هەنوکە سەید مەجید لەشکری کۆمەڵەی بە سەرەوە وەکردووم، لێکۆڵینەوەی درشت و وردی مەوجووداتی تیپەکەیان لێ پرسیوم و چی چەکی زیادە بوو دەستییان بەسەرداگرت و بردیان. کە خۆم لەناو لەشکری ئیسلامی هێناوەتە..! مام جەلال بە کورتی وەڵامی دایەوە و گوتی.. فلان پشووت درێژ بێت، بە یەکەوە جارێکی دیکەش حەج دەکەین، پێمەڕەت ئەوەندە بڵاو نەبێت، زیاتر دەوی ئەو برادەرانەی کۆمەڵەی وەک حاجی مەمۆمان لێ مەکەوە..

پاش ئەوەی مام جەلال گەیشتە گوندی وەرتێ. لەسەر رێگای کوێستانی مەکێی بناری کارۆخدا، بارەبنەگەی خۆیان دامەزراند. مام جەلال رۆژانێک خەریکی لێپرسینەوە و بەدواداچوونی کێشە و کاروبارەکانی مەڵبەند بوو. دیار بوو لە چەند لایەکەوە راپۆرتی سەیروسەمەرەی بێ بنجوبنەوان بە تایبەت لەسەر بەرپرسی مەڵبەندی پێ گەیشتبوو. رۆژێک هەر خاڵە سەید مەجید بە خۆی هاتە سەردانی ئیعلام و ئاگاداری کردمەوە، کە

نیوەڕۆکەی لە لای مام جەلال نان دەخۆم. من هیچ گومانێکم لەسەر خۆم نەبوو، کە ڕاپۆرت لەسەر خۆشم نووسراوە، بۆیە سەربەستانە چوومە دیداری مام و هەتا لەگەڵ هەندێ میوانی لایدە نانی نیوەڕۆمان خوارد. دوای بەڕێکردنی میوانەکان، مام جەلال دەستی دایە گۆچانەکەی و گوتی.. حاجی مەمۆ با پیاسەیەک لەو ناوە بکەین. منیش چاپوک ڕاستبوومەوە و تارادەیەک سڵەمیمەوە، چونکو ساڵانێکی پێشتر دیتبووم، بە گۆچان چۆن پشتە ملی _ف. س._ی سۆر کردبووەوە کە من و یوسف زۆزانی شەفاعەتمان بۆ کرد. بە نابەدڵی گوتم فەرموو.. بەڵام لە هەموو هەوران باران نییە و مام جەلال یش، پیاوی لەو جۆرەی دەناسی کە چۆن داماڵەخاسی دەکردن. ئەوەبوو بە هەندێ پرسیاری مام و وەڵامی ئەزی، قسە و باسەکان هێواش هێواش هاتە سەر مەڵبەند و ڕای خۆمی پرسی لەسەر خاڵە سەید مەجید. من بەو شێوە ئاساییەی کە خۆم پەیوەندی دۆستانەم هەبوو لەگەڵ ناوبراودا، بە هەناسەیەکی پۆزەتیڤانە باسم کرد. لێرەدا مام جەلال گوتی.. ئەوە چییە دەڵێی لەگەڵ عەزەی داودی و ئەحمەد مەولودی لە یەکتریتان گێڕاوەتەوە، ئەو سێیەتانی لێ دەرچێت، هەموو لە عەلەیی سەید مەجید قسە دەکەن..! گوتم.. من نازانم ئەوانەی دیکە چییان گوتوە، بەڵام سەید مەجید خراپەی کەسی نەبووە، لەگەڵ هەمووان دۆست بووە. بەڕای من ئەوەی بە شێوەیەکی ناهەموار باسی کردووە، ناحەقییان نواندوە. دەمویست قسەی تر بکەم، مام جەلال دەستی لە گیرفانی ناو و کاغەزێکی پێچراوی دەرهێنا و کردییەوە، دەستێکی خستە سەر ناوی بنووسی ڕاپۆرتەکە و دەستەکەی دیکەی خستە بن کاغەزەکە و گوتی.. حاجی مەمۆ ئەو کاغەزە بخوێنەوە. کە ڕاپۆرتەکەم هەموو خوێندەوە، لە پێشەوە لە دەست خەتەکەیەوە زانیم، نووسەرەکەی کێیە و کۆمەڵێک بوختانی نابەجێی بۆ بەندە هۆنیبوەوە. بە تایبەت لەوەی کە من عەمیلی _حشع _ م چەند فەردە بەندە کاغەز و کەلوپولی چاپەمەنی یەکێتیم بۆ ڕەوان کردوون و لە لای ئەوانیشەوە چەردەیەک پارەم بۆ هاتووە و پێشمەرگە لە بنکەکانی دیکە شپرێو و بێ جلوبەرگن، کەچی ئیعلام ڕۆژانە شت چاپ دەکەن و هەموو پێشمەرگەکانیان پۆشتە و پەرداخن، هەموو هەفتەی جارێک گۆشتیان هەیە و بەردەوام خەڵکی نەیاری ینک هاتوچۆیان دەکەن..! چەندان قسەوقسەلۆکی نارێکی دیکە کە هەموویانم لە بیر نەماوە.

مام جەلال سەرەتا بە توڕەیی لێی پرسیم، ئەوە چییە حاجی مەمۆ..! لەبەر ئەوەی لە خۆم دڵنیا بووم، بە شێنەیی بەم وشانە وەڵامم دایەوە..،

مام جەلال ئەگەر ب. ج ئەوەی نەنووسیبیتن و _ کە ئەندامی مەڵبەندبوو _ هەر یەکێکی دیکە نووسیبیتی راست دەکات...! مام جەلال بە بزەیەکەوە گوتی.. شەیتان دەستخەتەکەت ناسیوەتەوە. بەڵێ ئەو جەنابە ئەوەی لەسەر من نووسیوە کە خۆت بەوە ئاگاداری من هەندێ پارەم بۆ کۆمەککردن بە کەسوکارەکەم لە جەنابتەوە پێگەیشتووە، بەشێکی ئەو کۆمەکەم بۆ راپەڕاندنی کاروبارەکانی ئیعلام تەرخان کردووە، کە هەتا کارمان بۆ مەڵبەندی چواریش ئەنجام داوە. هەر لە بەچاپگەیاندنی گۆڤارەکەیان و هەتا دەگاتە بەیاننامەکانیان. دیسانەوە مام جەلال پرسیاری ئەوەی لێ کردم. ئایا من ئەو پێشمەرگەیەم لە زیندان رزگار کردووە..! کە لە کێشەی مەلای چوار ژن تاوانبار کرابوو !..

گوتم و بەڵێ و بە شێنەیی سەرلەبەری شتەکانم وەک خۆی بۆ گێڕایەوە. پرسیاری ئەوەم لەگەڵ باس کرد، دەکرێ ئەو وەک سەرکردە و پارێزەرێکی گیانی خەڵکی کورد، لەگەڵ غەدرکردن لە پێشمەرگەیەکی گەنجی قارەمانی نەبەردەکان، لەسەر خۆشەویستییەکی ئارەزوومەندانەی دوولایەنەی نێوان خۆی و کچێکەوە بە شێوەیەکی نا مرۆڤانە گوڵلە باران بکرێ...! ئەو جارە بە خەندەوە چرپاندییە گوێچکەم، باشتان کردووە..! کە زۆر بۆی گەشامەوە و لەگەڵ تەواوبوونی دیدارەکەم، بەدەم ڕێکردنی گەڕانەوەم بۆ بنکەی ئیعلام، بڕیاری خۆم دا کە مرۆڤ دەبی لە دەم بەدەستهێنانی سەرکەوتنێک بەسەر نەیارەکانی، تووشی لووتبەرزی نەبی، وردتر سەیری مەجەرای ڕووداوەکان بکات. لەو دیدارە لە خۆم و بارودۆخەکەی ئەو ناوچەیە گەیشتم. کە شوێنی کارکردنی سەربڵندانەی خۆمی تێدا نەماوە. هەر بۆیەش بەدەم ڕێگای گەڕانەوەم، کەوتمە کەلکەلەی ئەوەی، کە نامەی دەست لە کار کێشانەوەی خۆم لە ئەندامێتی مەڵبەند بنووسم. شەوەکەی نامەکەم نووسی و بەیانی بۆ برادەرەکانم خوێندەوە، تەسلیم بە خاڵە سەید مەجیدم کرد. بەدوای بەرێکەوتنی مام جەلال، منیش تێگەیشتم کە یەکێتی لە ئانوساتی موفاوەزاتکردنە لەگەڵ ڕژێمی بەعس. بۆیە هەڵوێستی لاتەریکبوونم هەڵبژارد و چووم لە گوندی نازەنینی خۆشناوەتی دانیشتم تاکو بزانم کار بە کوێ دەگات

# راگەیاندنی مەڵبەند و دەرکردنی گۆڤار و بڵاوکراوە

زستانی ساڵی ١٩٨٢ بوو، بەدوای کۆنفرانسی دووی کۆمەڵەوە، لە بەرگی مانۆڕیکی دوور لە هەر جۆرە هەست و نەستێکی هاوڕێیانە، تەنیا بۆ بەرژەوەندی کەسە سەرەکییەکانی ئاکاری لە فەلاقەدانی توخمە هەڵسوڕاوە رادیکالەکانی ناو کۆمەڵە، دوور لە هەر هەڵسەنگاندنێکی بەر چۆڕاوکەی ویژدانێکی زیندوو، ژێر پێنانی بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵە و بیروباوەڕە شۆڕشگێڕییەکەی، بەبێ پێدانەچوونەوەی کاروکردەوە پڕ لە بەرهەمەکانی دەستەیەک لە هاوڕێیە ماندووەکانی کەرتی شەقڵاوە، کە ئەو دەمە سەرتاپای ناوچەکانی هەولێری دەگرتەوە. لەسەر دەستی ئەو چەپکە پێشمەرگە لە خۆبوردووەی ئەوان رۆژاندا، کۆمەڵە ببووە وێردی سەر زمانی خەڵکی رەشوڕووت و شیرازەی رێکخراوەیی ناو خەڵکی هەموو کونج و ئاوەدانییەکی ناوچەیەکی پڕ لە کێشەی نێوان حیزبە چەک لەدەستەکانی شاخی تەنیبووەوە. هەموو خەون و خەیاڵی ئەو خەڵکە تێکۆشەرەی رۆژانی تەنگانە و لێقەومانی کۆمەڵە، بۆ گەورەبوونی کەسایەتی رێکخراوەیی مادی و مەعنەوی کۆمەڵە بوو. کەچی بڕیاربەدەستەکانی ناو سەرکردایەتی کۆمەڵە، بە بیانوی بانگاشەی نادروستی پێکەوەنانی لەشکری سووری کەرتی رێکخستنی شەقڵاوە، ئەز لە مەیدانی هەڵسوڕانی ئەو پرۆسەیەدا پەراوێز کرام و بە شێوەیەکی نەخوازراو بەناوی ئەندامی مەڵبەندی سێی یەکێتی دوورخرامەوە. بەو خەیاڵپڵاوییەی کە بەو کارەیان دەتوانن هەڵوەستەم پێ بکەن و بێزاربوونی بەسەردا بسەپێنن. بەڵام بیرکردنەوەکەیان بە پێچەوانە کەوتەوە. لەشانی یەک دەستە هاوڕێ و پێشمەرگەی لەخۆبوردوو، لە هەمێزی راگەیاندنی مەڵبەندەکەوە و لە کەشوهەوارێکی دیکەوە، بنکەی باوەشێک بەرهەمی رۆشنبیری چاوەڕواننەکراومان پێکەوە نا و لێرەوەش ئیعلامی مەڵبەندی سێ بووە مایەی چاولێکەری و لاسایی کردنەوەی مەڵبەندەکانی دیکەی یەنک بۆ سازدانی بوارێکی لەو جۆرەی ئارەزووی خزمەتکردن. بنکەیەکی لەو چەشنەیان بۆ دانەمەزرا و هەتا ئیعلامی مەرکەزی یەنک سەرباری ئەو هەموو بودجە و پشتگیرییەی هەیانبوو، لەچاو ئیمکاناتی مەمرە مەژی ئێمەوە، قامەتی ئیعلامی مەڵبەندی سێیان لە وەرتێی ساڵانی ١٩٨٢-١٩٨٣ لە بواری چاپ و بڵاوکردنەوەی دوو گۆڤار و چەپکێک بڵاوکراوەی هەمەچەشنەمان پێ لە تۆزی وەرنەدرا.

له گەیشتنە وەرتێ_مدا، پاشماوەی ئەوەی لە پەراوێزی کۆمیتەی هەولێری هەڵوەشاوە بە ناوی بەشی ئیعلام مابوونەوە سەرلەنوێ بۆ دەستبەکاربوونی راگەیاندنی مەڵبەند بەگەڕکەوتنەوە. ئەوان لەو زەمانی بەر لە ئێمە خولێکی گۆڤاری راپەڕینیان دەرکردبوو. دەستەی نووسەران و بەڕێوەبەرەکانی ئەو خولی گۆڤاری گۆڕین، لەگەڵ گەیشتنی ئەز و دەستبەکاربوونم. سەرباری سەردانی کردنیان لە کەرتی رێکخستنی چۆمان. بە هیچ جۆرەک لە بەردەوامی چالاکیمان لەو بنکەیەدا، بەچاوپێهەڵنەهاتنەوە ئامادەی هاوکاری ئێمە نەبوون. نەوەک هەر لێمان نزیک نەبوونەوە و بگرە لە پروپاگەندەی ناراست لە دژمان درێخییان نەکرد. وایان دەزانی ئەگەر ئەوان خۆیان کێشایەوە، ئیعلامەکە لە پەل و پۆ دەکەوی و کەس بە دەنگمانەوە نایەت..! کەچی بە ئەنجام لە گوێی گادا پرخە پرخی پرتەو بۆڵەیان هات و لەبەرانبەر خەرمانی گەشەکردووی رۆژانەی بەرهەمەکانمان مێش وەگەز تامەزرۆیان بوو.

ئەو دەمەی بە هاوڕێتی عەبدوڵڵا مەرزانی و گوشاد ئیلنجاغی گەیشتینە وەرتێ. شان بە شانی م. حەمید کۆیی کە خۆی هەر لەو بەشەی راگەیاندن مابوەوە. لەشانی ئەو سێ سەربازە نەناسراوە بەردی بناغەی جێبەجێبوونی بەرنامەی کارەکانمان هەڵچنی. هەموو ئەو بەرهەمانەی بە لۆگۆی مەڵبەندی وەرتێ بڵاومان کردنەوە، دەست و قامی ئەوانی لە هەمێز بوو. هەرسێکیان بۆ تۆکمەکردنی پێداویستە هونەری و تەکنیکییەکانی چاپەمەنی شاخ و کەمکردنەوەی کەموکوڕی ئامێرە سەرەتاییە خراپبووەکان، داهێنەر و بە دەستوبرد بوون و شەو و رۆژیان پێکەوە گرێدابوو. بەرهەمەکانمان لە شاخ پێشکەش بە خەڵک و پێشمەرگە کرد.

یەکەم کارێک کە بە تەڕ دەستی ئەنجاممان دا، دەرکردنی ژمارە یەکی خولی دووەمی گۆڤاری راپەڕین بوو. کە زۆرتر بۆ بابەتی نووسینی سیاسی، فیکری، لێکۆڵینەوە و وەرگێڕان باوەشی گرتبوەوە. لە گەرمەی ئەو کارە دابووین، هەر لە رێگای هاوڕێتی گوشادەوە، سەرەتا چەند برادەرێک وەک میوان سەردانیان کردین و لەناویاندا، مەریوانی وریا قانع و گارای هونەرمەند لە تەکمان گیرسانەوە و لە بەڕێوەبردنی ئیشەکانمان تێکەڵ بوون و بە دروستی هاوکار و بەشدارێکی بەبڕشتمان بوون. دواتر هاوڕێیان شەماڵ ـــ زرار ـــ و هۆشمەند بۆ ماوەیەک ـــ و فەرهەنگ و حاجی ئەکرەم لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگە بۆ پاراستنمان، هاوڕێ و هاودەممان بوون.

له پاڵ کارناسانی و هاوکاری خاڵه سه‌ید مه‌جید وه‌ک به‌رپرسی مه‌ڵبه‌ند بۆ ڕاپه‌ڕاندنی کاروباری ڕاگه‌یاندن، که لووتکه‌ی ئه‌و هاوکارییه خۆی له پێشکه‌شکردنی ئه‌و تاکه فۆتۆستێنسله بوو که هه‌یان بوو. له شانی پشت و په‌نابوونی محمد سیاسی وه‌ک به‌رپرسی سیاسی مه‌ڵبه‌ند، له‌گه‌ڵ هاوکاری به‌شیکی زۆری هاوڕێیانی کۆمه‌ڵه و هه‌ڤاڵانی بزووتنه‌وه و کۆمه‌ڵانی خه‌ڵک لێره‌وله‌وێ. بۆ ئێمه زه‌مینه‌یه‌کی باوه‌ڕ به خۆ کرده سه‌رمه‌شقی ئه‌وه‌ی بوێرانه و به‌بێ گوێدانه هه‌ر پشتتێکردن، به‌ربه‌ره‌کانییه‌کی فلان و فیساری مه‌سول و هه‌ندێک له‌و ستافه ئه‌ڵقه له گوێیه‌ی ڕێکخستنه فه‌رمه‌ییه‌کانی کۆمه‌ڵه له ناوچه‌که‌دا، که له‌و گۆڕه‌وه نه‌یارییه‌کی زۆریان کردین. ئێمه به پێچه‌وانه‌ی چاو پێ هه‌ڵنه‌هاتنی ئه‌و سه‌رکز و بێنمودانه، به یه‌کریزی و یه‌کگرتوویی ئه‌و ده‌سته هاوڕێ و پێشمه‌رگه‌یه، سه‌رباری بارودۆخی ناهه‌مواری خه‌باتی چه‌کداری شاخ، ته‌نگوچه‌له‌مه‌ی ڕۆژانه‌ی گوزه‌ران و ده‌ستکورتی مه‌ڵبه‌نده‌که، قورخکردنی کۆمه‌کی مانگانه‌ی بنکه‌که له‌لایه‌ن به‌رپرسی دارایی بۆ بنکه‌ی ڕاگه‌یاندنی وه‌رتێ. به قامه‌تێکی بڵند که‌شوهه‌وایه‌کی ڕۆناکبیری بزێومان له‌ناو پێشمه‌رگه و خه‌ڵک سازاندبوو. هه‌فته نه‌بوو چه‌ندان گوتار و نامیلکه‌ی ڕۆشنبیری و که‌لتوری نه‌گاته بنکه‌که بۆ بڵاوکردنه‌وه و به‌چاپگه‌یاندن. ئه‌و براده‌رانه به گیانێکی پڕ له‌خۆبردن و به‌بێ وه‌ڕسبوون، نمانامه‌ی کوردپه‌روه‌رانه‌ی هه‌مێزی هه‌ست و نه‌ستی وڵاتپارێزی به‌ر ئاوێنه‌ی فه‌لسه‌فه‌ی خه‌باتی چینه چه‌وساوه‌کان، مرۆڤپه‌روه‌رانه په‌یامی خۆمان گه‌یاند. بۆ نمونه هه‌ر له ڕێگای هاوکاری چه‌ند هاوڕێ و دۆستێکی ناوشاری هه‌ولێر _ ع. ح ، ع. گ و هاوڕێی نه‌مرم فریاد محیه‌دین _ که ده‌ستپێشخه‌ری هه‌بوو له په‌یداکردنی که‌ره‌سته‌ی ئامێری ڕۆنیۆ نیوداشه‌که‌مان و مه‌ره‌که‌ب، به‌نده کاغه‌زی چاپ و پێداویستی دیکه. دیاره بۆ هێنانی ئه‌و که‌لوپه‌لانه، دایکم و نه‌جیبه خانی هاوژینم، خوشکه‌کانم و ڕۆسته‌م بۆ ناوچه‌ی دۆڵه‌ڕه‌قه، ئه‌وجا هاوکاری هاوڕێیان فه‌قێ مسته‌فا و ئه‌رسه‌لانی کوێخا هه‌مزه، خودی ماڵی کوێخوا هه‌مزه، عه‌لی نه‌بی و براکانی، حه‌مد نه‌بی جوتیاری به‌له‌نگازی سه‌رکه‌ش، ماڵی مام حه‌مه‌دی گوندی داره‌به‌ن، هاوده‌نگی فه‌قێ محمد و مام هێدی و خدری برای به خۆ و به ترومبێله‌وه، له‌گه‌ڵ قادرحه‌مه‌دی که‌سکانی و برایه‌کانی مایه‌ی ده‌ستگرتنمان بوون. به‌ده‌نگه‌وه‌هاتن و پاراستنمان له‌و هاتوچۆیه‌دا، له‌لایه‌ن پێشمه‌رگه دلێره‌کانی هه‌ردوو که‌رتی نه‌بی چالاک و عه‌لی کۆیله له به ئه‌نجامگه‌یاندنی ئه‌رکه‌کانی ئه‌و

کاروانەمان، نابێ جێپەنجەی ماندووبوونیان لە بیر بکرێت. هەروەها دیسانەوە لەو بوارەدا، هاندانی جەلال بەگی دەرگەلە، بنەماڵەی مام وەسمانی دەرگەلەیی، مەلا ئەحمەدی وەرتێ و ماڵی هەمزە و جوانەی بۆلیی حاجی شێخە و مەلا تەیب ئەو خزمانەی ملازم فوئاد چەلەبی گەرەکی بە رۆژێی گوندی وەرتێم لە بیر نەچووە. لەو کەشوهەوایەدا، دەرچواندنی یەکەم ژمارەی گۆڤاری راپەرین _ خولی دووەم _ لە پەراوێزی خەباتی شاخ بەو ناوەرۆکە نوێیەی ئەوان رۆژان، لە لایەک پەیامێکی ئاشکرای توێشەبەرەی کوانووی هەڵقولاوی کاروانی چالاکییەکانمان بوون و لە لایەکی دیکەوە تروسکایی گەشی ئەو ژمارە نوێیەی هەردوو گۆڤاری _ راپەرین و پێشمەرگە_ تۆمبزێکی بەهێز بوو، بەر رواژ و دەنگی لەرزۆکی تەنگەتاوی هیچ لەبارا نەبوو کەوت. کە بەبێ چاوپۆشیی و پەلەپروسکێ لە نووسینی راپۆرتی کز و پڕ لە تانە و شەڕ پێ فرۆشتنمان بازاری گەرمکردن.، بەوەی کە دیسانەوە لێرەشەوە ئەز بە پشتیوانی و هاوکاری لەشکرێک لە (تابوری پێنجەم وەک ئەو دەنگە نەخۆشانە پێیان دەگوتین)، چراهەڵگری رۆشنبیری لە سێبەری مەڵبەندی سێی، کە گوایە لەگەڵ بەرژەوەندی کۆمەڵە _ راوکەی پیسی مەبەستی خۆیان _ و یەکێتی یەکنایەتەوە..! ئەو کۆمەڵەیەی لە دەمی فرسەتدا بە رۆژی رووناک بە گورگان خواردنیاندا.

## ئازاد هەرامی و هاتنی بۆ مەڵبەندی سێ

سەرەتای بەهاری ساڵی ١٩٨٣ بوو، نوێنەری سەرکردایەتی یەکێتی بۆ بەسەرکردنەوەی مەڵبەندەی سێ، بە پەلە گەیشتە گوندی وەرتێ کە ئازاد هەورامی بوو. ئازاد یەکێک لەو کادر و پێشمەرگە تاکوتەرایانەی کۆمەڵە بوو، لە رۆژانی تەنگەژەی دۆزی بەڕێوەبەرەکانی کۆمەڵە بە تایبەتی و کۆمەڵە خۆی بە گشتی، بەدوای لە مەیدان نەمانەوەی ئەو سەرکردانەی کە کۆمەڵەیان بە هەتیوی جێهێلا. دوابەدوای ئاشبەتاڵی خەڵکی کورد لە ساڵی ١٩٧٥دا، دەستەیەک لە ئەندامەکانی کۆمەڵە بوێرانە، لە شانی شاسوار جەلال _ئارام_ و هاوڕێیەکانی کە بواری نوچدان و خۆدزینەوە لە ئەرکی قورسی دەموساتێکی دژواری ئەوێ رۆژگارییان رەتکردەوە. ئەو چەپکە هاوڕێیە بوونە وێردی موقاوەمەت و دەنگی بەرخۆدان لە کوردستانی باشووردا. فریای کۆمەڵە کەوتن و

له گلانی دەم هەڵدێری یەکجارەکی بەر هەڕەشەی دێوەعەجانەی بەعس دەربازیان کرد.

ئازاد هەورامی و هاوڕێیەکانی لە کەرکوک و سلێمانی و هەولێر سەرباری راوەدونانی دەمودەزگاکانی رژێم، سەرباری ئیعتراف لەسەرکردنیان لەلایەن کەسە گیراوەکانی کۆمیتەی رێکخستنی هەرێمی کۆمەڵەی بەغداد، سەرباری بەجێهێشتنی تێکڕای رێکخراوەکە لەلایەن سەرکردایەتییە رەسمییەکەی و رۆیشتنی پەلەپڕوسکێیان بۆ وڵاتی ئێرانی ئەوسا. سەرباری لە یەکهەڵوەشانەوەی شیرازەکانی رێکخستن بە هۆی ئەو بارودۆخە ناهەموارەی بەسەری داهاتبوو. بە تایبەتی هەبوونی یەک دەسرازە تەنگوچەلەمەی ئایدیۆلۆژی، رێکخراوەیی و بەلانس لەدەستدانی سەرکردایەتییە بەرێوەبەرەکەی لەدەمی رووداني ئەزمەدا. ئازاد هەورامی یەکێک لەو رۆڵە تێکۆشەرانەی رۆژانی تەنگانە بوو. بەبێ گوێدانە سەختییە لە رادەبەدەرەکان، ژیانی خەباتی ژێر زەمینی هەڵبژارد و بۆ گیرانی بەردەستی رژیمی بەعس دەستی بە خۆدا شۆڕنەکردەوە. بەڵکو لەتەک ئارام و هاوڕێیەکانی لەناو شاری سلێمانی و کەرکوک و هەولێر و خانەقین، ئەوەندەی بۆیان کرا باری لارەوەبووی کۆمەڵەیان راستکردەوە. دواییش بۆ عەقلیەتی زاڵی ئەوێ رۆژێیان، ئەو هاوڕێیانە بە کولەمەرگی موجازەفەی بەر رەوتی رووداوەکان، هەنگاوی سازدانی مەفرەزە سەرەتاییەکانی چەکدارییان بە ناوی زل و زەبەلاحی شۆڕشی نوێ، لە چەند ناوچەیەکی وەک شارباژێر و شارەزوور و گەرمیان و قەرەداغ کردە دەستپێکێکی پراکتیکی و هەر بە خۆشیان بوونە یەکەم دەستە سوارەی ئەو مەفرەزە تاکوتەرایانە و سەرلەنوێ بەرخۆدانیان خوڵقاند.

ناسیاوی بەندە و ئازاد هەورامی بۆ هاوینی ساڵی ١٩٧٢، رۆژانی دەستپێکردنی ئۆردوگای قوتابیان لە گوندی هەشەزینی ناوچەی سەنگاوی سەر بە شارۆچکەی چەمچەماڵ دەگەڕایەوە. ئەو ئۆردوگایەی لەلایەن بەشێکی بەرچاو لە ئەندامانی کۆمەڵەی مارکسی لینینی لە رێکخستنەکانی بەغداد، سلێمانی، کەرکوک، هەولێر لە ژێر چەتری یەکێتی قوتابیانی کوردستان تێیدا بەشداربوون. لە رۆژانی سەرەتای کردنەوەی ئۆردوگایەکەشەوە، وا رێککەوتبوو هەردووکمان بەر هەمان گروپ کەوتین. یەکێک لە نیشانەکانی مرۆڤێکی بەهرەمەند، زەوقودەسترەنگینی ئازاد بریتی بوو لەوەی کە لە بواری هونەری مۆسیقا و چڕینی سروودە نیشتمانی و چینایەتییەکانی وێردی سەر زمانمان لەوان رۆژاندا، لە هەموو هاوڕێیەکانی زیاتر چەشەیەکی ناسکو بە سەلیقەی تێدا

دیار بوو. له بیرمه هەموو بەیانیان لەگەڵ دەستەیەک له قوتابییەکان، به دەنگە زوڵاڵەکەی سروودی بەیانی دەچڕی و هەموو بەشداربووەکانی به جۆش و خرۆش دەخست. ئازاد له ئیشکردن و هاوکاریکردنی ئەو جوتیارانەی لەسەر خەلەو خەرمان سەردانمان دەکردن نموونەی دەستپێشکەری کارکردن بوو.

رۆژان هاتن و چوون، بەدوای تۆرنوگای هەشەزین له ناوچەی سەنگاوەوە. دوور و نزیک لەگەڵ ئازاد هەورامی یەکترمان نەدیتەوە. تاکو بەدوای دەرچوونی ئەز بۆ شاخ و ریزەکانی پێشمەرگایەتی لەسەرەتای هاوینی ١٩٨٠دا ، بۆ یەکەمجار و بەدوای ئەو هەموو ساڵەدا، لەگەڵ ناوبراو له هەندێ له کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە له خڕی ناوزەنگ به دیداری یەکتری گەیشتینەوە. ئازاد دیسانەوە له ناو کۆڕی ئەزموونی پڕ له تاڵوتفتی ئەو بزاڤە چەکدارییە زۆرەملییەی هەمێزی ساڵانێکی زۆر، ئینسانیکی هێمن و به حەوسەلەی خاوەن کەساتییەکی تایبەت به خۆی لێ دەرچووبوو. بەراستی مەودایەکی زۆر لەگەڵ مژدانەی سەرەتاکانی هزر و بیروباوەڕە پراکتیکییەکانی ئارام ئاشناو هەوادار بوو.

له بیرمه له بەشداریکردنی له کۆبوونەوەکانی ستافی مەڵبەندی سێ له گوندی وەرتێدا. به شێوەیەک له شرۆڤەی رووداوە پڕ کارەساتەکانی شەڕی خۆکوژی حیزبە چەکبەدەستەکانی شاخ قسەی خۆی کرد. وەک کەسێکی سەرکردەی ینک پەیامی سەرکردایەتی یەکێتی گەیاندە کۆبوونەوەکەی مەڵبەند. بۆ خۆ ئامادەکردن له بەشداریکردنی پەلاماردانەکانی سەر هێزە چەکدارە نەیارەکانی بناری قەندیل، که پێکهاتبوون له حشع ، پارتی ، حسک ، پاسۆک که له ناوچەکانی هەولێر و بەتایبەت له دۆڵەکانی خۆشناوەتی و بەستی شەرغە و دەوروبەری هەولێر و کۆیەدا، هێزەکانی مەڵبەندی چواری یەکێتی تەنگاو کردبوو. لەو کۆبوونەوە قسەی زۆر کرا، بۆ مێژوو دەیگێڕمەوە من و محمد سیاسی زۆر به ڕاشکاوی بیر و بۆچوونی خۆمان به پێچەوانەی بڕیاری شەڕی خۆکوژی ناوخۆ دەربڕی. تارادەیەکیش خاڵە سەید مەجید و عەوڵای حاجی شێخە رایەکانی ئێمەیان پێ خراپ نەبوو. بەڵام که ئازاد هەورامی راشکاوانە ئەوەی دووپات کردەوە، که شەڕەکه دەقەومێ و ئەوە بڕیاری زۆربەی سەرانی یەکێتییە. دەبێ لەو کۆبوونەوە هەمووتان لەسەر ئەو بڕیارە ئیمزاتان دابنێن. لێرەدا من له پێشەوە و بەدوای منەوە محمد سیاسیش، بەبێ دڵەڕاوکێ ئامادەی ئیمزای کردن لەسەر ئەو

شەڕە قێزەوەنە نەبووین. ئەو ڕەشنووسەی کۆبوونەوەکەمان بە ناڕازیبوون لەسەر شەڕ ئیمزا کرد.

بۆ پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ ئازاد سەردانی بنکەی ئیعلامی کرد. داوای لە من کرد کە لەشانی ئەودا سەردانی بارەگای تیپەکانی هێزی چەکداری یەکێتی بکەین. منیش ئەو کارەم بۆ ئەرکی محمد سیاسی گێڕایەوە. لێرەدا ئازاد پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم، بە جووتە هەندێ پیاسە بکەین و هاوڕێیانە بیروڕایەکانمان بگۆڕینەوە. منیش بە خۆشحاڵییەوە قبووڵم کرد و چووینە سەربانی بارەگای مەڵبەند، کە بۆ پیاسەکردن بە مەوداتر و دوورە دەستتر بوو، تاکو کەسمان بەسەرەوە نێت.

ئازاد دۆستانە کۆمەڵێک بەسەرهاتی خۆی لە ناخۆشی و تاڵوتفتییەکانی سەرەتاکانی ئەو دۆزە چەکدارییە، تژی لە کارەساتەی بۆ گێڕامەوە. تێیدا ئامۆژگاری کردم کە هەڵسوکەوتەکانم هێمن بکەمەوە، دەنا پێش هەموو کەسێک خۆم زیانی گەورە دەکەم. بە نمونەش ئەوەی لەگەڵ باس کردم کە بەرای ئەویش ئیشکردن لەگەڵ نەوشیروان لە کۆمەڵەدا، وەک ئەوە وایە لەگەڵ کەرتە شاخێک کار بکەی ! بەڵام خۆ بەدوای ئارام ـەوە، کۆمەڵە چ سەرکردەیەکی هەڵکەوتووی تری هەیە ! تاکو وەک تۆ پشتی پێ ببەستم..! گوتی ئەگەر باسی مەلا بەختیار و سالارم بۆ دەکەی، من هەردووکیان بە نزیکترین ڕەفیقی خۆم دەژمێرم، بەڵام بۆ ئەوانە ئەگەر جیا ببنەوە، لەگەڵ یەکتری هەڵدەکەن و یەکترییان قبووڵە..!

ئازاد لە درێژەی ئەو باسوخواسانەدا، کە ئەو دەم وام دەزانی گوێزم بۆ دەژمێری، پێی گوتم.. کە ئەز ئینسانێکی خاکی و دڵسۆزی هاوڕێی کۆمەڵەم. ئەو لە مەبەستی بۆچوونەکانم دەگات، بەڵام حەز دەکات من لەوە بگەم، هەتا بیر و بۆچوونە دروستەکانی کاک ئارام، لەو جۆرە کەشوهەوایەی چەکداری کوردان، بە پراکتیک وەک پێویست جێی نەبوەتەوە ئارام وەک ئینسانێکی بە دەگمەنی کەموێنە بە تەنیاباری مایەوە. هەر بە تەنیاباریش بووە شەهیدی ئەو مەسەلەیە. بۆیە حەز دەکەم ئەو کۆمەڵە هاوڕێیەی وەک ئێوە سەر لە بەرد نەدەن، خەباتی چینایەتی، بیروباوڕی دروست لە سێبەری بزاڤی چەکداری شاخ ناکرێ و ئەستەمە. ڕاستە گفتوگۆکەمان هاوڕێیانە بوو، بەڵام لە لای منەوە گفتوگۆی دوو جۆرە ڕێباز بوو. ڕاستە بەشێکی قسەکانی ئازاد هەورامی، لە ڕۆژانی دواتر وەک نەخشی سەر بەرد ڕاست دەرچوون. بەڵام کەسانی وەک ئێمە بەو

کاڵفامییەی خۆمان، لەگەڵ ئەو بیروباوەڕەی خۆمان پێ بادەدا. بێپەروا سەرمان لە ڕەقوتەقی شاخدا و قوربانی بێهودەمان دا. ئێستاش لەو باوەڕەدام ئەگەر کەسێکی وەک ئارام بمابووایە، یاخود رابەرێکی لەو ئەستمان هەبووایە، هەر هیچ نەبووایە نە دەبووینە سەپانی پۆشێ و پارووپەکی ئاسان و ئەو هەموو قوربانیدانە بۆ باوەشی سیاسەتی جامبازی، خۆدەوڵەمەندکردنی چاوچنۆکانە و پلەی پایەی بەرسێبەری دەسەڵات، ئێسک و پروسکی هاوڕییەکانمان بۆ نەدەبووە میرات..!

## وازهێنانم لە ئەندامێتی مەڵبەندی سێ

دەمەدەمی وەرینی بەهاری گوڵەکان بوو، گیاوگژ بەرەو سیسبوون دەچوون. کانی و ئاوی قەدپاڵی شاخەکان لە بڕێژ بڕێژی تەقینەوە دابوون. وەرزی هاوێن و دەرکەوتنی گەرمای ساڵی ١٩٨٣ سەرەتاتکێی لەگەڵمان دەکرد. بەڵام دڵ و دەروونی ئەز بلەز و سەرلەنوێ پاییزی گەڵاکانی لە خۆی دەوەراند.

ڕۆژانێک بوو دڵەڕاوکێیەکی سەیر سەری کردبووە سەرم. چەندی دەمهێنا و دەبرد، مانەوە و بەردەوامیم لەو مەڵبەندە ـیە زیاد دەزانی. یاخود دروست تر بڵێم، خۆم لەو شوێنە بە تایف دەبینی. بە تایبەت دوای سەفەرەکەی مام جەلال و دەنگۆی لادانی خاڵە سەید مەجید لە بەرپرسی مەڵبەندەکە لە لایەک و لەسەر هەڵوێستە بەردەوامەکانم بە رووی شەڕی کوردکوژی نێوان ی ن ک لە دژی حیزبە چەکبەدەستەکانی دیکەی شاخ. لەو دەڤەرە درکم بە شتی ئاسایی نەدەکرد. بە جۆرێک ناوەڕۆکی ئەو گوڤارانەی دەرمانکردبوون، لە شانی نامیلکە و ئەو سیپارانەی دیکەوە بە ئاشکرا لە لایەن بەشێکی سەرانی ینک جێگای قبووڵ نەبوو. دیارە نووسینی قسەوقسەلۆکی ڕاپۆرتنووسەکان لەو بارەوە قوچەک بووە. بۆیە شەوێک لەگەڵ تێکرای هاوڕێیانی بنکەکە دانیشتنێکی دۆستانەی پڕ لە گفتوگۆ، ڕاگۆڕینەوەمان ساز دا، برادەران هەموویان بە پەرۆشەوە، نیگەرانییان دەربڕی لەوەی کە بڕیاری بە جێ هێشتنی بنکەکەم داوە و دڵسۆزانە لە خەمی دواڕۆژی ژیانمدا بوون. منیش بە ڕاشکاوی موتیڤی بڕیارەکەم بۆ شەنوکەو کردن، ڕوونکردنەوەکانم بە قەناعەتەوە بۆ دەربڕین. هەرچەندە ئەو کۆمەڵە هاوڕێیە کە بەشی زۆرمان لەو بنکەیە، ببووینە هاودەم و هاوڕێی گیانی بەگیانی شەو و ڕۆژی یەکتری.

لەوێ ڕۆژاندا بە پراکتیک یەکدیمان دەخوێندەوە، یەکە بە یەکەیان سەرگران بوون، نیگەرانی خۆیان نەشاردەوە، سەبارەت بە بە جێهێلانی بنکەکە، کە لە دڵەوە کارکردنم لەوێ بارودۆخی ناهەمواردا، بە شانازی دەزانی و بە هاوڕێیەتییان سەربڵند بووم. بەڵام مانەوەم بە خۆمەڵخەڵەتاندن دەدیت و دواجار ئەوانیش، سەریان بۆ لەقاندم و یەکە یەکە بەدوای منەوە بنکەکەیان چۆل کرد. بە داخ و نیگەرانییەکی زۆرەوە بۆ جارێکی دیکە ئەو بنکە هەڵسوڕاوەی بواری ڕۆشنبیری لەو ناوچەیە نەکەوتەوە سەرپێیانەوە. ئەوە بوو بەرەبەیانێکی زوو لەگەڵ کۆمەڵێک پێشمەرگەی وەک مەلا هاوکار، شەماڵی گچکە، سۆرانی مەسیحی، حاجی ئەکرەم و ڕۆستەم و کێ و کێی تر کە ناوەکانیانم بە لێبوردنەوە لە بیر نەماوە، باروبارگەی خۆمان پێچاەوە و بە هەورازی بناری کارۆخ بۆ ساوسیۆکان کێلبووینەوە و نیوەڕۆکەی لە لای ڕەشماڵی ئەو ڕەوەندانەی تازە هاتبوونە کوێستانەکە، خۆمان کردە میوان و بە نانی گەرم و دۆی کابانێ، برسێتی سکی خۆمان ڕەواندەوە.

## گوندی نازەنینی خۆشناوەتی و هەواری دانیشتنم

هاوینی ساڵی ١٩٨٣ بە هاوڕێتی برادەری ساڵانێکی دووروودرێژی ئەمەن، مەهدی کاوانی لە گوندی نازەنین کونجی قەناعەتم گرتبوو. لە خانوولۆچکەیەکی تاک ژوور و هەیوانێکی گچکە، بەدەم ژیانی ڕۆژانە داوەرابووینەوە. ئەوەش بە کۆمەکی برای گەورەمان لەوێ ڕۆژان، حاجی ئەحمەد نازەنینی _ سڵاو لە گیانی _، هاوکاریی دایکە کڵۆڵەکەم کە هەموو دوو هەفتە جارێک لە شاری هەولێرەوە، بە کۆمەڵێک کەرەستەی جۆراوجۆری پێویستی ماڵ و حاڵ سەری لێمان نەدەبڕی و بەسەری دەکردینەوە. بە نیگەرانییەوە نە خۆم توانیم خزمەتێکی بکەم و قەرەبووی ماندووبوونەکانی بکەمەوە و نە بەشێکی زۆری ئەو هاوڕێیانەی لە دەمی لێقەومانیان دایکە کڵۆڵەکەم خزمەتی شەو و ڕۆژی کردبوون. ئەو برادەرانە ئەوەندە وەفایان تێدا نەبووە و نییە، لە ڕۆژانی تڕەکەلەکی پێداوی و دەسەڵاتی سەر کەلەکی ڕێکەوت، یادەوەرییەکانی خۆیان دەگێڕنەوە، لەجیاتی ئەو خزمەتکردنەی دایکم باس بکەن، وەک نموونەی دایکی هاوڕێیەکی بە وەفا، هاتوون

درۆزنانە، بەسەر شانوشەوکەتی کەسوکارە ترسنۆکەکانیان لەوێ ڕۆژان هەڵداوە. کە لە دەمی لێقەومانیان ئامادەی مەرحەبای نەبوون.! و دایکی من وەریگرتوونەتەوە.

هەروەها ناوناوە برادەرەکانی شارم و هاوڕێ بە وەفاکانی دەوروبەر لە سەردانی و بەدواچوونی کاروباری ژیانم ڕێچکەیان نەپساوەتەوە. بە تایبەت بەشێکی زۆری ڕێکخستنی گۆڕین. هەر هەموویان لە شانی برای پشتێمان مەلا غەفور، بەبێ دریغی لە خەممان دابوون. برایانی ناو هێزەکانی خۆشناوەتی، دەشتی هەولێر، کۆیە، هەرێمی حەفت، بەڕانەتی.. هتد بەردەوام بەسەریان دەکردینەوە و لە خەمی پاراستنماندا بوون. تاکو لەو زەمانیدا لوقمەیەکی ئاسانی فرسەتهێنانی کەسە نەخۆشەکانی بەرگی چەکداری نەبین.

پیاوەتی و جوانمەردی جوتیارەکانی گوندی نازەنین، لە شەو و ڕۆژدا پشت و پەنایەکی بەهێزمان بوون. لەوەی کەسێکی چەمبەری پرکێشی پەلاماردانمان نەکات. هەتا مردن لە لاوچاکی هەموویان، بە تایبەت وەستا عەلی، خاڵە کاکە، حاجی ئەحمەد، مام جەلالی بابی کەیفی، کاکەسوار، مام قادراغای باوکی غازی، حەمەد و کاکەسوور و حەمەدەمین _سڵاو لە گیانی یەکە یەکەیان _ هەروەها کوڕ و ڕۆڵە گەنجەکانی ئەوان ڕۆژان، هەموویان هاوڕێ و هاوکارمان بوون. ئێمەش لە یارمەتیدانیان بۆ خوێندنەوە و باشتر تێگەیشتنی وانەکانیان لە قۆناغەکانی قوتابخانە دریخیمان نەدەکرد، بەتایبەت مەهدی بەردەوام بۆ وانەکانی ئابووری و عەرەبی و ماتماتیک بەسەریەکەوە کاتی خۆی بۆ ڕەخساندبوون.

بە چەشنێک گوندی نازەنین بۆ ئەزێ، هەواری هەڵوەستەکردنم بوو. لە سێبەر و پەنای ئەو گوندە حەسامەوە و بە شێنەیی کەوتمە بەخۆداچوونەوە. دیمەنەکانی هەنارڕنین، تەماتە و میوەی وەک ترێ و هەرمێ و هەڵوژە، تووی سپی و شاتوو، سێوی لاسوورە و سپی، بۆ من جیهانێکی تێکەڵەی بەرهەمهێنان، کۆششی زەحمەتکێشیی پڕ بە سوود بوو. بە پراکتیک لەگەڵ جوتیارە هەژارەکان هەرەوەزی کارکردنمان کردبووە نمانامەی ڕۆژانەی ئەو یەکانگیرییە لەگەڵ خەڵکی ئەو گوندە. هەتا جاروبار بۆ سناوە و جەلی، کاموسەک و فریز و کەوەرتییان و بەرەکەی سەربڵند دەپەڕینەوە. یاخود ئاودیوی سماقولی و خۆران لای ئەبوبکر خۆشناو دەبووم. لەگەڵ جوتیارە زەحمەتکێشەکان پەیوەندییەکی دۆستانەی گەرموگوڕمان هەبوو.

# دوا دیدەنی هاوڕێ کاوە مەخموری و دیمەنێکی ڕاوڕووتی بێتواتە

ئەو دەمە زەمەن لەگەڵ شەو درەنگانێکی خۆیدا، هاوڕێ کاوە مەخموری و سەید جەوهەری کردە میوانمان. هاوڕێ کاوە بۆ مەڵبەندی چوار و لەسەر هەندێ سەرپێچی فەرمانە بێسەروبەری بەرپرسەکانی مەڵبەند، بە تایبەت لەسەر قسەی ڕاپۆرتنووسینی ئامر قوەتەکەی هەولێر بۆ بەرپرسی عەسکەری مەڵبەندەکە بۆ لێپێچینەوە بانگ کرابوو. گوایە کاوە بەقسەی ناکات و لەگەڵ سەفینی مەلاقەرە هەردووکیان هاواداری بەناو (عیراقچییەکانن). کاوە لەگەڵ خۆیان سەیارەیەکی دەبل قەمارەی نیوە سەربڕاوەی پێبوو. خوازیاری ئەوە بوو بۆ ئەزی بەجێبهێڵێ. بەڵام من ڕازی نەبووم و بەو شەوە هاوکاریم کردن لەناو باخچەکەی خاڵە کاکەی نازەنینی لە پەنایەک سەیارەکەمان تەقەت کرد. هەتاکو لەو سەری دەگەڕێتەوە. داخەکەم کاوە نەگەڕایەوە و دوایی سەید جەوهەر ترومبێلەکەی بردەوە. هەرچەندە ئەویش زۆری گەرەک بوو، بۆ منی بەجێبهێڵێ و قبووڵم نەکرد، چونکە هیچ پێویستییەکم بە سەیارە نەبوو.

شەوەکەی لەگەڵ کاوە بە جووتە لە سەربانە بچکۆڵەکەمان کە بە پەنا گردێکەوە بوو. بەدەم پیاسەی سەودا کورتەوە، زۆرمان قسە کرد و هاوڕێ کاوە لە کار و کردەوەی هەندێ لە مەسولەکان بێزار ببوو. زۆر بە ڕاشکاوی ڕەخنەی لە خۆ گرت، کە درەنگ و بە تەواوی ئاشنای ئەو مەسولە دەسەڵاتدارانەی ئێرە و ئەوێ نەبووە. من سەرەتا زۆرتر گوێم لێگرت، تاکو وەرسبوونی خۆی لە جۆری بیرکردنەوەی ئەو دەمی کۆمەڵە کە هەموو سەرەداوێکی ڕوحی بە خەڵکی زەحمەتکێش و کرێکارانەوە لەو دەمەوە کەوتبوە کاڵبوونەوە و بەحسێبی خۆمان دەبوو بەدوای چارەسەر بکەوین. ئەز لەو ڕۆژی و بەپێی بیرکردنەوەی ئەو دەمم گەلێک سەرەباسم لەگەڵ کردەوە. ئەوەندەی عەقلم پێدا شکا، کێشە و باسوخواسەکانم بۆ ڕوون کردەوە. داوام لێ کرد کە دەچێتە بالیسان وریای خۆی بێت، لە قسەکردن و ڕووبەڕووبوونەوەکان هێمن و لەسەرەخۆ وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە. تاکو بە ئاسانی لە تەڵەی نەهاوێن و ئازاری پێ نەگەیەنن. چونکو بەڕاستی هاوڕێ کاوە خۆی ئارەزوومەندانە، یەکێک لەو گەنجە هەرزەکارانەی خەڵکی ستەمدیدەی کوردبوو، لە ساڵی ١٩٧٧ و لە تەمەنێکی زووەوە، پەیوەندی بە مەفرەزەکانی پێشمەرگەی کۆمەڵەوە کردبوو. نزیکەی دوو ساڵێک لەگەڵ دەستەکەی مەلا بەختیار بە

پێشمەرگایەتی زۆربەی ناوچەکانی سلێمانی و هەورەمان و شلێر و بناری قەندیل و خۆشناوەتی و دەوروبەری کۆیە سوورابوەوە. وەک هاوڕێیەکی دڵسوزی کۆمەڵە، خۆی بە سەرەتاکانی بیروباوەڕی م. ل گۆش کردبوو. بە هاوکاری هاوڕێیەکانی خوێندەوارییەکەی پەرەپێدابوو، پارتیزانێکی تۆکمەی بزێو و گورجوگۆڵی لێ دەرچووبوو. کاوە شان بەشانی هاوڕێیان عەلی سالح و ئەحمەد قەمبەری _ یادیان بەخێر _ ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە کەوتنە سەرپێیانی مەفرەزە تاکوتەراکانی پێشمەرگەی کۆمەڵە لە ناوچەکانی بەستی شەرغە و دێدەوان و دەشتی هەولێر و قەراج و کەندێناوە. هەروەها بۆ گەشەکردن و بڵاوبوونەوەی دەنگ و ڕەنگی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە هاوکار و هاودەمی ڕێکخستنەکان بوو.

ئەو سبەینە زوو لە خەو رابووم. بەدوای ئامادەکردنی قاوەڵتی بەیانی و دانانی لەسەر سفرەی بەردەم هەیوانی ژوورەکەمان. مەهدی کاوانیم بێدار کردەوە و خۆم بە خێرایی بەرەو ناوەراستی گوندی نازەنین پێڵاوم بەسەرپێوە کرد، تاکو بۆ چێشتی نیوەڕۆ، گۆشت لەو قەسابەی گوندی بکڕم. کە ڕۆژانە کەلەشێکی بەدارەوە دەکرد و بە خەڵکی گوندی دەفرۆشت. سەیرم کرد چەند پێشمەرگەیەک کەلەشێکی مانگایان بە داری وەکردووە و منداڵەوردکە لێیان گردبوونەتەوە. لە بەرانبەریشەوە ئەو برادەرەی قەساب لەتەک کەلەشە سەربڕاوەکەی خۆی بە تەنیا راوەستابوو. یەکسەر بۆ لای قەسابەکە چووم، داوای دوو کیلۆ گۆشتم لێ کرد. ئەو خەریکی کەلوپەلکردنی گۆشتەکەی من بوو، دیتم یەکێک لە پێشمەرگەکان بە پرتاو بۆ لامان هات، روو لە من گوتی.. ئەوە مامۆستا ع. ح دەڵێ بێتن _ کە لەبن دار تووی بەر مزگەوتی گوندەکەوە لە من دیار نەبوو _ لێرە گۆشتی مشەو بە خۆرایی ببات..! منیش پرسیم گۆشتی بە خۆرایی چی..! قەسابەکە وەڵامی دامەوە و گوتی.. ئەدی بۆ ئاگات لێ نییە لە دوێنێوە پێشمەرگەکان یەک گاڕانە گاوگۆلکی خەڵکی ئەو گوندانەی گوایە جاشن هێناوە و ئەمڕۆ کەوتوونەتە کوشتنەوەی یەکێک لەو مێنگینە تاڵانکراوانە..! منیش هەر ئەوەندەم بەو پێشمەرگەیە گوت.. من گوشتی تاڵانی راوڕووت ناخۆم و بە مامۆستاکەت بڵێ با هەمووی بە خۆی لەجیاتی ئێمەش بیخوات..! هێشتا قسەکانم تەواو نەکردبوو، مامۆستای ناوبراو پارچە گۆشتێکی رانی بەدەستەوە گرتبوو، روو لە ئەزی دەهات، کە خەریکی وێرکردنی پارەی گۆشتی قەسابەکە بووم.

دروست لەو تاویدا. دیمەنی ڕۆڕۆی دەنگی ژنێکی ڕەشپۆش خۆی کرد بە مەیدانەکەوە. ژنەکە گۆچانێکی خواروخێچی بە دەستێکی و پرچ ڕنینەوەی بە دەستەکەی دیکەیەوە، کۆمەڵێک ژن و زەلام بە دەوروبەرییەوە دەرکەوتن. وەک ئاژەڵێکی ئاگر لەسەر پشتکراوە، لە حەژمەتی نێلەنێلی ئەو ئاگر بەربوونەی هەناوییەوە، بە هەموو دەنگی دەیقیژاند..

_ ئای هاوار کوو ماڵم وێران بوو، مێنگینەسۆرم ڕۆ، تاکە ئومێد و پنچکمان ڕۆ.. کە شیرەکەی تەنیا بژێوی منداره سەرکە و بنکەکانم بوو..! وای وای لەو تاڵانچییانەی گوایە گاوگۆلکی جاشانیان هێناوە، ئەوە گاڕانی گوندی سەردۆرییە، لە ئاقاری کەند و لەندان پێش خۆیان داوە و گاوانەکەشیان دارکاری کردووە.

ئیتر نازانم مامۆستای کۆنە ئەندامی م.س یەکێتی، لە شەرمەزارییان بۆ کوێ خۆی بزر کرد و رانە گۆشتەکەی دەستی چ لێ کرد..! بەڵام دیتم پێشمەرگەکانیش لە بەرچاوی خەڵکی گوندی نازەنین، بە تەنگەتاوی پەرتەیان کرد..! ژنەی بەستەزمان هەر ئەوەندەی بۆ مایەوە پیستی مێنگینە سۆری بە دەستەوە گرت، بەرەو ئاسمان بەرزی کردەوە، لە بەرانبەر پاشماوەی کەلەشەکە، بە هەلەکە سەماوە، بە چەپەرۆکان وەرگەڕایە سەروگوێلاکی خۆی. پڕ بە قوڕگی هاواری دەکرد.. خودایە ئەو غەدرە قبووڵ نەکەی.. سەببکاری مەرگی مێنگینەی سۆرم نغرۆ بکەی..! بە قوڕپەسەری بۆی کەوتبووە گریان و فیغانەوە، حەشاماتی خەڵکی گوندی بەدەوری خۆی کۆ کردبووەوە...

بە ناچاری و دەمچەفتی ئەوێ ڕۆژێی خۆم، سەرم کز کرد و بەرەو قەلەندەرخانەکەمان ڕێگام گرت. بەڵام دەتگوت قورسترین باریان لەسەر شان و ملم بار کردووە، بۆ بێدەسەڵاتی خۆم لەئاست ئەو زوڵمە گەورەی ملۆزمەکانی بەرگی پێشمەرگەوە، فرمێسکی شەرمندەیی بەلاجانگم قەتارەی بەستبوو، دەتگوت چەندان دەمژمێرە بەسەر هەورازێکەوە بەڕێوەم، ئارەقەی شین و مۆرم کردبوو، وەک کوندەئاوی سەرشانی کابانی رەشماڵ دەلەرزیم..

دیار بوو دوایی ئەو ژنە لێقەوماوە، بە هەنسکەهەنسک پاشماوەکەی گاڕانی گوندەکەیانی پێش خۆی دابوو، کەسێک لەوان پێشمەرگە چاوڕووی نەبووە بەری لێ بگری و بەرهەڵستییەکی بکات..

کاوە مەخموری و مەهدی و جەوهەر بەدەم دیتنی رووخساری پەشۆکاوم، هۆی دواکەوتن و بێحەوسەلەبوونمیان پرسی.. وەڵامێکی کورتی بەسەرهاتەکەم دانەوە و لە شانی ئەزەوە، ئەوانیش دۆش دامان و ئەوەندەم لە دەست هات، سەرلەبەری ئەو بەسەرهاتەم، بە نامەیەک بۆ کاک رەئوف سلێمان نووسی _ یادی بەخێر_ بەڵکو بە هیمەتی خۆی نامەکە بگەیەنێتە دەست مام جەلال. دوایی بۆم دەرکەوت نامەکەم گەیشتبووە شوێنی خۆی. رەئوف سلێمان پەیوەندییەکی هاورێیانەی هاوسۆزی بیروباوەڕی کۆمەڵەی لەگەڵ ئەزی هەبوو، بە کورتە نامەیەک ئاگاداری کردمەوە، کە مام جەلال حەز دەکات لە نزیکەوە چاوی بە خۆم بکەوێ..

ئەوە یەکێک لەو رۆژە ناخۆشانەی ژیانم بووە و هەرگیز لە بیرم نەچووە و ناچێتەوە..!

دەمەدەمی پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ، بەدوای نانخواردنێکی ساردوسڕی ناو دڵتەنگی ئەو رووداوە قێزەوەنە. هاورێیان کاوە و سەید جەوهەر ماڵئاواییان لێمان کرد، بەرەو گوندی بالیسانی چارەنووسی نادیار بە رێ کەوتن. داخی گران ئەوە دوا ماڵئاوایی هاورێ کاوە مەخموری بەلەنگاز بوو، چونکو جارێکی تر یەکترمان نەدیتەوە، ناوبراو بە دەسیسەیەکی نامەردانە لەناو گوندی بالیساندا، بە غافلگیری تیرۆر کرا..

خاڵێک دەبێ سەبارەت بە هاورێ کاوە پەنجەی لەسەر دانێم، ئەو شەوەی لەگەڵ ناوبراو، بەدەم پیاسەی سەربانەکەمانەوە، لەبەر نمە نمی باران، هاورێ کاوە بە هەندێ وشەی ناسکی پاکی ناو دڵی، داوای گەردەن ئازادی لێ کردم، وەک ئەوەی دڵی خەبەری مەرگی خۆی پێ دابێت. ئەو چرکە تاوە لە بەرچاوم رەشنابێتەوە. بەر لەوەی بچینەوە ژوورەکەمان، لەناو تاریکاییدا دەستی لە مل کردم و پڕ بەقورگی گوتی.. بمبەخشە بە هەڵە لە تۆ گەیشتبووم، زۆر ناحەقیمان بەرانبەرت کردووە لەوەی بە قسەی فلان و فیسار راپۆرتی باشی کاروکرداری جوامێرانەی تۆ و مامۆستا سدیق گۆرانم نەنووسیوە، تکاتان لێ دەکەم وریای خۆتان بن، شەمشەمەکوێرەکانی تاریکی زەفەرتان پێ نەبەن. خەباتی ئێوە جێگای ئومێد و تروسکایی هەموومانە. بە گەرموگوڕی باوەشم لێ وەرهێنا و نیوچەوانم ماچ کرد.

# ئەوێ ڕۆژان لەگەڵ مام جەلال دا

١

ماوەیەک بوو، مەهدی کاوانی بە سەردان چووبووە دۆڵی بالیسان. منیش بە فرسەت وەرگرتن لە هەبوونی چەند پێشمەرگەیەکی وەک فوئاد سوسەیی، فوئاد گۆمەشینی _ یادیان بەخێر _ لەگەڵ یەک دوو پێشمەرگە بە یەکەوە سەرێکی گوندی سماقولی سەروچاومان دا. لە پێشەوە سەردانی جەلالە شەل _ مان کرد و دواتر چایەکمان لە لای کوێخا عەزیز خواردەوە و زۆری هەوڵدا کە شەو لە لایان بمێنینەوە. بەڵام چونکو نیازی سەردانی هاورێ ئەبوبەکر خۆشناومان هەبوو، نەماینەوە و ملی ڕێگامان بەرەو گوندی خۆران گرت. دوو شەومان لەو گوندە نیمچە وێرانەیەی بەکر خۆشناو بەسەربرد. کە پڕا و پڕ لە موناقوشە و دەردەدڵی بزاڤی چەکداری و وەیشومەکانی گەڕەلاوژێی بەناو شۆڕشگێڕی بوو. هاوڕێیان منیان هەتا سەر تۆقەرەی لووتکەکانی چیای سەفینی سەر گوندی نازەنین گەیاندەوە و ئەوجا ئەوان هەر یەکەیان بۆ شوێنەکانی خۆیان گەڕانەوە. هەرکە گەیشتمەوە ماڵەکەی خۆم، لەبەر کۆسپی بەردەرگە، لە دوورەوە مام جەلالی نازەنینی بانگی لێم کرد کە بۆ پراڤینی نیوەڕۆ بۆ لای ئەوان بچم. لەسەر سفرەی ئەو ماڵە خانەدانە بووم، کە لەسەر بانەکەیان ساباتێکی قشتیلەیان پێکەوە نابوو. خاڵە کاکەی نازەنینی لێمان پەیدا بوو، گوتی لەگەڵ هەواڵی گەیشتنەوەت و هاتنت بۆ ماڵی کاکە جەلالم بیست و یەکسەر بۆ لاتان هاتووم. ئەمڕۆ بەیانی دوو پێشمەرگە لە لای مەلا غەفورەوە دوو نامەیان بۆت هێناوە. نامەکانم وەرگرت و هەر لەوێ هەڵیانم پچڕی. کەوتمە خوێندنەوەیان کە یەکێکیان لەلایەن مەلا غەفور خۆیەوە نووسرابوو، تێیدا هەواڵی ئەوەی بۆ نووسیبووم، کە ڕێکخراوی کۆمەڵە بە فەرمانی مەسولەکەیان _ڕێکەوت_ بە گەلەکۆیی و گوایە بە ئەمری مام جەلال، تفەنگیان لە مەهدی کاوانی وەرگرتووە. قسە و قسەلۆکی ناخۆش ڕوویداوە. بەڵکو بۆ دۆڵی بالیسان بێی و خۆت سەردانی مام جەلال بکەی. نامەی دووەم لەلایەن ئەو برادەرانەی یەکێتی نووسەرانی شاخەوە بوو، کە تازە لە دۆڵەڕەقەوە بنکەکەی خۆیان بۆ گوندی بالیسان گواستبوەوە، لە دیدارێکیان لەگەڵ مام جەلال، مام داوای دیدەنی ئەزی کردبوو.

سبەینەکەی ڕۆژی دواتر بە هاوڕێتی خودی خاڵەکاکە و خەسرەوی کوڕی، بە چیای هەورێدا ئاودیوی گوندی چیوەی حاجی بەدیعی بووین. نیوەڕۆکەی لە ماڵی عبدالرزاقی هاوڕێی کۆمەڵە لامان دا و ئەوەی بۆمان دانرا، بە تێری خواردمان و هەتا بالیسان لامان نەدایە شوێنێکی دیکەوە.

ئێوارەیەکی درەنگ بوو، لە پێشەوە خۆم سەردانی ماڵی خەلیل دهۆکی ـــم کرد. کە ماوەیەک بوو لەوێ لە هۆدەیەکی خوازراو لە شانی هاوسەرەکەی نیشتەجێ ببوون. خاڵەکاکە و خەسرەویش بۆ شەوەکەی چوونە لای حاجی ئەکرەمی کە بۆ خۆی خانووێکی بە کرێ گرتبوو. باروبنەگەی لێ دانابوو. چەند هاوڕێیەکی پێشمەرگەی وەک کاوەی کێخوا سادقی قەشقەی لە شان بوو.

شەوەکەی خەلیل دهۆکی بە ڕا و سەرنجەکانی، زۆر لەو قسانەی بۆ گێڕامەوە کە لە حزوری مام جەلال کرابوو. ئەو قسانە بۆ من پڕ بە پیستی ئەو دەنگۆیانە بوون، کە بەناو خەڵکی یەکێتی لەو دەمی لە دۆڵی بالیسان بڵاو ببوەوە. لەوەی کە گوایە ئەز بانگاشەم بۆ ئەوە کردووە و گوتومە.. مام جەلال چێشتخانەی تایبەتی هەیە و پێشمەرگە خزمەتی دەکەن..! زۆر قسە و قسەلۆکی دیکەی پەنادیواران، هەمووی لە ملی من شەتەک درابوو. دیار بوو ڕاپۆرتنووسە بێویژدانەکان وەک ئەوەی هەنگوینیان لەناو داری کلۆر دۆزیبێتەوە. لە هۆنینەوەی ئەو شتە ناڕاستانە ناوی حاجی مەمۆیان کردبووە پێخۆری جێبەجێبوونی خواستە نەخۆشەکانیان و نان و پیوازیان پێوە خواردبوو. بەبێ ئەوەی خۆم لەو دەڤەرە ببم، یاخود خۆیان لەگەڵ من دانیشتبن و دەمولفتیان لەگەڵم سوڕابێت...!

ئەو یەک دوو ڕۆژەی لە گوندی بالیسان و مێرگەسەر بووم. زۆربەی هاوڕێیە هاوبیرەکانی خۆم دیت و زۆرمان باسوخواسەکان بە یەکەوە تەتەڵە کرد. ئیتر هەموو لەسەر ئەوە کۆک بوون، کە خۆم سەردانێکی خودی مام جەلال بکەم. لە نزیکەوە لە ڕاستی قسەکان بگەم و ڕوونکردنەوەی بدەمێ.

ئەوە بوو لە ڕێگای نووسینگەی سکرتارییەتی سکرتێری گشتی ینک ـەوە بە تایبەت لە ڕێگای ڕەئوف سلێمانی سەربڵندەوە کە زۆر ڕێزی دەگرتم ـــ یادی بەخێر ـــ، کورتە نامایەکم بۆ مام جەلال نارد، کە دەمەوێ سەردانی بکەم. ڕۆژی دوایی ئاگاداریان کردمەوە کە سبەی بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ میوانی مامم. ئەوە بوو لەگەڵ مەلا غەفور و

مەهدی کاوانی بۆ کاتی دیاریکراو گەیشتینە گوندی خەتێ -ی دەڤەری هەروتیان. کە بنکەکەی مام جەلال لە دەرەوەی گوندی جێگای گرتبوو. سەرەتا خۆم لە پێشدا مام جەلالم دیت. یەکەم قسەی مام ئەوەبوو بۆ دەستم لە ئەندامێتی مەڵبەندی سێ کێشاوەتەوە و ئەوەی بە عەقلم داهات راشکاوانە گوتم.. من بە ئارەزووی خۆم بۆ شاخ هاتووم، نە عەسکەری فیرارم، نە بیانوو بەکەسیش دەگرم. لە لای خۆم بڕیارم داوە لەو ململانێ ناتەندروستە بەشدار نەبم و پێم باش بووە خۆم کەنارگیر بکەم. پێویستم بە حەسانەوە و هەڵوەستەکردنە. مام جەلال تۆزێک بە دیقەتەوە تێیدەڕوانیم و گوتی.. حاجی مەمۆ تۆ کادرێکی رۆژە تەنگانەکانی کۆمەڵە و یەکێتی، ئەوە من بە تەنیا نیم سەبارەت بە تۆوە، بەبێ هەندێ لەو برادەرانەی دیکە بڕیار بدەم. بەڵام ئەو دانیشتنەی تۆ لەو گوندە، بووەتە جێگای مقۆ مقۆی کەسانێک کە یەک چەردە راپۆرتیان لەسەرت نووسیوە و پێم باشە بێی لە نزیکی خۆمەوە کارێکی لای من بە دەستەوە بگری.

مام سەبارەت بە نارەزایی و دژە هەڵوێستی ناو بۆڕبۆڕینەکانی کۆمەڵەوە، یەک چەردە روونکردنەوەی دامێ و خۆی لێ بەدوور گرت. بەڵام هەستم بە تورەیی دەموچاوی و قیتبوونەوەی قژی سەری کردبوو، بە هێمنی گوێم لێ گرتبوو.

هەرکە دەمی نانخواردنی نیوەڕۆ هات، گوتم مام جەلال من حەزم کرد سەرێک لە جەنابت بدەم. دەربارەی دوو شت قسە و روونکردنەوەت بۆ بدەم.. گوتی بڵێ و گوێت لێ دەگرم. بەدەم رۆێشتنەوە، ئەو کارەی بەرانبەر مەهدی کاوانی کرابوو بۆم باس کرد و گوتم.. مەهدی کوڕی حەمید کاوانییە و برازای تۆیە. حەمید کاوانیش ئەو پێشمەرگە گیان لەسەردەستەی لە ریزی دەستەی پێشمەرگەکانی خۆتەوە، لە دەوروبەری چەمیرێزان شەهیدبوو. باوەڕ ناکەم مەهدی هیچ جۆرە قسەیەکی خراپی بە لای تۆوە کردبێت. هەروەها ئەو قسانەش بە ناوی مەلا غەفورەوە هەڵبەستراون و فریان بە راستییەوە نییە. مام جەلال گوتی.. ئەوجا من چی بکەم ! گوتم ئەوە مەلا غەفور و مەهدیشم لەگەڵ دایە، لە پرسگەکەدا دانیشتون. ئیتر بەدوای هەردووکیانیدا نارد و بەگەرمی سەر و دۆقەی لەگەڵ کردن.

لەسەر نانخواردن بوو، مام جەلال رووی لە من کرد و بە پلارێکی نەرم گوتی.. حاجی مەمۆ بۆیە ئیزنم نەدای تا لەگەڵ ئەو هاورێیانەت، چێشتخانە تایبەتییەکەم ببینی..! تەبیعی من تێگەیشتم، کە چی دەڵێ. بە لەسەرخۆیی وەڵامم دایەوە.. مام

جەلال هەرگیز ئەوە قسەی ئێمە نییە، هەموو عالەم دەزانی کە خۆراک بۆ جەنابت ئامادە دەکرێ و قابیلە بەخۆت خواردن لێ نێی..! ئەگەر من لەو جۆرە قسەیەم کردبێ، ئەوە لە پێشەوە لە عەلەیی خۆم دواوم و نوقسانییە بۆ خۆم. چونکو تۆ مەسولی یەکەمی یەکێتی. گوتی حاجی مەمۆ لەو قسانەت دڵنیام و لاپەڕەیەکی تازە دەکەینەوە. بەدوای چاخواردنەوە مام جەلال فەرمانی بە نووسینگەکەی دا، کە بزانن ئەو تفەنگەی مەهدی لای رێکخراوی کۆمەڵە وەرگرنەوە، تەسلیمی خۆی بکەنەوە و ئەوەندەی لە بیرمە دەستی لەسەر شانی مەلا غەفور دانا و هەندێک کۆمەکیشی پێ کرد.

## ٢

بەدوای رووداوی دڵتەزێنی تیرۆرکردنی کاوە مەخموری، لە عەرشی مەڵبەندی چواری یەکێتی لە بالیساندا. ئەوجا رووداوە نەخوازراوەکانی پەراوێزی داستانی بێتواتەی قەپاغی راوڕووتی ئاشکرا. بیستنی هەواڵی ناخۆشی دەست بەسەرکردنی تەحسین کاوانی و زیندانیکردنی، کوڕی رۆژە تەنگانەکانی کۆمەڵە لە هەولێر، کادری پێشمەرگایەتی بوێری ناوچەکانی خۆشناوەتی. بە بیانوی ئەوەی کە یەکێک لەو پێشمەرگانەی دەستەکەی، تەسجیلێکی کاسێتی گۆرانی لە شاڵاوی راوڕووتی بێتواتە هێناوە. لەسەر داوای خودی مام جەلال چوومەوە دۆڵی بالیسان. ئەوجارە لە پێشەوە سەردانی حاجی ئەکرەمم کرد، لەوێ لەگەڵ کۆمەڵێک لە برادەران و سەفینی مەلا قەرە کە ئەویش بۆ لێپێچینەوە بانگی مەڵبەند کرابوو.

خەڵکەکەش بۆ ئەو مامەلەی لەگەڵ تەحسین کاوانی کرابوو نیگەران بوون. بە جۆرێک زاقوزریقی سەرکەوتنی سەربازی داستانی بێتواتەی کاڵ کردبووەوە. ئیتر تێگەیشتم، هەندێ کەسی ناکەسبەچەی بەرپرس لە مەڵبەندی چوار، خۆیان لە تەحسین بە بیانوو بوون. ناجوامێرانە ئەوەی بۆیان رەخسابوو، لە لای مام جەلال بۆیان تێکوشیبوو، کە گوایە بەشداری لەو شاڵاوە قێزەوەنەی راوڕووت کردووە و عیراقچییشە..!

بەیانی سەرێکم لە بنکەکەی نووسەراندا، هەموویان برادەری نزیکی تەحسین بوون و سەرگرانی خۆیان دەربڕی. بەدوای هەندێ قسەوباس، خۆشحاڵ بوون بەوەی کە لە شانی ئەوانەوە، سەردانی مام جەلال دەکەم. دیار بوو بەوە ئاگادار بوون، نیوەڕۆکەی لە ماڵی

د. کەمال خۆشناو داوەت لە گۆڕێیە و مام جەلال یش لە لای خۆیەوە نووسەرانی بۆ ئەو داوەتە بانگهێشت کردووە. منیش حاجی ئەکرەم و مەلا غەفورم لەگەڵ خۆ راپێچ کرد. ئەز بۆ بەردانی تەحسین لەوێ رۆژاندا بێسڵەمینەوە بە گەریان کەوتم. سەعدوڵڵا پەرۆش لە پەناوە، تەکلیفی ئەوەشی لێ کردم، ئەگەر لەگەڵ مام جەلال لە بۆ بەردانی تەحسین کاوانی سەرکەوتین، ئەوە دەبێ باسی گوزەران خراپی ئەو نووسەرانەی لەگەڵدا بکەمەوە و ئەوجا ئەوان بە تێری قسەی خۆیان دەکەن.

ئەوە بوو بەدوای گەیشتنی مام جەلالەوە، ئێمەش خۆمان کردە میوان. لە بیرمە مام جەلال بە هەندێ قسەی کورت، باسوخواسی سەرکەوتنی بێتواتەی گێرایەوە و سفرە ئامادە کرا. وا رێکەوت ئەز کەوتمە تەنیشتێکی مام و حاجی ئەکرەم لە لایەکەی دیکەیەوە بوو. مام جەلال دەنگی هەڵبڕی و گوتی... بە یارمەتی میری خۆشناوان، د. کەمال، ئەوەتە لەسەر ژەمی خواردنیش لەگەڵ عیراقچییەکان شان بەشانم و هەموومان عیراقین، بەس ناوی گورگی بەدە..!

هەموو لەسەر چاخواردنەوە بوون و فرسەتم هێنا و گوتم.. مام جەلال ئێمە هەموو ئەو نووسەر و کادرانە، روو لە جەنابت دەنێین کە ئەمر بفەرموون تەحسین کاوانی بەربدرێت..! مام جەلال یەکسەر بەبێ هیچ پێشەکییەک، بە گڕێ و خۆ توندکردنێکی قیتبوونەوەی قژی سەری بە تورەیی گوتی  ئۆی.. ئۆی حاجی مەمۆ هاتوە و دیفاع لە خەڵکی گەندەڵ دەکات، کە من لەسەر راوڕووت سزام داوە..!

بەدوای تاوێک دیسانەوە گوتم  مام جەلال بە یارمەتی خۆت، ئەگەر گوێم لێ بگری.. گوتی بڵێ.. دەی...گوتم.. من هەردەم لەگەڵ سزای رەوای گەندەڵکارانم. بەڵام ئایا ئەتۆ بەوە ئاگاداری راوڕووتچییە گەورەکان، وەک بەرزەکی بانان بە پشتی وڵاخ ئەلاجە و مجمدەیان گواستوتەوە. بە چەندان مەولیدەی کارەبایان بۆخۆ بردوە، بە عارەبانەی تراکتۆر تاڵانی فەرش و رایەخ و فەخفوری رەنگاورەنگیان هێناوە، گاڕانی خەڵکی فەقیرو فەقاراتیان بەتاڵان بردوە. کەچی پێشمەرگەی برینداریان بە جێ هێشتوە. هەتا لەسەر گاڕان و مێگەلی مەڕی خەڵکی گوندەکانی دۆستی یەکیتی و شۆڕش بازیان نەداوە. دەستیان لە راوڕووتکردنی ماڵ و حاڵی هاوڕێیانی خۆشمان نەپاراستوە.. هتد و کەس لە گوڵ شیرینتری پێ نەگوتوون. کەچی تەحسین کاوانی گوایە لەسەر هێنانی تەسجیلێک لە لایەن یەکێک لە پێشمەرگەکانی مەفرەزەکەی زیندانی

کراوە. مام جەلال بلەز قسەکانی پێ بڕیم و گوتی.. ووس ووس بەسە.. حاجی مەمۆ بڕۆ تەحسین لە زیندان دەربهێنن. گوتم ئەگەر بە زەحمەتی نەزانی، کورتە نامەیەکمان بۆ بنووسە. یەکسەر بە دکتۆر کەمالی گوت، کاغەزێکی سپی بۆ بهێنن و ئەمری ئازادکردنی تەحسینی نووسی. ئەوجا بەر لە ماڵئاوایی، قسەم هێنایەوە سەر خواستی نووسەرانی دانیشتوو. ئیتر خۆیان تەواوی داواکاری خۆیان کرد.

لێرەدا ئەو سەربردەیەش لە بیر ناکەم.. هەرکە لەو دانیشتنە هاتینە دەرەوە. هەموو بە یەکەوە بەرەو گوندی شێخوەسانان بە ڕێکەوتین. بە دەستپێشخەری سەعدوڵڵا هەندێک تشتمان لەگەڵ خۆ برد. لە ڕێگادا لەسەر پێشنیاری ئەز و حاجی ئەکرەم ڕێککەوتین کە بە هەندێ شۆخیکردن، ئەو سەردانە بکەین و جارێ لە پێشەوە کەسمان ئەمری ئازادبوونی تەحسین بۆ ش مەسولی زیندان نەدرکێنی. بەڵکو حاجی ئەکرەم کە لە هەموومان زیاتر برادەری بوو، لەگەڵ سەعدوڵڵا ڕاسپارد، مۆڵەتی هینانە دەرەوەی تەحسین وەرگرن و بە ناوی ئەوەی بۆ خۆمان لە سەربانی زیندانەکە، گەعدەیەک چێدەکەین..!

سەرەتا پلانەکە بە وردی چووە ئالی جێبەجێبوونەوە. تاکو ئەو دەمەی ش گوێی لە پەیڤی خواردنەوەی شیری شێران ٭بوو. ڕاست لێمان پەشیوان بوەوە و کەوتە خۆتەنگاوکردن. کە ئەو ناتوانی لەبەر فەرمانی مام جەلال، تەحسین لەناو حەوشی زیندانەکە زیاتر ڕێگا بدات. چەندی کردمان بۆ دانیشتنی سەربانەکە سەری نەهینا بەرێ و گوتی.. ئەنگۆ دەتانەوێ من سەرپێچی ئەمری مام جەلال بکەم. ئیتر حاجی ئەکرەم بە تووڕەیی نوسراوەکەی مام جەلالی لە دەستم وەرگرت و بە تێڕادیتنەوە بەدەموچاوی دادا و پێیگوت.. بگرە پیسکە، ئەوە تۆمان تاقی کردەوە. دەنا تەحسین ئازاد کراوە و نەتتوانی وشکە پیاوەتیش بکەی..! ش وەک ئەوەی تەنەکەیەک ئاوی ساردی پێداکرابێت. بەڵام لەبەر چاوی ئێمەوە بەسەر خۆی نەهێنا و گوتی.. من ئەمری مام جەلال هەر ئێستا جێبەجێ دەکەم و فەرموون تەحسین لەگەڵ خۆتان بەرنەوە.

له رۆژانی تەناشی کێرڤی موفاوەزاتی یەکێتی لەگەڵ دەسەڵاتی عیراق و له پاییزی ساڵی ١٩٨٤ دا، سەردانێکی مام جەلال م له بنکەکەی له سورداش کرد. بەدوای هەندێ موجامەلەی ئاسایی، مام زێدە مەسرەفی ئەو نووسەرانەی لەو بنکەیەی له سورداش کۆببوونەوە باس کرد. من له چونە ناو ئەو باسە بوارد. دواتر نازانم و له بیرم نەماوە، لەسەرچی باس هاتە سەر ئەوەی من بە مام جەلال بڵێم.. مام جەلال تۆ له شاخ بەوە ناسرابووی کە هیچ یەکێک له کەسوکارەکانتەوە، بە دەورتەوە نەبوون له پاراستن و راییکردنی کاری رۆژانە، هەردەم پێشمەرگەی کۆمەڵە بەدەوروبەرتەوە بوون و بەسەر و بە گیان پەرژینی پاراستنت بوون.

_ شەیتان من گەرەکمە باسی سەرەداوی چەند مەسەلەیەکت لەگەڵ بکەمەوە، کەچی تۆ خۆتی لێ هەڵەداوان دەکەی! دەست بۆ باسوخواسی دیکە دەبەی..! مام جەلال بە توندی پێی گوتم.

منیش بەبێ سڵەمینەوە، گوتم فەرموو..

مام جەلال بەئەم خۆ خەریککردن بە هەندێ کاغەزی سەرمێزەکەیەوە کە وام مەزەندە کرد. لەو راپۆرتانە دەگەڕێ کە لەسەر من بۆی نووسراوە. وەک شتێکی هاتبێتەوە خەیاڵی له ناکاو سەری هەڵبری و گوتی.. پێم خۆشە بێی له نزیکی خۆمەوە، خۆت بە کارێک خەریک بکەی. من شوێنی نیشتەجێبوون بۆ خۆت و هاوژینەکەت فەراهەم دەکەم. گوتم مام جەلال هاوژینەکەم بۆ خۆی مامۆستایە و پێم خۆش نییە دەست له کارەکەی هەڵگری. بۆیە هەتا گفتوگۆ لەگەڵ حکومەت بە لایەکدا دەکەوێت، من له دەوروبەری هەولێری دەقەتێنم و لێیەوە نزیک دەبم.

_ باشە بۆ لەگەڵ ئەو برادەرانەی نووسەران نامینێیتەوە..!

من زوو زوو سەردانیان دەکەم و هەندێ جار شەویش لایان دەمێنمەوە.

لەوێ رۆژاندا، ئێمە ئەو ئەندامانەی کۆمەڵە. دەروێش ئاسا بۆ تەریقەتی خۆی، شێلگیرانە داکۆکیمان له رەوتی بیرکردنەوەی رێکخراوەکەمان دەکرد. بە تایبەت ئەوەی لەسەر دەستی ئارامدا، سەرەتایەکەی بۆ دارێژرابوو. بەبێ ئەوەی ئەز درکی پێ بکەم، مام جەلال بە خشکەیی منی راکێشایە ناو گفتوگۆیەکی توندڕەوی خۆم. لەسەر

بیروباوەڕی مارکسیزم _ لینینزم شیرم بە دەستەوە و تیرو کەوانم بەشانەوە بوو. لە بیرمە ئەوەی مام جەلال گەرەکی بوو بۆ دانەخۆرەکردنم، من دروست بە پێچەوانەی خواستی ئەو وەڵام دەدایەوە. هەتا ناو ناوە لێم تورە دەبوو، دەیگوت.. تۆ گوێ ناگری و سووری لەسەر قسەکانت و کۆڵ نادەی ..! ئەوە بوو لە ناکاو ئەوەم بۆ هات کە داوای رۆیشتن بکەم. ئەویش وەک ئەوەی لە من بێئومید بووبی، گوتی باشە و زیاتر یەکدی دەبینین و میوانی دیکەم هەیە.

بۆ خۆم هاتمە دەرەوە و پشوویەکم وەرگرت و تەنگەتاوییەکەم رەوییەوە. لە پێشەوە سەرێکم لەو بنکەیەی نووسەراندا. لەوێ خەلیل دهۆکی و ریاز خدر وادی نامەیەکیان بۆ دانابووم. کە لە دووکان لە لای ماسی فرۆشەکانی سەر پردەکە چاوەڕوانم دەکەن.

ئیتر هەر لەوێوە بە پیادە وردە وردە بەرەو سەرجادەی سەرەکی دووکان ملی رێگام گرت. زۆری نە مابوو بگەمە سەرجادەکە، لەپڕ قەمارەیەکی سۆری سوپەر کە لە سورداش دەهاتە خوارەوە. سەرەتا بە تیژی بە تەکمەوە تێپەڕی و دوایی ئیستۆپی گرت و بۆ لای ئەز پشتاوپشت کشایەوە..

سەیرم کرد عبدالخالق مەعروف لە پێشەوە دانیشتوە،_ ئەو ئینسانە بوێرەی دەتوانم بڵێم، یەکەم مرۆڤی دەستپێشکەر بووە لە پەردە هەڵدانەوەی بەسەر جەهالەتی ئایینپەرستانی کورد و لە بزاڤی لێکۆڵینەوەی زانستیدا، دەربارەی کەرەکیفەی هزری دواکەوتوویی لە چەوساندنەوەی ژنان بە دەنگ هاتووە. کە تا ئەو دەمە لەناو بزووتنەوەی رۆشنبیری کوردی و رەوتی ژیانی بنەماڵەی دینی بڤە بووە و بۆ ئەو هەڵوێستەی بە فیتی مەلا کۆنەپەرست و ئەڵقەلەگوێیەکان لەلایەن دەزگای ئەمنی بەعس لە ساڵی ١٩٨٥دا تیرۆرکرا_. ئەوەیش سووکانی بەدەستەوە بوو، کەریم خانی برادۆست بوو. سڵاو لەگیانیان کە هەردووکیان بەژیان نەماون. عبدالخالق جامی هێنابووە خوارەوە، دوای سڵاوکردن، گوتی.. تۆمان لە ئاسمانان دەویست، لە عەردی توشت هاتین. هەردووکیان لە سەیارەکە هاتنە خوارەوە و سەر و دۆقەی گەرمیان لەگەڵ کردم. من هەر لە دوورەوە کەریم خانم دەناسی و هیچ ئاشنایەتییەکی پێشترمان نەبوو. بەڵام لەگەڵ عبدالخالق لە ٩٧٤ و دواتر لە هەولێر چەند جارێک پێکەوە رێکەوتی دانیشتن ببووم. لە رووی هەڵوێست و راوبۆچوونەکان زۆرمان تێک نە دەکردەوە. هەتا جارێکیان لەگەڵ

کاردۆ گەڵاڵی _ یادی بەخێر _ لە بەغداد لە ئوتێلی هەولێر پیاسەیەکی ئەبو نواسمان کرد و لە گفتوگۆیەکانمان، ئەوێ ڕۆژی عبدالخالق بە پێی ئەزموونی خۆیەوە کە لە ئێمە بە تەمەنتر و دنیادیتەتر بوو. لە موناقەشەکانماندا ڕاشکاوانە سەرباری دڵسۆزی و پاکی، ئێمەی بە منداروتار خوێندەوە.

عبدالخالق بە کەریم خانی گوت.. ئەوە ئەو حاجی مەمۆیەیە، کە هەنوکە مام جەلال بۆی باس کردین. تەماشا بکە چەند خاکی و سادەکاری و بە تەنیا لەسەر ئەو جادەیە..! ئەوجا لێیان پرسیم، ئەوە بۆ کوێ دەڕۆی..! گوتم.. دەچمە دوکان و فلان و فیسار چاوەڕوانم دەکەن کە هەردووکیانی دەناسی.. فەرموویان لێ کردم و لەگەڵیان سەرکەوتم.

دیار بوو مام جەلال وەک ئینسانێکی تێکۆشەری ڕۆژە تەنگەکان، برادەری ئەزی لەگەڵ کاک ئارام بۆ باس کردبوون، کە هەموو نوقسانییەکەم ئەوەیە، بە دوو مەلا بەختیار و سالار کەوتووم..!

لە پێشەوە کەریم خان گوتی.. من ئەو ناوبراوانە نا ناسم، ئەوەندەی لە بیریشم بێت، یەکەم جارە تۆش دەبینم، بەڵام دیارە ئێوە هێشتا خورتن و باوەڕ ناکەم لە سیاسەت لە مام جەلال بەرنەوە. کۆمەڵێک قسەی دیکە کە هەموویانم یەکە یەکە لە بیر نەماون.

دواتر عبدالخالق بە هەندێ پرسیاری لەوان ڕۆژان، گەرەکی بوو لە ناخی ناکۆکییەکانی ئێمە لەگەڵ ئەوانەی دیکە لە کۆمەڵە ئاشنا بێت. من خۆم لە وەڵامدانەوەی نەبان گرت و بە خەندەوە تێگەیشت، من لە وجوودی کەریم خان، خۆم لە قەرەی ئەو باسانە نادەم. خەریک بوو دەگەیشتینە ناو دوکان و هەردووکیان زۆریان تەکلیف کرد کە بە یەکەوە ماسی بخۆین. من بە بیانوی برادەرەکانم، داوای بوردنم کرد. لەگەڵ دابەزینم، دیسانەوە عبدالخالق پێشنیاری بۆ کردم، بەڵکو لە هەولێر سەری لێ بدەم و بەیەکەوە دانیشین

لە سەردانێکم بۆ لای عبدالخالقی تەکنیکار، زۆری بەخێر هێنام و هەر خۆم و خۆی بە پیاسەکی ناو سەیارە، ستایشی زۆری هەڵوێستەکانی کاک ئارامی کرد. نهێنی ئەوەشی بۆ درکاندم کە تا دەکرێ ئاگاداری خۆم بم، چونکە وەک کەریم خان بۆی گێڕاوەتەوە، موخابەراتی عیراقی سۆراخی بەندەیان لەو کردووە و مەبەستیانە حاجی مەمۆ دانەخۆرە بکەن..!

# کارەساتی لە دەستدانی چەپکێک مرۆڤ

یەکێک لەو رۆژە ناخۆشانەی ژیانم، کە هەتا ئەو دەمەی سەردەنێمەوە. بۆ چرکەیەکیش لە دید و هزرم لا نەچووە و ناچێت. کارەساتی لەدەستدانی دەسرازەیەک هاورێی گیانی بەگیانیم بووە.

راستە ئەز، بە رۆژانێکی زۆر و پڕ لە مەرگەسات تێپەڕیوم. گلانی هەڵدێرانی ئێرە و ئەوێیم بە سەردا هاتووە، کە هەر یەکەیان بە جۆرێک چەنگەپڕی زۆرانبازی نوچ نەدانیان پێبەخشیوم.

راستە لە تاکە تاکەی دەیان هاورێی بە دەگمەنی ئەو کاروانە لە مەرگیان بە جێ ماوم و بە یەکجارەکی نەمدیونەتەوە. کە یەکە یەکەیان لە نمونەی دڵشاد محمد (مام جەمال)، مەناف زراری (مام کەمال)، رێباز سورچی، وریا حاجی قادر، رەشادی مام مورادی، فەرهادە شەل و فوئاد گۆمەشینی و لوقمان (کاروان) و زۆرانی دیکە کە بە حەق قوچەکێکی قایمی بە سەر پێوەبوونی هاورێتیم بوون. لە چەشنی ئەستێرەیەک لە گەرمەی هەتاوی ژیان لێمان ئاودیو بوون. یادیان دەکەم و لە تامی یادەوەرییەکانی هاورێتییان تێر نابم. لێرەوە و لەو رۆژەشدا، دوای دەیان ساڵ لە هەگبەی هەواری یادەوەرییەکانم یادیان دەکەمەوە و بەو نووسینە لە خزمەت بەسەرکردنەوەیاندام.

بە داخم، جەرگم زۆرتر داغان داغان بێ. کە بۆ تاک تاکەی هاورێیەکانم سووتاوە و بۆنکروزی برینی جەستەم هەتا هەنوکەش بەدەم گێژبوونی کولانەوەی ناوەناوە بۆیان دەکروزێتەوە. نازانم چ گیانلەبەرێکی قیرسیا بووم، هەتاکو ئێستاکەش دەژیم..! دیارە بۆ ئەوە ماوم، چیرۆکی داستانی ژیانی کۆمەڵێک لە هاورێ و زیاتر لە برا بنووسمەوە. ئەوانەی لە دەمێکی ئەو مێژووە سەر بە گۆبەندەدا، پزووی چاوی نە یاران بوون، بە ئاسانی لێمان وون بوون و شەهید بوون. بە مەرگی ناوەختی کتوپڕیان بۆ یەکجارەکی بەجێیان هێشتین.

رۆژی١٧ _ ١٢ _ ١٩٨٣ سەر لە بەیانی رۆژێکی ساردوسڕ بوو. ستاف و پێشمەرگەکانی کەرتی رێکخستنی شەقڵاوە لە گوندی نازەنین، کۆبوونەوەی دەوری ئاسایی خۆیان هەبوو. من کە پێشتر نامەیەکی سپارەیی مەلا بەختیارم بە دەست گەیشتبوو. تێیدا داوای کردبوو، بەڵکو بۆ یەکتردیتن و تاووتوێکردنی ئەو راو و

بۆچوونانەی پێشتر لەگەڵ یەکتر بە نامە گۆڕی بومانەوە، سەرێکی دۆڵی بالیسان بدەم. هەر ئەو ڕۆژە لە لای مەلا غەفور و شەوقی و حاجی ئەکرەم و فەرهاد کاوانی، نیازی سەفەرکردنم بۆ باس کردبوون. ئەوانیش وەک لە بیرمە لە ڕێگای کورتە نامەیەکی ڕەقی نەوشیروان بۆ مەلا غەفور، کە خێرا بگاتە لای لە دۆڵی بالیسان، هەمان نیازیان هەبوو کە بەشێکیان لە شانی مەلا غەفور بۆ ئەو دیو بچن. بەتایبەت مام جەلال بەڵێنی بە حاجی ئەکرەم دابوو، بۆ چارەسەری برینەکانی جەستەی، لەگەڵ خۆی بۆ بەغدادی ببات. ئەز لەگەڵ مەهدی کاوانی و جەوهەر ڕۆمانی کە پێشمەرگەیەکی دەشتی هەولێر بوو، بە میوانی لە لامان بوو. هاوڕێ لەگەڵ هاوار بادینی کە چەند شەوێک بوو لە لای ئێمە مابوەوە. بەدوای چێشتەنگاوێکی درەنگ، ئەو چوارەمان لە گوندی نازەنینەوە بۆ گوندی کاموسەکی بە ڕێ کەوتین. بەو نیازەی یەکسەر بە گوندی کونفلوسەدا، بە پێ چیای هەورێ ببڕین و ئاودیوی دۆڵی بالیسان بین.

وەک ئەوەی بای مەرگەموش ڕوو بە ڕوومان بێت. گەیشتینە گوندی کاموسەکی سەرجادەی ناحیەی هیران و نەگەیشتین. هەتا دەهات ڕەشەبای ساردی بناری زنجیرە شاخی هەورێ بە تاوتر هەڵی دەکرد و بە گێفەگێفتر خۆی دەنواند. گەردەلوولی ڕەشەبای بەفراوی گسکی لە سەر عەردویانی دەوروبەرمان دەدا. بە چەشنێک هەر چوارمانی تۆپەڵکردبوو، بەدەم لە یەکتر نزیکبوونەوە، بە ناچاری خۆمان گەیاندەماڵەکەی هاوڕێیانُ مستەفا و کابان ـــی خاڵە کاکەی نازەنینی کە لەو گوندە نیشتەجێ بوون. بەو هیوایەی ئەو باو و تەوژمە توندە تۆزێک هێور بکاتەوە و لەگەڵی پارووێک نانی نیوەڕۆ بخۆین. ئەوەبوو بەدوای نانخواردنەوە، دەوری عەسرێکی درەنگ، بە فرسەت وەرگرتن لە کەمێک هێوربوونەوەی ڕەشەبایەکە، بۆ کزەبای زریاناوی تەزیوی بەفراوی وشک، پێمان خستە ناو پێڵاوەکانمان و بەندە بە پێش کەوتم. ئەوانەی دیکە بەدوامەوە بوون. ئەو زریانە ساردە بە پێی هەنگاونانمان، تا دەهات زیاتر و زۆرتر دەتەزی، تەزینی خۆی بەسەر جەستەمان دەباراند. لەگەڵ ئەوەی بە جەمەدانییەکانمان سەروگوێلاکی خۆمان پێچابوەوە، کەچی گەردەلوولی باوبڕی سەرمای ئەو بنارە، بە لوورە لوور پەلاماری چڕتر چڕتر دەبوو، هەنگاو هەڵگرتنمانی قورس و گرانتر کردبوو. لەگەڵ گڤە گڤی هێرشی ڕەشەبایەکە، نەڕ و هۆری دەنگی هاوار، بە ئاوڕدانەوە بۆ دواوەی خۆمان ناچاری کردین. سەیرمان کرد برادەران مەلا غەفور و حاجی ئەکرەم و شەوقی و زاهیر بە

هاوارە هاوار بە دوامانەوەن. بێگومان ئەگەر گڤە گڤی رەشەبایەکە نەبوایە، بەو نەراندنەی ئەوانەوە، گەوارە هەوری ئاسمانییان بەخەبەر دەهێنا بۆ داکردنی ئەو بارە بەفرەی بەکۆڵییانەوە بوو. لە راوەستانی ئێمە و خۆدانە پەنا کەرتە شاخ و گاشە بەردە زلەکانی دەم قورگی کونەفلوسە و گەیشتنی ئەوان. لەوە تێگەیشتین بەدوای ئێمەدا هاتوون، تاکو بۆ گوندی کاموسەک بگەڕێینەوە... بۆ..!

بگەڕێنەوە، وەرن لە گەل ئێمەدا بن، بەو رەشەبایە توشە مل لە سەرکەوتنە سەر شاخی هەوریێ مەنێن..!

مەلا غەفور لێم هاتە پێشەوە و پێی گوتم،. تۆ بەڵێنت بە ماڵی پورە عەیشێ و کوڕەکانی داوە کە سەریان بدەی! ئەم شەو بە سەیارەکەی جەعفەر بۆ لایان دەچین. تاریک و روونی بەیانی هەر بەو ترومبێلە بە کلکەی گردۆلکان، بە نێوان بتوێن و گوندی قورەبەرازە دەپەڕینەوە و بەرەو دۆڵی بالیسان لەجادەکە دەکەینەوە

حاجی ئەکرەمیشی هاتە پاڵ و گوتی.. لەبەر خاتری من و حەز دەکەم بەیەکەوە بین، بەڵکو بە مام جەلال رادەگەین..! لەو هێن و منهێنەدا ئەو برادەرانەی خۆشم، پێیان خۆش بوو کە لەو رەشەبایە دەربازبین.

ناچار لەشانی ئەوان، رێ و رێ گەڕاینەوە گوندی کاموسەک و لەسەر جادەکە، هەموو پێشمەرگەکانی کەرتی رێکخستنی شەقڵاوە و ئەوەی تەحسین کاوانی، وەک ئەوەی لە دوا دیداری بەرەو مەرگ بەرێمان دەکەن. کۆ ببوونەوە و بە خۆگرمۆڵەکردنی بەرتەوژمی رەشەبایەکەوە، بە دەوری ترومبێلەکەی جەعفەر قژقژابووینە باریەکترییەوە. دنیاش تا دەهات تاریکو تاریکتر دەبوو، بە ماڵئاوەیی لەو پێشمەرگانەی دەوروبەری سەیارەکە، دڵنیام ئەگەر لۆریی بوایە، هەموو پێشمەرگەکان بۆ بەرەوپیرچوونی ئەو کەرەنڤالەی مەرگی بەشێکی هاورێیەکانیان، بە چەپڵەرێزانی ناو گەردەلوولی زریانی سەرمایەکەوە، هەموو بۆ ناو ترومبێلەکە سەردەکەوتن...! بەڵام هەر ئەوەندە جێگایە بووەوە کە چواردە کەسمان بە قەرەپەستانی جێمان گرتبوو. ئەز لەتەک مەلا غەفور، حاجی ئەکرەم، لە پێشەوە لە تەنیشت جەعفەری شوفێر جێگای خۆمان لەپاڵ یەکتری کردبووەوە. مەهدی کاوانی، زاهیر خۆشناو، هوشیار، هاوار، لە ناوەراستدا بوون. شەوقی، ئاشتی، شەبیب، جەوهەر، بەکر و یاسینی برای لە پشتەوە دانیشتبوون.

ئای لە دەرەوەی ترومبێلەکە، سەرەتای چ شەوێکی ئەنگوست لەچاو بوو. کەچی لە ناوەوەش بە هۆی قەرەپەستانێمان بەدوای ماوەیەکی کورت گەرم گەرم داهاتین. بە تایبەت برادەران دەتگوت، مژدەی هەواڵی زەماوەندی نێوان شەو و رۆژیان بەرگوێ کەوتووە. بە تامەزرۆیی بەرەوپیرەوەچوونی چارەنووسێکی نادیار، تاریکایی شەوی دەورووبەرمان راودەنا. ئەوانەی پێشەوە بە هۆی سێرەگرتنی تروسکایی چاوەکانمان، بۆ هاتنە پێشەوەی هەر رووداوێکی نەخوازراو، لەگەڵ بەرزونزمی لایەکانی پێشەوەی سەیارەکەوە، بۆ دیتنی زیاتر تەکە تەکمان بوو. کەچی ئەوانەی ناوەند و دواوە، بۆ خۆیان لە دنیای بەزمورەزمی هەڵکردنە گۆرانی دابوون. دەنگی بە سۆزی زاهیر و ئاشتی لە سەرەتاوە، پێشقاولی مژدانەی بەهرەی ئەو چەند کاتژمێرە بوون، کە هێشتا نەزانرابوو... کێمان کێ بۆ مەرگی ئەبەدی بە رێ دەکات..!

ئەگەر باوەڕ بکەن و نەکەن، دەنگیان لە چریک و هۆڕی ئەو چۆلەکانە دەچوو، لە دوورەوە تۆڕی رەشی راوچییە غەدارەکان بەرچاویانی تاریک کردبوو. چ شەوێکی نگریس بوو، لە یەخەی چارەنووسی ئێمەدا. بۆنی گوڵێکی رەشی قەترانی بەدەمەوە بوو. هاوار هاوار بە ماڵم بۆ ئەوەندە دەنگیان خۆش بوو. بۆ منیان وەک کۆرسی هەڵپەڕکێی مەرگی خۆیان قبووڵ نەرکرد و بۆچی بەجێیان هێشتم..!

هێشتا مێگەلی رانە مەڕ لە سەرهەوێزی درێژایی شەوی شەوینێ، نەکەوتبوونە کاوێژکردنەوە. وەک ئەوەی رەوەیەک گورگی برسی، بە تریسک و هۆڕی چاوە تیژەکانیان، راویان نابین و دەستوبرد لە بەردەمی رەشماڵی پورە ئایشێی بۆڵێیان دابەزین. دیار بوو ئەو شەوە کەسی دیکەیان میوان بەسەرەوە نەبوو. بنەبانی دیوەخان چۆل بوو. کاکە جوان، هەمزە و براکانی دیکەیان لە پێشوازی بەخێرهێنان و دیتنمان شاگەشکە ببوون. هێشتا بەدەم پێڵاو لە پێ کردنەوە رێزمان گرتبوو. یەکێک لەو رەشماڵانەی بە نۆ کۆلەگان قیتییان کردبووەوە، بۆ ئێمەیان بە جوانترین فەرش و رایەخی دەستکرد پۆشتە خستەوە. پورە ئایش لە بنەبانێی رەشماڵی، یەکە یەکەی لەشکرەکەی دۆستی دێرینی مەلا غەفوری بەخێرهاتن دەکرد. بەڵێ ئەو بنەماڵە سەربڵندەش، ئێمەیان بە بەراتی خوێنی سەربڕینی کاوڕە نێر ماندو شەرمەزار کرد. وەک ئەوەی دڵیان خەبەری پێدا بن، جارێکی دیکە مەلا غەفوری جوانمەرد نابیننەوە و هەندێکی زۆر لە هاوڕێیانی بۆ شایی مەرگ بە راگوزاری سەردانمان کردوون..!

نیوەی شەو رابرد، رانە مەڕ بۆ شەوینێ رادرابوو، نانی بەر هاڵاوی چەلاوە گۆشتی مشە، برنجی کوردی و مەرەگە، پراوساواری نایابی دەستاوی ئایشێی لاچەکبەسەر، بەو بۆنەی تێکەڵ بە نێلە نێلی سۆبای دارێ، هەموومانی خستبوە خەیاڵەوە. بە جۆرێک باسک و قۆڵی خۆمان لێ هەڵکردبوو، بەراستی ئەوە دواجاری ژەمەخواردنی سەر سفرەی ژنە بۆلییانی بەشێکی هاوڕێیان بوو، کەچی مەلا غەفور نانە رەقەی خۆی لە بیر نەکردبوو.

(چاوت کوێر بێ، دایکی‌ی عوبێدی) لەو هەشت سوارەی بۆ هەتا هەتایێ سەریان نایەوە. وای وای گێڕانەوەی ئەو کارەساتە، چ ماڵوێرانییەکی بە سامە. لەگەڵ چرکە بە چرکەی دەمی ژیانم روحیان هەڵتەکاندووم. لە کەلاوەی بیر و هەستی ماندووی خێر لە خۆ نەدیوم، هۆڕ هۆڕ سەربردەیان دەگێڕمەوە. دەگریم و گریان بە رۆکی قورگی ووشەکانی گرتوم. لێم مەگرن کەس وەک بەندە، بریندارى ئەو کارەساتە نین. هۆی هۆی براکانم، بە هەتیوی بەجێتان هێشتم، دەبوو منیش لەگەڵ خۆتان بەرن. مەرگ مەرگی قەزا و بەڵا، چ نفوراتێکە بۆ گیانی ئەوان مرۆڤانەی گەورە و گەورە دەبن و لەگەڵ هەنگاوەکانیان تروسکایی سەرەتاتکێی بوو. کەچی بۆ بەختی جامبازەکان زۆر بە ئاسانی لە ناکاو بزر بزر تێچوون. هاوار هاوار‌ی گیانی ئارامی رابەرمان، قاف قاف بە باڵای بیری تۆوە خۆیان گرێ دابوو، بۆ هەواری خاڵی تۆ، خونچەی نوێ بوون. بەڵام بۆ یاریکردنی چانسی چەمبەرییەکان بلەز وەرین. دڵم لە دەنگی ئاوازی دوا چریکەی ئەوان، هێلانەی وەفاداری، پاکی و دڵسۆزی، ئیستقامە و بوێری ئەوانە، دەرسی داوم و پێوەی دەنازم

پورە ئایش زۆرمان لەبەر ناورایەوە، بەمشەوە پڕ لە ماندوبوونە، زیاتر گەورەیان بکەین. بۆ رۆژ و سبەی شەو لە لای ئەوان بحەسێینەوە. بەیانی زوو شوفێر و سەیارەکە ئێزن بدەین و دوایی بێتەوە دوامان. زۆریان لەگەڵ گوتین، سەرلەشکرەکەمان، مەلا غەفور سەری نەهێنا بەرێ و لە بیرم نەچووە، لە وەڵامی ئایشێ دا گوتی.. خانمی گەورە و بەرێزمان زۆرمان ماندووکردن، ماڵتان ئاوا بێت، ئەگەر بژین..! لە بیرتان ناکەین، شەو قەڵای مێردانە و کارمان هاتییە و بمانبورن ناتوانین دواکەوین.

ترومبێل خۆت هەڵکە و برادەران سەرکەون. رێگای هات و نەهاتی خۆت بگرە و دەست لەملانتین. هەموو بەوپەڕی بێمنەتی جێگای خۆمان گرتن. جەعفەری شوفێر لەگەڵ حاجی ئەکرەم لە قۆشمەی سوار سوارانێی پەلە پڕوسکێدا بوون. بەڵام لە ناکاو

دەنگی تێهەڵکردنی حەیرانی مامۆستا شەوقی سیانان، شەوەزەنگی بەرچاومانی ڕەواندەوە، بەند بەند مەلا غەفور و ئاشتی مورتکەیی، دەستی نۆبەتیان لەگەڵ دەگرت. پاشان چریکەی لاوکی هاوار بادینی، بەسەرماندا باری، زۆری نەبرد ئاشتی و زاهیر دوو قۆڵی گۆرانی هەمە ڕەنگیان چڕی.

لە بیرمە لەو ڕێگایە هاتونەهاتەدا، بەو شەوە تاریکە، چوار جاران ماشێنەکە بۆ پێداویستەکانمان وەستا، هەموو جارەکانیش، نەفەرەکان جێگامان دەگۆڕی. برادەران لەگەڵ بە جێگەیاندنی حاجەتەکانیان، لە بەردەمی ترومبێلەکە، یەک پێچە شایی سێ پێیان دادەبەستا و گەرم دەبوون.

دوایی تێگەیشتم ئەوە شایی بەرەو مەرگ بوو. ئەو شەوە ماندوبوون بە کەسمان نەوێرا، هەموو ڕاومان دەنا... دواجار لەگەڵ کەوتنە جولەی ماشێنەکەوە، هەموو بە یەک دەنگ سروودی ئینتەرناشیۆنالمان بۆ پێشوازی مەرگی چاوەڕواننەکراوی خۆمان گوتەوە. دیسانەوە دەنگی هاوڕێیان شەوقی و ئاشتی و زاهیر و هاوار بەسەر دەنگی هەمووماندوە دەپەنگایەوە. هەموو سروودەکەیان ئەزبەر بوو. نازانم لە چ حالەتێکی خەیاڵی دەروێشانەدا دەخولامەوە. کتوپڕ گرمەی تەقەنیوە و بە ئاسمانەوە ئاوێزانبوونی ترومبێلەکە، یەک بە یەکمانی بە تاقی ئاسمانەوە لەناو خەوێکی قووڵەوە هەڵواسی بوو. کە زۆربەیان بێدارنەبوونەوە و بە گیانەوە بۆ هەواری ئارام ـــی پەرجو ئارام ئارام هەڵفڕین.

ئێستاکەش لە مێشکم ڕەشنەبوەتەوە، دیمەنی کۆمەڵێک کۆترە باریکە لە پێش چاوی منەوە، دەستە دەستە لە شەقەی باڵیان دەدا. ئەوەندەی توانام لەبەردا بوو، بەدوایان کەوتم، تاکو شوێنەواریان بزر نەکەم. بەڵام ئەوان لەبەر چاوی منەوە کۆتری سپی ئاسا، دوور دوور هەڵفڕین و لە سێرەی تروسکایی ڕەشکەوپێشکەی چاوانم بۆ یەکجاری گوم بوون. ئێمەش ئەوانەی لەو چرکەساتەی مەرگدا قەدەر نەیبردین. لە هەمان تاوی هەڵپژانمان بە ڕووی ئاسمانەوە، بە کەلەشی شەقوپەق بووی ترومبێلکەوە کەوتووینەوە سەر عەردی. هەر کەلەشە و لە کونجێکی سەرزەوی، لاتی زەوییەکە دەست لە ملمان، بە خوێنی برینەکانمان ماچبارانمان کرد.

من یەک بە خۆم کە چاوم کردەوە، چەند هاوڵاتییەکی گوندی مێرگەسەری دۆڵی بالیسان لەناو عارەبانەی تراکتۆرێکەوە، بە برا ڕۆ ڕۆ بەسەرمانەوە بوون. لەو دەم و

ساتەی میانی مەرگ و ژیاندا، سەباحی حاجی تایەری مێرگەسەریم ناسییەوە، بەسەرجەستەمەوە لەشانی خەڵکەکە، لە داخان سنگی خۆی دەکوتا. بە دەست هێمای زیاتر خۆ نزیک کردنەوەیم بۆ کرد، گوێی هێنایە بەردەمم و بە پچڕ پچڕی تێمگەیاند.. بلەز بچی بە مەلا بەختیار بڵێ، بگاتە سەر کەلەشەکەم و نامەکەی خۆی لە گیرفانم وەرگرێتەوە. تاکو دەست یەکێکی تر نەکەوێ..! نازانم بە چ هێزێکی شاراوەی ئەفسوناوی، دەستێکم لەسەر زاری ئەو گیرفانی شەلوارە خوێناوییەکەی بەرم، کردبووە قفل و هەتا مەلا بەختیار خۆی نەهاتە سەرم، ئەو قفلەی دەستم بۆ هەوڵدانی کەسی تر نەکرابوەوە.

دووەم شت لە دەمی بە هۆش خۆ هاتنمەوە، لە یەکە یەکەی هاوڕێیانم پرسی، سەرەتا کەس هیچی ئەوتۆی بۆ نەدرکاندم. بەڵام کە ئێمەیان بۆ نەخۆشخانەکەی بالیسان گواستەوە، گوێم لە ناوی شەهیدەکان بوو، بە قووڵایی ئەو برینە قورسەی کەوتە جەستەمەوە، بە دەنگێکی ئاشکرا هاوارم کرد، خۆزگە من لە جێگای یەک بە یەکی ئەو هاوڕێیانە بومایە، تازە لە کوێ بە دیداریان دەگەمەوە..!

خاڵێک لە کۆتایی ئەم گێڕانەوەیەدا، دەبێ قامکی لەسەر دانێم. کە بە یەکجاری بووە مایەی ئەوەی بۆ یەک چرکەی دیکە، خۆم بە هاوڕێی ئەو کەسە نەزانم و بە هەر شێوەیەک بێت، لە ژیانی خۆم شوێنەوارەکەیشم سڕییەوە. ئەویش کە خەبەری شەهیدبوونی ئەو پۆلە هاوڕێیە بۆ سکرتێری ئەو دەمی کۆمەڵە دەبەن لە دەمی خوتبەدانی لە کۆبوونەوەیەکدا. لەجیاتی ئەوەی هەر هیچ نەبێت بەدواچوونێکی رووکەش بۆ ئەو رووداوە جەرگبڕە بکات. کە ناوی شەهید و بریندارەکانیان بۆ هەڵڕشتبوو، دەمی هەڵهێنابوو و گوتبووی.. پشیلە حەوت رووحەکە دەرچووە...! کە دیارە مەبەستی من بووە و راستیکردووە، من پشیلەی نەک حەفت رووح، بەڵکو سەد رووح بووم و نەمردم و نەمردم، هەنوکەش دەژیم ..!

ناوی شەهیدەکان

مەلا غەفور، شەوقی عەباس، ئاشتی مورتکەیی، حاجی ئەکرەم، زاهیر خۆشناو، بەکر، هاوار بادینی، جەعفەر نازەنینی، هوشیار کۆیی

بریندارەکان...

مەهدی کاوانی، جەوهەر رۆمانی، شەبیب، یاسینی برای بەکر،حاجی مەمۆ

# چیرۆکەی چارەسەری بریندارییەکەم

بەدوای کارەساتی تەقینەوەکەی قورەبەرازەی دەشتی بتوێن بۆیان گێڕاومەتەوە. لە دەمی برینداربوونم لە شانی مەهدی کاوانی، جەوهەر رۆمانی، شەبیب، یاسینی براکەی شەهید بەکر. یەکێک لەو پزیشکانەی بنکە تەندروستییەکەی بالیسان، چ بە مەبەست و چ هەر لە خۆیەوە دەمی هەڵپچڕیوە و گوتویەتی.. حاجی مەمۆ نەزیف داخلی بووە و هەر دەمری، دەستی لێ مەدەن با لێرە بمینێتەوە..! بەڵام دیارە هاوڕێ دڵسۆزەکانی خۆم، کە بە دەوروبەرمەوە بوون، گوێییان لێ نەگرتووە و لەگەڵ هەموو بریندارەکان بە هەر شێوەیەک بێت. گەیانراوینەتە نەخۆشخانەی سەربازی قەزای سۆران.

ئەو دەم تازە گفتوگۆی نێوان ینک و رژێمی بەعس دەستی پێ کردبوو. رژێم بە هۆی جەنگی عراق _ ئێرانەوە، نەخۆشخانەیەکی گەورە و نوێی سەربازی لەو نزیکە ئەو بەرەیەی شەڕ دامەزراندبوو.

بەرەبەیانێکی زوو بوو چاوم کردەوە. چەندان کەسی وەستاوی جل و بەرگی سپی لەبەر بە دەوروبەری خۆمەوە درک پێکرد. یەکێکیان لە ناو هەموویان باڵا بەرزتر و قژ سۆر بوو. هەرکە/هەستی بە چاوکردنەوەی من کرد. بە زمانی عارەبی رووی تێکردم و گوتی.._ خلسناك من موت حقيقي و نزفنا راسك من كل قتره دم و سوينا لك عمليه كبيره في الراس، كوني متاكد بعد ماكو خطر عليك _. واتە برینەکەی سەرتمان پاککردەوە و لە مردنی حەتمی رزگارمان کردی. عەمەلیاتێکی گەورەی سەرکەوتوومان بۆ ئەنجام دای. دڵنیا بە ئیتر لە مەترسی دەربازمان کردوی. ئەوجا هەستم کرد، هەموو سەروگوێلاکم وەک مەلۆتکە، بە لەفاف پێچراوەتەوە و پشتم ژانی دەکرد و قاچەکانم سڕ ببوون. هەرکە پزیشکەکان بەجێیان هێشتم. گوێم لە ناڵەی مەهدی بوو، دەیناڵاند.. وەی بابۆ پشتە و برادەرە بریندارەکانی دیکەش لەولاترەوە تەداوی کرابوون. لەو دەمی دەستم بە سەروگوێلاکی خۆم دادەهێنا، کابرایەکی کورد لەبەر دەرگەی ئەو قاوشەوە وەستابوو کە ئێمەیان لێ دانابوو. ئیشارەتم بۆ کرد و لێم نزیک بوەوە و لێم پرسی ئێرە کێندەرێیە! گوتی.. نەخۆشخانەی عەسکەری دیانایە. ئەوجا خێراتر چاوم بە دەوروبەردا گێڕا، برادەرەکان هەر یەکەیان بەدەم ئازاری خۆیانەوە دەیانناڵاند. سەیرم کرد جەمەدانییەکەم لە تەنیشتم لەسەر کورسییەک دانراوە و یەک پارچە خەڵتانی خوێنمە.

بەو برادەرە کوردەم گوت.. بەڵکو ئاوڕێک بەو جەمەدانییەمدا بکات..! کابرا زۆر بە توڕەیی وەڵامی دامەوە.. جەمەدانی جاشان ناشۆم! بە ئەسپایی گوتم.. ئێمە پێشمەرگەیین. زەلامەکە رەقتر گوتی.. پێشمەرگە لێرە چی دەکات..! پێمگوت.. موفاوەزات هەیە لەگەڵ رژێم. ئەو برادەرە نەچووە عەقلی و لێمان دوورکەوتەوە.

بۆ رۆژی دواتر، پاش دڵنیابوون لە دۆخی تەندروستیمان، بە ئەمبولانسێکی گەورەی پاڵکەوتن و بریندارەکانی دیکەش بە ترومبێل بۆ نەخۆشخانەی سەربازی حامیەی هەولێر گواسترابینەوە. بە جۆرێک دایکم لە تەک خوشکوزایەکی خۆی، بۆ دڵنەوایی لە پێشەوەی ئەمبولانسەکە دانیشتبوون. من لەپاڵ ئێشوئازاری سەرم و تێکڕای جەستەم، خەیاڵم بۆ دیداری ئەو چرکە ساتانە هەڵدەفڕی کە لە پێش دەمی تەقینەوەکە لەگەڵ کێ و کێ گۆرانیم دەگوت. بەڵام کە گێژبوون پەلاماری دەدامەوە، هەموو وێنەکان بە فلچەی دەستکرد لەبەر دیدم رەش دەبوونەوە. دیارە بەدەم گەوزینی نێوان هۆشیاری و بێهۆشیدا، گەیشتبووینە نەخۆشخانە سەربازییە گەورەکەی هەولێر. کاتێک چاوم هەڵهێنا دایکم و چەند کەسێک بەسەرمەوە بوون. من لە قاوشێک لەسەر قەرەوێلەیەک راکشێنرابووم و برادەرە بریندارەکانی ترم دیار نەبوون. وەک ئەوەی لەسەربانم بەردەنەوە، سەرلەنوێ کەوتمەوە بێهۆشی _ هەروەک دایکم دوایی بۆی گێڕامەوە_ بەڵام دیارە دەرزییەکی هێمنبوونەوەی ئازاریان لێداوم. پاش مەودایەک دووبارە چاوم کردووتەوە، لەو لای منەوە چەند زەلامێک لەسەر قەرەوێلە بوون، بە مۆنی تەماشای منیان دەکرد. گوتم.. دایکە کوان برادەرەکانم..! گوتی.. دەڵێن لێرە جێگایان نەبووە و لە قاوشێکی دیکەن. ئەدی ئەوانە کێن کە لەو قاوشە پاڵکەوتون. دایکم بزەیەکی تاڵی هاتێ و هیچ قسەی نەکرد..!

لەو تاوەدا چەند پزیشکێک و ئەفسەرێکی سەرشان پڕ ئەستێرە لە دەوروبەرم پەیدا بوون. دیار بوو گوێیان لە پرسیارەکەی من و بێدەنگی دایکم ببوو. یەکێک لە دکتۆرەکان بە عارەبی پێی گوتم.. هدوله هم رفاقک ، بس من غير قوه جماعتک..! _ واتە: ئەوانەش برادەرانی خۆتانن (کوردن)، بەڵام لە گرووپەکەی ئێوە نین. بەدەست خۆم نەبوو، لە تاوان بە کوردی بەسەریدا قیژاندم.. ئێمە جاش نین، هەر ئێستا دەبێ من بۆ لای هاورێیەکانی خۆم بگوازنەوە. دوایی زانیم ئەفسەرەکە، دەرەجەدارێکی گەورەی موخابەراتی ئەو دەمی رژێمی بەعس بوو. زۆر لەسەرخۆی دەستی بۆ درێژکردم کە

دۆقەم لەگەڵ بکات و گوتی دەزانین تۆ کێی، هەنوکە بۆ شوێنێکی بەتەنیاتان دەگوازینەوە. لەناو تورەیی و ئازارەکانم بەبێ ئەوەی دۆقەی لەگەڵ بکەم. بە عارەبی پێیانم گوت.. ئێوە سووکایەتی بە خەڵکی کورد دەکەن، کە پێشمەرگەی بریندار لەگەڵ جاشە نۆکەرەکانی خۆتان تێکەڵ دەکەن..!

بە جۆرێک هەموو گیانم دەلەرزی. لێرەدا دکتۆرەکان خۆیان بە پشکنینی برینەکانمەوە خەریک کرد. کابرای ئەفسەریش ئاگام لێ بوو بە چاو ئەبلەقی و خەندەیەکی مەکرۆیانە سەیری دەکردم.

دەمە دەمی نیوەڕۆ بوو، بە هەر شێوەیەک بوو، دایکم ڕەوانەی ماڵەوە کردەوە. چونکو لەلایەن یەکێتییەوە هاوڕێیەکی دکتۆری خۆمانیان لەگەڵ ئەندامێکی لێژنەی تەنسیقی نێوان یەکێتی و ڕژێم ڕەوانەی لای ئێمە کردبوو. ئەو برادەرە ئەگەر هەڵە نەبم، ڕێبواری خۆمان بوو. کە هەنوکە وازی لە دکتۆری هێناوە و لە سلکی دادوەری حاکمە. ڕێبوار خەمخۆرانە پێمانەوە خەریک بوو. لەسەر داوای خۆمان، سەرەتا جاشە بریندارەکانیان لەو قاوشەی ئێمە گواستەوە و هەموومانیان بەیەکەوە کۆکردەوە. بەڵام کتوپڕ بڕیارەکەیان گۆڕی و ئێمەیان بۆ خەستەخانەی کۆماری مەدەنی هەولێر گواستەوە. لەوێ مەفەرەزەیەک و یەک دوو برینپێچی یەکێتی بوونە هاودەم و چاودێریکاری چارەسەرییەکانمان..

بۆ ڕۆژی دواتر یەک قاوشی سەربەخۆیان بۆ ئێمە تەرخان کرد. هەندێ لە پزیشکە هەولێرییەکان بۆ تەداوی و پشکنینمان، بێجگە لە دکتۆر فەرهاد جەلیل خەیات، بە پارێزەوە بۆ لامان دەهاتن. لەوانە یەک دووەکیان هەر ڕەتییان کردبووەوە، سەرمان لێ بدەن..! ڕۆژێک سەر لە بەیانی بەدەم ئازارەکانم دەتلامەوە، زۆر سەیر سەرم کەوتبووە گێژبوونەوە. بە جۆرێک چاوم ڕەشکە و پێشکەی دەکرد. گوێم لێ بوو چەند کەسێک بە عارەبی لەو برادەرە بریندارەی بەر دەرگەیان دەپرسی کە وابزانم هاوڕێ شەبیب بوو. دەنگەکە بە زمانی عارەبی دەیپرسی... یاهو منکم عباس محمد حسین الملقب ب حاجی ممو..! _ واتە: کامتان عباس محمد حسینی ناسراو بە حاجی مەمۆ یە..! ئەو هاوڕێیەش کە نەیدەناسین و بۆ خاتری پاراستنی من، دەستی دەستی بە وەڵام دانەوەی دەکرد. منیش لەبەر بێزەوەری ئازارەکانم لە بیانو دەگەڕام. قیژاندم.. جنابک منو ، انی عباس الملقب ب حاجی مەمۆ، تعال لگدام..! _ واتە: جەنابت کێی ! من عباس و حاجی

مەمۆم، وەرە پێشەوە. کابرا کە هاتە پێشەوە، زێتر بەسەریدا نەڕاندم.. اتلع برە و بدون رخسە مسبقە، ما عندک حق تتفرج علینا... _ واتە: بەبێ دواکەوتن بڕۆ دەرەوەو بۆت نییە، بەبێ ئیزنی لەپێشینە بێیتە ئەو قاوشەوە. لەو مشت و مڕەدا بووم. ئەو برادەرە برینپێچە پێشمەرگەیەی خۆمان پەیدا بووەوە، کە وا بزانم، سابر _ سەرکەوت _ کە ئێستا لە وڵاتی نیوزلەندایە. کابرا لەگەڵ دەست و پێوەندەکانی، دواتر زانیم یەکێکیان نەقیب مدحەت کۆیی بوو کە ئەو دەم جێگری بەڕێوەبەری ئەمنی هەولێر بوو، لە تەشکی خۆیانداو خێرا بزر بوون. لێرەدا دکتۆر سەرکەوت کە زانی تەندروستیم باش نییە، خێرا چوو پزیشکێکی نەخۆشخانەکەی هێنا و دەرزییەکی هێورکەرەوەی ئازاریان لێدام و پاش تاوێک خەوم لێکەوت. دەمەدەمی عەسرێکی درەنگ لە خەویان راستکردمەوە، دیتم فەرەیدون عبدالقادری ئەندام مەکتەب سیاسی ئەوکاتی ینک، لەگەڵ ئەو کەسانەی سبەینەکەی دەرمکردبوون، بەسەر سەرمەوەن. فەرەیدون دەستی منی لەناو دەستی خۆی ناو و بەناوی مام جەلال و برادەران لە تەندروستی پرسیم و بە پێکەنینەوە گوتی.. کوڕی چاک ئەو سبەینە ئەو برادەرانەت دەرکردووە، ئەوە دووبارە بە پێی خۆیان بۆ لاتان هاتونەتەوە. ئەوە ئەبو لوقمانی مخابەراتی عیراقی لقی باکوورە، ئەوەش ئەبو غەسانی بەرپرسی لیژنەی تەنسیقە و ئەوەش نەقیب مدحەتە.

برادەرە بریندارەکانم، یەکە یەکە لە پێش منەوە لە نەخۆشخانە دەرچوون. تەنیا من بۆ ماوەی دوو مانگ مامەوە و دکتۆر فەرهاد خەیات بە تایبەتی رۆژانە سەری لێ دەدام و درێغی نەدەکرد. تاکو لە رێگای لیژنەی تەنسیقەوە رەوانەی خەستەخانەی رەشیدی عەسکەری لە بەغداد کرام. لەوێش وردە عەمەلیاتێکی سەریان بۆ کردم و بە مەبەستی رێکخستنەوەی رووخساری دەرەوەی گوێچکەی راستەم. بەڵام دکتۆرەکان لەوێش راپۆرتی خۆیان دامێ بۆ ئەوەی بۆ چارەسەری تەواوی برینەکانی ناوەوەی سەرم.

# کۆپتەر و کەرکوک

بەدوای سەرەتای ساڵی١٩٨٤ و دەرچوونی یەکجارەکیم لە نەخۆشخانەی کۆماری هەولێر. ڕۆژانە چ دکتۆر فەرهاد بۆ هەندێ تەداوی خۆی بۆ ماڵی باوکم دەهات. یاخود برادەرەکانم و بە تایبەت فەرهادە شەل وەک برایەکی گیانی بە گیانیم بوو. بۆ عیادەی پزیشکییەکەی دەبردم. لەو ماوەیە کە بە پسولەی مەرەخەسی تەنسیق دەهات و دەچووم. چەند جارێک برادەرانی مەسولی یەکێتی لە ماڵەوە سەریان دەدام. لە ناویان مەلا بەختیار، فەرەیدون عبدالقادر، سابر ڕەسول و زۆری دیکە. بەدوای گواستنەوەی دەسگیرانەکەم _ نەجیبە _ و پێکەوەنانی چوارچێوەی خێزانی. چەند جارێک لەلایەن مام جەلال و ناوەندی کۆمەڵە لە سووورداش داوەت کراوم و قسە لەسەر باری تەندروستیم کراوە و تاکو مانگی چاری ساڵی ١٩٨٤ لە دیدارێکی بە تەنیام لەگەڵ مام جەلالدا، ئەوەی پێڕاگەیاندم کە لەو هەفتەیە و فلانە ڕۆژە، خۆم کۆ بکەمەوە و بگەمە سووورداش. بۆ ئەوەی لەگەڵ وەفدی یەکێتی بەسواری کۆپتەر بۆ بەغداد بەگەر کەوم. تاکو لەوێ بۆ چارەسەری ڕەوانەی دەرەوەم بکەن.

ئەوەبوو سبەینەی ڕۆژی دیاریکراو لە سووورداش ئامادە بووم. چێشتەنگاوێ گرە گرِی کۆپتەر ئاسمانی دەڤەرەکەی تەنییەوە. بەڵام ئەو جارەیان بۆ مەبەستی ڕاوکردن و کوشتنی پێشمەرگە نەبوو، بەڵکو وەفدی یەکێتی بۆ موفاوەزات بۆ کەرکوک دەگواستەوە. کۆپتەرە سەربازییەکە لەو گۆرەپانەی خوار سووورداش نیشتەوە و چەند ئەفسەرێکی سوپای عیراق لە ناوی دابەزین. وەفدێکی بڵندی یەکێتی لە پێشوازییان دابوو. منیش لە لای سکرتارییەتی مام جەلال چاوەڕوان بووم کە سالار عزیزیشی لێ بوو. وەک ئەز بۆ سەفەری دەرەوەی وڵات گفتی پێ درابوو. ئەفسەرەکان بە هاوڕێتی عقید غسانی بەرپرسی لیژنەی تەنسیقی نێوان ڕژێم و یەکێتی، بەدوای سەردانی مام جەلال و حەسانەوەیەکی کورت. بە هاوەڵی مام جەلال و وەفدی یاوەری بەرەو کۆپتەرەکە لەسەر پێبوون. ئێمەش بە شوێن پێی ئەوانەوە لە کۆپتەرەکە نزیکبووینەوە. بەدوای سەرکەوتنی وەفدەکە، مام جەلال هەر خۆی بانگی سالار و منی کرد بۆ هەنگاوهەڵگرتن. وا ڕێکەوت من لە نێوان کەمال خۆشناو _ یادی بەخێر _ و سالار بەرانبەر مام جەلال و ئەفسەرەکان جێگام لەسەر کورسییەکی ڕەقوتوق گرت. یەک بە خۆم زۆر باش لە قسەکانی مام جەلال حاڵی نەدەبووم، کە باسی سالار و ئەزی بۆ

ئەفسەرەکان دەکرد. زۆرتر لەبەر دەنگی گرمەوڕی مەکینەی کۆپتەرەکە بوو، سالار بە چرپە شتێکی گوت کە لەویش حاڵی نەبووم. بەڵام دیتم کەمال خۆشناو لێوی خۆی لێمان دەکرۆژت..!

لە تاقی ئەسمانەوە و لەناو کۆپتەرەکەوە خۆم بە تەماشاکردنی ئەو عەردوبانانە خەریک کردبوو. کە کۆپتەرەکە بە ئاسمانیدا هەڵدەفڕی و هەتا لەو گوندانەی دەڤەرەکە، لەو بڵندایییەوە ئاژەڵ و مرۆڤەکانم لەسەر عەردی لێک جیا دەکردەوە. لە دڵی خۆم ئەو جارانەم بیرکەوتەوە، کە لەو جۆری کۆپتەرانە عەرد و عاسمانییان لێ دەکردینە دۆزەخ. نازانم چۆن چۆنییەک لە دەستییان رزگارمان بووە..!

دەڵێن بزن ئەجەلی بێت نانی شوان دەخوات..! دوای ئەوەی کۆپتەر لە گۆرەپانێکی عەسکەری ئۆردوگای سەربازی لە دەوروبەری کەرکوک نیشتەوە. لەگەڵ دابەزینی هەموومان، سەیرم کرد تەنیا یەک ئەفسەری دەرەجەدار و یەکێکی دیکەی موخابەراتی عیراقی و حاکم عومەری یەکێتی، هاتونەتە پێشوازی مام جەلال و وەفدی ینک..! بە دەست خۆم نەبوو، کە لەناو ئەو سەیارەی ئێمەیان دەگواستەوە بۆ بارەگای لیژنەی تەنسیق. بۆ بەختی خۆم بەرێککەوت لەگەڵ کەمال خۆشناو لەسەر کوشنی دواوە و شوانەی لیژنەی تەنسیق پێکەوە لە سەیارەیەک جێگامان گرتبوو. گوتم.. دکتۆر کەمال ئەوە موفاوەزاتە یاخود تەسلیمبوونەوەیە..! چۆن بەوە رازی دەبن کە هەتا قائد فەیلەقێ، قائد فرقەیەک، پارێزگاری کەرکوک بۆ پێشوازی مام جەلال و وەفدی یەکێتی نەهاتوون..! خۆی لێ نەبان کردم و چەند ئێوە وەڵامتان هەبوو، ئەویش هەر ئەوەندە. بەڵام کە لە بەردەم بارەگاکەی حاکم عومەر هاتینە خوارەوە و هەر وەفدەکەی یەکێتی لە سەیارەکان دابەزین. پاش دە خولەکێک ئەوجا بەرپرسێکی موخابەراتی عیراقی لە کەرکوک گەیشتە ئەو شوێنە و دووبارە مام جەلال و وەفدەکەی یەکێتی بە پێشوازییەوە چوون. ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبووم، ناوی ئەبو لوقمان بوو. من دیسانەوە بە ناخێری گیانم، لە هۆلەکە کەوتمەوە تەنیشت کەمال خۆشناو کە ئەو دەمە ئەندامی م.س بوو، بە چرپە هەمان پرسیاری خۆم لێ دووپات کردەوە و یەکسەر لە تەکم هەستا و سەرنجمدا بۆ ئەو ژوورە چوو کە مام جەلال لەگەڵ ئەفسەرەکەی مخابەراتی عیراقی دانیشتبوو. حاکم عومەر و شوانە لەولاترەوە لەسەرپێ وەستابوون. لەو تاوەدا مام جەلال و ئەبو لوقمان بە جووتە هاتنە دەرەوە و کەمال خۆشناو بەدوایانەوە بوو. زانیم ئەوە ئەبو

لوقمان بە رێ دەکەن. لە گەڕانەوەدا کەمال خۆشناو بە فسکە فسک، قسەکانی منی بۆ مام جەلال گواستبوەوە، هەروەک شوانەی تەنسیق دواتر بۆی گێڕامەوە. لەگەڵ هاتنەژوورەوەیان بۆ هۆڵەکە، مام جەلال بە روویەکی گرژ رووی تێکردم و گوتی..حاجی مەمۆ تۆ لێرە دەمێنییتەوە و خۆیان لیژنەی تەنسیق مشوری سەفەرەکەت دەخۆن..! حاکم عومەر و شوانە بە حەپەساوی لە بەندەیان روانی. مام جەلال قسەکانی تەواو کرد و چەند سەیارەیەکی قەمارەی مارسیدس لە بەردەرگا ئیستۆپیان کرد و هەموو وەفدەکە بەدوای مام جەلال بە سالار عزیزیشەوە، بێجگە لە من و شوانە، بۆ لای قەمەرەکان رۆیشتن و هەر یەکەیان جێگای خۆی گرت و بۆ بەغداد بەرێکەوتن.

## سێیەم کۆنفرانسی کۆمەڵە

ماوەی ساڵێک دەبوو، لەناو رێکخستنەکانی کۆمەڵە و بە تایبەت لە شاخدا، بە زنجیرە کۆنفرانسی ناوخۆیی، نوێنەرانی کۆنفراسی گشتی کۆمەڵە و دیاریکردنی ستافی نوێی شیرازەکانی رێکخستن کە خۆی لە کەرتەکانی رێکخستن و رێکخراوەکانی ناو خەڵکی بەر شمری هێزی پێشمەرگەی چەکداری یەنک دەدیتەوە. وەک هەنگاوێکی نوێ هەڵبژاردن کرابوو.

بەڵام سەرانی دەسەڵاتداری کۆمەڵەی بەر سێبەری تفەنگ، بە ئەنجامەکانی ئەو کۆنفراسە ناوچەییانە دڵخۆش نەبوون، بەتایبەت لە ناوچەکانی هەولێر و گەرمیاندا. چونکو لەناو ریزەکانی کۆمەڵە و هێزی پێشمەرگە لە دەرەوەی شارەکاندا، دەنگۆی نوێ و جیاواز لێرە و لەوێ کەوتبووە گاگۆڵەکردنەوە. لەو کەشوهەوایەدا جەولەکانی شەڕێ کوردکوژی ناوخۆ بە لای قازانجی هێزی یەنک لە ناوچەکانی سلێمانی و کەرکوک و هەولێر لە تەواوبووندا بوون. یەکسەر مانۆڕی موفاوەزاتی بە تەنیای یەنک لەگەڵ رژێمی بەعس، بە بیانوی ماندوبوونی هێزی پێشمەرگەی یەنک، کردنەوەی دەرگەیەکی نوێ لەجیاتی داخرانی سنوورەکان بە رووی یەکتییەوە مەبەست بوو.

ئەوە بوو لە ناوەراستی هاوینی ساڵی ١٩٨٤ دا، جاڕی بەستنی کۆنفرانسی سێی کومەڵەی رەنجدەرانی کوردستان درا. ئەو دەمەی هاتوچۆی نوێنەرە رەنگاورەنگەکانی تێکەڵەی سەرانی یەکێتی بە مەبەستی موفاوەزات بۆ بەغدادی پایتەختی عیراق گەرموگوڕ بوو. ئەگەرچی کۆنفرانسەکە زیاتر لە هەفتەیەکی خایاند و کۆمەڵە لە هەموو

دەنگێکی ئاشکرای مارکسیزم _ لینینزم داماڵەخاس کرا. تەنگەژە ناوخۆییەکانی بە قازانجی دەسەڵاتدارەکان تەقێنرایەوە، کۆنفرانس وێستگەیەکی بەهێزی دەستەبەرکردنی هەنگاوەکانی مانۆڕی موفاوەزات بوو..

راستە لەو کۆنفرانسەدا، لە یەکترازان و مشتومڕی زۆر، چەند رۆژێکی گرتبوو. دەنگە زاڵەکان بۆ بە لاڕێدابردنی کۆمەڵە بەرەو بوون بە حیزبی جەماوەری و وازهێنان لە خودی کۆمەڵە سەرکەوتن. لەپاڵ دەنگێکی شەرمن و پێکۆرەکردنی کەمایەتییەکی ناو ئەندامەکانی کۆنفرانس لێک ئاشکرا بوون. بەڵام ئەو برادەرانەی لە سێبەری هێنانی لەشکرێکی دەمامکدار بە ناوی رێکخستنی نهێنی شارەکان و دەیان نوێنەری دیکەی دەرەوەی کۆنفرانسە ناوخۆییەکان و بەبێ هەڵبژاردن بە خشکەیی جلیتی ناو کۆنفرانس کردبوو. زیرەکانە دەنگی زۆرینەی ئەندامانی کۆنفرانسیان بە لای ویستی خۆیانەوە دورییەوە.

خاوەن دەسەڵاتەکان بە پێی ئەزمونی لە مێژینەیان، پلانی تەونی جاڵجاڵۆکەیان بۆ توخمە نەیارەکانیان هۆنیبوەوە و مەکرۆیانە چەندانی وەک ئەزیان لە بەردەمی بەشداربووەکانی کۆنفرانس خستە قەفەسی تاوانبارکردنەوە. بە بیانوی ئەوەی گوایە نووسینم وەک بڵاوکراوە بەناو ریزەکانی رێکخستن بڵاو کردووتەوە. بە راشکاوی بۆ ئەوێ رۆژانی بەردەم کۆنفرانس دەڵێم، تابڵیی دەستەپاچە بووم. وەک پێویست نەمتوانی داکۆکی لە خۆم بکەم. کە ئەوەش بۆ دوو هۆی بەرچاو دەگەڕایەوە، یەکەم کەم تەجروبەیی لەو جۆرە رووبەڕووبوونەوانەدا، دووەم خراپی باری تەندروستی و دەروونیم، ئازارەکانی برینداربوونە سەختەکەم لە سەروگوێلاکم فرچکی لێبڕیبووم. هەتا کار گەیشتە ئەوەی لەپاڵ هەڕەشە و گوڕەشەی هاتوهاواری بەشێکی ئەندامانی کۆنفرانس. تەقاندنەوەی شاڵاوی رقەقینەی چاوپێهەڵنەهاتنی کاروکردەوەکانی رابردووم، ئەوجا تفەنگ لێڕاکێشانم لە پەراویزی کۆنفرانسدا، کە من تەنیا یەک دەمانچەی سمیس و شەش فیشەکم پێبوو. لەو کەسە زۆر بێمنەت هاتمەدەست و دەستم لەسەر دەمانچەکەم دانا و پێمگووت.. تەقەم لێ بکەی، تەقەت لێ دەکەم و بزانین خودا بە کیهانمانی دەدا. ئەوە بوو بە دەمم پێکەنی و گوتی   گاڵتەم لەگەڵ کردی...!

من لە بیرم نەچووە و هەتا دەمرم بە بەرچاومەوەیە، کە لە بەردەمی توندوتیژی کۆنفرانس نەمتوانی بەرگری لە راستودروستی هەڵوێستەکانی خۆم بکەم. دڵنیام ئەوە

یەکێک لەو خاڵانەیە، لەوێ ڕۆژەوە هەژمونی خۆی لەسەر داناوم، کە من بەدوای کڵاوی بابردەلەی سیاسەت کەوتووم. من و حیزبایەتی نێوانمان عاسمان و ڕێسمانە. بەس چ دەکەی لەگەڵ کوردە غیرەتی، کە ئۆقرەم نەگرتووە و سەرلەنوێ هەڵەم کردووە و بۆ ماوەیەک تێهەڵچوومەتەوە. بەڵام هەرگیز ئەو شەنگ و تاقەتەی جارانم بەرەوە نەمابوو، تاکو بە یەکجارەکی بەدوای کۆنگرەی سێی یەکێتی لەو حیزبایەتیە پاشەکشەم کردووە و هەرگیز تخونی ناکەومەوە.

دەبی ئەوەش لە بیر نەکەم، لەو کۆنفراسەوە برینم کەوتووتە بەدەنێ. بەدەم نووسین و بڵاوکردنەوەی ئەو یادەوەرییانە خەریکی سارێژکردنیم. بۆ مێژوو لەو کۆنفراسەدا، مەلا بەختیار سەرباری هەڵوێستی جوانمەردی لە ڕووبەڕووبوونەوەی نەوشیروان مستەفا و گروپە باڵادەستەکەی ناو کۆنفراس، گەورەترین هەڵەی سیاسی خۆی و دەوروبەرەکەی ئەنجامدا، لەوەی بوێرانە لە کۆنفرانس دەرچووین، بەڵام کز و کڵۆڵانە گەڕاینەوە ناو کۆنفرانس، کە دەبوو لە سەرەتا هەنگاوی دەرچوونمان نەنایە و وەک جاران بە پرتە و بۆڵەی پەناوپەسیوان سەرمان کز بکردایە. یاخود کە چاونەترسانە بە ڕووی هەڕەشە و گوڕەشەکانی نەوشیروان و دەست و پێوەندەکانی، لە کۆنفرانس هاتینە دەرەوە و دەبیوو تاسەر بووایە و لەوێ ڕۆژەوە کاری شۆڕشگێڕانەی خۆمان بە ئەنجام بگەیاندایە و ڕێکخراوی تایبەت بە خۆمان ساز بدایە. بە دڵنیایی هەنوکە کار و حاڵ لە قۆناغێکی دیکە بوو.

## ژن هێنانەکەم

بەدوای بریندارببوونەکەمەوە، ١٨ی ١٢ی ١٩٨٣ و لەدەستدانی دەستەیەکی هەڵبژاردەی نزیکترین لە هاوڕێیەکانم. لێتان ناشارمەوە لە شانی برینەکانی جەستەمەوە. خۆخواردنەوەیەکی هێجگار کوشندە سەری نابووە سەرم و لە ناخەوە هەپرون بە هەپرونی دەکردم. یەک دوو پزیشکی برادەری نزیکم ئامۆژگاریان کردم، هەوڵ بدەم ژن بهێنم و هاوژینەکەم دەبێتە مایەی پڕکردنەوەی هەندێک لە کەلەبەرەکانی ئەو خۆخواردنەوەیە و بەڵکو ئەو دەردە دڵییەم کاڵ بێتەوە. خۆشم هەرچەند ئەو کیژەی چەند ساڵیک بوو، دەسرازەی خۆشەویستیمان بەیەکەوە هۆنیبوەوە. بەردەوام یەکترمان

دەبیت و وەک مرۆڤێکی بە وەفا لە مەودای کەوتنم لە نەخۆشخانە و ماڵەوە بە نهێنی سەری لێ نەدەبڕیم. هەنگاو بە هەنگاو لە سێبەرەوە بە تەکمەوە بوو. گەرەکم بوو ئەویش لەو دڵەڕاوکێ و فشاری چاودێریکردنی لەلایەن هەندێ لە کەسوکارە نزیکەکانی ڕزگار بکەم و بڕیاری هاوژینی یەکجارەکیمان دا. بەڵام نە کەسوکارەکەم و نە خۆم قروشێکم بەدەستەوە نەبوو. ئەوە بوو لە ڕێگای هاوڕێی سەربڵند ملازم عومەرەوە، نامەیەکم بۆ مام جەلال نارد و بە سوپاسەوە لە ڕێگای نەوشیروانەوە یارمەتییەکەیان بۆ مەیسەر کردم کە لە بیرمە هاوڕێی ڕۆژانی تەنگانە حەیدەر سوێریم نارد و نەوشیروان زۆر بە سەرگرانی و هەر لەسەر فشاری ملازم عومەر کۆمەکەکەی تەسلیم کردبوو.

## موخابەراتی عیراقی لە کەرکوک و پاسەپۆرت

### ئەگەر بشمدەن لە دار، هەتاکو لەسەر عەردم ناکەم خزمەتی غەدار

بەدوای ڕۆیشتنی وەفدی یەکێتی بە سەرپەرشتی مام جەلال بۆ بەغداد و مانەوەی بەتەنیام لە بارەگای لیژنەی تەنسیقی یەکێتی لە کەرکوک. لەگەڵ حاکم عومەر عزیز و هاوڕێ شوانە _ سڵاو لە گیانی (کە دواتر شەهید بوو _ بەدوای هەندێ دەمەتەقێی دۆستانە، بۆ بەجێهێشتنم زۆری پێ دڵگران بوو. بەڵام دیارە هۆیەکەی بۆ چوغلکردنم لەلایەن کەمال خۆشناوەوە گەڕاندەوە. گفتی دامێ کە ئەوان خۆیان لەگەڵ گەڕانەوەی عقید غسان لە بەغداد قسان دەکەن. چونکو هەتا ئەو نەگەڕێتەوە کەرکوک، شتێکیان بۆ من پێ ناکرێت. ئیتر هاوڕێ شوانە لەلای خۆیەوە پسولەیەکی یەک مانگی مۆڵەتی هاتوچۆی ئیمزاکراوی بۆ پڕکردمەوە و چەند دانەیەکی دیکەی پڕنەکراویشی دامێ، تاکو لە کاتی پێویست بە کاری بهێنم.

بەدوای نانخواردنی نیوەڕۆ لە بنکەی لیژنەی تەنسیق، شوانە بە سەیارەکەی خۆیان هەتا گەراجی سەیارەی هەولێری بردم. لەوێ بە نەفەرات گەڕامەوە هەولێر و لە ماڵەوە هەر کە منیان بە خۆم و بارگە دیتەوە، هۆپێکیان لە منەوە بینی.

زیاتر لە دوو هەفتەی بەسەرچوو، تاکو ڕۆژێکیان شوانەی تەنسیق بە نامەیەک ئاگاداری کردمەوە کە فلانە ڕۆژ بگەمە لایان. بە ناوی تەواوکردنی مامەلەی پاسەپۆرتەکەم لە لای موخابەراتی عیراقی لە کەرکوک بۆ سەفەر. لە بیرمە لەگەڵ هاوڕێ

فەرهادە شەل بە سەیارەکەی رێگای چوونە کەرکوکمان گرت. پێش نیوەڕۆ بوو، فەرهادمان لە بنکەی تەنسیق بە جێ هێشت. شوانە بە خۆی بە سەیارەیەکی موخابەرات منی گەیاندە ئەوێ. سەرەتا چەند ژوورێکیان پێکردین، تاکو گەیشتینە لای هۆدەکەی ئەبو لوقمان. کە زەلامێکی درێژی کەتەی ناو جلکی مەدەنی بوو. لە پێشەوە بە رێزەوە بەخێرهاتنی کردین و بۆ ماوەی سعاتێک و نیو شوانەی ئیزن دا و منی بە تەنیا لە لای خۆی هێشتەوە. هەر ناو ناوە چایەکی بۆ بانگ دەکردم، چونکو لە پێشەوە گوتم قاوە ناخۆم. بە وردی سەیری چایەکەم دەکرد و بە کاوەخۆ چەند فرێکی گوماناویم لێ دەدا. ئەویش بەبنی چاوی سەیری دەکردم و لە گومانەکەم گەیشتبوو. دەستی بە پرسیاران کرد و گوتی.. ئێمە پەساپۆرتمان بۆت ئامادە کردووە و هەر بەخۆشمان سەفەری چ وڵاتێکت گەرەک بێت، بۆ چوون و هاتنەوە بۆتی مەیسەر دەکەین. بەڵام حەزمان کرد ئەو دانیشتنە بکەین. منیش گوتم فەرموو ئەوە دانیشتووم. ئەبو لوقمان جگارەکەی لە بەردەمی خۆی کوژاندەوە و ئەوەی بەر دەرگای ئاگادارکردەوە، کە هەتاکو خۆی نەڵێ، کەس نەیەتە ژوورەوە و میوانێکی تایبەتی لە لایە.

ئیتر دەستی بە قسە کرد. سەرەتا لە چۆنیەتی برینداربوونەکەم و بارودۆخی چارەسەرییەکەمی کۆلییەوە. لە یەک بە یەکی هاوڕێ شەهیدەکانی دەپێچایەوە و مەبەستی بوو بزانی پلەی ناسیاوییان لەگەڵ ئەزی چ بووە..! شەهیدەکان خەڵکی چ ناوچەیەک و لە شاخ چ پلەیەکیان هەبووە. من بە هەندێ نیگەرانبوونی خۆمەوە لەو پرسیارانە، وەک فیشەکە شێتە گوتم.. من بۆ لێکۆڵینەوە بانگ کراوم ..! چونکو دیار بوو وەک سەرەقەڵەم جاروبار قسەکانی منی دەنووسییەوە.

بەدوای داواکردنی دوو چای دیکەوە. ئەوجارە هاتە سەر پلەی بەندە لە شاخ. هەڵوێستم لە موفاوەزاتی نێوان یەکێتی و حکومەت. تاکو گەیشتە سەر ئەوەی من چ پەیوەندییەکم لەگەڵ عیراقچییەکانی وەک مەلا بەختیار و سالار هەیە. ئێمە بۆ نەیاری موفاوەزاتین..! تەماشام کرد بەراستی بەپێی خۆم هاتومەتە بەر مێزی لێکۆڵینەوە. بە زۆریش قسەکان درێژەی دەکێشا و بەوپەڕی بێمنەتی وەڵامی پێچەوانەی حەزی دڵی ئەوم دەدایەوە. هەر بۆ نموونە من لە وەڵامی پرسیاری جیاوازیم لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتی چییە..! پێمگوت من کادرێکی خوار سەرکردایەتیم، هیچ ناکۆکیم لەگەڵ

نەوشیروان و مام جەلال نییە، ئەگەر جیاوازییەکیشم هەبوبێت، ئەوە بە خۆمانەوە بەندە و چ پەیوەندییەکی بەنگۆوە هەیە..!

هەنوکە دەزانم، بەراستی پیاوێکی بە حەوسەڵە بوو، هەموو گرژی و توڕەبوونەکانی منی بە پێکەنین و سوحبەتێک وەڵام دەدایەوە. پێش ئەوەی دوا قسەی بکات، تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد و ئەوجا گوتی.. پێشنیار دەکەم جارێکی تریش یەکتر ببینینەوە، خۆمان بەبێ شوانە دادەنیشین..! پاشان ڕێگای نەدام ڕاستەوخۆ قسەی منی بڕی و گوتی.. حەز دەکەم ئەوە بزانی پێش تۆ ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی حیزبەکەت بۆ کارێکی تایبەتی خۆی لە لام بوو، وەک تۆ توند و لاسار نەبوو، باسی هەموو ئەو ناکۆکییانەی ڕیزەکانی یەکێتی و بەتایبەت کۆمەڵەی بۆ کردم، بەتایبەت پەیوەندی خراپی تۆ لەگەڵ نەوشیروان.

بەراستی بەو قسانەی تووشی سەرسوڕمانی کردم و یەکسەر پێمگوت.. ئەو کەسە هەرچییەکی گوتبێ، گوێزی لە گیرفانی خۆی ژماردووە، دەنا نەوشیروان هاوڕێیەکی نزیکی منە و ــ بۆ ئەوێ ڕۆژی و لە بەردەمی موخابەرات ــ بە مەسولی خۆمان و کۆمەڵەی دەزانین. کابرا تارادەیەک داما و ئیتر باسی پاسەپۆرت و سەفەری لە بیر خۆی بردەوە.

هەر ئەوەندە و بۆ جارێکی تر ناماقوڵی لەو جۆرەم نەکرد بە پێی خۆم بچمە ناو کۆشک و تەلاری موخابەراتی عیراقی. داخی گرانم هاوڕێ شوانەی تەنسیق نەماوە، لە ڕێگای گەڕانەوەمان کە باسەکانم بۆ گێڕایەوە. شوانە گوتی دەزانی کێ لە پێش تۆ لە لای ئەبو لوقمان بوو..! گوتم چوزانم. گوتی کاک ف. ع بوو. زەمەن هات و ڕووی، ساڵی ٢٠٠٥ لەو فایلی فایلدارانەی لەسەر مێزەکەی هۆدەکەی مام جەلال بوو لە ماڵەکەی لە قەڵاچۆلان، فایلی ئەو گەورەترین فایل بوو. بەڵام بە هەموو تێکە و لێکەیەک لەوان ڕۆژان ئەو لە لای کاکە و مامە دەستووری موبارەک بوو.

## لێکۆڵینەوە و دادگاییکردنی چەپکێک کادر

زەمەن هەندێک جاران، مرۆڤ وەک تۆپەڵە بەنێک لول دەداو بەدەم کردنەوەی بەنەکەوە ژیان ئینسان رێ و پێ دەگری. جاری دیکەش هەر زەمەن وەک تۆپەڵە بەفرێکی ناو زریان و لوورەلووری گورگ ئاسا، رەشەبا خۆی بە دەموچاوت دادەدا و بەدەم گێژەلوکەی خۆیەوە، سەراسیمای سەماکردنت دەکا، سەمای ناخۆشی و دەردەسەری دەربازیبوون. چونکو هەموو سەمایەک ئارەزوومەندانە نییە و سەمای لەو جۆرە چارەنووسی دەردەسەریت بۆ دەهۆنێتەوە.

وەرزی پاییزی ساڵی ١٩٨٤ بۆ ئەزی، ئەوەک هەر پاییزی گەڵارێزانی سروشست بوو، وەیشومەکانی ژیانم لێرە و لەوێ گەمارۆیان دابووم و پاییزی ئەزمونی تاڵ و تفتی کاروانی خەباتم گەڵاکانی بەسەردا دەباراندم.

هەنوکە کە بۆ فەزای ئەوان رۆژان دەچمەوە. وەک گیانلەبەرێک بۆ لە عەرددان و سەربرین، لە هەموو لایەکەوە تەنگەتاو کرابووم و سەری هارومارانم لێ وێک هاتبوەوە. لە ناو هەموو ئەو گێرەوکێشانەدا، دۆزی لێکۆڵینەوە بوو لەگەڵ من، لە لایەن سەرانی سەرکەوتووی زاڵی کۆمەڵەوە. باری سەرشانمیان چەند قات قورستر کردبوو. باوەڕ ناکەم لەوە قورستر و ئێسکگرانتر هەبێ، لەسەر هیچ و خۆڕایی بە ناو هاوڕێیانی دوێنێی خۆت شەرت بکەن. ئازاری روحیت بەدەمەوە بکەن. کە بە رای من لە کوشتنی یەکجاری چەند کەرەت نگریس ترە. چونکو ئینسان ئەگەر ئینسان بێت یەکجار دەمری و دەبرێتەوە. بەڵام تەنگەتاوکردنی مرۆڤ لەسەر چاو بەیەک هەڵنەهاتن، بوختانی زۆرەملی لە مل شەتەکدان، هەموو رۆژێک و بگرە هەموو تاوێک مردنێکی وەرسکەرە. ئەوانەی هاوڕێیەکانیان لەسەر جیاوازی بیروکردار ئازار داوە و دەدەن، بیانەوێ و نەیانەوێ ویژدانیان پوتە و مرۆڤگەلێکی نەخۆشن. من تێناگەم مرۆڤ کە داوای ئازادی بکات، خۆی بە ئازادیخواز بزانی، چۆن چۆنییەک مەودای ئەشکەنجەدانی روحی هاوڕێیەکانی تر، لەبەر مەیدانبوونی خۆی شایی لەبەردەکات..!

رزگارکردنی کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە، بە پینەپەڕۆی پێکەوە گرێداوی تەونی بەردەستی کارێکتێرە سەرەکیەکانی ینک و هاوکاری دەستی دووەمی توخمە دیارە میانڕەوەکانی ناو خودی کۆمەڵە، کە گوایە بە لایەنگری مەلا بەختیار دەخوێندرانەوە. مایەی رادەستکردنی یەکجارەکی کۆمەڵە بە کەسانێکی زاڵی سەرکەوتووی ئەنجامی

شانۆگەری هەڵبژاردن بوو. هەروەها بەیداخی دەمچەفتی _لە درک پێنەکردنی سەرەداوەکانی پلانی چەند سەرە_ی توخمە مەسولەکان دەشەکاندەوە. دەمڕاستی سەرەکی ئەوان ڕۆژان جەرگبڕترین هەڵەی پێکردین لە چوونەوە ناو کۆنفرانس.

راستە سەرانی هەڵبژێردراوی کۆنفرانس بەسەرپەرشتی نەوشیروان، بەڵێن و گفتێکی کاتی سەرزارەکی هەڵخەڵەتێنەرەیان بەو برادەرە میانرەوانەی وەک ملازم عومەر و ئازاد هەورامی دابوو، کە لە دوای کۆنفراس بە گیانێکی هاوڕێیانە و دوور لە هەر جۆرە تۆڵەسەندنەوەیەک لەو هاوڕێیە بوێرانەی لەناو کۆنفرانس، نەترسانە و بە کۆمەڵ هەڵوێستیان وەرگرت و چوونە دەرەوە. بەڵام ئەوەی بە پراکتێک دەرکەوت، ئەو قسانە تەنیا تاکتیکێکی هەرزان بوو، بۆ لە خشتەبردن و کات تێپەڕاندن. نەوەک هەر لەگەڵ گفتەکانیان راستگۆ نەبوون، بگرە هێشتا چەند هەفتەیەک تێنەپەڕیبوو، بە ئاشکرا کەوتنە لادان و دوورخستنەوەی دەیان کادری ڕۆژە دژوارەکانی خەباتی کۆمەڵە. بە تایبەت لە بواری ڕێکخراوەیی کە هەتا ڕێکخستنەکانی ناو شاریشی گرتەوە. دوا بەدوای ئەو هەنگاوە مەغرورانەیە، وەک گەف و چاو ترساندنێک مانۆڕی دادگاییکردنی دەستەیەک لە هاوڕێ برێوە دیارەکانی (وەک خۆیان بە نەیاریان دەخوێندنەوە) بەشداربووی کۆنفرانس بەدەم قاقای پێکەنینی گاڵتەجاڕانە هێنرایە گۆڕێ.

نا.. هەرگیز ئەو ڕۆژانەم لە بیر ناچێتەوە و لە بیرم نەکردوون، باری ئازارەکان هەتا دەمرم بەسەر فەزای بیروکردارم، بەسەر شانمەوە لنگیان شۆڕکردووتەوە..

ڕۆژێکی کۆتایی مانگی نۆی ساڵی ١٩٨٤ بوو. بە ئاگادارییەکی ناوەرۆک وشک و برینگ، پێیان ڕاگەیاندم، کە دەبێ لە بەردەم ئەو لیژنەیەی سەرانی کۆمەڵە بەدوای کۆنفرانسەوە بۆ لێکۆڵینەوە لە ئەز و جەپکێک هاوڕێ بڕیاریان لێداوە، بەبێ دواکەوتن ئامادەبین. ئەوانەی قازی و حاکمی ئەو دادگایی کردنە بوون.. ئەم زاتانەن

_ خەسرەو شێخ محمد خاڵ _ یادی بەخێر کۆچی دوایی کردووە_ تا ناخی سەر ئێسقان بە رقوقینەی کوێرانە هەڵسوکەوتی لەگەڵمان کرد و زۆری ئازاردایــن. هەموو جارێک بە یەک پاشۆڵ پەیڤی لەوجرانە ڕووبەڕوومان دەبوەوە. بە ڕوویەکی ترش و دەموچاوێکی لوچاوی تژی لە دڵەڕاوکێی ئیستفزازی دەکردین.

_ عومەر فەتاح کە هەنوکەش ئەندامی م.س یەکێتیە. جار ناجارێک نەرمی دەنواند و پێوەی دیار بوو لە قەناعەتەوە فشەی سمێلانی بەو جۆرە دادگاییکردنە دەهات و کاتی بە ڕێ دەکرد.

_ محمد تۆفیق رەحیم بەدوای چەند دانیشتنێک، ئەو بوارەی بە جێ هێشت. کە هەنوکە لە سەرکردایەتی بزووتنەوەی گۆڕانە. ئەو چەند جارەی لەگەڵمان دانیشت، بەوپەڕی ڕێز و حورمەت و دەم بە پێکەنینەوە مامەڵەی دۆستانەی خۆی نەدەشاردەوە و فشەی بەو دادگاییکردنە دەهات. لە قسە رەقوتەقەکانی هاوکوفەکانی دەهاتە دەنگ، وەک مرۆڤێکی بە مەعریفەی خاوەن هۆش هەڵسوکەوتی دەنواند و زۆر جاران بواری زێدەڕۆیی خەسرەوخاڵ و ئەوانەی دیکەی بەرتەسک دەکردەوە.

_ حەسەن کوێستانی _ یادی بەخێر لە شەڕی ناوخۆ تیرۆر کرا_ بە شەرمەوە ڕووبەڕوومان دەبوەوە و جاروبار دەیگوت.. ئەتۆ مامۆستامان بووی. لە بەردەوامی فستق تەقاندنەکەی بەدەممان پێدەکەنی.

_ شۆڕش حاجی هەنوکە بە رەسمی لە هەڵسوڕاوانی بزووتنەوەی گۆڕانە. لەشانی خەسرەو لە رەقوتەقی قۆشمەی بوو. بۆ ئازاردانمان و تۆڵەی ئەو چاکەیەی منی دەدایەوە، کە لە مانگی دوازدەی ساڵی ١٩٨٠ لە گوندی خدرانی بناری کێوی کۆسرەت، لەلایەن هێزەکەی فەرەج و مەندەی کۆیی دەستبەسەر کرابوو، من بە تۆبزی لێیانم وەرگرتەوە، کە دایان نابوو بیکوژن. ئەو چەند جارەی بەرانبەرم دەبوەوە، دەتگوت لە دادگای لاهای دانیشتوە و دوژمنی باوککوژەی دادگایی دەکات. هەتا دەمرم لە بیرم ناچێتەوە و لە ڕۆژی خۆیدا سکاڵای خۆم بۆ دادگای کاتی گونجاو بەرزدەکەمەوە..

لە یەکەم دانیشتنی ئەو دادگاییکردنەی مندا، کە بە تەنیا لێکۆڵینەوەیەکی یەک سعاتییان لەگەڵ کردم. دەموچاوەکان بە میکیاجی خەندەی دەستکرد پێشوازییان لێ کردم. کە زۆرتر خۆی لە قەشمەری پێکردنی دەم گاگۆڵەکردنەوە لە شەقەی باڵی دەدا. خەسرەو خاڵ بە پلەی یەکەم لە هەموویان زیاتر پڕ گەف و قسەی بێدەرپێی تاوانبار کردنمی دەخوێندەوە، کە تەنیا شایستەی لەسێدارەدان بم. بەڵام نامکوژن هەتا هەموو سەرەداوەکانی پلانی کودەتایەکەمانم پێ ئاشکرا دەکەن..! وەک ئەوەی ئەز و هاوڕێیەکانی تر لە کەمینی شەوانەی سەر ڕەوسە، دنکە گەنمی ماڵی پادشای شاخەکانم خواردبی..! بەدوای ئەو قسە بێتام و بێ بەڵگانە، بەڵێنی ئەوەیان پێ پڕکردمەوە_ من

لە پاکی خۆم دڵنیا بووم ــ، کە دەبێ یان لەبەر دەستییان و نزیک خۆیانەوە بژیم، یاخود لە هەموو ئەو دانیشتنانە بەبێ دواکەوتن ئامادە بیم و خۆم بزر نەکەم..!

چاو سوورکردنەوەکان، پتک و پلارەکان لەلایەن خەسرۆ خاڵ و دواتر عومەر فەتاحەوە، رەق و تەق بوو، وەک ئەوەی تامەزرۆی بە سزاگەیاندنی، یەکێکی باوککوژەی خۆیان بن. یاخود جاسوسیکی فایلداری سووکوسەلیمی ریزەکانیان دادگایی بکەن. دیار بوو لەلایەن وەستایەکی پسپۆری ئەشکەنجەی روحی ئامۆژگاری کرابوون. کە بەدەم فستق و تۆخم تەقاندنی سەرجۆخینەکان، بەردەوام بە لیژنەی چار پێنج کەسییەوە، روو لە تاکە کەسێک، دەکەوتنە هێرشی رووشکێنەرانەی دوور لە هەر هەستێکی گیانی هاورێتی دوێنێمان. تاکە کەس کە لەو زنجیرە دانیشتنەی لەگەڵ ئەز بەسترا، تەنیا حەمەتۆفیق رەحیم بوو، ئەگەر بهاتایە ناو دەمەتەقێیە ورە پرووکێنەکانی ئەو زاتانە، زۆر بە رێز و پەیڤی نەرم و هێمنانە دەیدواندم و هەرگیز گوشاری نەدەخستە سەرم بۆ وەڵامدانەوەی دەیان پرسیاری پرپووچی ئەندامەکانی دیکەی لیژنەکە. کە جاری وا هەبوو هەمان پرسیاریان بۆ تەنگاوکردنم بەدوای یەکەوە دووبارە دەکردەوە.

زەمەن وردە وردە خلۆر دەبوەوە، بوردومانی فرۆکە و تۆپبارانی هێزەکانی رژێم بۆ سەر ناوچەکە لە زیادبوون دابوو. دەمڕاستی لیژنەکە، خسرەوخاڵ هەر زوو فریای خۆی کەوت، لە ترسی فرۆکە بۆ دەرەوەی وڵاتی قوچاند. عومەر فەتاح شوێنەکەی گرتەوە، بەڵام هەموو ئەو هاورێیانەمان کە لێکۆڵینەوەمان لەگەڵ دەکرا (ئەوانەی ژ بیری ئەزی مابن... مەهدی کاوانی، سدیق گوران، خەلیل دهۆکی، مام هێدی، حەمە رەئوف، ئەز بوون.) لەباتی ماندووبوون و گیانفیداکارییەکانی ئێمە، ئەوان خۆیان هەموو جارێک سەریان دەدا لە بەردی رەقی وەڵامەکانمان. هێدی هێدی وەرسبوونیان پێوە دەلەنگاوە. ئەوەبوو بەبێ ئەوەی بگەنە سەرەداوێکی مەبەستە هەڵبەستراوەکانیان، لەوەی ئێمەی خەریک و گوایە لەناو ریزەکانی کۆمەڵە خاوەن رێکخستنی ژێر بە ژێرەکی تایبەتی خۆمانین و بنکەی نووسین و بڵاوکراوەی شاراوەمان هەیە..! ناچار ئارەزوومەندانە خۆیان دەستییان لەو دادگاییکردنە بازارییە هەڵگرت. کەس بە ئەنجامەکانی ئاشنا نەبوو، کە سەری زمان و بنی زمانیان ئەوەی دەگوتەوە، لەپاش بە ئەنجام گەیشتنی خەیاڵپڵاوییان، ئەو ئەنجامە بە هەموو لایەک بڵاو دەکەنەوە. کە هەرگیز بڵاویان نەکردەوە و گوایە دەمانکەنە سۆدرە و وەک عیبرەت بۆ چاوشکاندنی کەسانی دیکەی

هاوبیرمان. به ئاشکرا جاڕی دەدەن، تاکو وەک هەڤاڵە فایلدارە سووک و سەلیمەکانیان، ئەستێرەی پلەوپایەی جاسوسییان ببریقێتەوە..!

بێگومان کاری تژی لە شەرمندەییان کە ئەو دەمیش جامی شەرمیان بەتاڵ بوو. تاکە بەرهەمێکی ئەوە بوو، ئێمەیان ناچار کرد و ئەوەیان فێرکردین کە بیر لە خۆمان بکەینەوە و لەدایکبوونی ئەڵقە رۆشنبیرییەکانی سەرلەنوێی ئاڵای شۆڕش یەکێک لە بەرخوردەکانمان بوو. لەپێناوی لەدایکبوونی رێکخراوێکی نوێ کە ئەوانی تووشی ئەوە کرد، دەستی خۆیان بشکێننەوە، کە ئێمەیان بە زیندوویێتی چاوان زیندە بەچاڵ نەکرد و بە خۆرایی لەدەستیان دەرچووین.

## داوەتی مام جەلال لە گوندی ئاوژێ

رۆژانی تەمتومانی تەمومژاوی دادگاییکردنەکەمان بەردەوامبوو. مەزەندە دەکەم لە دانیشتنی سێیەم بوو، زۆریان ماندی کردبووم. هەڕەشەی زۆریان بەسەردا هەڵڕشتبووم. بە جۆرێک هەتا بە گەف داوایان لێ کردم کە نابێ بەبێ ئاگاداری ئەوان، بۆ هیچ شوێنێک و سەردانێکی دووری دەسەڵاتی ئەوان بچم.

لە بیرمە بەسەروگوێلاکێکی بریندای ئەو دۆخە فشاراوییەدا و بەدوای دانیشتنی ئەو رۆژە. گەرەکم بوو بەدەم پیاسەکردنەوە، بچمە ماڵی محمد سیاسی لە گوندی مەرگە. بۆ ئەوەی پشوویەکی حەسانەوە بدەم، وەک هاوڕێیەک لەو دەڤەری، دەردەدڵی خۆمی لەلا پەنهان بکەم. کە دەبوو بۆ سبەینێ سعات دەی پێش نیوەڕۆ، سەر بە دانیشتنێکی دیکەوە بکەم.

بەدەم رۆیشتنەوە لەو بارەگای دادگاییکردنە دەرچووبووم. بە رێگاوە سەری خۆم لە بەرخۆم نابوو، کەوتبوومە دنیایەکی تایبەت بە خۆم لە پێداچوونەوەی رۆژمێری ئەو دادگاییکردنە سیناریۆئامێزە کە بەرۆکی گرتبووم. لە پڕ سەیارەیەک لەتەکمەوە ئیستۆپی گرت و بە هۆشی هێنامەوە. سەرم هەڵبڕی و دیتم ئەوە هاوڕێ مامۆستا سەرکەوتی ـــم تاهیر یادی بەخێر لەم یەک دوو ساڵەی دوایی لە سوید کۆچی دوایی کرد_ هەڵبجەیی بوو. لۆم دابەزی و دوای یەکتری لە باوەش گرتن، بە وردی دیقەتی دام و گوتی.. دیارە ئەو نا ئینسانانە زۆریان ئەزیەت داوی. چونکو دادگاییکردنمان بە هەموو لایەک بڵاو

بیوەوە. مامۆستا سەرکەوت _ تاهیر یەکێک لەو پێشمەرگانەی سەرەتایی هەڵگیرساندنەوەی بزاڤی چەکداری شاخەکان بوو، مرۆڤدۆستێکی بەوەفا و سەربڵندی دڵسۆز و هەواداری بیروباوەڕەکانی کۆمەڵە و ئارام بوو. لە وڵاتی سویدیش هاوڕێتیمان خۆش بوو، بە هۆی نەخۆشییەکی کوشندە کۆچی دوایی کرد _ دەستی گرتم و بەزۆر لەگەڵ خۆی سواری پێشەوەی سەیارەکەی کردم، کە پیکابێکی عەسکەری بوو. لە درێژەی قسەکانی گوتی.. بە خۆم لەدوات دەگەڕام و هەواڵی وجوودی تۆم بۆ بەردەم ئەو شانۆگەرییە گاڵتەجاڕییە دوێنێ لە مامۆستا پشکۆ بیست. بۆ چەندان مانگ دەبێ کۆمەکی پێشمەرگانەکەتم لە لای خۆم بۆت گلداوەتەوە. کە بە هیچ جۆرێک ئامادەی وەرگرتنی نەبووم و گوتم با یەکێتی بۆ خۆی هەڵیگرێتەوە. قسەکانمان تەواو نەکردبوو، گەیشتینە بنکەکەیان. لەو دەمی نازم عومەر کە مەسولی کاروباری مەکتەبی دارایی یەکێتی بوو. دەهاتە دەرەوە و چاوی پێمان کەوت و دۆقەیەکی گەرمی لەگەڵ کردم. بە هاوڕێ سەرکەوتی گوت.. بەپەلەم و بۆ لای مام جەلال دەچم، هەتا دێمەوە حاجی مەمۆ ئیزن مەدە. م. سەرکەوت بۆ ژوورەکەی خۆی بردمی و بە خۆی چوو لەو خۆراکی نیوەڕۆیەی هەیانبوو، بەشی خۆی و ئەزی هێنا. بەدەم بەردەوامی قسەکانمانەوە هێشتا خواردنەکەمان تەواو نەکردبوو. یەکێک لە دەرگەیدا. تەماشامان کرد، حاکم شوانی برازای مام جەلال بوو، کە ئەو دەم بەرپرسی نووسینەگەکەی سکرتێری گشتی یەکێتی بوو. بەدوای سڵاوکردنێکی دۆستانە گوتی.. کاکە حاجی مەمۆ، مام بەدوای تۆیدا ناردووم. فەرموو با بڕۆین و دوایی ئەگەر مام ئیزنی دای، شەو هەر خۆم بۆ ئێرەت دەهێنمەوە.

ماڵئاواییم لە م. سەرکەوت کرد و عوزرم خواستنەوە بۆ نەگەڕانەوەی شەو. چونکو بەراستی گەرەکم نەبوو کەس لەسەر داڵدەدانم تووشی سەریەشەی لێپێچینەوە بکەم و هەر لە لای خۆشمەوە بڕیارم دابوو شەو لە ماڵی محمد سیاسی لە شارەگوندی مەرگە بمێنمەوە. بە چەند خولەکێک گەیشتینە بەردەم بنکەکەی مام جەلال. دیار بوو مام لەسەر سەکۆی پێشەوە پیاسەی دەکرد. هەرکە چاوی پێم کەوت، چەند هەنگاوێک هاتە پێشەوە و دۆقەیەکی گەرمی لەگەڵ کردم و بەرەو هۆدەکەی خۆی دەستی گرتم. لە پێشەوە نیگەرانی خۆی بۆ دەرخستم لەو جۆرە مامەڵەی دەسەڵاتدارانی کۆمەڵە، کە بۆ خودی کۆمەڵە بە زیان گەڕایەوە. مام قسەی زۆری بۆ کردم و من سەرەتا هەر گوێمگرت. تاکو هاتە سەر ئەوەی کە لەو تاوەوە بچم لە نووسینگەکەی ئەو بە

شێوەیەکی کاتی بمێنمەوە و گوتی.. دڵنیات دەکەمەوە لەسەر حسەی خۆم بۆ ساڵێکی دیکە دەتگەیەنمە مەکتەبی سیاسی ینک، چونکە نامەوێ تۆم لەکیس بچێ..! هەروەها لەناو قسەکانی پێی گوتم.. دڵنیات دەکەمەوە مەلا بەختیار و سالار ئەمرۆ یاخود سبەی بێت، هەر دەگەڕێنەوە و واز لە لاساری خۆیان دەهێنن. بەڵام بەخۆڕایی کەسی وەک تۆم لەدەست دەڕوات. وەرە واز لەوانە بهێنە و لە لای من خۆت بە کارێک خەریک بکە. ئیتر کەس ناتوانی شەڕت پێ بفرۆشی. لەو لەحزە بە چاکم زانی بە تێری بیر بکەمەوە، ئەوجا وەڵامی تەواوی مام جەلال بدەمەوە. هەر ئەوەندەم لێ داوا کرد، کە لە لایەن خۆیەوە مەرەخەسی رۆیشتنەوەم بۆ دابین بکات و بیرێکی لێ دەکەمەوە. مام جەلال یەکسەر دەستی بۆ قەڵەم و کاغەزێک برد، شتێکی لەسەر نووسی و بانگی یەکێکی کرد و گوتی بەخێرایی ئەو نامەیە بۆ کاکە نەوە _ نەوشیروان__ ببەن. دواتر مام جەلال کە سەیری کردم، تۆزێک هێور بوومەتەوە. ئەوجارە باسی ئەوەی لەگەڵ کردم، ئەگەر ئێوە بە نیازی دروستکردنی رێکخستنی خۆتانن..! من هیچ لارییەکم نییە، بەو مەرجەی لەناو یەکێتی بمێننەوە و باڵی چوارەم بن، یا بە هەموومان یەک هێزی پێشمەرگەمان هەبێت..! ئەوە پەیامی منە بۆتان و ئامادەم هەموو هاوکارییەکتان بکەم

هەنوکەش من لەو باوەڕەدام، کە ئەو دەم مام جەلال وەک سیاسەتمەدارێکی بە ئەزمون، ژیان تژی لە کێشە و دژوارییەکانی هەوراز و نشێوی کاروانێکی سەر بە گۆبەند، گەرەکی بوو.. هەمیشە بە خۆی خاڵی کۆکردنەوەی خەڵک بێت، ئەو خەڵکە بە دەوری بەری خۆیەوە گرێ بدات. بەڵام چ ئێمە، چ ئەوان لە ئاستی تێگەیشتن و کارئاسانی پێکەوە گونجان نەبووین، بە تایبەت ئەوان کە لەقوڵایی ناخیانەوە و بەوپەڕی رقەقینە، بڕیاری تارمایی مەغروربوونی سێبەری هێزی چەکداری دەوروبەریان، بڕیاری یەکلایەنی شەڕی ئێمەیان دابوو. کە دەبی بە هەر نرخێک بێت، ئێمە ترۆ بکەن

ئێوارە درەنگ لە لای مام جەلال بە سەیارەیەک رەوانی گوندی مەرگە کرام کە من پێم گوتن بەدوای سەردانی محمد سیاسی، شەو دەچمە بنکەکەی نووسەران. هەر لە سکرتاریەتی مام جەلال بە ئیمزای خۆیەوە، بۆ بەیانیش پسوڵەی مۆڵەتییان بۆ کردبوم، بۆ گەڕانەوە هەر ناوچەیەک کە خۆم گەرەکمە و لە لای ئەو گوتم، دەچمەوە خۆشناوەتی و لە گوندی نازەنین دادەنیشم.

# خۆ دەربازکردنم لە دەسیسەی دەستبەسەرکردن

بەدوای ئەوێ دیداری مام جەلال و گەڕانەوەی بێمنەتانەم بۆ ناوچەکانی خۆشناوەتی کە ئەوە یەکەمجارم بوو بەدوای مەرگی هاوڕێیان مەلا غەفور و دەستەبرا شەهیدە نەمرەکانی هاوڕێ، سەردانی لەو جۆرەی نازەنین بکەم. لەبەر ئەو گفتەی دابووم جارێکی دیکە بۆ دانیشتنێکی دیکەی دادگاییکردنەماندا چوومەوە. لە قسەکانی سەرزارەکی دوا دیداری ئەوان کەسانەی لیژنەکەوە، هەستم کرد زمانی هەڕەشە و گوڕەشەکانیان کاڵبوەتەوە و ئەوجا ترسام. بە جۆرێک لە شێوازی تەفاهومی رووکەش دەدوان. بە تایبەت ئەوان رۆژان پەلاماردانەکانی رژێمی بەعس بۆ سەرهێزەکانی یەکێتی، کەوتبووە دۆخێکی دژوار. سەرما لە دەموساتی خۆی بوو. کۆتایی پاییز شێی بە هەموو پوش و پەڵاشی دەشتودەر هەرهێنابوو. هەر بابایەکی مەسول بوو لە مشورخواردنی ئەوەبوو، لەو ناوچەی سەرکردایەتی دووریکەوێتەوە. بەڵام دیسانەوە گومانەکانم ئەوەیان لە بەر هزرم دەخولقاند، کە گۆڕانی رەقووشکی زاریان بۆ نەرمونیانی، نیشانەی چارەنووسێکی نادیاری لە بەر دیدم بەسەر پێ خستبوو. بە جۆرێک ئەو رۆژە تەمومژ، بەسەر سەرتاپای دەڤەرەکە رەشماڵی خۆی بەردابوەوە. لە بیرمە لە لیژنەکە تەنیا عومەر فەتاح و حەسەن کوێستانی هاتبوون. بە هەندێ قسەی گشتی و بەبێ هەر جۆرە پرسیار و وەڵامێک لەگەڵ ئەزی، دانیشتنەکەیان بە زوویی پێچاییەوە و منیان مەرەخەس کرد. ئازادم بۆ هەرکوێیەک دەچم. منیش بەبێ ماڵئاوایی کردن خەریکی بە جێهێشتنی ئەو شوێنە بووم. دیتم حەسەن کویستانی هەنگاو بە هەنگاو دوام کەوتووە و دوای هەندێ خۆ هینان و بردن، کەوتە دواندنم لەوەی ئەو ناچارکراوە کە لەو لیژنەیە بەشداری بکات. دەنا هەنوکەش ئەز بە مامۆستای خۆی دەزانی و رێز و حورمەتی منی بەدوای ئەو دانیشتنانە لە لا گەورەتر بووە..! حەسەن لەپاڵ قسەکانی پێشنیاری پێ کردم، بۆ شەو بچمە لای ئەوان و سەرێکی نەوشیروان بدەم. منیش وەڵام دایەوە و پێم گوت تازە ئەو خۆ شیرین کردنەی گەرەک نییە و ئەز لە لای مام جەلال دەعوەتم و بەبێ هەر جۆرە موجامەلەیەک بەجێم هێشت. لێرەدا زیاتر دڵم قرقراو لە خۆم بەترس کەوتم. لە رێگای دەرچوونم لە نووسینگەی مام جەلال ـەوە، کە زۆر بە کورتی رای خۆم پێگوتن..

من تەندروستیم ناتەواوە و دەچمەوە ماڵەکەی خۆم لە گوندی نازەنین و لە هەر گۆڕانکارییەکی دۆخی خۆم ئاگادارتان دەکەمەوە.

ئەو جارەیان گوراحم لە جێی خۆی بوو، بە هێمنی بیرم کردەوە و پێش ئەوەی بگەمە بەردەم ماڵەکەی محمەد سیاسی، رووبەڕوو تووشی هێمن_ە رەش هاتم. کە لەو ساڵەدا چەند جارێک لەلایەن مەلا بەختیارەوە نامەی بۆ هێنابووم. ناوبراو دڵسۆزانە باوەشی پێدا کردم و تەماشایەکی ئەملاو و ئەولای کرد. کەسی ئەوتۆ دیار نەبوو، هەردووکمان بناسی و بەدەم پیاسەکردنەوە لەوە ئاگاداری کردمەوە. لە بنکەکەی نەوشیروان گوێی لە جەبار فەرمان بووە، پێشنیاری کردووە کە پێش ئەوەی مام جەلال فریای رزگارکردنی حاجی مەمۆی بکەوی، با لە پەنایەک بیگرین و من خۆم دەزانم چی بەسەر دەهێنم..! دڵنیا بن بە چارەنووسی وریای گورپەگوڕی دەبەم..!

بۆیە ئاگادارت دەکەمەوە، وریای خۆت بەو تا دەتوانی لەو ناوچەیە نەمینێیتەوە. بە سوپاسەوە لە هەمێزم گرت و لە یەکتری جیا بووینەوە و هەتا دنیا ماوە بۆ ئەو لاوچاکییەی سوپاسگوزارم..

بە عەقلی خۆم سەرەتا سەرێکم لە محمەد سیاسی دا. کورتەیەکی ئەو خەبەرەم بۆ گێڕایەوە و چەندی کردی کە بۆ شەو لە لای ئەوان بم و ئەو بێمنەتە لەوەی هەر یەکێک بێتە سەرمان... بەڵام خۆم سوور بووم لەسەر ئەوەی بچمە بنکەی نووسەران کە هەر لە گوندی مەرگە بوو. بە محمد سیاسیم گوت، ئەگەر بۆ بەیانی زوو سەرم نەدانەوە، سۆراخم بکات و لەدەمی بزربوونم هەواڵەکە بگەیەنێتە ملازم عومەر و ئازاد هەورامی تاکو ئاگاداری مام جەلال بکەنەوە..

شەو لە نووسەران کە دوو برادەری بادینیش لەوێ بوون، سعدالله پەرۆش و سامی.ش، جەوهەر کرمانج و محمد موکری هەبوون. هەتا درەنگانی شەومان بەکۆنکان و خواردنەوە و خوێندنەوە کۆتا پێهێنا. هەر کەسە لەسەر جێگایەک پاڵکەوتین. بەیانی بەر لە هەمووان بێدار بوومەوە، چونکە لە دڵەوە خورپەی رووداوی نەخوازراو تەزینی ناخۆشی بە گیانمدا دەهێنا. کە چوومە سەر کانیاوی مزگەوتەکە بۆ دەست بە ئاو گەیاندن، بە وردی دیقەتێکی ناو دەستەکانم کرد کە لە پشتەوە بە دەلاقەی گەورە کرابوونەوە. لەو گوڕە خەیاڵی بازدانم لێیانەوە بە ئاسانی هاتە بەرچاو بۆ هەوڵدانی خۆ

دەربازکردن لە دەمی فشار بۆ هێنانم و هەرچەندە یەک دەمانچەی سمسی پڕ لە شەش فیشەکم لەبەر پشتێن بوو..

دروست لەگەڵ گەڕانەوەم، خەریکی خۆ ئامادەکردن بووم، بۆ نانخواردنی سبەینە بچمەوە ماڵی محمد سیاسی کە بەڵێنم پێدابوون.، لەو دەمی و بەو بەیانییە زووە نەوشیروان و جەبار فەرمان و چەند کەسێکی دیکە کە ناوەکانیانم لە بیر نەماوە، لەگەڵ یەک دوو پێشمەرگە خۆیان کرد بە بنکەی نووسەران و لەو قەرەباڵغییە، ئەوانەی دیکەش بە واق وڕماوی بێداربوونەوە. نەوشیروان وەک ئەوەی نەزانی من لەو ناوچە بم، پرسی ئەوە چ کارەی حاجی مەمۆ لێرە..! گوتم ئەوە بنکەی نووسەرانە و ماڵی هەمووانە. من کۆلەپشتەکەم بە دەستەوە بوو، جەبار فەرمان بەبێ ئیزن لە خۆم، لە دەستی راپسکاندم و کەوتە پشکنینی کە تەنیا وردە کەلوپەلی خۆم و یەک دوو کتێبی رۆمانی عەرەبی تێدابوو. کە هەر ئەو دوو کتێبەیان بووە دەستکەوت دەنا بۆ سەری من هاتبوون.

ئەو برادەرە نووسەرانەی لەوێ بوون، بە چاوی خۆیان باوەڕیان نەدەکرد کە تازە من چۆن لە دەستیان دەرباز دەبم. چونکو نەوشیروان پرسی.. چ کەلوپەلی دیکەت لێرە هەیە..! گوتم نەخێر. درێژەی پێدا و گوتی... دە هەستە بچینە لای خۆمان و میوانی ئێمەی. نازانم چ بیرکردنەوەیەک بوو بۆم هات و گوتم باشە و پێم خۆشە. بەڵام تەنگاوم و دەچم سەر ئاوێک دەکەم، کە تازەش لەسەر ئاو هاتبوومەوە. وا بزانم لە بەرچاوی ئەو برادەرە نووسەرانە شتێکیان نەگوت و کەسیشیان لەگەڵ نەناردم. بەڵام ئەو دوو پێشمەرگە چەکدارەی لەتەکیان بوون، ئاگام لێ بوو بەدوای منەوە هاتنە دەرەوە و چاوڕوانی گەڕانەوەی ئەزیان دەکرد. کەچی هەرکە گەیشتم و نەگەیشتمە ناو ئاودەستەکەوە، بە دەستوبرد یەکسەر لە دەلاقەکە ئاودیو بووم و لەگەڵ خۆ فڕێدان، خراپ بەربوومەوە و ڕانیکم ئازاری پێگەیشت. بەڵام ئازارەکەی گەرماوگەرم بوو، بلەز خۆم گەیاندە بەردەم ماڵەکەی محمد سیاسی. وەک ئەوەی ئەوان چاوەڕوانم بکەن، خۆی و براکەی لەسەرپێ بوون و هەر گوێی لە گێڕانەوەی هەواڵەکە بوو. دەستی گرتم و بە شەلە شەل منیان گەیاندە ماڵی ئاسیاوێکیان کە ترومبێلی هەبوو. لەو ماڵە بەسەرپێییانەوە سەرونانە کولێرەیەکی گەرمی فڕنیمان بە ماست تۆش کرد. ئەو برادەرە شوفێرە لەسەر قسەی محمد سیاسی منی لە پشتەوە درێژکرد و هەتا لە ئاقاری

سەیتەرەکەی پێشمەرگەکانی نوقتەی کۆنترۆلی دەرەوەی مەرگە ترومبێلەکەی بە لاڕێدا لێخوری و کە مەترسی نەما. سەیارەکە ستۆپی کرد و لە درێژبوون راستبوومەوە و هاتمە پێشەوە. هەتا ناحیەی بنگردی بە لاڕێی گوندەکانی دەوروبەر بردمییە لای موزەمیدێکی ناسراوی و ئەویش دەست وبرد بریینی رانمی پاککردەوە و دەرزییەکی ئازاری لێدام و بەرچاوم گەشبوەوە و بەسەرپێیانەوە کەوتم. هەتاکو لەناو ماڵەکانەوە لە سەیتەرەکەی گوند دەرچووم ئاوڕم نەدایەوە. کە ئەو شوفێرە ناسیاوەکەی محمدی سیاسی برادەرم بۆی دەستنیشان کردبووم و لەسەر رێگاکە چاوەڕێی دەکردم. بە سەلامەتی گەیاندمییە ناو رانیە و چەندم کرد هیچ پارەی لێ وەرنەگرتم. ئیتر لێرەوە بە ئیجازەی سەربازی براکەم کە لە حامیەی رانیە سەربازبوو، بە سەلامەتی گەیشتمەوە هەولێر و خۆشاردنەوە و ئیختفای سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە. ئەوجا نەوەک هەر لە ترسی راوەدوونانی دامودەزگا سیخورییەکانی رژێم، بگرە بەدواداگەڕانم لەلایەن چەکدارەکانی یەکێتیشی هاتە سەر. چونکو لەلایەن ئەو هاوڕێ و دۆستانەی لەناو یەکێتی مابوونەوە. ئاگادار کرامەوە کە لێرە بەدواوە فەرمانی گرتنم بە زیندوویێتی یاخود کوشتنم لەلایەن دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵەی بەردەستی نەوشیروان بۆ دەرچوو بوو. لەلایەن هاوڕێ شێرزاد سەرسپی، بەرپرسی مەفرەزە چەکدارەکانی ناوشاری هەولێری مەڵبەندەی چوار هەفتانە بەسەر دەکرامەوە و زانیاری نوێی پێدەگەیاندم کە هاوڕێیەکی شاراوەی ئەڵقە رۆشنبیرییەکانی سەرەتایی ئاڵای شۆڕش بوو.

## ژانی ئازاراوی لە دایکبوونی ئاڵای شۆڕش

ژانی لەدایکبوون خۆی لە خۆیدا، پرۆسێسێکی پڕ لە ئازار و دەردیسەرییە. چوون ئەو لەدایکبوونە بە تایبەت ئەگەر سیاسی و رێکخراوەیی نوێ بێت. بە هەموو مانایەکی لوژیکی، واتە خولقاندنی گیانلەبەرێکی نوێ دەگەیەنێ. لەو چاوپەنایەیەوە، هەموو ئەو رێکخراو و حیزبانەی بە ناوی چەپگەرایی، ناسیۆنالیستی و کوردایەتی لە قەوارەی کورد هاتونەتە ئاراوە، بەو پرۆسەیەی ژانگرتنی ئاسایی و دروست سەریان دەرنەهێناوە و بە فراقبوونی ئاسایی تێنەپەڕیون. بگرە زۆرتر بە پارەسووانی تۆبزی بەرچنگی

توخمگەلێکی مەکرۆی لاسایی کەرەوەی دەورووبەر و بیانی، دروستکردنی بۆدی حیزب حیزبانێیان، بە هەنگاوی سەقەت و پەقەت بە سەرپێیانەوە خستووە.

سالانێک بەر لە سالی ١٩٨٥، کۆمەلەی مارکسی لینینی _ بیر و باوەڕی ماتسی تۆنگ _ لە سالی ١٩٧٠ لە دایک بووە. زۆرێک لەوانەی سەبارەت بە کۆمەلە لە بنەچەوە بۆ مەبەستی تایبەتی ئاوەژوکردنەوەی راستییەکان دەئاخڤن. ئەوجا سەروگوێکردنی راستییەکان بۆ بەر سێبەری تەلخی عەقلی قوندەیان، خەشیمانە بە دەستکاری ناوی ئەو کۆمەلەیە دەنووسنەوە و بۆ راپیکردنی خواستەکانیان بە کاری دەهێنن _. ئەوانە لە بیری خۆیان و خەلکی دەبەنەوە، کۆمەلە لەسەر دەستی شاسوار جەلال و دەستەیەک لە هاوڕێیەکانی، لە قۆناغی گاگۆلەکردن و ئینشاقاقاتی بچوک بچکوکی ئێرە و ئەوێی رۆژگاری بەسەرپێکەوتنییەوە، قۆناغی شەقوپەقی لە ١٩٧٥_١٩٧٧ بڕیوە.

کۆمەلە لەوێ رۆژگاردا وەک رێکخراوێکی چەپی نوێ، لە بارودۆخێکی هێجگار ناهەمواری پەراوێزی بە جێ هێشتنی لەلایەن سەرکردایەتییە رەسمییەکەیەوە و لە هەنگاوێکی بوێرانەی کەموێنەدا، هاوڕێگەلێک بەسەرپەرشتی خودی ئارام، گیان بە بەر بۆدی کۆمەلەدا کراوەتەوە و لە هەوێزی چەپکچەپکی ئێرە و ئەوێ بە شێوەیەکی کاتی رزگار کراوە.

ئارام هەوڵ و کۆششی بێوچانیدا، تاکو بە ستروکتورێکی نوێی هەمێزی بیروباوەڕی مارکسیزم _ لینینیزم، کۆمەلە بخاتە سەر راستە رێگای خەباتی چینایەتی و نیشتمانی. بەلام هەم کارێکتێری کەشوهەوای خودی کۆمەلە لەو ئاستەدا نەبوو، هەمیش ئەو کەرەستەی هەیبوو، لە پاشماوەی پەرێزێکی پەرشوبلاو کۆ کرابووەوە. مایەی دەستەخرۆبوونی ئارام _ ی بە نیوچەوانەوە بوو. شاسوار جەلال لەو مەیدانەدا تەنیا بار تەلاشی بێوچانی خۆی سەرف کرد. بە جۆرێک هەنگاوی شۆرشگێرانەی ئەوێ رۆژێی دەستبردنی پەلەپروسکێیانەی ناچاری بۆ بزاڤی چەکداری بەو جۆرە زەخیرە دەلەمەیە. بار و ئەرکی ئەوی بێپشت و پەنایەکی ئەوتۆی مەیدانی گەیاندە بنبەست و، ئەرکەکانی زۆر لەوە قورستر کرد کە هەتا خۆی چاوەڕوانی نەدەکرد. ئیتر لەو بارودۆخە دژوارەدا، لە کتوپڕێکدا تروسکایی ئەستێرەی ئاسمانی هیواکان کوژێنرایەوە. ئاوابوونی مانگەشەوی بیر و هزری پراکتیکی خودی شاسوار جەلالی بە دەمەوە بوو. بەبێ ئارام کاروانی هەوڵ و کۆششە بەردەوامەکانی دەمی لێقەومان، تووشی هەلوەشانەوەیەکی ترادیژیایی بێوێنە

بوو. به چەشنێک کۆمەڵە لە ئەنجامی مانۆڕی کەویکردنی کەسانی بە ژیان زیندووی دەوروبەری بەری ئارامی لە بەرچاو نەما لە لایەک و ساغبوونەوەی کۆمەڵە بۆ بەردەستێکی ئەنتی مارکسیستی خاوەن ئەزموونی تاڵوتفتی ئینشقاقاتی حیزبی کوردی پەراوێزی شاخ و توندوتیژی سێبەری تفەنگ، کە مەودایەکی زۆر بوو، خەونی بۆ جڵەوگرتنی کۆمەڵە دەبینی. کۆمەڵە نەوەک بە بەرنامەیەکی تۆکمە لە هەموو ئاسەوارێکی چینایەتی، رێکخراوەیی نوێی داماڵەخاس کرا، بەڵکو بە مروری زەمەن فڕی بەسەر ئەو ستروکتورەوە نەما، کە ئارام لە رۆژگاری ئەزمەی سەرکردایەتی فریای لەناونەچوونی یەکجارەکی کەوتبوو.

راستە ئارام خۆی سەرکردەیەکی لێهاتوی دەرکەوتەی ناو ئەزمەی جەستەی کۆمەڵە بوو. بەڵام واقیعی سەخت و دژواری بزاڤی چەکداری، لە زەمان و زەمینێکی نا هەمواری تژی لە گرێکوێرەدا، بە پێچەوانەی دەستپاکی، ویژدان زیندوویی، بیرکردنەوە جەمسەرییەکانی شۆڕشگێڕی ئارام هاتەوە و دەستکاری ورد و درشتی سەروەرییە چینایەتییەکانی ئەو شاسوارە کرا.

زۆرن ئەوانەی لە جۆری ئارام لە دنیای شۆڕشگێرە راستگۆکان، بەدوای پێشکەشکردنی گیانی خۆیان نوشستی ئەو ئەزموونەیان نووسیوەتەوە. جیڤارا، مەلا ئاوارە، غەسان کەنەفانی فەلەستینی... هتد وەک ئەمری واقیع وێنەگەلێکی زیندوون.

## ئەنجامی ململانێ توندوتیژەکان

لوتکەی کێشمەکێشی ناوخۆی کۆمەڵە، لە پانۆرامای رووداوەکانی کۆنفراسی سێیەمیدا، جەستەی ئەو رێکخراوەی راهەژاند. دەیان هاوڕێی دڵسۆز لە سەرەتادا راشکاوانە و بە بوێرییەکی کەموێنە، بەرانبەر پێویرانی گەلەکۆمەکی زۆریەی لەشکری دەوروبەری دەسەڵاتدارییەکەی نەوشیروان و گروپەکەی. هەڵوێستی جوامێرانەیان لە چۆلکردنی هۆڵی کۆنفرانسی سێدا نواند. بەڵام بە هۆی بێ ئیستقامەیی بڕیار بە دەستەکانی ئەو گروپەی خاوەن دەنگ هەڵبرەکان، لە چاوتروکانێک پاشگەز بە گەڕانەوە ناو هۆڵی کۆنفراسەکە بوونەوە و نوختەی وەرچەرخانیان بۆ دەسەڵاتداران سازاند و سەرکزیمان بۆ خۆ بەدارێ وەکرد.

# رۆژانی ئیختفا و هاتوچۆی پزیشک

سەرەتای ساڵی ١٩٨٥ بۆ من یەک دەسرازەی لە ئەزموونی تاڵوتفتی لە ژیانم هۆنیوەتەوە. لە لایەک بە هۆی باروذۆخی تەندروستیم و پێویستی بەردەوامی تیمارکردنی برینەکەم، دەبوو لە پزیشک دوور نەکەومەوە. رۆژانە بە پەنادزە و هەزار دەردی سەر بۆ خۆم، بۆ هاوڕێ و کەسوکارەکەم، بەتایبەت هاوژینە دڵسۆزەکەم. دەبوو رێچکەیەکی شاراوەم بۆ لای پزیشک هەبێت. لەو بوارەدا هاوڕێتی و لاوچاکی دکتۆر فەرهاد جەلیل خەیات، نەوەک هەر لە بەتەنگەوەهاتنی خۆم، بەڵکو لە پێشوازیکردنی لەو هاوڕێ و پێشمەرگە و خەڵکە دۆست و هەوادارانەی ئاڵای شۆڕش کە بۆ لام دەنارد، دکتۆر لەوێ رۆژانی پڕ لە مەترسی بەردەسەڵاتی دڕندەجانەی بەعس، خۆی لە خۆیدا چیایەک لە پشت و پەنامان بوو. هەمیشە لە ژیانی ئیختفای ماڵەکانی شاری هەولێر و شەقڵاوە، گوندە نزیک و دوورەکان بە دوامانەوە بوو. چ لە تەداویکردنی برینی لاسەرم و پەیداکردنی داوودەرمانی پێویستی گران بەها. کە بێجگە لە وەفاداری دۆستانە و بەردەوامی پەیوەندی هاوڕێیانەمان، بە هۆی دوورکەوتنەوەم لە کرۆکی دەسەڵاتی حیزبی و کەلاکەوتنم لە هەر جۆرە بەرپرسیاریەتییەک، بۆم نەکراوە لە قەرەبووکردنەوەی ئەو هەموو زەحمەتییەی دکتۆر فەرهاد بۆمانی چەشتوە، شتێ بە شتێ بکەین.

ئیختفای من لە پەراوێزی سەرهەڵدانی ئاڵای شۆڕش دوو سەرە بوو. من چ لە بەرچاوی زەبروزەنگی دامودەزگا سەرکوتکەرە سیخوڕییە زۆر و زەبەندەکانی رژێمی بەعس قاچاخ و داواکراو بووم. هەمیش لەلایەن دەسەڵاتی مەغرورانەی هێز و دەسەڵاتدارێتی یەکێتی فەرمانی گرتن و کوشتنم هەبوو.

هاوڕێیانم بە تایبەت ئەوانەی لە ماڵەکانیان بە نهێنی دەمامەوە، وەک سدیق بە حرکەیی، کاکلە رەش، خەلیلی نازەنینی، فەرهادە شەل، حەیدەر جوکل، حەیدەر سوێری، ماڵی دکتۆر لوقمان، ماڵی حەمیدی هاوژینی خوشکێکی نەجیبە، ماڵی نازەنین خانی حەیدەری، دایکی ئاسۆ و حەمە، ماڵی قادرە درێژ، ماڵی سامی هادی، ماڵی خەزورم، ماڵی شاخەوان مەولوود، ماڵی باوکم، ماڵی پورێکم لە گوندی چەغەمیرەی کەندێناوە، ماڵی خوشکێکم لە گوندی ئۆمەراوەی دەشتی هەولێر، ماڵی محمد حاجی

عەبدەی رەفیقم لە شاری هەولێر، ماڵی شێخ جەمال و حەمە رەئوف لە شاری سلێمانی...هتد بۆ من هەواری مانەوەی مسۆگەر بوون.

بێگومان هاتوچۆکردنیشم، بۆ ئەو هەموو شوێنانە بە یارمەتی هاوڕێیە گیان لەسەر دەستەکانم بووە. کە زۆرتر بە شەو و کاتی نیوەڕۆ، بەرەبەیانی زوو بووە. هەمیشە دایکە دڵسۆزە کلۆڵەکەم، هاوژینە چاونەترسەکەم لەشانمدا بوون. بۆ گورگەنەبوون و چاوبەستەکی سەیتەرەکانی ناوشار و دەرەوە گیانبازییان بۆ کردووم. هەندێک جاران دەمانچە و تفەنگیان بە خۆ بۆ هەڵگرتووم. لەو هاتن و چوونەدا، پایسکل، ماتۆڕسیکل، ترومبێل و زۆرتر قاچەکانی خۆم بە کار هێناوە. بە کوچە و کۆڵانە قوڕاوییەکان و تاریکایی شەوێ موجازەفەی هەرزەکارانەم کردووە. بەردەوام لە جلوبەرگێکی شڕو کراس و شەلوارێک تۆز و خۆڵاوی سوڕاوەمەتەوە بۆ جێگۆڕکێکردن هاوڕێ و ترومبێلی جیاوازی ئەو و ئەمم بە کار هێناوە.

پێتان سەیر نەبێ کە هەنوکە ئەو ڕۆژانە بە بیر خۆم دەهێنمەوە و بە نووسین دەیانگێڕمەوە، موچڕکی تەزیو بە هەموو گیانم گوزەر دەکات. لەوەی ئەوان ڕۆژ چ کەسانێکی بێپەروا لە گرتن و ڕاوەدوونان و رووبەڕووبوونەوەی دوو دەسەڵاتی بگرویکوژی شار و /غەداری شاخ موقاوەمەتمان دەکرد. مەگەر ئەو کۆمەڵە خورتەی ئەوێ ڕۆژێی ئاڵای شۆڕش، بەبێ هەر جۆرە پشت و پەنایەک، بەرگەی ئەو ئازار و دەردەسەرییەمان گرت. بە چەشنێک لە شانی گیانی خۆمان، روحی دەیان ژن و پیاو و منداڵی بێتاوانمان کردبووە قەڵغانی چالاکییەکانمان.

## هاتنی هاوڕێیان بۆ ناو شاری هەولێر

هەموو ئەو سەردانانەی مەلا بەختیارم لە بیر ماوە، کە بۆ بەدواداچوون و دیدەنی لەگەڵ هاوڕێیان بە تەنیا هاتوتە هەولێر. بە جۆرێک خۆم و ئەوانەی دەورووبەرم، هەر بە تەنیا لە خەمی پاراستنی خۆمان نەدەجولاینەوە، بەڵکو هەندێک جاران دەبوو مشوری هاتوچۆی هاوڕێیانی ئەوێ ڕۆژانی ئاڵای شۆڕش لە ئەستۆ بگرین. قوربانی بۆ پاراستن و پێشوازی کردنیان بدەین، لە نمونەی مەلا بەختیار، خولە کەشکۆڵ_ ناسراو بە شێخ عەلی، سڵاو لەگیانی_ هەندێ هاوڕێی شاخ کە بۆ کاری پێویست دەهاتنەوە شاری. دەبوو جێگایان بۆ بدۆزرێتەوە، ترومبێل و کەسی لێهاتوی چاونەترسیان بەگەر بخرێ. کە

زۆری ماندوو دەکردین و هەمیشە دەستمان لەسەر دڵمان دەبوو. هەتاکو دەگەیشتن و دەگەڕانەوە. زۆریەی کارەکانمان لەوێ ڕۆژان بە سەرچڵی و بێ دڵەڕاوکێ ئەنجام دەدا. بەبێ ئەوەی حسێبێک بۆ نۆکەر و دەسەڵاتی بگروبکوژی بەعس بکەین لە لایەک و هەڕەشە و گوڕەشەی ئەوانەی شاخ بتوانن هەر جۆرە بەربەستێکمان بۆ قیت بکەنەوە.

## دیتنی مەلا بەختیار لە گوندی نەوتیی قەرەداغ

لەو ماوەیەی بۆ پاراستنی خۆم، کە لە لایەن هێزەکانی ینک _ەوە وەک ئەوەی من ببووم بە تراویلکەی بەرچاویان. فشارێکی زۆرم بۆ هاتبوو. لێرە و لەوێ سوسەی پێزانینی شوێن و جێگای ئیختفای منیان کردبووە کاری شەو و ڕۆژیان. تا رادەیەک مەترسی کەوتبووە سەر ژیانی خۆم و ئەو کەسانەی پێمەوە ماندوو بوون. بۆیە بەدوای راوێژ لەگەڵ هاوڕێیان لە دەستەی ئەڵقەی ناوەندی بەڕێوەبەری ئاڵای شۆڕش. بە چاکمان زانی بۆ ماوەیەکی کاتی شوێنی ئیختفام لە هەولێرەوە بۆ ناو شاری سلێمانی بگوازمەوە. راستە لەلایەن مەلا بەختیارەوە لە ڕێگای دۆستێکەوە بۆ ئەو سەفەرە پسولەی جاش خەفیفەم بۆ کرابوو. بەڵام خۆم ئەو جۆرە پسولەیەم ڕەتکردەوە و بە پسولەی مۆڵەتی سەربازیی سەبلحی برام. بە هاوڕێتی دایکم و نەجیبەخانی هاوژینم سەفەرەکەمان کرد. نزیکەی چل شەو و ڕۆژان، لە ماڵی هاوڕێ حەمە ڕەئوف مامەوە. زۆریان خزمەت کردم و نموونەی بنەماڵەی بەوەفا و شۆڕشگێڕ بوون. لە هاوکاریکردنم درێخییان نەدەکرد. هەر لە ڕێگای ئەوانەی ژوانی دیدەنی نهێنی نێوان خۆم و مەلابەختیار لە گوندی نەفتە بناری گلەزەردە بەجێگەیاند.

(ناوەڕۆکی ئەو کۆبوونەوەی گوندی
نەفتە، بۆ زنجیرەی سێیەم _ لە هەواری
یادەوەرییەکانمدا _ دەمێنێتەوە.)

# کۆبوونەوەکەی سێوسێنان و جاڕدانی ئاڵای شۆڕش

ڕاستە ئەزیش بۆ بەشداریکردن لەو کۆبوونەوەی گوندی سێوسێنانی دەڤەری قەرەداخ بانگ کرابووم. بەڵام بە هۆی دووریم و مەترسی هاتووچۆیەکەوە لەجێگای خۆیدا. ئەوێ ڕۆژێ ئاوەزم ڕێگای نەدام و ئەو سەرچڵییەم نەکرد. چونکو بەراستی خورپەیەک لە ناخی دڵمەوە تەمتومانێکی لەبەر دیدم پەرژاندبوو. ناسینی ئاکاریی کەرەکیفەی سیاسەتی کوردنۆلۆژی لە دڵ و دەروونم نەدەسڕایەوە. کە هەرگیز ڕێگای لەدایکبوونی سروشتی هاتنە دنیای بۆ ڕێکخراوێکی نوێی وەک ئاڵای شۆڕش، لە پەنا هێزێکی شمشێر بە دەستی وەک ینک لە چیڕاوکەی شەری کوردکوژی ناوخۆدا، و لە سێبەری تەلخی بزاڤی چەکدارییەوە، ئەو لەدایکبوونەم بڕوا پێ نەبوو. بەڵام چ لەگەڵ کاڵفامی ئەوێ ڕۆژان، سۆز و وەفاداری هاوڕێیانە سواری کۆڵم ببوو، لەو کاروانە سەر بە گۆبەندە بەشداریمان کرد. هەندێ جاران خورپەی خۆرسک دەستی مرۆڤ دەگری، لە بەڵای نابەڵا دەریازت دەکا و ئەو خورپەیە زۆرجاران منی لە فەلاکەت قوتارکردوە. دەنا ئەگەر ئەو دەمیش بە قسەی مەلا بەختیارم بکردایە و بچوومایەتە گوندی سێوسێنان و لەشانیان بومایە. بێگومان وەک خۆیان دەبوومە لوقمەیەکی ئاسانی بەر شاڵاوی گرتن، سووکایەتیپێکردنی بەر دەستی هێزی چەکداری ینک و بە دڵنیاییشەوە ئەز هەنوکە لە ژیاندا نەمابووم. هەر ئەوێ ڕۆژێ نێسک و پروسکیان دەهاڕیم و لە پاداشتی تاووتوێکردنی سەرلەنوێی جەنجەری شەقوپەقی کۆمەڵە و یەکێتیدا لەساڵی ١٩٧٥_ ١٩٨٠ لەناوشاری و بەسەر پێخستنەوەی ئەو ڕێکخستنە لە هەولێر و بادینان و زۆر شوێنی دیکەوە. کە لە دوای ڕاکردنی مەسولە سەرەکییەکان، ڕاوەدونان و گرتنی هاوڕێیەکانی دیکە. تۆڵەی سەردەرێ و بەردەرێیان لێ دەکردمەوە و بەسەری مارەکە ناویان دەبردم. گوایە بۆ حەزی نەخۆشییان شایستەی سەر پانکردنەوە بووم..! بۆیە ناحەقم نییە، هەتا دەژیم بۆ دەسەڵاتی غەدرکردن و دەستەخرۆبوونی خۆم و خەڵک مل نادەم

ئەوەی بیستم و دواتر بۆیان گێراومەتەوە، هەرچەندە هەمدیسانەوە بۆ بیرکردنەوەی ئەوێ ڕۆژێی لاساری هەرزەکارانەم، وەک نەریتێکی شۆڕشگێڕانەی خۆم، لاسارانە هاوژینە تازە دایکی کورپەکەم بۆ سێوسێنان نارد کە لە پەراوێزی ئەو کۆبوونەوەی جاڕدانەی ئاڵای شۆڕش، بڕیار و چەپکەگوڵی ژاکاوی بەردەمی پەلەپروسکێی بۆمان هێنایەوە.

بەڵام کۆرپەکەمان لە غیابی دایکی بووە قوربانی و گیانی فریشتەئاسای لەپێناوی زێدەڕۆیی من بەخشی. تاکە یەک کەسیش، بێجگە لە هاوڕێیەکانی دەورووبەرم لە هەولێر، هەتا بە وشەیەکیش سەرخۆشێیان نەوەک لە خۆم، لە نەجیبەی هاوژینم نەکرد. دەبوو ئەوێ دەمی لە تەڕاتێنی بێوەفایی و گەڕەلاوژێی ئەو ناکەسبەچەییە بگەم. بەڵام زۆر درەنگ بە هۆش خۆم هاتمەوە و کار لە کار ترازابوو. بە دڵێکی شکاو و پرتە و بۆڵەی حەقبوونی نەجیبەخان، کوردە غیرەتی درێژەمان بەو کاروانە دا بە پێچەوانەی نوچدانی دەیان کەسی موزایەدەچی و خۆ هەڵکێشەر بەرگەمانگرت و کۆڵمان نەدا.

ئەندامانی ئەڵقەی ناوەندی بەڕێوەبەری ئاڵای شۆڕش بەوە منیان دانەخۆرە کرد. کە بە شێوەیەکی کاتی و هەتا دەمی کۆنفرانسی سەرتاسەری، سەرپەرشتی ڕێکخستنی دەڤەرەکانی هەولێر و شاخ بکەم. لە ژێر ناوی نهێنی ڕێناس بادینی لە ئەڵقەی ناوەندی درێژە بەو کارە بدەم. ئەگەر ئەو زەمانی عەقڵم کۆمەکی بکردامایە، هەرگیز نەدەبوو ڕەزامەند بوومایە. بەڵام ئەو ڕۆژە قبووڵکردنەکەم زۆرتر بۆ ئەوە تێنوێتی شکاندم. تاکو ئەوەم بۆ بەدارێوە نەکەن کە لە ترسی هەڕەشە و گوڕەشەکانی دەسەڵاتدارەکانی ینک پاشکشەم کردبێ و ترسابم لە لایەک، دڵم بەرایی نەدەدام هاوڕێیە بەلەنگازە پڕ قوربانییەکانم لە هەولێر و دەورووبەری بۆ خۆیان بە جێ بهێڵم. دەنا خورپە ڕاستگۆیەکەم ئەوەی پێ گوتبووم، کە ڕێکخراوی نوێ لە ریزەکانی بزاڤی چەکداری دروست ناکرێ. ئەو جۆرە خەون و خۆزگەیە بە توخمی خاوەن ئیستقامەی هەتا سەر و هەڵگری بیروباوەڕی بێ ئەملا و ئەولای مارکسیزمی شۆڕشگێڕانە لە باروذۆخی پێویستی خۆی دەبێ.

بۆ ئەوەی لە بیرم نەچێتەوە، لەو مانیفێستەی، بە قەولی هەندێک دەم بڕێشکەی خاوی دانیشتووی ژێر جەمەلۆنەکانی ئۆردوگای زێوەی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی ناو ئاڵای شۆڕش، بە سەری زمان و بنی زمانیان دەیانگوتەوە. بە چەندان وشە گەلی وەک کۆمونیست، مارکسیزمی شۆڕشگێڕ، پرۆلیتاریا و زۆری دیکە کە زۆرتر لاساییکردنەوەی بەرنامەی حیزبی کۆمۆنیستی ئیرانی بوو، ئەو مانیفیستەی پێ سیخناخ کرابوو. ئەو توخمانە درەنگ و زوو، دەستە دەستە و یەکە یەکە، بە خۆشمەوە بۆ ماوەیەک بەبێ ئەوەی ئەو هەموو خۆبادانەی ئەوێ ڕۆژانی لە بیر بێت، بای سەرەداوێک بۆیان بە وەفا بێت، لە پراکتیکی دەسەڵاتی حیزبی و حکومیدا، تۆزقاڵێک سەر ڕاست بکەونەوە و لە بیریان مابێت، هەندێکیان کتوپڕ شەروالی دڕاوی پرۆلیتاری،

کۆمۆنیستبوونی دوێنێیان داکەند، خۆیان بە جلوبەرگی زاقوزریق، سەروەت و سامانی مشە، دەسرازە کۆشک و تەلار و ترمبێلی هەمەچەشنەی سەر حسێبی قوربانی هاورێیەکانیان، خۆیان تۆکمە کرد و چاوچنۆکییان بەری ئاسمانی تەنییەوە.

بێگومان پرۆلیتاری بوون، لەبن و بۆتکەوە لە پێودانگی پرۆسەی ئابووری سەرمایەداری تەندروست، بەرچۆڕاوکەی نیوچەوانی کرێکاری کارگە و فابریقە گەلاڵە بووەو دەبێ. ئێمە هەر لە خۆڕاییەوە رۆژانێک ئەو زاراوە کرێکارییە خاوێنەمان خەشیمانە بە کار هێناوە، دەنا مەگەر بە دەگمەن نەوەک پرۆلیتاریا، بگرە کرێکاری تاکوتوکی ئێرە و ئەوێ، لەناو ریزەکانی کۆمەڵە، ئاڵای شۆڕشدا وجوودیان هەبووە.. بەڵکو ئەوە وەک پێشتریش گوتومە و دووبارەی دەکەمەوە، ئەوە پێکهاتەی ئەو رێکخراوە بەناو چەپانە، سەرجەمی پێکهاتەکەی لە وردەبورژوای_ شۆڕشگێڕی دەرەوەی دەسەڵات_، زەحمەتکێشان و جوتیارە زەنگینەکانی گوندی و خەڵکی کارمەندی خوێندەواری شاری پێکهاتووە. پاشان بۆ زاراوەی کۆمۆنیست دەتوانم زێتر بڵێم، کە هەرگیز لە ریزەکانی رێکخراوەکانی کۆمەڵە و ئاڵای شۆڕشدا، کەسانی کۆمۆنیستی بیر و کرداری دوای پەرجۆیەکی وەک ئارام لەئارادا نەبووە. ئەوە وەک پاشتر لە پەراوێزی گرتنە چنگی ٰلێچکی دەسەڵاتی حیزبی و حکومی دەرکەوت، کەسێک لەو توخمە موزایەدەکارانە بە بیر و کردار هەرگیز کۆمۆنیست نەبووە. دیارە لەو بارەوە لەناو خەڵکی کورد، جوان گوتراوە.. پرکێشی کردنە هەڵگرتنی بەردی گەورە، نیشانەی پێنەوێران و درۆی لە خشتەبردنە. کوان ئەوانەی ئەوێ رۆژان، خۆیان بە وشەکانی پرۆلیتاریا، کۆمۆنیست، مارکسیزمی شۆڕشگێڕ، سۆسیال ئیمپرایالیزم و چی و چی تر بادەدا و وەک بنیشتە خۆشە دەیانگوتەوە..! بەرای من دیارترین نیشانەی شۆڕشگێڕی و کۆمۆنیست بوون، بۆ توخمگەلی وردەبورژوازی، لە ئانوساتی کەوتنە دەستی دەسەڵات و مەسولبوون دەردەکەوێ، نەوەک هەر بە نووسین و شەنەباکردنی خەرمانی ووشەوە.

## ئێمه و ئەوان

ئێمه لە هەولێر و دەوروبەر بە هێمنی و کاوەخۆیەکی پشوودرێژانە، بەرمان لە بژاری پەرێزی پرۆسەی تەنزیماتی ئاڵای شۆڕش گرتبوو. سەرەتای گاگۆڵەکردنی سترکتورێکی نوێیی هەمێزی بیروکرداری کاک ئارام _مان دەست پێ کردبوو. بە تایبەت لەناو شاری هەولێر و شەقڵاوە و هیراندا، هەندێ گوندی کەندیناوە و خۆشناوەتی و وڵاتی کۆیە و زرارەتی و شارەدێی بەحرکە. دەسرازەیەکی یەکانگیرمان دەستلەملانێ کردبوو. دیارە دیسانەوە هەندێک لە خوێندکارە شۆڕشگێرە گیانلەسەردەستەکانی زانکۆی هەولێر، هەوێنی ئەو چالاکی و کۆششە بوون، کرێکاری تاکوتەرا و زەحمەتکێشی ئێرە و ئەوێی تێکەوتبوو. بەڵام ئەرکی قورسی چەکداری شاخەکان، چوونە ریزی پێشمەرگایەتی دەیان هاوڕێی پاک و دڵسۆز، هەڵگری سەرەتاکانی بیری مارکسیزم _ لینینزم، تیکەڵکردنی رێکخستن و بزاڤی چەکداری، بۆ سەرجەم ئاڵای شۆڕش تەنیا مایەی ئاسنی ساردکوتانەوە و بە فیرۆدانی گیانی دەیان هاوڕێی بەلەنگازی لێ کەوتەوە.

## پەیوەندییکردنی سەرلەنوێم بە شاخ

ئەز لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٥ بە کەشوهەوای ژیانی ئیختفا و چالاکی ژێر زەمینی ناو شاردا. خەریک بوو دەقم دەگرت و رادەهاتم. چەندان شوێنی خۆحەشاردانمان لەناو شار و گوندەکانی سنووری پارێزگای هەولێر، بۆ کاتی پێویست بە هاوکاری کەسوکاری خۆم و دۆست و هاوڕێیەکانم پێکەوە نابوو. بەڵام کەوتنە ژێر فشاری ئەوانەی سەر سنوورەکان لە لایەک و بانگی دەستەیەک پێشمەرگەی خۆدەربازکردووی بەر پەلاماری هێزەکانی ینک، لە نموونەی وەرزێر، وریا، سۆران دیان، گۆران، مام هێدی، عەبدوڵڵا شێخە، دواتر راوەدوونانی هاوڕێیان مەهدی، مەناف، رێباز، فەرهادکاوانی و دەربازبوونیان لە چنگی هێزەکانی ینک لە مەڵبەندی چاری سماقولی و گرتن و ئازاردانی نامرۆڤانەی دەیان هاوڕێی دیکە. وەک مەفرەزەیەکی تەنیا گەیشتبوونە دەرەوەی بازنەی بەر شمڕی یەکێتی لە لایەکی دیکەوە، ناچار بووم بەرەو داواکارییان لە چوونم بۆ شاخ هەنگاو هەڵگرم کە لە زنجیرەی یەکەمی ئەو هەوارە قامکم لەسەردانابوو.

بێجگە لەو چەند پارچە پەخشانەی لە کۆتایی ئەو زنجیرەی دووەمە، بڵاوم کردووتەوە، بە خوێنەرانی رادەگەیەنم، کە ئەوەندەی تەندروستی و تەمەنم بە بەرییەوە بێت، خەریکە سەرەتاتکێی پرۆژەی نووسینی زنجیرەی سێیەم لە دید و هزرم سەرەتاتکێ دەکەن. چونکو هێشتا زۆر کەلێن و کەلەبەر ماون لەو دوو زنجیرەی یەکەم و دووەمە دەرەقەتیان نەهاتووم. پڕ بەدڵ خۆم بۆ پرکێشییەکی دیکەی نووسینی زنجیرەی سێیەم هەڵدەکوتم.

**بەرابییەکی پێویست**

ئارەزوم دەکرد لەگەڵ بڵاوکردنەوەی زنجیرەی دووەمی ئەو یادەوەرییانەمدا کە تێیدا بەشێکی دیکەی خوێندنەوەم    سەبارەت بەباسوخواسەکانی ئەو کتێبەی نەوشیروان. خوازیاری ئەوە بووم، نەوشیروان _ سڵاو لەگیانی _ ئەو بەشی دووەمیشی بدیتایە.

لە زنجیرەی یەکەمی (لە هەواری یادەوەرییەکانمدا) سەبارەت بە کتێبی_ لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ _ دا نووسیومە، سەرنج و رەخنەکانم بۆ هەمان ئەو رۆژانە دەگەڕێتەوە کە ئەو کتێبانە نوسراون. بەڵام لە پێشەوە بە هۆی سەرقاڵی کارکردنی شەو و رۆژی ژیانی ئاوارەیی سوید لەوێ رۆژاندا، دوایی بە هۆی رووداوە تێکقرژاوەکانی باشووری کوردستان و جیابوونەوەی خودی نەوشیروان مستەفا لەو ر ڕێبازەی شاخ و شاری لە لایەک، هەڵبژاردنی تەوەرێکی دیکە _ بەناوی گۆڕان _ ی کاروانی سیاسەتکردن لە لایەکی دیکەوە لە بەچاپکەیاندنی بلەز نەبووم.

گەرەکم نەبووە ئەو را و بۆچوونانەم سەبارەت بەو دوو کتێبە و نەمویستوە لەلایەن هیچ لایەن و کەسێکەوە، بکرێتە پێخۆری جەلەحانێی رۆژ و دەمچەوریوون. هەر بە تەنیا خۆم لە یەک بە یەکی پەیڤەکان بەرپرسیارم. چونکو ئەوەی دەیڵێم یادەوەریی خۆمن و لە پەنا هەژمورنی کاریگەری کەس و لایەنێکی گورەپانەکە وابەستە و جلیت نەکراوم. نووسینەکانم مەودایەکی بۆ سەربەخۆیی خۆم لە هەمێزە و تەنیا کاریگەری رادیکالیزمی بیروبۆچوونەکانم لە رابردوو رێچکەیان بەستووە. دەبێ ئەوەش لە بیر نەکەم، سەبەتەی یادەوەرییەکانم لە توێشەبەرەی ژێر کاریگەری بیر و کرداری ئارام _ی رۆژانی خەباتی کوێرەوەری و تەنگانەی کۆمەڵە قوچەکیی داناوە و بێرەنگدانەوەی ئەزمونی ئەو مرۆڤە گەورەیە نییە.

هەروەها بۆ هەموو لایەک و هەر کەسێکی فرسەتتەلەبی مشەخۆری سەر رەوسەی زیوانی میدیای کوردی رادەگەیەنم. هەر یەکێک لە هەر زەمان و فرسەتی خوازراویاندا، بەکارهێنان و قۆستنەوەی ئەو نووسینانەم بە بێ پرسکردن و مۆڵەت وەرگرتن لە خۆم، خۆیان تووشی لێپێچینەوەی یاسایی دەکەن.

خوێنەریش بۆ ئەوە دڵنیا دەکەمەوە. ئەو پەرەگراف و رستە و ووشانەی لەو کتێبە وەرمگرتوون و قسەم لەسەرکردوون. دەقاودەق لەو کتێبە گواستراوەتەوە، هەتا خاڵ و

ویرگولیش _م وەک خۆی نوسیوەتەوە. ئەگەر هەر یەکێک دیقەتی جۆری ستیلی نوسینەکانی نەوشیروان بدات، ئەوە ستیلی ئەو بووە.

## کوردستان و کورد و نەتەوە

(لە رۆژهەلاتی ناوەراست دا نەتەوەیەک ئەژی کە نیشتمانەکەی لە دوای یەکەم جەنگی جیهانییەوە بەپی ی قازانجە ستراتیجی، سیاسی، ئابووری و پەترولییەکانی ئیمپریالیزمی جیهانی و کۆنەپەرستی تورک، عەرەب، فارس و کورد، بی گوی دانە ئارەزوی دانیشتوانی ناوچەکە، بەسەردەولەتەکانی تورکیا ، ئیران،عیراق وسوریا دابەش کراوە.) ل/٩

ئەو دەستە واژەیە لە رووی فۆرمەوە مقۆمقۆیەک هەڵناگری. نووسەر وەک پێشقاول بۆ رابیکردنی مەبەستەکانی بە کاری هێناوە. بەڵام لە ناوەرۆکدا تا بڵێی نارێک و شاش کەوتووتەوە. چونکو بەر لە هەردوو جەنگە جیهانییەکەی یەکەم و دووەمدا، وڵات، نێشتمانێکی یەکگرتوو بە ناوی کوردستان (نەوشیروان بۆچاوبەستەکی خوێنەر لێرەدا پەیڤی _ نیشتمانی _ نووسیوە و خۆی لە بەکارهێنانی ناوی ئەو نیشتمانە لاداوە_ نەبووە کە خەڵکی کورد وەک گروندی نەتەوەیەکی دیاریکراو بێ ئەملا و ئەولا تێیدا ژیانی ئاسایی بەسەر بردبێت.

بێگومان هەبوونی تاکە سەرچاوەکی دیکومێنتاری نووسراو و نەنووسراو بۆ بەڵگەبوونی ئەو تێڕامانەی نەوشیروان نابینرێت. بەڵکو دەبی کادری حیزبی سیاسەتچی کورد، بە چاولێکەری هەندێ بەناو مێژوونووسی کۆلەوار ئەوە بزانن و لەبەر رۆشنایی ئەوەی کە خەڵکی کورد هەر لە زووەوە،(بگرە لە بەرەبەیانی پەیدابوونییەوە) لە پانتاییەکی پارچەپارچەی هاوسنوور ژیاون و لە خۆرا و بێ بەڵگە حیکایەتمان بۆ نەهۆننەوە. دیارە دواتریش ئیپراتۆریەتەکانی ئیسلامی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی و سەفەوی لەگەل خۆیاندا، ئەو چارەنوسەیان بۆ خەڵکی کورد بە میرات هێشتوتەوە و کردوتە ئەمری واقیع. ئەوجا بۆ ئەوەی نەوەی نوێی کوردەواری بۆ مەبەستی تەسک و تروسکی بەرژەوەندی وشکی حیزبی هەڵەداوانی بەسەرچیخچوون نەکرێ. نابێ شێواندنی راستییەکان هەتا هەتایێ بە دارێوەبێت وخەڵکی کوردی بۆ سەرخۆش بکرێ.

مێژوو له ڕابردوو شتێکی لەو بارەمان بۆ ناگێڕێتەوە، کە گوایە نیشتمانێک بە ناوی کوردستانەوە هەبووە و کۆلۆنیالیزم و کۆنەپەرستان، لە دەرفەتی بەردەستیان بە سەر چەند دەوڵەتێکی هاوسنووری نزیک بە یەکیان دابەش کردبێت. ئەوە بە ڕووکەش تەنیا کاری نەکردەی سیاسەتمەدارانی کورد بووە لە کۆن و نوێدا. کە گوایە خەبات بۆ بەدیهاتنی ئامانجی کوردستانێکی یەک وڵاتی دەکەن و کوردستانی بوونی موزایەدەکارانە بە خەڵکی ستەمدیدە دەفرۆشنەوە...!

پاشان هەر وەک لەو دەستەواژەیەی سەرەوەدا هاتوە..(بە پێی قازانجە.. کۆنەپەرستی تورک، عەرەب، فارس، کورد.... بەسەر دەولەتەکانی تورکیا، ئیران، عیراق و سوریا دابەش کراوە). ل/٩

من دەپرسم، بۆ هەر بە قازانجی کۆنەپەرستانی تورک و عارەب و فارس — ەوە بووە! ئەتۆ بڵێی پێشکەوتووخوازاەکانی ئەوێ زەمان لە خەون و خەیاڵی سیاسەتمەدارەکانی کورد، دژ بە پەتار پەتاری خاکی کوردستان وەستابوونەوە! بەڵکو ڕژێمەکانی وەک تورکیای نوێ، ئێرانی پەهلەوی، عیراق و سوریا. هەروا لە ختوخۆراییەوە، هەر یەکەیان پارچەیەکیان لەو کوردستانە پێبڕابێت! نەخێر خۆی ئەو بەشانەی کوردستان؛ باکوور، ڕۆژهەڵات، باشوور، ڕۆژئاوا هەر خۆیان لە بنەڕەتەوە و زیاتریش لە ژێر قەڵەمڕەوی ئیپراتۆریەتی عوسمانلی و سەفەویدا بوون. کە دواتر لە ئەنجامی دەرهاوێژەی کۆتاییهاتنی هەردوو جەنگە جیهانییەکەوە، دەوڵەتەکانی وەک تورکیا و ئێران و عیراق و سوریا دامەزراون، پارچەکانی کوردستانیان بە زیاد و کەمەوە، چەسپاوتر بۆ بە میرات ماوەتەوە. بێگومان ئەوەش لە چاوپەنای گەمەی دەسەڵات و بەرژەوەندی هێزە داگیرکارە جیهانی و ناوچەییەکانەوە بووە. کە ئەو دەم بە ناوی کۆلۆنیالیزم و دەسەڵاتی ناوچەیی برەوییان هەبووە و خەڵکی کورد خۆی تێیدا سفری دوای فاریزە بووە.

من نازانم نەوشیروان بە چ پێوەرێک کۆنەپەرستی کوردی هاوشان لەگەڵ کۆنەپەرستی نەتەوەکانی دیکە خوێندوتەوە! مەبەستی لە کێ و چ دامودەزگایەکە! ئەگەر کورد، کۆنەپەرستی هەبوویێت، ئەوە دەبێ پێشکەوتنخوازیشی هەبوویێت.

من دەڵێم بەکارهێنانی ئەو زاراوانە بۆ ڕابردوو، تەنیا لە باوەشی بەڵگە و دیکۆمێنتی بەرچاو جێیان دەبێتەوە. حەق وایە سیاسەتمەدارەکانی کورد لە هێنانەگۆڕێی

پەیڤەکانی کۆنەپەرستی و پێشکەوتنخوازی لەناو خەڵکی کورد بۆ مێژوویەکی رابردوو هەروا بە گۆترە نەبێت. بە چاولێکەری دەواری مێژووی نەتەوە خاوەن دەوڵەتەکانی دەوروبەرمان نەیگوزەرێنین.

نەوشیروان وەک هەر سیاسییەکی دیکەی مێژووی ئەو پەنجاساڵەی بەسەرچوو، دوور لە لۆجیک، بە پێی حەزەکانی هەر یەکەمان، پاشۆڵی لە هەندێ گوزارشت تژی کردووە و نووسیویەتی..

(نیشتمانەکەی لەکۆن دا مەلبەندی شارستانی بوە و ،) ل/٩

بەبێ ئەوەی پێمان بڵێ کامە شارستانی! کوا ئاسەوارەکانی ئەو شارستانییەی باوەشی حەزی تەویاوییانە! یاخود لە درێژەی ئەو دەستەواژەیە دەڵێ: (خۆیشی لە زۆر کۆنەوە لەپێناوی رزگاری دا لەخەباتیکی بی وچانی خویناوی دایە) ل/٩ ئەوەش تەنیا بە باڵادا هەڵگوتنێکی خەیاڵاوییە. ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی ئێرە و ئەوێی هەرەمەکی خەڵکێکی غەدرلێکراوە. کە لە راستیدا هەرگیز هەتا بەم دواییەش، ئەو بزاڤە ناوچەییانە هەرگیز بۆ رزگاریی نەتەوەیەکی ژێردەست و نیشتمانێکی دیاریکراو نەبووە. بگرە بە ئامانجی بنەماڵەیی ناوچەیی و عەشیرەتگەری و ئایینپەرستی و سنووورداری ئەو پەرەکەی حوکمی زاتی و مافی رۆشنبیری تۆقرەی گرتووە و حەساوەتەوە. ئیتر ئەو زێدە بە خۆدا هەڵبەزینە هەر بە قەد دەواری شرپوشۆڵی سیاسەتچییەکان وەشاوەتەوە. دەنا لەسەر ئەرزی واقیعدا، نیشانەیەک لەو بارەوە لە بەردەستدا نییە، کە تامی دەمی ئەو گوتنانە خۆش بکات.

لەوانەش زەقتر سەبارەت بە شێوەزمانە ناوچەیەکانی کوردان، بە پێچەوانەی خودی قسەی ناو دڵی خۆی نەوشیروان نووسیویەتی: (_ جگە لەجیاوازییەکی کەمی نیوان لەهجەکانی، بنچینەی زمانیکی یەکگرتوی ئاخاوتن و لەیەک گەیشتنی هەیە. _ مێژویەکی شارستانی و جەنگی و سیاسی ناوکۆیی هەیە.... کە خۆی لە پیکهاتی سایکۆلۆجی لەیەکچودا ئەتوینتەوە... _ بنچینەی ئابوریەکی یەکگرتوی هەیە.) ل/١٠

جارێ بە گوێرەی زمانەوە، ئەوەی حەقیقەتە لە پەراوێزی سیاسەتی دوژمنکارانەی یەک بە یەکی بەشەکانی ئەو نیشتمانە و، چەوساندنەوەی نامرۆڤانەی خەڵکەکەی و ژێردەست هێشتنەوەیان. خەڵکی ئەو بەشانە بۆیان نەلواوە ئازادانە تێکەڵی یەکتری بن، چ جای بە ئاخاوتنی یەکتری ئاشنا بن! من لە نەوشیروان دەپرسم، تاکوتەرای

سیاسەتمەدار و هەندێ قاچاخچی و شارەزا و پسپۆڕی زمانی لێ دەرچێت، کامانەن ئەو خەڵکەی کورد کە خاوەن چەند لەهجەی یەکگرتووی ئاخاوتنن! یاخود لەکوێ و کوێی بەشەکانی کوردستاندا، لەیەکگەیشتنی لەهجەکان هەیە..!

لە دونیای ئەمڕۆدا، ئەوە تەنیا بازاڕی هاوبەش و سیاسەتی ئابووریی نەتەوەیی دەکاری لەیەکگەیشتنی نێوان لەهجەکانی زمانێک و هەتا لە نێوانیان چەندان زمانی جیاواز بسازێنی. _ کە تروسکایی ئەو دەرفەتە لە جوڵەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی لەنێوان هەرێمی باشووری کوردستان و بەشە داگیرکراوەکانی دیکەی کوردستان لە ئاقاری سەرەدیقانێیە_. ئەوەک قسەی گیرفانی حەزی خۆشەویستی وڵات و نەتەوە. دەسەڵات و بەرژەوەندی داگیرکەرانی ئەمڕۆی نیشتمانی کوردستان، هەرگیز بواری ئەوەی بۆ خەڵکی کورد نەهێشتوتەوە، کە بە ئارەزووی خۆیان مێژوویەکی شارستانی و جەنگی و سیاسی ناوخۆییان هەبوبێت. چونکو ئەوە ماکینەی جەنگی داگیرکەران، بەرژەوەندی ئیمپراتۆریەت و کۆلۆنیالیستەکان بووە، بۆ خۆیان بڕیاری جەنگی هەمەچەشنەیان لەسەر خاکی پارچەکانی کوردستان داوە، ئەوەک کورد بە خۆی هەروەک ئەوشیروان کە نازانم بە چ زانیارییەکی شاراوە خەملی بۆ لێداوە! هەروەها بۆ مەسەلەی سایکۆلۆژیی لە یەکچوو، بە داخەوە جارێ کەسمان وێنەگەلێکی ئەو لەیەکچوونەی لە رابردوو بەدەستەوە نییە. باری سایکۆلۆژی تەواوکەری یەکتری بەندە بە کۆمەڵێک ڕێسا و کۆلەگەوە، کە زۆریان لەو مەیدانە وجوودیان نەبووە و نییە. ئەوجا ئەوە هەر دەوڵەت و سیاسەتی نەتەوەیی بێ ئەملاو ئەولایە، بە تەنیا بنچینەی ئابووری یەکگرتووی دروست بخوڵقێنی و زمانی یەکگرتوو ساغبکاتەوە، دەنا بە چەند قاچاخچییەکی کاتی و وابەستە بە جاڵجاڵۆکەی جاسوسی دەزگا سیخوڕییەکانی ئێرە و ئەوێ ناکرێ.

هەروەها سەبارەت بە مێژووی شارستانییەتی کورد کە ئەز نازانم مەبەست لە مێژوی شارستانی ناوکویی کوردی چییە و ئەو شارستانییە لە دەواری شڕوشۆڵی مێژووی کورد لە کوێ بزربووە! چونکو ئەو دەوارە شڕوشۆڵە دیرۆکییەی رابردووی خەڵکی کورد، هیچ ئاسەوارێکی ئەو شارستانییەی بە دی نەکراوە، چجای مێژووی هەبوبێت! دیارە بەشێکی زۆر لە نەتەوەکانی سەر رووی زەمین لە سێبەری شارستانیەتی دامەزراو و بەرچاوی لەمێژینەیان، پرۆسەی دروستبوونی نەتەوەی خۆیان تێپەڕاندوە. لەسەر زێدی نیشتمانی خۆیاندا، بوونەتە خاوەن دەوڵەت و دیاریکردنی چارەنووسیان بە دەستی

خۆیان بۆ خۆیان ساغ کردووتەوە. هەروەک لە تێکڕای ئەورووپا و بەشێکی زۆری ئاسیا بە دی هاتووە. عارەبەکانیش لە سایەی قورئان و ئایینی ئیسلامەوە، چوارچێوەی نەتەوەیی خۆیان دەستکەوتووە و دەیان دەوڵەتییان دامەزراندوە، هتد. بۆیە ئەگەر کوردیش خاوەن شارستانییەت، هەر جۆرێک لە جەنگی ناوکۆیی سەرتاپای بەشەکانی کوردستان بووایە، دەبوو خاوەن لچکێکی تۆکمەی بە نەتەوەبوون، پێکهێنانی دەوڵەتی خۆی لە پاشۆڵ مایە بووایە.

لە پانتایی بەسەرکردنەوەی ناوەڕۆکی ئەو وتارەی نەوشیروان خۆی کە لە زەمەن و زەمانی ساڵانی دوایی هەفتاکان لە شاخ بڵاو کراوەتەوە، نەوشیروان بە هاوتەریبی بیر و کرداری رۆژانەی سیاسەتکردنیان لەوێ رۆژاندا نووسیویەتی..

گوایە ئەو هێز و چین و تاقمانە، رۆڵی سەرەکییان لە چەوساندنەوەی خەڵکی کورد و داگیرکردنی خاکەکەی هەبووە.

( _ چەوسێنەرانی هاونەتەوە، دەرەبەگ، بورجوازی کۆسموپولیت و کومبرادوری کورد.

_ چینە کونەپەرست و چەوسینەرەوەکانی نەتەوە ( دەسەلاتدارەکان)، بەتایبەتی بورجوازی بیروکراتی.

_ ئیمپریالیزم وکۆلۆنیالیزمی نوێ. ) ل/١٠

لێرەدا ئەو پانۆرامایەی ناوی چینەکانی کۆمەڵی کورد کە لە لایەن نەوشیروانەوە ریز کراوە. هەمان کۆپی ناسنامەی چینەکانی کۆمەڵگایەکی دوور لە کۆمەڵی کوردییەوەیە و هەروەک تەواوی تێکۆشەرەکانی زەمان و زەمینی خەباتی کۆمەڵەی مارکسی _ لینینی، بە هەڵەداوان بانگاشەمان بۆ دەکرد. ئەوەی من لە بیرم مابێت، لەوێ رۆژگاری لێقەومانی کۆمەڵەوە ١٩٧٥، یەکەم کادر و دواتر بەرپرسی سەرەکی کۆمەڵە، لەو دەمدا ئارام لەو بە کۆپیکردنە وەرگیرانەی دەرەوەی کۆمەڵگای کوردی بە کردەوە بە دەنگهاتووە و باشترین بەڵگەش ئەو دەستکاریکردنەی کە لە شیرازەی دابەشکردنی چینەکانی کۆمەڵدا کردویەتی، کە لە دەمی وەرگێڕانی نامیلکەی _ یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆ ! _ دا بە زمانی عەرەبی بڵاو کراوەتەوە و ئارام لە کوردییەکەی سەرلەنوێ و لەبەر رۆشنایی کۆمەڵی کوردی دایرشتوتەوە و ئەوجا بڵاوی کردووتەوە.

یەک بە خۆم، بەدوای دەیان ساڵ بە خۆداچوونەوە و هەڵوەستەکردنم. سەرلەنوێ هێنانەوە گۆڕێی بیروباوەرەکانی ئارام، لەو راستییە گەیشتم کە تێکۆشەرانی کۆمەڵە

چەندە دەستە پاچە و کەم مەعریفە بووین، سەبارەت بە مەسەلە چینایەتی و هەتا لە پێڤاژۆیە ئایدیۆلۆژییەکانیش کرچوکاڵ و چاولیکەرانە بیرمان دەکردەوە! کەچی لە فەرهەنگی بیری ئارام دا، لەناو کۆمەڵی شڵەپەپەی کوردیدا، هەرگیز کۆمپرادۆر وجوودی لە رابردوو و هەنوکەش نەبووە و نییە. هەتا بە گوێرەی بورژوازی کۆسمۆپۆلیتی کوردی کە لێرەدا لەسەر زمانی نەوشیرواندا هاتووە، شتێکی رووتی داتاشراوە و هەتا ئەو ساڵانەی بە چاپگەیاندنی ئەو کتێبەش نموونەیەکمان لە کۆمەڵی کوردی دەست ناکەوێ.

لاریم لەوە نییە، رەنگبێ مەودایەکی کەم نەبێت، هزر و پراکتیکی کۆسمۆپۆلیتی لەناو کوردانێکی زۆر هەبوبێت، بەڵام ئەوە بە تەنیا لە چوارچێوەی کار و کردەوەی چینی بورژوازی کوردی و گەندەخۆری سیاسەتچی جێگای بووەتەوە.

## کۆمەڵە و کاروباری رێکخراوەیی

لە باسوخواسەکانی سەبارەت بە کۆمەڵەوە، سەرباری ئەوەی نەوشیروان بە پێی ئەو زانیارییانەی تەنیا بەر سێبەری ویست و حەزی کەسی خۆی، لە کتێبی _لە کەناری دانوبەوە بۆ خری ناوزەنگ _ دا قەزاوەتی کردووە و منیش سەبارەی بەو پرسە و لە خوێندنەوەی خۆمەوە، بەشێکی قسەوباسی یادەوەرییەکانی خۆم لەوێ گێڕاوەتەوە. لێرە بە دواوەش لەناو ئەو دەراوە شێلوەدا، درێژە بە سەرنج و تێڕوانینەکانم دەدەم. چونکو بە پراکتیکی بە چاک و خراپییەوە لەگەڵ بەشە سەخت و دژوارەکەی ئەو کاروانە بە تایبەت لەناو شارەکاندا، جێگا و پێگام هەبووە. لە شانی دەستەیەک رۆڵەی تێکۆشەری شەهید و زیندوو، گیانفیداکاریمان کردووە.

(دوای ئەوەی ئارام هات بوە شاخ هەمو ریکخستنیان یەک خست بو لە ژێر ناوی (کومیتەی هەلمەت) دا. چەند خەتی تر و کەسی کەش بە جیا لەمان هەبون. جمال تایەر _ سەرکەوت _ دینەمۆی کۆمیتەی هەلمەت بو. پاش ماوەیەک ئەم کۆمیتەیەمان کرد بە _کۆمیتەی سەرکردایەتی ریکخستنی ناوخۆ. _ ) ل/١٣

نەوشیروان کە خۆی لە ساڵی ١٩٧٥ نە لە ناو کۆمەڵە و نە لە باشووری کوردستان بوو. لەو بارەوە بەخۆی رافەرمووە پچڕ پچڕ و بێ سەرچاوە، زانیاری بێ سەروبەر بهێنتە گۆڕێ. لێرەدا بەبێ ئەوەی پێویستی پێ بێت، خۆی تووشی بشێوی کردووە و سەر لە خوێنەر و نەوەکانی هەنوکە دەشێوێنی. ئەوەندەی من پێی ئاگادارم و لەوان رۆژاندا لەناو

شارەکان هەڵسوڕاوێکی کۆمەڵە بووم. هەتا دوای کۆنفرانسی دووی کۆمەڵەش لە شاخ و لە سایەی سکرتێربوونی خودی نەوشیروانەوە، زاراوی ڕێکخراو لەناو کۆمەڵەدا نەبووە. ئەوەی بۆ لیژنەکانی سەرپەرشتی ڕێکخستنەوە بە کار هاتووە، هەر بە تەنیا زاراوەی ــ کۆمیتە، یاخود کۆمیتەی هەرێم ــ بووە. بۆ نمونە لە شارەکانی وەک بەغداد، سلێمانی، هەولێر، کەرکوک، سەرەتا کۆمیتەی هەرێم هەبووە کە لە بەغداد خاڵە شەهاب و دواتر ئەنوەر زۆراب سەرپەرشتکار و بەرپرسی بووە. لە سلێمانی ئاسۆی شێخ نوری و دواتر عومەری سەیدعەلی. جەعفەر عبدالواحید و دواتر بۆ چەند مانگێک ئەرسەلان بایز و عبدالرزاق لە هەولێر. لە کەرکوک فەرەیدون عبدالقادر و دواتر علی بچکۆڵ و ئەبوشەهاب و ئازاد هەورامی بەرپرس بوونە. لە تەک شەهاب و جەعفەر و فەرەیدون و ئاسۆەوە، ناوەکانی ئاوات عبدالغفور و حەمەی سەعیدی مەلاعباس لە کۆمیتەی سەرکردایەتی کۆمەڵە بوون. ئیتر لە گەرمەی ڕووداوەکانی ئاشبەتاڵی خەباتی چەکداری چواردەساڵەی کورد. بارودۆخی روخانی دەروونی خەڵک بە گشتی، فشاری ڕژێمی بەعسی سەرکەوتوو لەو ڕۆژەدا بە تایبەت بۆ سەر ئەو خەڵکانەی لە شاخەکانەوە بە تەسلیمی بۆ بەعس ئاڵای سپییان هەڵکردبوو. سەرکردایەتی کۆمەڵە لە ئەنجامی خەمسارییان لە بەرانبەر دەسەڵاتی بەعس، کەوتبوونە جرت‌و‌فرتی پەیوەندیکردن، هاتوچۆی دەرەوەی وڵات. کە وڵاتی سوریای عەرەبی و بۆ لای خودی کەسی مام جەلال لە ئەوروپا بە سەرتۆپی پەیوەندییەکانیان مۆر بووە. دیارە لە پەراوێزی نامە و نامەکاریدا و لەو پێناوەدا بە هەر شێوەیەک بێت، کەسە دیارەکانی کۆمەڵە لە بەغداد بۆ دامودەزگاکانی ڕژێم ئاشکرا ببوون. زوو فەرمانی گرتنیان دەرچووە. ئەو کەسانەش زۆربەیان لە مەسولە دیارەکانی ئەو زەمانی کۆمەڵە بوون. ئەوانە لەجیاتی ئەوەی ژیانی ئیختفای ناو ریزەکانی خەڵکی خۆیان هەڵبژێرن و بە هێمنی بیریکەنەوەو خەباتی ژێرزەمینی تاووتوێ بکەن. ڕێگا چارەی خێرای تەنگەژەکانی کۆمەڵە بدۆزنەوە. دیسانەوە فاولێکی دیکەیان کردووە و پەلەپروسکێیانە بە دوو بەش بەدوای یەکەوە ڕیچکەی چوونە وڵاتی ئەو دەمی ئێرانی شایان گرتووە. لێرەدا ئارامی پەرجوو لەشانی یەک زنجیرە هاوڕێدا، سەرباری ئیعتراف لەسەرکردن و راونانیان لەلایەن دامودەزگا سیخورییەکانی ڕژێم، ژیانی ژێرزەمینی باوەشی هاوڕێ و خەڵکی خۆیان هەڵبژارد. بە پێچەوانەی سەرکردە ئانوساتەکانی کۆمەڵە لە لێقەوماندا، کۆمەڵە و وڵات و خەڵکەکەیان بێسەر بە جێ نەهێشت. بگرە لە بەرانبەر

جەبەروتی بەعس کەوتنە سەرچڵییەکی بوێرانەی ئەوتۆ، کە دڵنیام بۆرەپیاو و کەسە فرسەتتەلەبەکانی ئەمڕۆی سەر رەوسەی دەسکەوتەکان، ئێستاکەش لە بەری بلەرزن. لەو بارودۆخەدا کۆمەڵە نوزەی ژیانی بە بەردا کرایەوە. کە نەوشیروان کەموزۆر ئاوڕی لێناداتەوە وبێمنەتانە بەسەریدا باز دەدات. هەر ئەوەندە بەدرەنگەوە و بە لەبیرچوونی ئەوەی لە کتێبی _ لە کەناری دانوبەوە بۆ خری ناوزەنگ _ لەو بارەوە دەنووسی: (دوای ئەوەی ئارام هات بوە شاخ هەمو ریکخستنیان یەک خست بو لەژیر ناوی _ کۆمیتەی هەڵمەت _ دا) ل/١٢

بەبێ ئەوەی زەحمەت بداتە بەر خۆی، وەک چۆن لە باسکردنی خەڵکی دیکەوە، ئەوانەی بە تایبەت کۆنە رەفیقی دێرینەی خۆی بوونە وەک مافێکی سروشتی خۆی درێخی نەکردووە. دەبوو سەبارەت بە ماندووبوون، قارەمانێتی ئارام و ئەو هاوڕێ ئەساسییانەی لەو رۆژەدا، شانیان دابووە بەر راستکردنەوە باری لاریووەوەی کۆمەڵە و دەربازکردنی لە هەڵوەشانەوە و فەوتان لەوێ رۆژانی چڵەپۆپەی مەترسیی مەیدانی. دەبوو راستییەکانی دەربارەی ئەوانیش پشتگوێ نەخستایە. (جەمال تایەر _ سەرکەوت _دینەمۆی کۆمیتەی هەلمەت بو) ل/١٢. بەپێی ئاگادارییەکانم و نەبوونی هیچ جۆرە لارییەکم لە تێکۆشەری و گیانفیداکاری جەمال تایەریە تایبەت لەدەمی دووجارگیرانی لەلایەن دامودەزگانی بەعسەوە، بەڵام هەر ئەو بەتەنیا داینەمۆی کۆمیتەی هەڵمەت نەبووە، بگرە ئەوە برایم سەرسپی _ ناسراو بە برایم موسەور _ بوو کە لەوێ رۆژاندا بەدوای سالار عەزیزەوە، یەکەم بەرپرسی ئەو کۆمیتەیە بوو. من دەزانم برادەران، خودی برایم سەرسپی، سالار عەزیز، مەلابەختیار، چەندانی دیکە.. هتد، کە لە ژیاندا ماون، لەو بارەوە بەشێکی راستییەکانیان لایە، بەڵام بۆچی قورقەپیان لێ کردووە..! دەبی بۆ بەرژەوەندییەکانی هەنوکەیان بڤە بێت و راستییەکان ببەنە ژێر گڵەوە ..! پاشان لەو رۆژانەی کۆمیتەی هەڵمەت دەست بەکاربووە، هەرگیز بە رێکخستنی شارەکانی کەرکوک و هەولێر ئاگادار نەبووە و سەرپەرشتی نەکردوون.

(پاش ماوەیەک ئەم کۆمیتەیەمان کرد بە _کۆمیتەی سەرکردایەتی ریکخستنی ناوخۆ) ل/١٢. ئەو پاش ماوەیەکە بۆ چ ساڵێک هەڵواسراوە ! جارێ کۆمیتەی سەرکردایەتی ناوخۆ لە ساڵی ١٩٧٨ دامەزراوە و هەرگیزیش کۆمیتەی هەڵمەت نەکراوە بە _ک ، س. ن _ و بگرە ئەو کۆمیتەیە لە نوێنەری رێکخستنەکانی سلێمانی و هەولێر

و کەرکوک و ناوچەکانی دیکەوە بووە و لەناو کۆمیتەکەدا، نوێنەری کۆمیتەی هەڵمەت _ یش، شان بەشانی بەرپرسی کۆمیتەکە خەڵکی سلێمانی بوونە. دواتر ئەو کۆمیتەیە لە پاش کۆنفرانسی دووی کۆمەڵەوە، لەجیاتی کۆمیتەی ناوخۆی شارەکان، لە هەر شارەو ڕێکخراوی تایبەت بە خۆی جێگایانی گرتوتەوە.

(جگە لەم کۆمیتەیە دو ڕێکخستنی گەورەی ترمان هەبو یەکێکیان _ کومیتەی ڕاپەڕین _ بو کە حەسەن کویستانی لیپسراویان و، ئەوی تریان خەتیک بو د.خەسرەو خال _ زۆراب _ لیپسراویان بو. کومیتەی ڕاپەڕین تۆڕیکی فراوانی ریکخستنی لە چۆمان قەسری، گەلاڵە، ڕەواندوز، شەقلاوە، هەولێر... هەبو. کومیتەکەی زۆرابیش تۆڕیکی ریکخستنی فراوانی.. ...لەسلیمانی و هەولێر و بەغداد دامەزراند بو). ل/١٢

خۆزگە منیش وەک سەرجەمی ئەو خەڵکەی لەو رۆژە، بەشدارییەکی نزیک و دووری ئەو بەسەرهاتانە نەدەبووم. حەزم دەکرد یەکێک لەوانە بوومایە، سەروسەکوتێکم لەگەڵ چەقی خەبات و ماندوبوونەکانی ئەوان ڕۆژان نەبووایە. تاکو بۆ ئەو گێڕانەوە خەیاڵ ئامێزە سەراسیما و شاگەشکە بوومایە..! نەوشیروان لەو گێڕانەوە بێبەڵگانە، پاش ساڵانێکی بەسەرچوودا، لەجیاتی ناوهێنان و باسکردنی ڕۆڵی جوامێرانەی یەک بە یەکی کۆمیتەکان، لە پاڵ کۆمیتەی هەڵمەت لە سلێمانی و گەرمیان، کۆمیتەی ئاگر لە ناو کەرکوک و خوێندکارانی زانکۆکانی عیراق، کۆمیتەی شەهید برایم عەزۆ لەناو هەولێر و تێکڕای پارێزگاکە و بادینان و خەتێکی بەغداد بگێڕایەوە، کە بە حەق کرۆکی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بوون لە شارەکاندا. ئەوەی تر کە خەتوختوتی تاکوتەرای پەیوەست بە کادر و مەسولەکانی پێشمەرگەوە بوون. کە یەکێکیان خودی نەوشیروان بووە لە زەمانی ئامر هەرێمییەکەی لە دەوروبەری سلێمانی ئەو خەتەی لە ڕەفیقە کۆنەکانی سەردەمی جەلالیەت نوێ کردوتەوە و بە شاباش بە کۆمەڵەی دەفرۆشتەوە. بە دڵنیایی ئەو خەتوختوتە تاکوتەرایانە لە بارتەقای قەڵافەتی ڕێکخستنە سەرەکییەکانی ناو شارەکان هێشویان نەکردووە. ئەو ڕاستییانەی کە نەوشیروان دواتر لە نزیکەوە بە کار و چالاکییەکانیان ئاگادار بووە. کەچی لەجیاتی ئەوانە و لە گەرمەی باسوخواسەکانی ڕێکخراوەییدا، دوو هێڵی بەناوی کۆمیتەی _ ڕاپەڕین و زۆراب_ ی بەر شمڕی حەزی

تایبەتی خۆی، بە ستایشکردن زەقکردوتەوە کە کەس نازانی کەی و لە کوێوە هەنگاویان هەڵگرتووە و لە ڕۆژە سەخت و دژوارەکان ئەوانە لەکوێ بوون !

بەر لە دروستکردنی کۆمیتەی سەرکردایەتی ناوخۆی کۆمەڵە، ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە هەولێر بەدوای دەرچوونی سەعدی خەلیل _ سیروان _ بۆ شاخ، سەرلەبەری پەیوەندییەکانمان، لە ڕێگای تاکوتەرای ئەو کادر و پێشمەرگانەی کۆمەڵە لە ناوچەکە پچرابوو. بە ناچاری و بە هەوڵ و هیمەتی هاوڕێی ماندونەناس مەلاعەزیز _ دواتر ناسراو بە مەلا غەفور _ کە لەخۆبوردووانە لەوێ ڕۆڵاندا، بە دەستپێشکەری و شارەزایی خۆیەوە سەفەری بناری قەندیلی کرد، لە ڕێگای دۆستێکییەوە نەوشیروانی لە دۆڵەکۆک دیتبوو. لەو دانیشتنەدا پەیوەندی نێوان کۆمیتەی هەولێر و سەرکردایەتی کۆمەڵە، لە ڕێگای تەتەرێکی شارۆچکەی قەسرێوە دروست بووەوە. کە ئەو دەمە ئەز بەناوی _ هەوراز _ ەوە نامەکانم لە راپۆرت و چالاکی و کاروباری ڕێکخراوەیی لە ئەستۆبوو. خودی نەوشیروان وەڵامەکانی بۆ دەنووسینەوە و لەگەڵ بڵاوکراوەکان لەو ڕێگایەوە بۆی دەناردین. بەڵام وەک پاش ماوەیەکی کورت، بۆمان دەرکەوت کەسی سەر بە ڕژێم کنەی کردووتە ناو ئەو هێڵەی پەیوەندییەکانی ئێمەوە. چونکو هەموجارێ پرێسکە نووسراوەکانی بە کراوەیی و پێچانەوەی دەستکاریکراو دەگەیشتنە دەستمانەوە. هەتا خودی ئەو تەتەرەی شتەکانی لە هەولێر وەردەگرت و دەیناردن، بەرگدرویەکی خەڵکی قەسرێ و لە هەولێر دووکانێکی بەرگدرویی کردبووەوە. کە ئەو برادەرەی ئێمەی_ هاوڕێ حەسەن ئەنوەر_ ی دەدیت، هەموو کەرەتێک پێی لەسەر ئەوە دادەگرت، کە پێویستە ئەو خودی ئەو هاوڕێیەی ناوی _ هەوراز _ ە ببینی! ئەوە بۆ خۆی چیرۆکێکی درێژە، هەوڵ دەدەم لە فرسەتێکی دیکە بیگێڕمەوە. ئیتر ئێمە بەدوای ڕووداوی چوونی دەزگای ئەمنی هەولێر بۆ سەر ماڵی هاوڕێیان مەلاعەزیز و حەسەن ئەنوەر لە کۆتایی ١٩٧٨، کە هەردووکیان لە سەربانەوە خۆیان دەرباز کردبوو، بە ناچاری پەیوەندییان بە ریزەکانی پێشمەرگەوە کرد و ڕێکخستنەکانیان لە تەپکەی دوژمن دەرباز کرد.

بە کورتی خەتوختوتێک بە ناوی کۆمیتەی ڕاپەڕین و زۆراب، کە دوو هێڵی لابەلای ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و سەر بە خودی ڕاستەوخۆی نەوشیروانەوە بوونە، کە نەوشیروان وەک شارچییەتی لە ناوهێنانی تەنیا ئەوان تەیارەو بۆ کۆمیتەی ئاگر لە

کەرکوک و کۆمیتەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ لە هەولێر و بادینان بێدەنگی هەڵبژاردوە. کەس نازانی نەوشیروان بۆ لە ناو کولەکەی وشکەوەبوش ناویان ناهێنی...!

لەدەمی دروستبوونی کەرتەکانی ڕێکخستن بەدوای کۆنفرانسی یەکیشەوە لە شاخ. ئەز کە ئەو دەم لە شاخ بووم، کە کەرتی ڕێکخستنی شەقلاوە بۆ ناوچەکانی پارێزگای هەولێر هاتبووینە خوارەوە، لە بیرمە یەکەمجار پۆلێکی ڕێکخستنمان لە شانی ئەو پۆلەی لەناو هێزی پێشمەرگە بۆ هاوڕێیانی کۆمەڵە لە بناری قەندیل و چۆمان و قەسرێ و ڕەواندوز دروست کرد کە فەقێ محمد و هێدی و شێخ شەماڵ سەرپەرشتیان دەکرد. شیرازەی ئەو ڕێکخستنانەی چۆمان و قەسرێ و ڕەواندوز لە پەنجەکانی دەست تێنەدەپەڕین، کە دواتر کەرتی چۆمانی لەسەر دروست کرا. نازانم ئەو تۆڕە ڕێکخستنە فراوانەی گۆڕینی _ کۆمیتەی ڕاپەڕین _ لە چۆمان و قەسرێ و ڕەواندوز و شەقڵاوە و هەولێر بۆ کوێ چووبوون..! هەروەها ئەوەشم هاتووتەوە بیر کە لە گەرمەی هەڵسوڕانی ناو شار، لە ساڵی ٧٩ دا، لە ڕێگای هاوڕێیەکی گەڕەکی تەیراوەی هەولێر کە ناوەکەیم لە بیر نەماوە، بیستمان چەند کەسێک، لە بارەگای حیزبە کارتۆنییەکەی مەلاماتۆڕ و شێخ سەتار تایپ و ڕۆنییەکیان فڕاندوە، لەلایەن دەزگای ئەمنی هەولێرەوە گیراون و دوایی دووان لەو هاوڕێیانە لە سێدارە دران. پاش بەدواداچوونی خۆمان، بۆمان ڕوون بوەوە کە ئەوانە سەر بە هێڵێکی شاخ بوونە لە ناو شاری هەولێردا چاڵاکییان هەبووە، چونکو چەندانی دیکەیان لە نموونەی وەرزێر نەگیران و چوونە شاخ. ئەوجا لە دەمی دروستکردنی کۆمیتەی سەرکردایەتی ناوخۆی کۆمەڵەدا، بە بڕیاری ناوەندی و خودی نەوشیروان خۆیەوە، تێکڕای خەتوختوتی ڕێکخستنەکانی ئێرەوئەوێی کۆمەڵە لە هەر شار و شارۆچکەیەک هەبووبێت، بۆ سنووری چالاکی ڕێکخستنیی پارێزگایەکە گێڕدراوەتەوە. لەو سەروبەندەدا، بێجگە لە هەندێ شانەی ژێر ناوی ڕێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ڕەواندوز، هیچ هێڵ و خەتێکی ئەو ڕێکخستنانەی کۆمەڵەمان تەسلیم نەکراوە. کە نەوشیروان سەبارەت بە کۆمیتەی ڕاپەڕین بە تۆڕی فراوان باسی کردووە! بێگومان ئەو گومەزەیە ئەوە دەخەملێنی، کە نەوشیروان هەمیشە لە کاروانی خەباتی خۆیدا، بە پێچەوانەی ئارام لە خەمی ئەوەدا بووە سەرەداوی ڕێکخستنەکان بە خۆیەوە بەسترابێتەوە. ئەوجا ئەگەر کەسە مەسولەکانی ئەو کۆمیتە و خەتوختوتانە، لە ڕەفیقە دێرینەکانی خۆی بووبێت، ئەوە بۆ دەرخستنیان پێمەڕەی بڵاوبووە. بێگومان مەبەستی

سەرەکی لە گەورەکردنی هێڵی رێکخستنەکانی فلان و فیسار، کە کەس بەوە نازانێ ئەوانە لە چ ساڵانێک دروست بوونە! زۆرتر مەبەستی قیتکردنەوەیان بۆ کاتی خوازراو لە لایەک و بە هەند نەخوێندنەوەی رێکخستنە سەرەکییە هەڵسوڕاوەکانی ناوشارەکان لە دەمی هاتنەپێشەوەی ئەو تاوە خوازراوە بووە. یاخود سوودلێوەرگرتن و دانانیان وەک یەدەک بە کار هێنراون. نەوشیروان لەپاڵ ئەو دوو برادەرەی وەک مەسولی ئەو دوو کۆمیتەیە ناوی هێناون کە شتاقیان بە ژیان نەماون، ناوی یەکێکی دیکە لەو هاوکارانەیان ناهێنێ کە لەوێ رۆژاندا، دەبێ ئەسپی راکێشانی عارەبانەی ئەو دوو کۆمیتەیە بوون، وەک ئەوەی تەنیا و تەنیا نەمران، شەهید حەسەن کوێستانی و کۆچکردوو خەسرەوخاڵ، هەموشتێک بووبن و هاوکارەکانیان سەپانی پوشێ بوون. هەروەها باسی یەکێک لە چالاکییە دیارەکانی ئەو دوو کۆمیتەیە لەچاو کۆمیتەکانی ناوشیرازەی کۆمیتەکانی سنووری سەرکردایەتی ناوخۆ ناگێڕێتەوە. خەبەرێک لەوە بەدەستەوە نادات، کە چەند لەو دکتۆر و کارمەندە زۆر و زەبەندەی ناو تۆڕی فرواوانی ئەو کۆمیتەیە، هاتبنە ریزی خەباتی چەکداری، کە مانگ و راپۆرت نەبووە، ناوەندی کۆمەڵە بە دەستخەتی نەوشیروان، بۆ ناوخۆی نەنووسێ، هەوڵ بدری پزیشک و کەسانی لێهاتوو بۆ ریزەکانی پێشمەرگە بنێردرێتە دەرەوە.

دیسانەوە لەبارەی ئەو دوو کۆمیتەیەوە، پێداهەڵگوتنی تەنیای شیرازەی فراوانی رێکخستنەکانیان، کە ئەوان رۆژان دەهێنمەوە پێش چاوی خۆم، دڵم بۆ ئەو تێکۆشەرە راستەقینانەی ساڵانی ١٩٧٦ _ ١٩٨٠ دەسووتێ کە نەوشیروان هەتا لە هەگبەی یادەوەرییەکانی سەر لاپەڕەی نووسراویش، دوای دەیان ساڵ نایانخوێنێتەوە و بگرە ئەوانەی بەدوای ساڵی ١٩٨٠ وە هاتوون و لەو کاروانەی سێبەری تەنیای شمڕی خۆی بەشدارییەکیان هەبووە. بەرز دەکاتەوە و بۆ تۆڕی فراوانی دەوروبەریان دەخوێنی کە سەد خۆزگە وابووایە..!

(ریگەمان دابو بەهەمو کادرە سیاسی و پیشمەرگەییەکانی یەکیتی هەرکەسە لە لای خۆیەوە، چەندی لەتواناى دا بی، کەسانی دلسوز ریک بخا و، بەرەو روی ناوەند یا دەزگا ریکخراوەییەکانی بکاتەوە.

سالانی ١٩٧٦_ ٧٩ هەزاران تیكۆشەری تازە هاتنە ریزی ریكخراوەكانی كۆمەلەوە بەدەیان شانە، شانەی سەرەكی و ریكخراوی تازەیان لەسەرانسەری كوردستان دا دامەزران.) ل/١٣

بەراستی حەق وا نەبوو، نەوشیروان وا بە پەرێز پەرشوبڵاوی، خۆی لە قەرەی دۆزی رێكخراوەیی كۆمەڵە بدات، و بۆ خۆیشی باشتر بوو، ئەگەر چۆن دەربارەی زۆر مەسەلەی گرنگی ئەو رۆژە بێدەنگی هەڵبژاردوە، هەر هیچ نەبوایە لەو بوارەدا قسەی بۆ ئەو كەسانە بە جێ بهێشتایە، كە لە ساڵەكانی ١٩٧٦ _ ٧٩ زۆر لەو ئاگادار و شارەزاتر بوون و بگرە بە پراكتیكی لەو كاروانە سەر بە گۆبەندە گیانفیداكارییان نواندوە. ئەوەندەی لەوێ رۆژان ئاگادار و بەشداری هەڵسوڕانی فیعلی رێكخراوەیی ناو شارەكان بووم. هەرگیز كۆمەڵە لەوێ رۆژاندا، خاوەنی هەزاران تێكۆشەری رێكخراوەیی نەبووە و شیرازەی چەندایەتی رێكخراوەیی كۆمەڵە، بەدوای ئەزمەی ١٩٧٥ی ستافیی سەركردایەتییەكەیەوە و دەستبەكاربوونی ئارام و هاورێیەكانی لە گرتنەوەی شیرازە پچرپچرپوەكانی كۆمەڵە و دارشتنەوەیان. ئەوجا سەرلەنوێ لە بەر رۆشنایی رێنماییەكانی ئارامدا، رێكخستنەكان هەتا بەدوای شەهیدبوونیشیەوە، وازی لە شانە و بازنەی بە ژمارە زۆر هێنا و رووی كردە رێكخستنی هێشوویی شانەی بە ژمارە كەم، كە پێویستییەكی لۆژیكی خواستە سەخت و دژوارەكان خەباتی ژێرزەمینی رێكخراوەیی ئەودەم بوو كە خەمی گەورەی ئارام بوو. لە بۆ پاراستنی رێكخستنەكان لە ئاشكرابوون و لەوەی سەرلەنوێ و بەستروكتورێكی نوێوە بكەوێتەوە سەرپێیان.

ئیتر نازانم نەوشیروان بەپێی چ داتەیەك، سەرژمێرییەكی رێكخراوەیی ئەو ژمارەی هەزاران لە تێكۆشەری لە ریزەكانی كۆمەڵە لەنێوان ساڵە پڕ قوربانییەكانی هاورێیانی كۆمەڵە١٩٧٦_١٩٧٩ هەژمار كردووە..! نەوشیروان كە لەئان و ساتی دوای شەهیدبوونی سەركردە هەڵكەوتووەكەی رۆژانی لێقەومانی كۆمەڵە، بووەتە بەرپرسی سەرەكی ئەو رێكخستنە. دەبوو لەجیاتی ئەو هەژماركردنە بێبەڵگە ناریالیستە، دەربارەی قوربانی و كاری نەكردەی رووبەڕووبوونەوەی دەسەلاتی بەعس، لەلایەن ئەو زنجیرە تێكۆشەرە بە ژمارە كەمەی ریزەكانی ریكخستنی شارەكان، خۆی ماندوو بكردایە و گیانفیداكارییەكانیانی بەبێ جیاوازی هەڵسەنگدایە و بە حەق بۆ قوربانیدان هەتا بە كەسوكاری خۆیان راستییەكانی بە دارێ وەكردایە.

هەر بۆ بەڵگە ئەوەش دەگێڕمەوە.. لە ڕۆژانی بەر لە نەورۆزی ساڵی ١٩٨٠، بە نوێنەرایەتی سەرکردایەتی ناوخۆی شارەکان، بە سەرچڵی کردنێکی لاسارانەی کەسی خۆم، سەردانی ناوەندی کۆمەڵە و خودی نەوشیروانم لە خڕی ناوزەنگ کرد. لە یەکێک لەو دانیشتنانەی نێوانمان، نەوشیروان لێی پرسیم، کە ژمارەی ئەندامە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە، لە ناو شاری هەولێردا چەندە بێت! من بە دەوری ٤٠٠ ئەندام وەڵامم دایەوە. کە ئەو ژمارەیە هەتا ئەو خەڵکەشی دەگرتەوە کە بەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ڕێکخرابوون. نەوشیروان بە گرژبوون وەڵامی دامەوە کە چۆن دەبێ لە شارێکی گەورەی وەک هەولێر هەر ئەو ژمارە کەمەی خەڵک ڕێکخراوبن! ڕاستە بە هەوڵ و کۆششی بەردەوامی سەربازە گومەکانی ڕۆژانی تەنگانەی کۆمەڵە لەوێ ساڵاندا، لە شارەکانی باشووری کوردستان و لەناو خەڵکی کورد، بە دەیان کەس لێرە و لەوێ لە دەوری ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە کۆ ببوونەوە. بەڵام بەدوای سیاسەتی ملهوڕانەی سەدام و ڕژێمە دیکتاتۆرییەکەی بەرانبەر خەڵکی کورد لە لایەک، لووتبەرزی و مەغروربوون بەو سەروەت و سامانە بێشومارەی کەوتبووە بەردەستیان، بۆ شانسی نەیارەکانیان لە کورد و شیعە، زۆر لاسارانە شەڕی قێزەوەنی عیراق _ ئیرانیان بەرپا کرد، کە تارادەیەک هێزە سەربازییەکانیان وەک پێویست نەدەپەرژانە سەر بەردەوامی شاڵاوی دڕندانەیان بۆ سەر هێزی پێشمەرگەی شاخەکانی باشووری کوردستان و سەرکوتکردنی یەکجارەکی نەیارەکانیان لە تێکڕای عیراقدا. ئیتر لە چاوپەنای بێزاربوونی خەڵکی کورد بە تایبەتی لە جەنگی کاولکارانەی قادسیەی سەدام، گەشەکردنی چەندایەتی بە ژمارەی هێزی حیزبە چەکدارەکانی شاخ هەموولایەکی گرتبووەوە. لەو پێناوەدا هێزی یەکێتی زۆرتر گەشەی کردبوو. ئەوجا بەدوای دروستبوونی کەرتەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵە بەدوای کۆنفرانسی یەکەوە، ڕاستە دەیان و سەدان تێکۆشەری نوێ هاتنە ریزەکانی ڕێکخستن و هێزی پێشمەرگەوە. بەڵام دیسانەوە بەدوای کۆتاییهاتنی جەنگی عیراق _ ئیران و دەستبەتاڵبوونی هێزە سەربازییەکانی ڕژێم بۆ پەلاماردانی دڕندانەی ناوچە ڕزگاربووەکان و ئەنجامدانی شاڵاوی بەدناوی ئەنفال لە پانتایی ئەو ناوچانەدا. ئەو چەندایەتییە پوکایەوە و هەموو حیزبە چەکدارەکان نیشتنەوە سەرپێوادنگی قەوارەی گۆڕینی خۆیان و ئاودیوی سنوورەکان بوون. هەڵچوونی ئەو بەهەزارانەی بەر خەمڵێدانی خەیاڵاوی سەرگەڤارە_کان نیشتەوە سەر مەفرەزەی پارتیزانی تاکوتەرا.

دواتر نەوشیروان نووسیویەتی..

(سالی ٧٦ ریکخراویک لەسلیمانی گیرا ١٢ کەسیان لی ئیعدام کردن.

سەرەتای ٧٧ عەبدوللا حەسەن گیرا و بەئەشکەنجە کوژرا.

سالی ٧٧ ریکخراویک لە هەولیر گیرا چەند کەسیکیان لی ئیعدام کردن.

سالی ٧٨ ریکخراوی _ هەلۆی سور _ لە بەغدا گیرا و چەند کەسیکیان لی ئیعدام کردن.

سالی ٨٠ ریکخراویک لەهەولێر گیرا کەریمیان بەئەشکەنجە کوشت.) ل/١٢ — ١٤

دیارە ئەو بەسەرهاتانەی وەک نموونەگەلێک بۆ زنجیرەیەکی نەپساوەی گیران و بەرلێدانکەوتنی رێکخستنەکانی شاری کۆمەڵە دەگێڕێتەوە، کە لەلایەن دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی رژێمی بەعس ئەنجام دراوە. وەک لە پێشەوە تریش گوتومە، ووشەی رێکخراو تەنیا بۆ ئەو تەنزیمەی هەڵۆی سوور بە دروستی بە کار هاتووە، دەنا ئەوانەی دیکە لەوپەڕی حەڵەتدا، هێڵێکی ئێرەوئەوێی رێکخستنی ناو کۆمیتەی شارەکان بووە. هەر بۆ نموونەش ئەوەی ساڵی ١٩٧٧ لە هەولێر رووی داوە، بەراستی نەوشیروان چاکی پێکاوە کە دواتر نووسیویەتی، ئەو گیرانانە زۆرتر لە رێگای خۆخزاندنی بۆرە پیاوەکانی رژێمەوە بووە بۆ ناو ئەو رێکخستنانەوە.

بەڵام دەبوو باسی دوو جار گیرانەکانی _ جەمال تایەر _ و لەگەڵ ئەوانەی کەرکوکیشی بەسەردا تێنەپەڕیبایە..! پاشان بەنیسبەت ساڵی ٨٠ و گیرانی رۆڵەی سەربڵندی کۆمەڵە لەوێ رۆژاندا، کەریم رەسول و هاوڕێیەکانی، زانیارییەکانی هەگبەی یادەوەری من بریتییە لەوەی.. ئەو برادەرانە، کەریم رەسول و تەها فەقێ یوسف و ئیسماعیل حەسەن بەیەکەوە مەفرەزەیەکی نهێنی پێشمەرگەی ناو شاری بوون، بەبێ پرسی رێکخستن و سەرباری ئاگادارکردنەوەیان لەلایەن خودی بەندەوە، یەکلایەنە پەیوەندییان بە بۆرە پیاوێکی رژێم جەلال کاکۆ (کە لە کۆتایی شەستەکان یەکێک بووە لە پێشمەرگە دڕەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی لە هەولێر) و ئەویش سەرەتا هەتا هەرسێکیانی بە باشی ناسیوە، شارەزای شوێنی کارکردن و ژیانی ئەو برادەرانە بووە، بۆ کل لەچاوکردنیان هاوکاری کردوون، شەوێک نارنجۆکێکی دەستی وەک چالاکی فرێداوەتە یانەی کانی شەوانەی هەولێر، کە تەنیا خەڵکی مەدەنی تێدابووە و کەس زیانبەخش نەبوو. دواتر گوایە پلانیان بۆ چالاکییەکی گەورە لەناو شار دارشتوە. ئەوە بوو لە رۆژی

پێش جێبەجێکردن، هەرسێکیان لەلایەن دەزگای ئەمنی هەولێر لە شوێنی دیاریکراوی خۆیان بەئاسانی پەلبەست کراون. کەرەستەکانی دەمانچە و نارنجۆکی دەستییان لە شوێنی تەقەتکراو دەرهێناوە کە پێشتر لە رێگای سیخورەکەی خۆیان پێیان زانیوە. بەڵام ئەوانە بە تایبەت کەریم و تەها، هەردووکیان سەرو مێڵی رێکخستنی کۆمەڵەشیان لە لا بووە، کەریم ئەندامی کۆمیتەی ناو شار بوو، بە خۆڕاگری و بەختکردنی گیانی خۆیان، شیرازەی رێکخستنەکانی لای خۆیان پاراستوە و ئیعترافیان لەسەر یەک کەس نەکردووە.

دەمینێتەوە سەر ئەوەی بۆ سەبارەت بە ناوهێنانی ئەو موختارەی لە ساڵی ١٩٧٧ لە ناو شاری هەولێردا وەک خۆی دەڵێ، بەشێکی زۆری ئەندامەکانی رێکخستنی کۆمیتەی هەولێری بەگرتن داوە، بێدەنگەی لێ کردووە و کەچی جوامێرانە بۆ بەگرتندانی، هاوڕێیانی هەڵۆی سوور، راست و دروست ناوی ئەو کەسە سیخوڕەی هێناوە..! نەوشیروان لە درێژەی باسوخواسەکانی ئەو بابەتەوە. قامکی لەسەر بەشێک لە فاکتەرەکانی ئەو زنجیرە گرتنانەی بە کۆمەڵی ریزی ریکخسنەکان داناوە و دەڵێ..
(دوای لیکولینەوەی هەمو ئەو رووداوانە بۆمان دەرکەوت کە هۆی ئەم ئاشکرا. بوونانە چەند شتیکە..
١ ــ پەیوەندی کردن بە نۆکەرانی داو و دەزگا سەرکوتکەرەکانی بەعس.
٢ ــ تیکەلاوکردنی کاری ریکخراوەیی و کاری پیشمەرگەیی.
٣ ــ شیوەی هەرەمیی ریکخستن. ) ل/١٤

بێگومان ئەو خاڵانەی نەوشیروان تۆماری کردوون، هەموو نەخشی سەر بەرد بوون. بەڵام فاکتەری دیکە هەبوون، کە نووسەر خۆی لێ نەبان کردووە. گرینگترینیان چۆنیەتی دانانی تەتەرەکانی نێوان شاخ و شار بوو، کە بەزۆری لەلایەن کەسی یەکەمی یەکێتی و کۆمەڵەوە دانراون. لێرەوەش ئەوە دەگێڕمەوە.. لەو دیدارەی ئەز بە ئامادەبوونی نەوشیروان لەگەڵ مام جەلال ــ سڵاو بۆ گیانیان ــ لە خرێ ناوزەنگ و نەورۆزی ساڵی ١٩٨٠ دا دانیشتبووم. مام جەلال سێ کەسی لە کۆنە جەلالییەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی کۆن بۆ ئێمە پێشنیار کرد کە مایەی کارئاسانی و دابینکردنی تەتەری نهێنی نێوان شاخ و شار بۆ کۆمەڵە و یەکێتی لە ئەستۆ بگرن. من هەموویانم بەتوندی

ڕەتکردەوە کە ئەو جۆرە کەسانە جێگای باوەڕی کۆمەڵە نین و هەر یەکەیان بە شێوەیەک لە شێوەکان، کەشوکوشێکیان لەگەڵ دامودەزگاکانی بەعس هەیە.

پاشان ئەو برادەرانەی کۆمەڵە کە چووبوونە شاخ بە هەزارویەک ڕێگای دوور لە هەر جۆرە نهێنی پاراستنێ، بەردەوام خەریکی نامە و نامەکاری بوونە بۆ ئەو هاوڕێیانەی ناوشار. خودی خۆم کە هێشتا لە شار بووم، زنجیرەیەک نامەی لەم جۆرەم بە خەڵکی نە ناسراوەوە بۆ هاتووە و ئامادە نەبوومە وەریانگرم و ڕەتمکردوونەتەوە. فاکتەرێکی دیکەی ئاشکرابوون و زنجیرەی گرتنەکان، بۆ تەسلیمبوونەوەی بەردەوامی ئەو پێشمەرگانەی شاخ گەڕاوەتەوە، کە بۆ ڕزگارکردنی پیستی خۆیان و خۆشیرینکردنیان لە لای دەسەڵاتی بەعس، هەرەمەکی خەڵکیان بە گرتن داوە. ئەوجا هەوڵدانی بەردەوامی سەرانی یەکێتی و کۆمەڵە، لە پەیداکردن و چاندنی خەڵکی دووسەرە لەنێوان شاخ و ڕژێمدا. کە دیارە لە ئەنجامدا باجەکەی بە ڕێکخستنەکان دراوە و ئەو سیخوڕە دووسەرانە، دەیان کەسی تێکۆشەریان توش کردووە کە هەتا هەندێکیان لە کۆنە جەلالییەکان بوون.

(ڕیکخستنی (( هەرەمی )) مان گۆڕی بە ڕیکخستنی (( هیشویی)) و ((تەزبیحی))
ل/١٥

من یەک بەخۆم بەوە ئاگادارم، کە هەر لە سەرەتاوە گۆڕینی ڕێکخستنی هەڕەمی بۆ ڕێکخستنی هێشویی لەسەر دەستی خودی ئارامەوە بووە. کە لە یادەوەرییەکانم بۆ ئەو جارانەی لە ژیانی ئیختفای سلێمانی لە ساڵی ١٩٧٦ دەگەڕێمەوە، و چاوم بە کارێکتێری ئەو دەمی کۆمەڵە، شاسوار جەلال _ ئارام _ کەوتووە. شاسوار بە وردی لایەنە خراپەکانی شێوە تەنزیمی هەڕەمی بۆ شی کردوومەتەوە و بۆ گۆڕینی ئەو جۆرە ڕێنمایی داومەتێ. ئێمەش کتومت لەگەڵ هاوڕێیان لە هەولێر _ئەوانەی بەژیان ماون _ سدیق گۆران، برایم سەید غەفور، محمد مەنگوڕی، شەهیدەکان سەعدی خەلیل، مەلاغەفور، کەریم ڕەسول، دکتۆر مەجید، زریان لە ناوچەی سۆران، فریاد محی الدین لە بەغداد هەتا کۆتایی ساڵی ١٩٧٨ بەو جۆرە کارمان کردووە و تاکە یەک هاوڕێشمان لێ نەگیراوە.

## چیرۆکەی ناکۆکییەکانی نێوان حیزبە چەکدارەکانی شاخ

(جولانەوەی کورد لە عیراق دا لەو کاتەدا دابەش بوبو. لایەکی بنەماڵەی بارزانی و، لایەکەی تری یەکیتی بو. بنەماڵەی بارزانی و، سەرانی پارتی، تاوانباربون بەوەی دۆستی شا و هاوکاری ساواک بون، لەناو ئێران دا بەدناو بون. مەلا مستەفا لە ئەمریکاوە بروسکەیەکی پیروزبایی و پشتیوانی بۆ خومەینی نارد،.. زۆری نەخایاند بنەماڵەی بارزانی لەگەل سەرانی شۆرش و، کاربەدەستانی تازەی ئێران دۆستایەتییان تازە کردەوە.) ل/٢٢

لە قوتابخانەی حیزبی کوردی لە کۆن و هەتا هەنوکەش هەروا درێژەی هەیە و بگرە لە جاران زیاتر لەسەر خەرمانی قوربانیپێدانی خەڵکی ستەمدیدەی کورد گەرموگوڕترە. هەر یەکێکیان لەو حیزب و حیزبۆکانە لە هەر کوێیەک بۆی رەخسابێت، بە موناسەبە و بەبێ موناسەبە، لە هەڵدانەوەی رەوسەی سیاسەتی تژی لە زیوانی یەکتری درێخیان نەکردووە و قوربانی خەڵکی کوردی بۆ بە بادا دەدەن. ئەویش تەنیا بە مەبەستی شەنەباکردنی کوزری شاراوەی بەرخەرمانی یەکتری. هەمیشە و یەکلایەنە قرشەی جۆخینی سیاسەتی دانەخۆرەبوونی یەکتریان کوتاوەتەوە. چونکو هەر کورد خۆی جوانی گوتوە، ئەوەی درێشەی نەیارەکەی ببینی، دەبێ ئاگای لە دەرزیلەی خۆیشی هەبێت. تاوانبارکردن لەو پەراوێزەدا بۆ یەکتری، بەردەوام نان و پیوازی پێوە خوراوە و کۆمەڵانی خەڵکی سادە و بێئاگای پێ سەرخۆش و لە خشتە براوە. بەردەوام قوربانی بێشوماری بێهودەی پێ دراوە.

ئەگەر نەوشیروان لەوان رۆژاندا، کە دەستخۆشانە باسی خامۆشیەکانی سیاسەتی لایەنێکی دیاریکراوی نەیاری لە مێژینەی لەو مەیدانە دەگێرێتەوە. ئەگەر ئاوڕێکیشی لە بەرخوردی سیاسەتی خۆدانەپاڵ رژێمێکی وەک بەعس لە ساڵانی ١٩٦٨ _ ١٩٦٩ بدایەتەوە کە خۆیشیان لەو کاروانەدا کەم سوچ نەبوون. بێگومان رچەی ئەو چەپک چەپکییەی دەشکاند. بە کورتی سیاسەتی نەیاری سەرانی هەردوو رەوتی جیابووەوەی ناو شۆڕشی ئەیلوول و پارتی، تەنیا بۆ درێژەپێدانی تەمەنی سیاسی سەرکردەکان خۆیان بووە و تاوانبارکردنی یەکتری بەوەی ئەوەی لەدەستیان هاتبێت، هەمیشە بنیشتە خۆشەی ژێر ددانیان بووە و لێی نەسڵەمینەتەوە. کە بە حەق ئەوە بووەتە یەکێک لەو گرێکوێرانەی خەبات و کۆششی توخمگەلێک لە تێکۆشەرانی دڵسۆزی وڵاتپارێز و خەڵکی

کوردی مایەپوچ کردووە و هەتا ئێستاش پێوەی دەناڵێن. ئەوجا ئەگەر نەوشیروان، وەک چۆن بە خۆی رەوا بینیوە لە هەوڵدانیان بۆ پەیوەندیکردن بە دامودەزگای ئێرانی لە کۆن و نوێدا درێخییان نەکردووە. کەچی بۆ بنەماڵەی بارزانی و پارتی بە ناشیرینی ناوزەد کردووە و توانجیان تێدەگری..!

بنەماڵەی بارزانی و پارتی لە چاوی یەکیتی و بە تایبەتی دۆستە نزیکەکانی لە رۆژهەلاتی کوردستان (ئیران) خۆشەویست نەبوون. بەلام لە حەقیقەتدا ئەوانیش بەشی خۆیان دۆست و هەواداریان بە دەورەوە هەبووە. سەرباری هەڵە کوشندەکانیان توانیبویان بەسەرپێیانەوە بن و دواتر پۆشتەتر لە جاران بکەونەوە تەلاش و لە ناو ئیرانیش کارەکانیان بۆ مەیسەر بێت و لەچاو هێزەکانی دیکەوە بەرچاوتر بن. نابێ لێرەدا ئەوەشمان لە بیر بچێت _ کە لێرەشدا نەوشیروان خۆی لە قەرە نەداوە _ واتە رژێمی داگیرکەری کوردستان لە هەر پارچەیەک و هەر بوارێکدا بوو بێت، بۆ خاترجەمبوونی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت و نەتەوەکەی خۆیان لە لایەک، دیزەبەدەرخۆنەکردنی هەوڵ و کۆششی کوردان و مایەپوچکردنی خەباتەکەیان، پشی پشییان بۆ هەموو دەنگێک بەردەوام بووە. حیزبی کوردی خاوەن ئەجندای بزاڤی چەکداری بۆ بەرێوەبردنی ئەو پرۆسە قورسە و ئەستورکردنی باسکی دەرەقەت هاتنیان، هەردەم لە پەیوەندیکردن بەو دامودەزگای ئێرە و ئەوێی دەوڵەتی حوکمران بازیان نەداوە. چونکو لەراستیدا بزاڤی چەکداری کوردان لە پشتیوانی هەر هاوکارییەکی سروشتی دروستی هێز و لایەنی دۆست، هەتا خەڵکی خۆی بە شێوەیەکی بابەتی بێ پشتوپەنا بووە و لەگەڵ ئامادەکاری فاکتەرە بزێوەکانی بزاڤی چەکداری، لەناو ریزەکانی خەڵک بێپەروا و خەمسارد بووە.

(تازە کارەساتی هەکاری قەوما بو، یەکیتی و پارتی بەخوینی سەری یەکتری تینو بون. هەردولایان لە لای کاربەدەستانی ئیران هەولیان ئەدا، ئیران بە لای خۆی دا رابکیشی و لایەکەی تر لە لای ئیران بەدناو بکا. زۆری نەخایاند لایەنی سییەمیش، کە حسک بو، پەیدا بو. ئەوانیش، بە هۆی محەممەد رەحیم _ خالە حاجی _ ەوە، گەیشتنە لای سەرانی شۆرش و، دریخییان نەکرد لەهەولدان بۆ بەدناوکردنی هەردولای ناکۆک. بەدوای ئەوان دا هەندی کەس و تاقمی تریش هاتنە کایەوە) ل/٢٢

لەم روونکردنەوە راشکاوە پڕ لە راستییەی نەوشیرواندا. خوێنەر لەوێ رۆژانی لێقەومانی خەڵکی کورد ئەوە دەخوێنێتەوە، کە سەرانی حیزبی کوردی چەکداری شاخەکان، بە پێچەوانەی هەر جۆرە لۆجیکێکی گەمەکان، لە شوێنی هاوکاری ناوخۆییان، بەهێزکردنی قامکی دەستەجەمعی کورد، هەر یەکەیان بە تەنیا و بۆ خۆی لە قۆشمەی _ موسابەقە _ ئەوەدا بووە، گەرمترین شوێن بۆ خۆی لە لای دامودەزگای دەوڵەتی ئێران جێبکاتەوە.، بەڵام نەک بەو مەبەستەی ئێرانییەکان هاوکاری بزاڤی چەکداری کوردی باشوور بکەن، بگرە بە پراکتیکی جرتوفرتی یەکتر ناشیرینکردنی پیلەکانی بزاڤی چەکداری بووە و، هەر یەکە هەوڵیداوە خۆی لە بەرچاوی داگیرکەرێکی کوردستان شیرین تر بکات و دەستی چەوری خۆی بە سەری لایەنێکی تری ناو ئەو بزاڤە سڕیوەتەوە. ئیتر ترشی یان خۆشیمان بێت، ئەوە چەقی ناوەخنی نهێنی و ئاشکرای سیاسەت، ئەجندای بواری پەیوەندییەکانی بزاڤی چەکداری کوردان بووە. من یەک بە خۆم هەنوکەش لەوە سەرم سوڕ ماوە، سەرباری هەر جۆرە نەیاری و بینەوبەردەیەکی سیاسی، بۆ دەبێ سیاسەتچیی کوردان بە ناشیرین و ریسواکرانی یەکتری تینوو بن! لێرەدا لە لای بابایەکی وەک من، کە لەو کاروانەدا دوور و نزیک پرۆشکم بەر کەوتووە، ئەسلەن دۆزی نەتەوەبوونی خەڵکی کورد لەلایەن ئەو سەرکردانەوە جێی پرسیار نەبووە..! بگرە لە لای سەرانی ئەو حیزبانەوە ئەرێ بابەی وڵاتی واق واقی بۆ هۆنراوەتەوە. ئەو قسانەی سەرەوەی نەوشیروان تەنیا پەیڤی خەڵکە سادە و هاکەزاییە نەگبەتەکان نییە، بەڵکو قسەی سیاسەتمەدارێکی تەمەنی پڕ لە ئەزموونی گلان و کەوتن، هەستانەوە و دەسەڵاتی ئێرە و ئەوێیە. کە زەمانێک خوێندکارێکی ئەکادیمی زانکۆیەکی بەرزی ئەورووپی، بەردەوام خاوەن مەعریفەیەکی زەنگین و زمانزانێکی باڵادەست بووە..!

# بەعس و کەویاری حیزبی کوردی و عیراقی

(هەرکەس بە چاوی بەراورد و رەخنەوە لەم راپورتە ورد ببیتەوە بەزەیی بە جەماوەری حشع دا دیتەوە، چ سەرکردایەتیەکی هەبوە و، چۆنی سەرکردایەتی کردوە، دەربارەی حیزبی بەعس هەمو بۆچونەکان پیچەوانە دەرچون) ل/٢٩

کامانەن و لەکوێ ئەجندای سەرانی ئەو حیزبانەی باشووری کوردستان و عیراق سەبارەت بە دەسەڵاتی عیراق و تێکڕای رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان تشتێکیان راست دەرچووە..!

بێگومان یەکێکی تر لە خەوشە دیارەکانی سەرانی ئەو حیزبانە بریتی بووە لەوەی، کە یاداشت و ئەزمونەکانی کاروانی خەباتیان دەنووسنەوە. یەکلایەنە سەرەداوی هەندێ بارودۆخی سیاسەتکردن دەخەنە روو، کە زۆرتر سەروپۆتەڵاکی ئەزموونی بە تەنیا نەیارەکانیان بگرێتەوە و بەس. چەند خۆش دەبوو نەوشیروان لە پەنتایی دەرخستنی سەرچیخچوونی حشع دا، بە شێوەیەکی گشتگیر ئاوڕی لە ئەزموونی تاڵ و تفتی هەمووان بدایەوە. چونکو لە عیراق بەگشتی و لەسەر دەستی حوکمڕانی بەعسدا، ئەوە بەتەنیا سیاسەتی حشع نادروست دەرنەچوو بەرانبەر بە بەعس، بگرە خودی رەوتە سیاسییەکەی باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی گۆرینیش باڵی جەلالی کە نەوشیروان خودی خۆی لەو حیزبە هەڵسوڕاوێکی دیار بووە و مەسول و دەستڕۆیشتوو وجوودی هەبووە.

ئەو رەوتەی باڵی م.س لە مامەلەی دۆڕاوی لەگەڵ بەعسدا پێشقاول بووە و سیاسەتچییەکانی _حشع _ یش کلۆجێک لەو ئەزموونە پڕ کوێرەوەرییەی پێش خۆیان دەرسیان وەرنەگرتووە و بگرە بە دەستلەپشتدانی هێزی دەرەکی بەرژەوەندخواز و ماڵداریکردن بە خوێنی کۆمەڵانی خەڵک بۆ کوێخوا ئایدیۆلۆژییەکانیان، بە هەمان میتۆدی ناشیرینبوونی رەوتی م.س، خۆیان سەراوژێر بە قەنارەی ئەجندای بەعسەوە وەکرد، کە هەتا هەنوکەش پاشماوەکانی ئەو حیزبە لە قەرزەکانی ئەو باجدانە قوتار نەبووە.

نووسینی بە جەوهەری رێپیشاندەری نەوەکانی نوێ، بەرانبەر خەرمانی بزاڤی نەپساوەی ئەو حیزبە کۆلەوارانە لە هونەری بەرێوەبردنی کۆمەڵی کوردی، لەوە سەرقەڵەمانەی خۆی دەداتەوە، کە هەر هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوەیەکی رووداوە پڕ تراژیدییەکانی رابرووی ئەو کاروانە، لەلایەن هەر یەکێکەوە بێت، دەبێ لە حیزب و

ڕێبازی بزاڤی خۆیەوە هەنگاو بنێ و کەس دەستی چەوری خۆی بەسەری ئەوەکەی دیکە نەسرێتەوە. چونکو هیچ لایەنێک لەو کاروانە پڕ بازبازێکییە خامۆش ئاسایە، بێ سوچ و کەملادان و هەڵەی کوشندە نین و یەکێکیان لەو هەوارەدا داهێنانێکیان لە پاشۆڵدا نییە

کورد لە باشووری کوردستاندا، لەو جەلەحانێیە ناوخۆییە بێهودە فەشەلاوییەی شاخەکاندا ۱۹۷٦ _۱۹۹۱، ئایا گرەوی سەرکەوتن و بەرەوپێشەوەچوونی بەدەستەوە بووە! ئەگەر ئەو فرسەتە زێڕینەی لێ دەرچێ، کە لە ئەنجامی پرۆسەی سەرشێتانەی سەرۆکی عیراق سەدام حسین لە داگیرکردنی وڵاتی کوێت ڕەخساندی و جەنجەڕی شلوشۆقی سەرلەنوێی هاتنەوە سەر شانۆی ئەو حیزبانەی شاخی ئاوداماڵ کردەوە. ئەوجا لە سایەی بەرپابوونی ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵک لە سەرتاپای ئەو وڵاتەدا، ئەو حیزبانە هەناسەیان هاتەوە بەر و بە پێی ئەزمونی لەمێژینەی کەوتن و هەڵسانەوەکانیان، بوونەوە سەرقافلەی مەیدانەکە. دەنا کامانەن ئەو ستراتیژ و تاکتیکانە، کامانەن بەرنامە و ڕێوشوێنی سیاسی سەرانی حیزبەکان بە _حشع_ یشەوە، لەو بوارەدا بەختەوەر و ڕوومەتی خۆ پێوە بادانی هەبووبێت _بێجگە لە موزایەدەکردن بەسەر خەڵکەوە _ دەبوو وەک سەرمایە بەرهەمێکییان لە هەمێزدا بێت..!

نەوشیروان لەناو ئەو کۆڵەپشتە پڕ ئەزمونەی بە کۆڵییەوە بوو. دەیتوانی ڕچکەشکێنەرانە لە ئەنجامگیرییەکانی سەبارەت بە دروست دەرنەچوونی ئەجندای سیاسی ئەو حیزبانە بە خۆشیانەوە، تاکلایەنە لەسەر کەلاکی حیزبێکی دیاریکراو نەوەستی و شانەکەی بە تەنیا لەناو قڕی ڕشکاوی ئەوان نەشکێنی. گەرەک بوو لەو چارەنووسە هەمووان بەسەریکاتەوە و کەس نەبوێری. تاکو نەوەکان پێی بزانن و دەرسی لێ وەرگرن.

(د. موکەڕرەم تالەبانی، کە ئەوسا یەکی بو لە دو وەزیرەکەی حشع لەناو وەزارەتەکەی بەعس دا، لە ستایشی ئەو عەفوەدا کە بەعس بۆ بەشدارانی جولانەوەکەی دەرکرد. سەر وتاریکی بە عەرەبی لەژێرناویشانی _... اشداء علی الکفار رحماء بینهم _ بۆ گۆڤاری ڕۆژی کوردستان _ شمس کردستان _ نوسی. لە وتاریکی کەدا کە بە کوردی بۆ هەمان گۆڤاری نوسی بو، بە بۆنەی دو کۆنگرەی جیاوازی کۆمەلەی خویندکارانەوە بە هۆی ناکۆکی یەکیتی و پارتیەوە، ئەم دو لایەنەی شوبهاند بو بە

سەگەکانی لەیلان و تەپەلو. ) ل/٢٨

نەوشیروان لێرەدا بوێرانە و تەنیا بە نووسین رووی راستی یەک لەو پیاوانەی دەریاری دەسەلأت لە کۆن و _ لە پێشەوە وەک ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی حشع و وەزیری لە حکومەتی بەعس و دواتر وەک راوێژکارێکی پەنابیواری هەمان بەعس _ نوێدا دەخوێنێتەوە، و ئەوەمان بۆ ساغ دەکاتەوە، کە مرۆڤی سیاسەتچی کورد لە هەر پلە و پایەیەکدا بوو بێت، بۆ خاترجەمکردنی بەردەوامی بەرژەوەندی خۆیی لە لایەک، پاشان رازیکردنی ئاغاکانی دەسەلأت، بێ پەروا بووە هەتا لەوەی خەڵکی هاوزمان و نیشتمانەکەی بە سەگی ناوچەی لەیلان و گوندی تەپەلوی رۆژهەلأتی شاری کەرکوک بشوبهێنێ! وا دیارە سەگەکانی ئەو دوو گوندە لەسەر پاشەرۆکی ئێسک و پروسکی خۆراکی عەرەبە داگیرکەرەکانی ناوچەکە یەکتریان گەوزاندوە، موکەرەمی ناوبراویش بە خۆی و پاشەرۆکی ئەزموونی شەرمەزارانەی بە ئاگا و پاسەوان بووە لە وێناکردنیان..!

دیاردەی دووکانی حیزبی و جاشبوونی حیزب لە ناوچەی رۆژهەلأتدا. دیرۆکێکی درێوی دووردرێژی هەیە و ئەوانەی لەو پەنجا _ حەفتا ساڵەی دوایی تێکەڵی ئەو بازارەن، ژمارەیان کەم نییە و بگرە لە کۆن و نوێدا، مرۆڤ لە ژماردنیان وەرس و ماندوو دەکا. ئەگەر نەوشیروان لەو بارەوە تەنیا لەگەڵ باری لەنگی هەنوکەی حشع تامەزرۆیی باسەکانی نەشکاندایە، بە تۆژینەوەیەکی گشتگیرانە، سەروسەکوتی هەموو ئەو لایەنانەی بگرتایەوە کە لەو مەیدانەوە، ئەگەر لە حشع _یان زیاتر نەکردبێت، ئەوە کەمتریان لە خزمەت پێشکەش بە بەعس نەکردووە. هەر بۆ نمونە ئێستاکەش لە سێبەری تەشکی بەرەی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە باشوری کوردستاندا، مەیدان مەیدانی ئەو گروپ و حیزبۆکە دەستکردانەیە کە گوایە دەموچاوی پرۆسەی دیموکراتیەتی پێ چەور دەکرێ و هەموو لایەنە بە دەسەلأتەکان گەمەی بە هەدەردانی خۆیانی لە گەمەی مشک و پشیلەی لەگەڵ دەکەن.

(من خۆم پیشتر هیچ تیکەلاوییەکم لەگەل سەرانی حشع نەبو. کەسم لە سەرکردەکانیان لە نزیکەوە نەدی بو و نەئەناسی، بەلام لە سەردەمی (( اتحاد الشعب )) و (( ئازادی )) ەوە تا سەردەمی (( تریق الشعب )) و ((الفکر الجدید)) و (( الثقافه الجدیده)) بەردەوام رۆژنامە و بلاوکراوە ئاشکرا و نهینیەکانم خویندبونەوە و، چاودیری رەوتی سیاسی و ناکۆکییەکانی ناو ریزەکانیانم کردبو. زۆر لە هاوریکانم کە

پیشتر ناوی هەندی لە سەرکردەکانی حشعی بیست بو، کە دەیان سال ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و، مەکتەبی سیاسی بون و، لە سۆڤیت خویندبویان و، سەردانی چەندین کۆنگرەی جیهانییان کردبو، وایان ئەزانی ئەمانە سیاسی زاناو بلیمەت و، فەیلەسوفی هەلکەوتون، تین و تەوژمیکی سیاسی و ئایدیولوجی بە جولانەوەکە ئەدەن. دوای ناسین و ئاشنابون، وەکو ئەلین (( دەنگی دەهۆل لەدور خۆشە!)) دەرکەوت زۆری ئەمانە کەسانی بی ئاگابون لە روداوەکانی کوردستان و عیراق و ناوچەکە و دنیا. سەرچاوەی سەرەکی رۆشنبیرییان هەندی لە نامیلکە و کتیبەکانی (( دار التقدم)) و، سەرچاوەی ئاگاداری و زانیارییەکانیشیان بەشی عەرەبی رادیوی مۆسکۆ بو. ) ل/٣٢

لێرەشەوە نەوشیروان بە جورئەتەوە قامکی لەسەر فاکتایەکی رەوتی پێکهاتەی زەخیرەی بزاڤی سیاسی و حیزبی لەو ناوچەیە داناوە. بەڵام خۆزگە تەنیا بە نموونەی کادرەکانی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی حشع تەناشی نەکردایە. بەڵکو ئەو راستییەی ئەو باسی دەکات سەبارەت بە دۆخی مەعریفی و رۆشنبیری هەر لە کۆنەوە ماکی لاوازی بەرچاوی رەشکەی ناوک بۆشی زۆربەی هەرە زۆری هەڵسوڕاوە سەرەکییەکانی حیزب، گروپە جۆربەجۆرەکانی باشووری کوردستانیش بووە و هەتا هەنوکە ئەگەر لە جاران وێرانەتر نەبێت، ئەوە باشتر نییە.

## مەلایی و جەلالی لە تەرازودا ل٣٥

نەوشیروان لەو بەشە گرنگەی کتێبەکەیدا، سەبارەت بەو تراژیدیا خۆکوژییەی کورد بەناوی مەلایی و جەلالی بە درەنگەوە قەزاوەتی یەکلایەنەی لایەنگیری خۆی دەڕازێنتەوە. وێنەگرتنەکانی چیراوکەی نەگبەتییەکانی بزاڤی بەشێکی گرنگی ژێر دەواری کوردایەتی لە باشووری کوردستاندا، لە قۆناغێکی دیاریکراوی سەرەتای بەسەرپێخستنی چەرمەسەرییەکانی بەردەستی سەرانی ئەو حیزبە بە هەردوو باڵەکەیەوە، بە شێوەیەکی نیوە ناچڵ شەنوکەو کردووە کە دیسانەوە بە دیاردەیەکی نوێ هەژمار دەکرێ.

راستە لە پانتایی ئەو بابەتە گرنگەدا، زۆر زانیاری زانراوی خۆی بە شێوەیەکی رۆشن ئاشکرا کردووە، بەڵام لە روانگەی بەرژەوەندی بیرکردنەوەکانی ئەوێ رۆژێی رەوتی سیاسی و حیزبی باڵی مەکتەبی سیاسی جەلالی داشکاندوتەوە کە خۆی ئەو دەم یەکێک بووە لە کادرە دەستڕۆیشتووەکانی ئەو رەوتە.

## سەبارەت بە مەلا مستەفا و بارزانییەکان

(هەتا ئیستا بیوگرافی مەلا مستەفا و لیکولینەوەیەکی بیلایەن، پشت ئەستور بەبەلگەکانی کورد خۆی و، بە بەلگەی ناو ئەرشیفەکانی عیراق، ئیران، تورکیا، یەکێتی سۆڤیت، بەریتانیا و ئەمریکا، لەسەرخۆی و جولانەوەکانی نەنووسراوە. بیگومان ئەمە ناتەواوییەکی گەورەیە لە رۆشنبیری کوردی دا. ) ل/٣٦

نووسەر لە درێژەی باسوخواسەکانی ناو ئەو کتێبەوە و بەتایبەت لێرەدا، زۆر لایەنی ژیان و کەسایەتی مەلا مستەفای راشکاوانە دەرخستوە. بەپێی بۆچوونەکانی خۆیەوە هاتوتە پەیڤین و دەربارە بەو سەرکردەیە تامەزرۆیی خۆی لە نەنووسینەوەی بیوگرافی مەلا مستەفا ناشارتەوە و هیوای بۆ دەخوازێ.

(هیوادارم لە پاشەرۆژدا کەسانی کە لیکولینەوەی زانستی لەسەر لایەنە جیاوەزەکانی ژیانی مەلا مستەفا بنوسن)ل/٣٦

بەڵام بۆچی دامودەزگا حیزبی و رۆشنبیرییەکانی هەنوکە ناچنە ژێرباری بەجێگەیاندنی ئەو ئەرکەوە، لە ئاسانکاری زەمینە خۆشکردن و ئاراستەکردنی چەندان کادر و خەڵکی بەتوانا و شارەزا-لە بۆ تۆژینەوەیەکی لەم جۆرەی پێویست..! دەبێ بەرپرسەکان بەگشتی و بنەماڵەکەی بەتایبەت وەڵام بدەنەوە.

لە پێشی ئەو پەرەگرافانەوە، بە پێچەوانەی وەسفە نێگیتیڤەکانی بۆ مەلا مستەفا لەو زنجیرە لاپەڕانەدا، دروست بە هەڵگەڕانەوە لە گوتەکانی خۆی دەربارەی دیاردەی مەلا مستەفا، وەک سەرکردەیەکی هەڵکەوتووی مێژوویی ناوزەد دەکات و نووسیویەتی..

(بیگومان مەلا مستەفا یەکی بو لە گەورەترین سەرکردەکانی کورد لەم قەرنەدا. لە ناو خەلکی کوردستان دا لە هەمو سەرکردەکانی کە زیاتر پشتیوانی لی کراوە، لە هەمویان زورتر سەرکردایەتی جولانەوەکەی کردوە و، لە هەمویان زیاتر لە سیاسەتی ناوەوەی عیراق و، لە سیاسەتی کوردیی دەولەتانی ناوچەیی ئیران و تورکیا و، دەولەتانی گەورە، بەریتانیا، یەکێتی سۆڤیت، ئەمریکادا دەوری هەبوە. ) ل/٣٦

ئەو پێناسکردنە، لەچاو بارتەقای بەراووردکردنی لەگەڵ وەسفەکانی دیکەی _ کە من لێرەدا نووسینەوەیان بە پێویست نازانم _ هەمان مەلا مستەفای نووسەرە. ئەو پێناسە زۆرتر بۆ ئەوێ رۆژانی تێکۆشانی خەڵکی کورد، بابەتی و لوجیکیی ترە، چونکو مەلا

مستەفا لەچاو نەیارەکانی لە مەیدانی عەمەلیدا، وەک دیاردەیەکی ئەمری واقیع بەردەوام لەو کاروانە وجوودی هەبووە و بەڕێوەی بردوە، کەچی ئەو سەرکردە و رەوتانەی بەربەرەکانییان لە سەرکردایەتیکردنی خەڵکی کورد و خەباتە سیاسی و چەکدارییەکەی دەکرد، بەدەم رۆژە سەخت و دژوارەکان بەرگەیان نەگرت، درەنگ و زوو بە هەناسەی داکشان و راکشان کاڵبوونەوە و ئاڵای سپییان لێرە و لەوێ هەڵکرد.

## بارزانییەکان و گێرانەوەی هەڵفرین

لە نێوان لاپەڕەکانی ٣٧ _ ٤٠ ی کتێبی _ پەنجەکان یەکتری دەشکێنن _ دا، نووسەر لە ژێر ناوی عوسمان سەبرییەوە، چیرۆکێک سەبارەت بەو هەڵفڕینەی خودانی بارزانییەکانی بڵاو کردووتەوە کە لە دوا پەرەگرافدا بە خۆیشی لێی بە گومانە و نووسیویەتی..

(ئەم چیروکە هەندی لایەنی باوەڕی بارزانیەکان و شیخەکانیان رون ئەکاتەوە. عوسمان سەبری وەکو بەلینی دابو لە ژمارەکانی ترا زانیارییەکانی خۆی لەسەر خودانی بارزان بنوسی، بەلینەکەی بەجی نەهیناوە. هۆکەی چی بوە، دیار نیە.
ئەم چیروکە راست بی یان هەلبەستراو، ئوبالەکەی لە ئەستوی عوسمان سەبری دایە ،) ل/٤٠

واتە نەوشیروان لە بەرۆکی نادڵنیایی خۆیەوە، راستی و ناڕاستی ئەو چیرۆکە گێڕدراوەیەدا، خوێنەر لە باوەڕکردن و نەکردن بەو ناوەرۆکە سەرپشک دەکات.

_ (عوسمان سەبری _ بەدریژایی ژیانی و هەتا مردیش دلسوزی مەلا مستەفا بو .) ل/٤٠

جارێ لە پێشەوە عوسمانی سەبری هەتا تەمەنی منداڵی و گەنجی و بەشێکی زۆری بە سەرەوەی ساڵانی ژیانی، دڵنیام لە دوورەوە ناوی مەلا مستەفای بیستوە و ئەو _ بەدرێژایی ژیانی _ لە جێی خۆیدا نییە. دواییش هەموو مرۆڤێک مافی تەواوی خۆی هەیە، بەرانبەر بەو کەسەی خۆشی ویستووە و کەوتووتە ژێر کاریگەری کەسایەتی، مافی خۆی بووە بەرانبەر بەو کەسە هەتا سەر دڵسۆز بێت. ئەو سوخەتە یەکێک لە ئاکارە جوانەکانی مرۆڤبوون ساغ دەکاتەوە. نەوەک بە تەواوی ویست و ئارەزووی سیاسییە

زەنگینەکانی سەر رەوسەی بەرهەمەکانی خەباتی خەڵکی کورد، لە ژێر رەشماڵی بێوەفایی، سپلەیی، بێ چاوڕوویی، پشتکردن لە هاوڕێ تێکۆشەرەکانی رۆژانی تەنگانە نقوم بوبێت و تەنیا لە خەمی سەنگەری دەوڵەمەندکردنی خۆیان بووبن

دواتر سەبارەت بە شێخ عەبدولسەلام بارزان نەوشیروان لەو کتێبەدا، یەک دەسرازە وەسفی جوانی لە ئاکارە بە دەگمەنەکانی کەسانی رابەر لەناو بزاڤی سەرەتایی بارزانییەکان تۆمار کردووە و نووسیویەتی..

(شیخ عەبدولسەلام پیاویکی هەلکەوتو بوە، لە سەردەمی ئەودا بارزان ئەهمیەتی پەیدا کرد، نفوزی زیادی کرد، _خودان _ بۆ نەهیشتنی زولمی کومەلایەتی لەناو میللەتەکەی خوی دا هەندیک ریفورمی ئابوری، کومەلایەتی کرد. مولکیەتی زەویزاری هەلوەشاندەوە، کردیە خاوەنیتی گشتی هەموان، ژن و ژنخوازی ئاسان کرد و مارەیی هەلگرت، هەولی دا عەشیرەتەکانی ژیر دەستی خویان چەکدار کەن، بارزان بوبوە پەناگای زورلیکراوان. شیخ عبدولسلام نیوانی لەگەل مەسیحیەکان خوش بو، حورمەتی ئەگرتن و لەگەڵ میسیونیرەکانی ئینگلیزیش برایان (( ویگرام )) دوستایەتی خوش بو. شیخ عبدولسلام پەیوەندی لەگەل ریکخراوە سیاسیە کوردیەکانی ئیستەمول هەبوە، بلاوکراوەکانی ئەم ریکخراوانە ئەگەیشتنە خانەقاکەیان لەبارزان. ) ل/٤٠

ئەم شرۆڤەکردنەی کار و کردەوەی سەرکردەی بارزانییەکان لەوان رۆژانی سەرەتایی هەنگاو هەڵگرتنیان، بۆ بەشداریکردن و بوونە رابەر نەوەک هەر ناوچەیەکی بچوکی بارزان، بەڵکو لێرە و لەوێی کوردستان بە خۆرایی نەبووە. کە بێجگە لە بزاڤی شێخ مەحمود لە ناوچەکانی سلێمانیدا، هیچ عەشیرەت و شێخ و سەرۆکێک لە پەنتایی باشووری کوردستاندا، بەو قورساییە جولەیەکی تێدا نەبووە. بەڵکو سەرتاپایان لەبەرانبەر زوڵم و زۆرداری بەسەر خەڵکەکەی خۆشیاندا، ئەگەر نۆکەر و ئەڵقە لە گوێی رژێمەکانیش نەبووبن، ئەوە لە چاکترین دۆخدا، دەستیان بە خۆدا شۆڕکردوتەوە و نوقەیان لە دەم نەهاتوتە دەرەوە و بۆ بژێوی ژیانی خۆیان هەردەم بەگوێی مامۆستایان کردووە.

نەوشیروان لە درێژەی باسوخواسەکانی سەبارەت بە شێخ عەبدولسەلام بارزانی نووسیویەتی..

(یەکی لە هەولە نیشتمانییەکانی شیخ عەبدولسەلام تەلەگرافیکە کە بو کاربەدەستانی عوسمانی ناردوە دەربارەی هەندی مافی روشنبیری و بەریوەبەرایەتی و دینیی کورد.

دالدەدانی زورلیکراوان لە بارزان و رەفتاری خودان لەگەل میللەتەکەی و ریفورمەکانی کە بوبون بە هوی پەژارەی سەروکی عەشیرەت و شیخەکانی دەوروپشتی و، گازاندەی بەردەوامی ئەوانە لە رەفتاری خودانی بارزان لە لای کاربەدەستانی تورک.) ل/٤٠ – ٤١

داننانەکانی نووسەر بەو جۆرە بیرکردنەوە و پراکتیکەی شێخی بارزان، لەبار و زەمانیکی بەسەرچوودا. خۆی لە خۆیدا نیشانەیەکی دیکەی پشتگیری ئەو بیرۆکە دەکاتەوە، کە شێخ و سەرداری بارزانییەکان لەوێ رۆژاندا، هەمیشە لەچاو بەشی هەرە زۆری سەردارانی دیکەی عەشیرەت، سەرگەڤاری بنەماڵە گەورەکانی کورد، لە بواری نیشتمانپەروەری و ناوچە و وڵاتپارێزی، دادپەروەری و یەکسانی، ریفۆرمخوازی ناو کۆمەڵگای عەشیرەت و خەڵکی کورد، باوەشی داڵدەدانی زۆرلێکراوان و خەڵکە چەوساوەکان، زۆر لەپێشەوە بوونە. ئەوانیش ئەگەر وەک زۆربەی عەشیرەتەکانی دیکەی ناو هەناوی کۆمەڵی کوردی بە تەنیا پێخۆری سیاسەتی سەرکوتکردن و دۆزی چەوساندنەوەی خەڵکی کورد بوونایە، تووشی ئەو هەموو شەڕ پێفرۆشتنەی دەسەڵاتداران نەدەبوونەوە و سەردارەکەیان لەوێ رۆژێدا لە سێدارە نەدەدرا. ناوچە و عەشیرەتەکەی خۆیان لە وێرانکردن و تاڵانکاری، ئاوارەبوون و کوشتوبڕی خەڵکەکەی دەپاراست و هەواری پاراستن و داڵدەدانی زۆرلێکراوانیان نەدەسازاند. ئەوانیش لەوان رۆژگارەوە وەک ئەو سەردارە چڵکاوخۆرانەی دیکە، بەزوویی دەبوونە میوانی ناو کۆشک و تەلاری بەرهەمی خەبات و قوربانی خەڵکی ستەمدیدە، سمێڵی خۆیان بۆ چەوڕ دەکرد و بە پاڵدانەوە ئۆقرەیان دەگرت و هەموو کورد ئاو بیبردایە، تەقەی سەریان دەهات.

# شێخ ئەحمەدی بارزانی، ئەم یاخود ئەویان

نەوشیروان لەدرێژەی باسەکانیدا، سەبارەت بە شێخەکانی بارزان و دەربارەی شێخ ئەحمەد بە دوو لایەن تاوتوێی کەسایەتی ئەوی کردووە، لە لایەک _ ئەو_ بەو جۆرە دەخوێنێتەوە..

(بەلام رۆشنبیریی گشتی نەبو، شارەزای کاروباری سیاسی کوردستان و عیراق و دنیا نەبو. هەروەها شارەزای کاروباری جەنگی نەبو. بایەخیشی پی نەئەدا. هەولی ئەدا خوی و عەشیرەتەکەی لە کاروباری سیاسیەوە نەگلین. بە گوشەگیری دور لە کارتیکردنی دەوروپشت بژین. ) ل/٤٣

هەر لەو بارەوە درێژە بە قسەکانی دەدا و نووسیویەتی. (دوای ئەوە ئیتر لە بارزان گوشەگیری هەلبژارد، خوی لەکاروباری سیاسی و حکومەتی هەلنەئەقورتاند. ) ل/٤٣

کەچی لە لایەکی دیکەوە بۆ _ ئەم _ بەم پەیڤانە بەم جۆرە جیاوازە قەزاوەت دەکات..

(لەسەردەمی عوسمانی دا بە هوی هەلواسینی براکەی و لەشکرکیشی عوسمانیەکانەوە بو سەر ناوچەکەیان، هەلویستی لە حکومەت سەلبی بو، بروای پی نە ئەکردن دوای هاتنی ئینگلیزیش ١٩١٨ دیسان هەلویستی لە پەرەسەندنی دەسەلاتی حکومەت سەلبی بو. بە ئاگاداری ئەم هەندی لە بارزانیەکان بەشداری دانانی ئەو بوسەیەبوون کە لە ١٤ ی تشرینی دوەمی ١٩١٩ لە (( بیرە کەپرە )) بو حاکمی سیاسی مووسل کولونیل بیل و حاکمی سیاسی ئاکری کاپتن سکوت دانراو هەردوکیان کوژران. لە دەست بەسەراگرتنی شاری ئاکرێ یش دا بەشداربون.

شێخ ئەحمەد هەولی دا نەریتەکانی شیخەکانی بارزان دایان هینا بو بچەسپینی، هاوکاری یەکتری، دامەزراندنی پەیوەندی لەسەر بنچینەی دادپەروەری و وەکیەکی، گویرایەلی بی چەن و چونی میللەت بۆ خودان، پاریزگاری میللەتی بارزان نویژو حەجی لەسەر بارزانیەکان هەلگرت. ) ل/٤٣

هەر یەکێک بیەوێ لە نێوان ئەو دوو لایەنی دژ بەیەکی کەسایەتی شێخی بارزان لەبەر رۆشنایی ئەو قسانەی نەوشیرواندا هەڵوەستەبکات، بە ئاشکرا ناکۆکی لە نێوانیان دەبینێتەوە. چونکو ئەگەر شێخ ئەحمەد گوشەگیری هەڵبژارد بوو، رۆشنبیری گشتی نەبوو، شارەزای کاروباری سیاسی نەبوو، ئەدی چۆن لەوێ رۆژگاردا، بە تاقی تەنیا

بەیداخی هاوکاری یەکتری، دادپەروەری وەکیەکی _ یەکسانی _ باوەڕنەکردنی بە حکومەتی دەوڵەتی داگیرکەری ناوەکی و دەرەکی بەرز دەکاتەوە و خەڵکانی بارزانی پێگۆش دەکات و ڕێکیان دەخات ..!

گۆشەنیگایەکی دیکەی خەملاندنەکانی نووسەر سەبارەت بە شەڕوشۆڕی نێوان عەشیرەتەکانی وەک _ برادۆست و زێباری و سورچی و هەرکی و ڕێکانی _ عەشیرەتی بارزانییەکان، بە تەنیا لەسەر پاوان و پاوانکاری نەبووە، ئەوە بە سەرچیغ بردنی ڕەهەندەکانی ئەو ڕووداوانەیە کە بە فیتی داگیرکران بەسەر ئەو ناوچەیەدا هاتووە. هەموو کەسێکی ئاگادار ئەو حەقیقەتەی لە بیر بچوایە، نەدەبوو نەوشیروان لە بیری خۆی ببردایەوە. سەرەداوەکانی مێژووی دروست دەریخستوە، ئەو عەشیرەتە ناوبراوانە بە شێوەیەکی سەرەکی و هەمیشە بە دانەخۆرەکردنی دوژمنانی کورد، بە بیانوی پاوان شەڕیان بە بارزانییەکان فرۆشتووە و بەدەسیسەی دوژمن، پەلاماری ناوچەی بارزانیان داوە و بارزانییەکانیان لەسەر زێدی خۆیان ناچار بە بەرگری و خۆ پاراستن لە قەتل عامکردن و بە تالآن بردنی کەلوپەلەکانیان کردووە.

## گوشاربردن .. یاخود .. شۆرش ..!

هەر لە گێڕانەوەی باسوخواسەکانی بزافی مەلا مستەفا بارزانی دا، نەوشیروان بە هەندێ زانیاری وردەکارانەی بێسەرچاوەی دیاریکراو، بە ناوی خۆیەوە بەرانپیلی کتێبەکەی لێ تژی کردووە و لە لایەک نووسیویەتی...(مەلا مستەفا کە زانی حکومەت گوێ ی ناداتی کەوتە گوشاربردن... کەوتە پەلاماردانی مەخفەرەکانی ناوچەکە. ) ل/ ٤٦

دواتر بەبێ هیچ سەرەتایەک لەسەر ناوی ئینگلیزەکان دەڵێ.. (بەریتانیا داوای لە مەلا مستەفا کرد، دەس لە شورش هەلبگری، هەرەشەی لی کرد، کە دریژەدان بە شورش دژی عیراق، واتە دوژمنایەتی بەریتانیا و دەولەتانی هاوپەیمانان و...)ل/ ٤٧

منیش وەک هەر خوێنەرێک دەپرسم، لە تاووتوێکردنی بەسەرکردنەوەی ڕووداوەکانی ئەو بزافەی بارزانییەکان بەرابەری مستەفا بارزانی لەو زەمانیدا، کامە دەستەواژە لە نێوان (گوشاربردن) و(شورش) گونجاوە و ڕووی ڕاستی تێر دەکات..!

# شۆڕش ... یاخود جولأنەوەی بارزانییەکان

بە درێژایی جولأنەوەی سیاسی و چەکداری کورد لە دەڤەرە جیاجیاکان کوردستاندا، هەر لە موقاوەمەتی چەکداری شێخ مەحمودی نەمرەوە تا دەگاتە بزاڤە یەک لە دوای یەکەکانی بارزانییەکان. هەتا پێش هەڵگیرسانی بزاڤی چەکداری و سیاسی ئەیلول، زۆرتر جولأنەوەی ئێرە و ئەوێی ناوچەیی بوونە و لەگەڵ بەرگیی شۆڕش و راپەڕینی فراوانی خەڵکی کورد یەکنایەتەوە. بە داخەوە لە هەر کوێیەکی کوردستان جوڵەیەکی نارەزایی، رووبەڕووبونەوەیەکی زۆرداری روویدابێت. هەر لە سەرەتاوە بە گوترە ناوی گەورەی شۆڕشی بە باڵادا هەڵواسراوە..! راستە جولأنەوەکەی شێخ مەحمود، موقاوەمەتی بەردەوامی بارزانییەکان لە بەرانبەر ئەو زۆرداری و پەلاماردانەی لێرە و لەوێ بە ختوخۆرایی کراوەتە سەریان. بەرپەرچدانەوەیەکی شێلگیرانەی سەرەتایی هەڵگیرساندنی بزاڤی خەڵکی ستەمدیدە بووە لە ناوچەیەکی دیاریکراودا. بەڵام بە هەر هۆیەک بێت ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی لە ناوچەکانی خۆیاندا دامرکێندراونەتەوە، بۆ دەڤەر و ناوچەکانی دیکەی کوردستان پەرەیان نەسەندوە.

ئەوشیروان بەبێ لاکردنەوە لەو ڕەهەندە، یەکسەرە بۆ نمونە نووسیویەتی..

(شورشەکانی شیخ مەحمود ...) ل/٤٧

(ناوەروکی شورشی بارزان ...) ل/٤٧

(بو بە شورشیکی کوردی خاوەن داوای سیاسی) ل/٤٧

(ناوەروکی شورشی بارزان خەریک بو ئەگورا ، کە تا ئەوسا شورشیکی خیلەکی بو ، بە بە شورشیکی کوردی خاوەن داوای سیاسی .) ل/٤٧

ئەوەی من تێیگەیشتوم، لەسەرتاپای بزاڤی کورد لە نوکەوە تا کۆتایی. هەندێ زاراوە وەک حەز و ویستی سیاسەتەچییەکانی حیزبی کوردی بۆ گەرمکردنی بازاڕی بەرتەسکی بە حیزبایەتی کردنی خەباتی خەڵکی کورد وردکراوەتەوە. هەر بۆ نموونەش زاراوەی گەورەوگرانی _ شۆڕش _ ە کە بە درێژایی مێژوی بەر لە شۆڕشی ئەیلوول بە هەڵە بە کار هاتووە. چونکو دەبوو ئەو جولانەوانە ئەگەر شۆڕش بوون و لەو ناوچەیەی هەڵگیرساون، وەک شۆڕشەکەی ئەیلوول بۆ هەموو وڵاتەکە پەرەی بسەندایە و لە ناوچە دیاریکراوەکەی خۆیان تەناشی نەکردایە.

دواتر هەرگیز بزاڤی خێڵەکی چەند لەسەر حەق و بە ناوی دادپەروەری بێت، هەرگیز لەبن رەشماڵی شۆڕش هەڵناکات. مەگەر لە شەرعی گۆڕەپانی ئەجندای سیاسی حیزبی کوردی جێگای ئەوە بوویێتەوە. کە گوایە _ شورش_ ی خێڵەکی و ناوچەیی بۆ شۆڕشی خەڵکی کورد ناوزەد کراوە..! دیارە بە گوێرەی قسەکانی نەوشیروان بێت، شۆڕشی کورد هەر لە بناغەوە لەسەر بنیادی بزاڤی خێڵەکی و ناوچەیی داهاتووە، هەر بۆیەش و بە خۆڕایی نییە، لە ئەنجامی بەدەستهێنانی دەسکەوتی حوکمڕانی کوردی، قەدوباڵای بەشێکی زۆرینەی شۆڕشگێڕەکانی دوێنێی شاخ، ئەمڕۆ لەناو گەندەڵی و مشەخۆری و چاوچنۆکی و پێشێلکردنی سەروەرییەکانی مرۆڤ لە گۆمی نقوم بوون شەپەشەپییەتی.

## نائومێدیی هەندێک... نا دەستپاکی هەندێکی دیکە

لە بزاڤی کوردایەتیدا، زۆر جاران سەرکردە دیارەکانی حیزب لە دەموساتێکی هێجگار دژواری پڕ لە گرێکوێرەی ناوەکی لە پێشەوە، ئەوجا دۆزی ناهەمواری دەرەکی، تووشی نائومێدی بوونە و ئەو نائومیدییە سەری خواردون و بۆ هەندێک لەوانە، بە لەناوچوونیان، زیانی گەورە بەر جولانەوەی خۆرسکی شۆڕشگێرانەی خەڵکی کورد کەوتووە. هەر بۆ نموونە مەلا ئاوارە لە نائومیدی چیراوکەی بزاڤی چەکداری بێ پشت و پەنا شەهید بوو. ئارام _ شاسوار جەلال_ بەرپرسی ئانوساتی لێقەومانی کۆمەڵەی مارکسی لینینی باشور لە چلۆنایەتی زەخیرەی پێکهاتەی کۆمەڵە، بزاڤی چەکداری بێسەروبەری شاخەکان تووشی نائومێدی ببوو. بەو هۆیەوە لە ناوچەیەکی دیاریکراوی داخراو دانی بە خۆی داگرتبوو _ لەو بارەوە دواتر سەبارەت بە شەهیدبوونی ئارام تێڕوانینی خۆم، زۆرتر دەردەبڕم _ و لەچاوتروکانێک شەهیدکردنەکەی بووە مایەی ئەوەی کە کۆمەڵە و خەباتی شۆڕشگێرانەی چینە زەحمەتکێشەکانی بە هەتیوی و بێ سەرێکی لێهاتوو مایەوە. بزاڤی شۆڕشگێڕانە لەو پارچەیەی کوردستان لە ناوەڕۆکدا بەر مەرگەساتترین گورز کەوت و کۆمەڵە سەرکردەیەکی لەو جۆرەی بۆ دروست نەبووەوە. هەروەها قاسملۆی سکرتێری حیزبی دیموکراتی ئێران لە نائومێدی فاکتەری ناوەکی حیزبەکەی خۆی، بە بەربەست گەیشتنی بزاڤی چەکداری لە رۆژهەڵاتی کوردستان، چەرمەسەرییەکانی شەڕی کوردکوژی ناوخۆی بێهودە، بە ناچاری کەوتە داوی سوکە

گفتوگۆیەکی سادە لەگەڵ دەزگای ئیتلاعاتی ئیرانی و بەئاسانی سەری خۆی لەسەر دانا.. هتد

(مەلا مستەفا خەریک بو نا ئومید بی. دو نامەی بۆ ئیبراهیم ئەحمەد نارد یەکیکیان بۆ خۆی و ئەوی تریان بۆ بابەعەلی شیخ مەحمود. داوای لی کردبو نامەکەی بە بابەعەلی بگەیەنی. ئیبرایم ئەحمەد و هاوریکانی لە ژ ک لقی کوردستانی عیراق نامەکەیان کردبووەوە... ) ل/٥٢

مەلا مستەفا وەک نەوشیروان لە درێژەی ئەو باسانەدا گوتویەتی، بە هۆی ئەو بارودۆخە ناهەموارەی بارزانییەکان لە بەربەرەکانییان لەگەڵ حکومەتی عیراقی، نەبوونی پشتیوانییەکی ئەوتۆی کورد لە ناوەوەی باشووری کوردستان، ئەوجا تەنگ پێهەڵچنینی لەلایەن هێزی عەشیرەتە نەیارەکان. بارزانییەکان بە ناچاری پەنایان بۆ رۆژهەڵاتی کوردستان بردووە. کە تازەکی کۆماری مهاباد جاڕدرابوو. لەوێش وەک پێویست لەسەرەتادا بەدەنگییانەوە نەهاتوون. ئیتر بۆ تووشی نائومێدی نەبوویێت.! بەڵام نەوشیروان لەشانی رەهەندەکانی ئەو مێژووەوە، نەهاتووە باسی ئەوە بکات، کە ئەو نائومێدییە دەست و پێی مەلا مستەفای نەبەستوتەوە و تەسلیم بە واقیعێکی تاڵی سەر خۆخواردنی یەکجارەکی نەکردووە. مەلا مستەفا بە ملنەدانی بۆ دەسەڵاتی رژێمەکان و تەسلیم نەبوون، یەک بە خۆی رچەی مێژووی کەرەسیساوی ئەوێ رۆژێی شکاندوە و بە بەزاندنی سنوورە دەستکردەکان، ترادوشوێنێکی شۆڕشگێڕانەی نوێی لەو رۆژگار هێناوەتەکایەوە.

پاشان لە هەمێزی تاووتوێکردنی ئەو سەرەداوانەوە، نەوشیروان بە راشکاوییەکی کەموێنەی رۆژگاری خۆی، پەردەی لەسەر پاشاگەردانی سەرانی حیزبی کوردی هەڵداوەتەوە. کە گومان لە رادەو جۆری دەستپاکی و ئەمینی ئەو سەرکردانە دەخولقێنێ کە گوایە قەڵەمڕەوی کوردایەتی لە ناو گیرفانی ئەوان بووە. بە جۆرێک بە پێشێلکردنی هەر جۆرە پرینسیپێکی سەرەتایی حیزبایەتی، بە خۆیان رەوا بینیوە نامەیەکی ئەمانەتی ـــ زەعیم ـــ ەکەیان مستەفا بارزانی کە لە بارودۆخێکی ناهەمواری نائومیدیـــ هەروەک خۆی نەوشیروان ـــ نووسیویەتی، بۆ یەکێک لە دۆستە باوەڕپێکراوەکانی لە باشور ناردوە. کەچی ئەو سەرکردە حیزبییە لەشانی نەگەیاندنی ئەو نامەیە بۆ کەسی

دیاریکراو، نامەکەی هەڵپچڕیوە و ناوەڕۆکەکەی بەولاو بەملادا پەخش کردووە. وەک ئەوەی هەر لە نوکی کارەکانەکەوە لە _ زەعیم _ بە بیانوو بن.

لە چیراوکەی حیزبایەتی کوردان، ئەگەر کادرێک، یاخود هەر ئەندامێک لە ریزەکانی حیزبدا لەو جۆرەی بکردایە و لێی ئاشکرا ببوایە. ئەوە بەراستی تەنەکەیان بە کلکییەوە دەکرد و چی خراپ بوو بەسەریان دەهێنا..! بەڵام دیارە کورد بە خۆڕایی نەیگوتووە، گەورە ئاو دەرێژێ و بچوک پێی لەناودەنێ. بە داخەوە ئەو نائەمینییە لە ریزەکانی حیزب لە شاخ و شاردا ترادیشونی بەشێکی بەناو سەرکردەکانی حیزبی کوردی بووە، تاکو خۆیان زیاتر راپێش بکەن. یەک بە خۆم گومرگی لەو جۆرەم زۆرداوە و نامەکانم بۆ سەرەوەی خۆم کراونەتەوە و مامەلەی پێوەکراوە و بە مەبەست ناوەڕۆکەکەی بڵاوکراوەتەوە.

## پرسی کەسایەتی... و کۆمەڵەی خوێندکارانی

لە گەرمەی باسوخواسەکانی سەرۆکایەتی پارتی لە لاپەڕەکانی ٥٣ _ ٥٤ دا، نەوشیروان دەستخۆشانە خۆی لە قەرەی هەڵدانەوەی لاپەڕەکی پڕ گرێکوێرەی سەرکردایەتی حیزبی کوردی، نەبوونی کەسێکی شایستە لە لایەک و لاوازیی کەسایەتی لێپسراوەکانی ئەو دەمی پارتی داوە و لە لاپەڕەی ٥٥ یشدا، لە ناکاو دەکەویتە ناو کێشەی کۆمەڵەی خویندکارانی کورد لە دەرەوەی وڵاتدا.

هەروەک دەڵێ (بیگومان ئەمە نیشانەی لاوازیی کەسایەتی سەرکردەکانی ئەوسای پارتی بوە) ل/٥٤

نەوشیروان راست دەکات، چونکو هەر لە نوکەوە لەناو خەڵکی کورد پرسی کەسایەتی بە گشتی لاواز و دەستەپاچەیی پێوە دەلەنگێتەوە. بەڵام وەک سیاسەتمەدارێکی خاوەن زانیاری فرە و بەرۆکی ئەزموونێکی هەوراز و نشێوەکانی ئەو کوردایەتییە. دەبوو لەو بارەوە تێرتر ئەو پرسە گرنگە شیتاڵ بکاتەوە و خەملێدان بۆ خوێنەر نەهێلتەوە. چونکو ئەوەتە هەتا هەنوکە پرسی کەسایەتی سەرکردە لەناو حیزبی کوردی، ئەگەر لە جاران بەریادتر نەبێت، ئەوە هەرگیز سەرکردەی حیزبی سەریاری دەیان ساڵی پراکتیکیان لە شاخ و شاردا، بەشی زۆریان خاوەن کەسایەتییەکی دەلەمەن. بە تایبەت رووبەڕووی دەسەڵات و پارە و کەسانی حوکمڕان. خاوەن ناشیرین و

گەندەڵینترین پراکتیکن لە چاوپەنای چاوچنۆکی لە کۆکردنەوەی پارەوپولی بێشومار و دەسرازە کۆشک و تەلاری باقوبریقاوی سەر قوتی خەڵکی رەشورووت. ئەوەندەی ئاویان لەدوو بێری هاتووە، بەتەنگ خۆشگوزەرانی کەسوکارە تەمبەڵەکانی خۆیانن لە قورخکردنی پلەوپایەی حیزبی و ئیداری هەمەچەشنە. بایی رەشکردنەوەی تاڵەموێکی قژی سەروسمێلیان باکیان بە وڵات و خەڵکەوە نەماوە و مێش میوانیان نییە.

(ئیمە هەولیکی زورمان دا کومەلەی خویندکاران لەت نەبی، بەلام سەرەنجام بو رازی کردنی کوردەکانی ئیران ئیمەش، لایەنگرانی یەکیتی جیا بووینەوە. کونگرەیەکی جیاوازیان بەست..) ل/٥٥

لە تاووتوێی وشەکانی _ ئیمە، هەولیکی زۆرمان دا، لەگەڵ _ ئیمەش، جیا بووینەوە_ لەگەڵ پەیڤی _ جیاوازیان _ یەک نایەتەوە، بە جۆرێک هەتا دەمی بڕیاڕدان لەسەر کەرتبوونی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپادا، خۆی بە بەشدار دەخوێنێتەوە. کەچی لە بەستنی کۆنگرەی چارڕدانی جیابوونەوە خۆی هەڵاوێردووە و بەشداری کۆنگرەکە نەبووە، هەر وەک خۆی دەڵێ...(کونگرەیەکی جیاوازیان بەست) واتە ئەوانەی جیا بوونەوە.

ئەو راستییەی لێرەشەوە, نەوشیروان قامکی لەسەر داناوە، کورد هەمیشە بۆ جیابوونەوە لەسەر پێیان بووە. هەردەم بۆ پارچەپارچەبوونی ناوماڵی خۆی درێخی نەکردووە. ئەوەتە لە دووری خاکی کوردستان و لەناو توێژی خوێندکاراندا تەپڵی پەتارپەتاربوون زمانی حاڵ بووە و چەپڵەی بۆ لێدراوە. شایی لەبەرکراوە و ئەو ئەجندایەناموبارەکە تەنیا ئەوەی لێ هاتە بەرهەم کە ئەو ئۆرگانی یەکێتی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا، بە یەکجارەکی کرایە ئاردی ناو دڕکانی سیاسەتی سەرانی حیزبی کوردی موزایەدەکار بەسەر خەڵکەوە لێرە و لەوێ ناوی نەما.

# فاروقی مەلا مستەفا و سەفەری دەرەوەی وڵات

(فاروق مەسئولی بنکە و پیشمەرگە و ریکخستنەکانی کوردستانیان بو..

(روژانی ئاشبەتال، ئەمیش لەگەل سەرکردەکانی کومەلە قسەی کرد بو، هاوکاری بکەن بو مانەوە و بەرەنگاری. پاشان بویان دەرکەوت بو ئەم کارەیان پی ناکری، ئەوانیش لەگەل لیشاوی خەلک دا گەرابونەوە بو عیراق. ) ل/٥٥.

جارێ لە پێشەوە بەدوای کارەساتی ئاشبەتاڵی کورد لە ساڵی ١٩٧٥دا، کەس هەروا لە خۆیەوە بۆ عیراق نەگەڕایەوە، بەڵکو هەمووی تەسلیم بە دامودەزگای رژێم بوونەوە. نازانم بۆ نەوشیروان بۆ دۆستێکی خۆی _ بە گەرابوونەوە عیراق _ ناو دەهێنێ..! ئەوجا لەو جۆرە کەسانە بە چەردە تفەنگ و نازناوی حیزبی گەورەی ناسراوەوە خۆیان بەدەستەوە داوە و بەعس بەپێی ئەزمونی دانەخۆرەکردنی، مامەلەی تایبەتی لەگەڵ کردوون و وەک خەڵکە سادە و رەمەکییەکە، بە سووکوسەلیمی لەلایەن حکومەتەوە بەر بەرەڵلا نەکراون. لەو جۆرە کەسانە ئەگەر لەگەڵ خۆشیان چەردە چەکیان تەسلیم نەکردبیتەوە، ئەوە لە سەرەتادا، بە ناوی موقاوەمەت، چەکی دەستی پێشمەرگەکانیان کۆ کردووتەوە و یاخود بە شاردنەوەی ژێر زەوی و باخچەی ماڵان ئاگادار بوونە و ربوایی وەک بەرزەکی بانان ژێر بە ژێرەکی بۆ دەزگاکانی رژێمیان ئاشکرا کردووە. بە چەردە پارەی شیرینکردن و سیخوریکردنی خۆیان لە تەنگەی باخەڵان ناوە و لەژێر رکێفی بەعس قۆنتەراتچی دەرچوون و ئەو پیشە تازەبابەتەی سیاسەتچییەتی خۆیان بە خەڵک فرۆشتوتەوە و دواتر موبارەکە کراون.

بۆ ئاگاداری هەموو یەکێک، بەعس ئەوەندە دەبەنگ نەبوو. بە ئاسانی کڵاوی سووری تفەنگ بە دەستەکانی دوێنێی ماوییەکانی شاخی چوبێتە سەری و هەر یەکێک ئەگەر سەودای مامەلەیەکی پێشینە و نوێی لەگەڵ دەزگا جۆربەجۆرەکانی رژێمەوە نەبووبێت، هەرگیز بەعس بە سووک و سەلیمی لێی خۆش نەبووە. بواری هەر جۆرە گوزەرانێکی ئاسایی سەربەرزانەی بۆ نەدەهێشتەوە. بگرە بەلانی کەم کەسانی مەسولی حیزبە نەیارەکانی، رەوانەی خوارووی عیراق کردووە و چی خراپە پێی رەوا بینیون..

(کاربەدەستان، لەوانە غانم عەبدولجەلیل، لەگەل فاروق و هاوریکانی قسەیان کرد بو، کە حیزبەکەی ئەوانیش لە وەزارەت و بەرەدا بەشداری بکەن. ئەمان خۆیان لەو مەسەلەیە دزیبوەوە بە بیانوی ئەوەی مەسئولەکانیان لە دەرەوەیە) ل/٥٥

(فاروق له گەشتەکەی دا بو ئەوروپا گەیشته ڤیەننا... فاروق ملی نەدا و سور بو لەسەر گەرانەوە بو عیراق... بیگومان ئەمە هەلویستیکی جوامیرانه و ئازایانه بو...) ل/٥٥ — ٥٦

ئەتۆ بڵێی بەعس ئەوەندە پەری و میهرەبان بووبێت، کە مەسولێکی گەورەی قیادە مەرکەزی تەسلیم بوەوەی شاخەکان، له زەمان و زەمینی سەرکەوتنی بەعس بەسەر بزاڤی چەکداری شۆڕشی چواردە ساڵەی کورد، به خۆڕایی و بەبێ موقابیل سەفەری دەرەوەی وڵات بکات، کە ئەو رۆژە چۆلەکەش بەبێ ئاگاداری و پیلان و دەسیسەی سیخوری لەپێشینه لەگەڵ دامودەزگای بەعس، توانای هەڵفڕینی به ئاسمانی عیراقدا نەبووە. دوایی چ جۆرە هەڵوێستێک، له سەفەرکردن بۆ دەرەوەی عیراق و گەڕانەوە باوەشی ئەو رژێمه بگرویکوژە لەوێ زەمان و زەمیندا، نیشانەی جوامێری و ئازایەتی به باڵادا دەبڕدرێ..! مەگەر ئەوە هەر له قوتوی عەتار و بەتاڵی سیاسەتچییەکان ئەرێ بابەی بۆ هەڵدراوە.

## هەمزە عەبدوڵلا و سەربردەیەکی تاڵ و تفت

(هەمزە عەبدوللا، سکرتیری پارتی و هەندی له هاوریکانی لەم باوەرەدا بون. به ئاشکرا به لای حشع دا دایان ئەشکاند.) ل/٥٧

(مەلا مستەفا _ له ٣٠ حوزەیرانی ١٩٥٩دا _ تاقمی چەکداری نارده سەر بارەگای حیزب له شەقامی (( موتەنەبی)) له بەغدا، دەستیان بەسەر بارەگاکەدا گرت و، هەمزە و هاوریکانی.. نەژاد ئەحمەد، خەسرەو تۆفیقیان... به زور دەرکرد و، ئیبراهیم ئەحمەد و هاوریکانیان له جیگا دانان. ئەمەش یەکەمین جار بو زۆر به کار بهینری بۆ بەلاداخستنی ناکوکییه ئایدیولوجی و ریکخراوەییەکانی ناو حیزب.) ل/٥٧

(مەلا مستەفا هەمیشه بایەخیکی تایبەتی ئەدا، بەو کەسانەی گومانی جاسوسی یەکی له دەولەته گەورەکانی لی بکرایه. لەم کۆنگرەیەدا مەلا مستەفا د. موراد عزیز، که کوردیکی ئیرانی بو، دانا به ئەندامی م س چونکه گومانی لی ئەکرد جاسوسی سۆڤیت بی.) ل/٥٧

له خوێندنەوەیەکی وردی ئەو گێڕانەوەیەی نەوشیروان تەنیا لە بەر ڕۆشنایی زانیارییەکانی خۆیەوە، بەبێ هیچ سەرچاوەیەکی ناونەهێنراو نەوشیروان راشکاوانە رووەتی کاڵوکرچی ئەجندای حیزبی کوردی دەردەخات. بەبێ ئەوەی لابەلای ئەوەدا بکاتەوە کە پرۆسێسی پەیدابوونی حیزب و حیزبایەتی لەناو خەڵکی کورد خۆی لە خۆیدا، پرۆسەیەکی داهێنەرانەی ناو هەناوی کۆمەڵی کوردەواری نەبووە. بگرە هەر لە سەرەتاوە بە لاساییکردنەوە و کۆپیکردنی تەجروبەی دەوروبەر، بیرۆکەی ئەو حیزبایەتییە هەر لە نوکەوە بە سەقەتی لەلایەن دەستەیەک خوێندەوار و رۆشنبیری ئەو سەردەمی بە پارەسوان فەراهەم کراوە و بە ناوی لێخنی بەرگاوی کوردایەتی، جۆگەلەی قوربانی خەڵکی ستەمدیدەی کوردی بەستەزمانی بۆ هەڵبەستراوە. بە دڵنیاییەوە ئەو هەنگاوە بە تۆبزییەی لابردنی هەمزە لووتەبدوڵڵا و هاوڕێکانی، کە تەنیا کودەتایەکی ناوخۆیی حیزبی کوردییە، لە ئەنجامی پراکتیکی ناڕاستگۆیی لە بەرانبەر یەکتریدا و بگرە بە پاشقول لەیەکگرتن، بە بیانوو شەڕ بە یەکدی فرۆتن، سووکوسەلیم خوێندنەوەی یەکتری بۆ عەقلییەتی سڕینەوەی ماندوبوون، خەباتی یەکتری بە هەنجەتی هەڵبەستراوی بێ بەڵگە و... هتد، دەقی بەو چێڕاوکەی حیزبایەتی کوردییەوە گرتووە. مانۆڕی حیزبی کوردی بە درێژایی ئەو کاروانە سەر بە گۆبەندەی لەجیاتی کامڵبوون، کۆکردنەوەی مەلۆکانی پرۆسەی نەتەوەیی خەڵکی کورد، هەمیشە لەگەڵ کێشە و ململانێی ناوەکی هەژاوە و وەک مریشکی کورکی سەر هێلکەی باڵندەی دیکە، بەردەوام راوکەی ناتەندروستی لە بەر دانراوەتەوە و لەو ئاو و هەوایە پۆخڵەدا جوجکەی ڕەنگاوڕەنگی ناتەبای هەڵهێناوە.

بێگومان توخمە بەناو سەرکردە پیلانگێڕەکانی بەردەوامی ریزی حیزبی کوردی، ئەوەندەی سەرقاڵی دووبەرەکی ناوماڵی کورد بوونە، هەرگیز ئەوندە لە خەمی کۆکردنەوەی یەکگرتنی خەڵکی کورد نەبوونە و هەڵهێنانی ئاسۆیەکی گەشی پرۆسەی دامەزراندنی بنیادی ناسیۆنالیزمی کورد نەبوونە.. دیارە یەکەم هەنگاوی ئەو پراکتیکە قێزەوەنەش بە ناوکۆڵ کردنی پارتی لە دامەزراندنییەوە جۆگەلەی بەستوە. بەڵێ مانۆڕی دەرکردنی هەمزە لووتەبدوڵڵا و هاوڕێیەکانی مایەی پراکتیزەکردنی ئەو پیلان و دەسیسە سەقەتە بووە. کە تا بینەقاقا بە رق و کینە و ریسواکردنی بەرمایەکانی تێکۆشانی نەوە لەدوای نەوە دەقی گرتووە. ئەگەر ئەو بیانووەی نەوشیروان بۆ مەلا

مستەفا باسی دەکات کە گوایە بە خۆدانە پاڵ _حشع _ ی هەمزە عەبدوڵڵا ئەو کارەی بەرانبەر کراوە، کە دواتر هەمان نەوشیروان دیسانەوە ئەوە بۆ مەلا مستەفا قیت دەکاتەوە، کە فلانە کەسی ناوبراو بە گومانی جاسوسی سۆڤیەتی ئەو زەمان بە فەرمانی مەلا مستەفا لە مەکتەبی سیاسی ئەو حیزبە دانراوە. وەک ئەوەی مەلا مستەفا لە خۆیەوە بۆ هەمزە عەبدوڵڵا _ شدید العقاب _ و بۆ یەکێکی دیکە _ غفورالرحیم _ بووبێت. بێگومان ئەوانەی بۆ هەمزە عەبدوڵڵا و هاوڕێیەکانیان تێکوشیوە، زۆرتر چاویان بەو پلەوپایەی هەمزە عەبدوڵڵا هەڵنەهاتووە و چاوچنۆکانە مرخیان لە شوێنەکەی ئەو خۆش کردووە. دەنا ئەو رۆژە زۆربەی سەرانی پارتی دۆستی گیانی بە گیانی حشع بوون. ئەو بیانووەش کە بۆ هەمزە.ع هۆنراوەتەوە، بە پراکتیک دەرکەوت چروک بوو، چونکە هیچ لەو ناو هێنراوانە بە وەدەرنانیان لە پارتی، رۆژێک لە رۆژان بە لای حشع _ ەوە نەچوون

دواتر نازانم کامە سەرکردەی حیزبی کوردی لە کۆن و نوێدا، وێڵی داڵدەدانی کەسی ناسراو بە جاسوس نەبووە. ئەوە بە بیر نەوشیروان و هەموو لایەک دەهێنمەوە، کە ئەو گرنگیدانە لە باوەشگرتنەی بۆ کۆنە جاسوسێکی لات و پاتی وەک رەفیق پشدەری لە ساڵی ١٩٨٢ ەوە لە ناوزەنگدا، گیرابووە بەر بە چ پێوەرێک بوو، بۆ هەر دەبی دەستی چەور بە سەری ئەم و ئەو بسڕێتەوە و لە لاساییکردنەوەی کاری ناهەمواری خۆت بێپەروا بیت.!

## هەندێ لە لاپەڕەکانی _ هەڵگیرسانی _ شۆڕشی ئەیلوول

ئایا هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ لە باشووری کوردستان، رووداوێکی تەندروستی بەرئەنجامی ئاوێتەی ناکۆکییەکانی خەڵکی کورد لەگەڵ دەسەڵاتی حکومەتی ئەو دەمی عیراق بوو..! ئەو کەسەی سەرە قەڵەمەکانی نەوشیروان لە کتێبی _ پەنجەکان یەکتری ئەشکێنین _ دا دەربارەی رووی راستەقینەی چۆنیەتی هەڵگیرسانی ئەو شۆڕشە بە وردی بخوێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێ کە لەناو خەڵکی کورد بە گشتی و ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئەوێ رۆژێ بە تایبەتی، شۆڕش هەڵگیرساندن لە ئاشێک و خەڵک و پارتی لە هەوارێکی دیکە بووە. بە جۆرێک نەوشیروان نووسیویەتی.

(پیوەندی نیوان مەلا مستەفا و قاسم ساردی و گرژی تیکەوت بو ، مەلا مستەفا

ئەبویست قاسم ناچار بکا پیوەندی لەگەل چاک بکا. ) ل/٦٠

بەبێ ئەوەی نوسەر قامک بخاتە سەر فاکتەر و چۆنیەتی ئەو ساردی و گرژییەی نێوان مستەفا بارزانی و عبدالکریم قاسم..!

(سالی ١٩٦٠ لە کۆبونەوەیەکی فراوانی کۆمیتەی ناوەندی... کە مەلا مستەفایش بەشدار بو. لەم کۆبوونەوەیەدا مەلا مستەفا هیرشی کردە سەر قاسم و، داوای لە حیزب کرد خۆیان بۆ بەرەنگاری ئامادە بکەن و، هەندی کار بکەن. ...هەندی لە ئەندامانی م س وت بویان کاری وەها ئەبیتە هوی هەلگیرسانی شەر بی ئەوەی خومان بو شورش و بەرەنگاری ئامادەکرد بی) ل/٦٠

دیسان نەوشیروان خۆی لە باسکردنی هۆی ئەو هێرشەی مەلا مستەفا بۆ سەر قاسم ناگەیەنی و خوێنەر لەوە ناگات مەلا مستەفا بۆ و بە چ بیانوویەک قسەی لەسەر قاسم کردووە..!

لەو دەستەواژانەی سەرەوەدا، نەوشیروان لە لایەک بە راشکاوی فاکتەری سەرەکی هەڵگیرساندنی شۆڕش، تەنیا بۆ گرفت و ساردی پەیوەندی شەخسی نێوان مەلا مستەفا و قاسم دەگێڕێتەوە و لە لایەکی دیکەوەش قامک لەسەر دەستەپاچەیی سەران و بەرپوەبەرانی پارتی لەوێ رۆژێدا دادەنێ، کە چۆن لە هەڵگیرساندنی شۆڕشەکە، بەدوای هەڵلا کەوتوون و بە گوێی مامۆستایان کردووە...! دەنا بەرنامەیەک لە گۆڕێدا نەبووە بۆ بەرپاکردنی بزاڤی چەکداری، لە پەیداکردن و خەمخواردنی کەرەستەکانی..! هەر وەک نەوشیروان دەیگێڕێتەوە، هەندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی لە کۆبوونەوەکەیان لەگەڵ مەلا مستەفادا، لە نەبوونی هەر جۆرە بەرنامەیەکی ئەو حیزبە بۆ شۆڕشکردن هاتونەتە گۆ، کەچی دواتر کە بۆ ناوچەکانی کوردستان نێردراون، ئەوانیش بەدوو بەزمەکە کەوتوون.

لێرەدا ئەوەی جێگای سەرنجە، نووسەر لەسەر ناوی بەشێکی سەرکردایەتی پارتی، نەیاری بۆ بزاڤی چەکداری ئەیلوول دەردەخات. بەبێ ئەوەی ئەو نەیاری و نەگونجاوییە بۆ هەر فاکتەرێکی پێویستی بزاڤی چەکداری روون بکاتەوە. یاخود هەر هیچ نەبێت لەو بارەوە رای کەسی خۆی دەربڕێ.

بە کورتی هەر لەوێ رۆژەوە، لە ناو هەناوی کۆمەڵی کوردەواریدا، بیرۆکەی حیزب وەک قوتوی موعەلەب، کەوتووتە چنگی دەستەیەک لە کەسانی سیاسەتچی، کە بە

ئارەزووی خۆیان لە پێشەوە و بە پێی مزێجی ڕۆژ، هونەری سیاسەتکردنیان بە تەشی رووت و ڕەجاڵی کوردایەتییەوە وەکردووە. بە پێی ڕۆژ و مجێزی خۆیان بە خەڵکی بەستەزمانیان فرۆشتوتەوە و تا دەگاتە ئەمڕۆکە ئەو سەراوودەراوە وەک ترادیشون بۆ نەوەکانی هەنوکە بە میرات ماوەتەوە و موزایەدەی بیست و چوار عەیاری پێدەکرێ و خەڵکی هەرەمەکی لەبەری هەڵدەپەڕن. دەنا کوا بەرنامەی ستراتیژ و تاکتیکی لایەنی زۆر و کەم..! مەگەر هەر لە کۆڵەپشتە ناوەڕۆک بە تاڵەکەی سەرانی حیزبی کوردی جێگای بووبێتەوە. چۆن چۆنییەک دروشمی دیموکراتی بۆ خەڵکی عیراق لەگەڵ بزافی چەکداری خەڵکی کورد یەکدێتەوە..! چونکە چەکداری واتە شەڕوشۆڕی خوێناوی، ئاگربەردانە تەڕ و وشک، خوێنڕژانی تاوانبار و بێتاوان، ئەگەر بە کاتیش بێت، واتە سڕینەوەی ئاشتی و پێکەوە نەگونجانی لێدەکەوێتەوە.

وەک دواتر لە کاروانی مێژووی پارتی بە پراکتیک ئەوە ساغ بوەتەوە، مەلا مستەفا بەپێی ئەزموونی پڕ تاڵ و تفتی، هەر لە نوکەوە لە میتودی کاری ئەو جۆرە حیزبایەتییەی بەر ڕەوسەی پلان و مانۆڕی کەرەسیساوی هەڵقوڵاوی ناو بیرکردنەوەی داتاشراو، داگیراو بە رقوقینە و یەکتر بە سووک خوێندنەوە و ناتەبایی کۆمەڵی کوردی گەیشتوە. هەرگیز دڵی بەو سەرۆک بوونەی حیزب خۆش نەبووە کە بە پارەسوان کراوەتە سەرۆکی ئەو حیزبە..!

نەوشیروان لە سەرتیلەی گێڕانەوەی باسوخواسەکانی سەرەتاکانی هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلوول لە سەرەتای شەستەکاندا، ئاوڕ لە کەسایەتی شێخ ئەحمەدی بارزانی دەداتەوە و نووسیویەتی..

(شێخ ئەحمەد جوامێرێکی ڕاستگۆ و سەرراست بو. دلسوزی باوەڕەکانی خوی بو. گوی ی نەئەدایە مالی دنیا، بو ((میللەت)) ی بارزان بی ئەندازە دلسوز و، لە رەفتارو بریارەکانی دادپەروەر بو. ) ل/٦٣

خۆزگە سەرکردە و مەسولەکانی حیزبی کوردیش، لە ئەزمونی خەبات و کاسبی دواتریان شتێک لەو سەرەتا پڕ سەروەرییانەی کەسایەتی شێخ ئەحمەد بارزانییان بۆ کەسانی حیزبی و خەڵکی دەکردە مەلۆی دیار. لەجیاتی قرشەی پەرشوبڵاوی هەڵسوکەوتەکانیان بۆ مێژوو شتێکیان بە دارێ وەدەکرد..!

هەنوکەش جوامێرییەکی ڕاستگۆیانە، سەر ڕاستییەکی سەربڵندانە، دڵسۆزییەکی

ساغ و دروست بۆ ژیانی ریزەکانی خەڵکی ئاسایی و دوور لە چەپک چەپکی و دابڕان لە کۆمەڵانی خەڵک، دادپەروەرییەکی راشکاوانە بۆ مەسولی حیزب و سەرکردەی ناوی زڵ و دێی وێران، نەخشی سەر بەرد دەبوو. کە بۆ بزاڤی رەوای خەڵکی کورد لە نان و ئاو کەمبایەختر نین.

هەر سەبارەت بە کاری حیزبایەتی کوردەوە، نەوشیروان باس لە دانانی مستەفا بارزانی بە سەرۆکی حیزب و ئەو ترادیشونە دەگێڕێتەوە، کە بە چاولێکەری ئەزموونی حیزب لە دەوروبەرەوە هەڵگیراوەتەوە، بەڵام هەر بەناوی مەلا مستەفاوە نووسیویەتی..

(بۆچونی مەلا مستەفا بۆ حیزب، وەکو بۆچونی بو بۆ عەشیرەت. چۆن ئەندامانی عەشیرەت ئەبی بی چەن و چون گویرایەلی فەرمان و ئامۆژگاری و قسەکانی سەرۆکی عەشیرەت بن، ئەبی حیزبیش بەهەمان دلسوزی گویرایەلی فەرمان و ئامۆژگاری و قسەکانی سەرۆکی حیزب بن.) ل/٦٥

بەڵێ ئەو فەرمودانە ئەگەر بە ناوی مەلا مستەفاوەش ناوزەد کراون. بەردی نەستەقی گروندی حیزبی کوردییە لە کۆن و نوێدا. هەنوکەش کامە حیزبی بچوک و گەورەیە، لە ورد و درشتی کاری رۆژانە، سەرۆک و سکرتێر بڕیاردەری ئەوەل و ئاخیرە..! دیارە هۆی سەرەکی بۆ دۆخی کۆمەڵ دەگەڕێتەوە، کۆمەڵێک تا بینەقاقای لەناو کەڕەسیسەی دواکەوتوویی و فەرموودەکانی نەزانینی چەرخە بەسەرچوەکانی دەقی گرتبێت. هەنوکەش بە هەزارویەک شەکراوی مینبەری جۆراوجۆر بانگاشە بۆ بەردەوامی خەساندنی دەکرێ، بیری ئایدیالیزم هەموو داهێنان و مێشکی بیرکردنەوەی زانستی دەستەمۆ و لەبار بردووە و دەبات. دەبێ بەرهەمی کۆمەڵایەتی هەر لەو جۆرە بێت.

نەوشیروان دەستخۆشانە، لە رەوتی لە قاودانی ناکۆکییەکانی مەکتەبی سیاسی پارتی لە دەمی سەرەتاکانی شۆڕشی ئەیلولدا زۆر نیشانە شکێنانە نووسیویەتی..

(بیانوەکەیشیان بۆ نەکشانەوەی ئەمجارەیان ئەوە بو... مەلا مستەفا ئەیەوی کۆتایی بە شۆرش بهینی، بەلام ئەوان ئەیانەوی دریژە بە شۆرش بدەن. هەمو ئەو جارانەی نە ئەبو لە بەردەمی مەلا مستەفادا بکشینەوە کشابونەوە، ئەمجارەیان کە ئەبو بکشینەوە نەکشانەوە. ئەمەش هەلەیەکی کوشدە بو کردیان زەرەری گەورەی دا لە جولانەوەی کورد و لە پاشەرۆژی خۆیان.) ل/٧٨

بەڵێ رووداوە جەرگبڕەکانی هەڵگیرساندنی یەکەم کاروانی شەڕی خۆکوژی کورد

لەو پارچەیەی کوردستاندا. سەرلەنوێ لەوێوە هەنگاوی هەڵگرتووە و کارەساتەکەش بەوەوە کەرەسیسەی هەڵهێناوە، کە ئەو شەڕە بێهودە ناوخۆییە لە نێوخۆی هەمان ئەو سەرکردانەی ئەو حیزبە خۆی بووە. کە چڵکاوی خوێناوی قوربانی، دەرخواردی خەڵکی کورد هەتاکو هەنوکەش دەدا، و پۆخڵەواتەکەی بە سەروگوێلاکی کوردایەتی دێتە خوارەوە. بە بیانوی ئەوەی مەلا مستەفا ئەوان سەرکردانەی لە بڕیاردانەکان نەخوێندوتەوە..! کەچی خۆیان بۆ مانۆڕی ناوخۆیی لە لادانی هەمزە عەبدوڵڵا بە هەنجەتی پڕوپوچ لە سکرتێری حیزب و دامەزراندنی خۆیان بە سکرتێر، ئەو مەلا مستەفایەیان بە زۆری زۆرداری بە سەرۆکی حیزب هەڵبژاردوتەوە. چونکو ئەوە مەلا مستەفا نەبوو وازی لەو شۆڕشە هێنا، بەڵکو خۆیان دیسانەوە بە بیانوی بێ بنج و بنەوان، سەنگەری شۆڕشیان چۆل کرد و چوونە پاڵ رژێمی بگرویکوژی بەعسیی. خەڵکی کوردیان بە خۆرایی بەکوشت دا و قوربانییەکانیان بە بەعس شاباش کرد..! دواییش بەسەر سەلامەتی خۆیان، گەڕانەوە بەر شمڕی مەلا مستەفا و لە هەر مەسولیەتێکی مێژوویی بە فیڕۆدانی جۆگەلەی خوێناوی خەڵک لە هەردوولا وەک بەرزەکی بانان سەر سەلامەت لێی دەرچوون..!

(هەردولا کە یەکترییان بە جاشایەتی تاوانبار ئەکرد، هەردوکیان دو حیزبی خاوەن بەرنامە و ریبازی سیاسی و ریکخستن و بنکەی جەماوەری بون. هەر یەکەیان هەزاران رۆشنبیرو جوتیارو کریکاری لی کۆبوبوەوە. هەر یەکەیان بەهانەو بیانوی خۆی هەبو. )
ل/٨٦

نووسەر سەبارەت بە چیرۆکەی جیابوونەوەی نێوان هەردوو باڵەکەی ناو یەک حیزب، چەندان لاپەڕەی لە شێوازی وەسفکردن و لەقاودانی یەک بە یەکیانی هۆنیوەتەوە. کە بەراستی لە زۆر لاوە راشکاوانە راستییەکانی رووی ئەو دووبەرەکییەی خوێندوتەوە. بەبێ ئەوەی بە دروستی و سەرپەڕانە، قامک بخاتە سەر ئەوەی کە ئەو دووبەرەکییە، لە نوکەوە لەلایەن بەناو سەرکردەکانەوە، خەڵکی وابەستەی دەورویەری خۆیانی پێ دانەخۆرە کراوە. هەروەک لەو پەیڤانەی سەرەوەدا دەری دەخات. هەردوولا لەجیاتی ئاو بە ئاگر داکردن، بەرگرتن لە پەرەپێدانی ئەو دووبەرەکییە، کەوتوونەتە مەهاتەرات بڵاوکردنەوە لە دژی یەکتری و لەو زەمانیدا بەدوای بیانوی هەڵبەستراو گەڕاون.

دیاره ئەو شێوازە قێزەوەنە خۆی لە خۆیدا بووەتە، میراتی ترادیشونێکی کۆپیکراو لەلایەن زنجیرەی دووبەرەکی و لە یەک جیابوونەوە زۆرووزەبەندەکانی حیزبی کوردی شاخ و ناوشار، بەردەوام شایی لەبەر کراوە..!

لەگەرمەی شەنوکەوکردنی باسوخواسەکانی لە مێژینەی دووبەرەکی نێوان ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، _مەلایی و جەلالی _ لە شەستەکاندا، کە وەک بنیشتەخۆشە بۆ چیراوکەی دووبەرەکی حیزبی بە میرات رێچکەی خۆی بەبێ پسانەوە گرتووە. نەوشیروان هەر بەناوی مەلا مستەفاوە قامکی خستوتە سەر رەهەندێکی تاڵوتفتی ئەجندای سەرانی قوتابخانەی سیاسەتچی حیزبی کوردی و نووسیویەتی..

(مەلا مستەفا لای نوینەری دەولەتانی جیاواز قسەی جیاوازی ئەکرد. بەئەمریکای ئەوت... ئەگەر یارمەتیم بدەن کوردستان ئەکەم بە ولایەتی پەنجاو دوی ئەمریکا. و بە سۆڤیەتی ئەوت... ئەگەر یارمەتیم بدەن کوردستان ئەکەم بەقەلای کۆمۆنیزم. بە ئیرانی ئەوت... ئیمە هەمومان لەرەگەزی ئارین. و بە عیراقی ئەوت... من عەبباسیم. و بەعەرەبی ئەوت... من موسلمانم ئامادەم پیشمەرگە بنیرم بو شەری جو. و بە جولەکەیشی ئەوت... کوردو جو نەتەوەی حەزرەتی ئیبراهیمن ئەبی پیکەوە هاوکاری بکەن. ) ل/١١٠

ئەوە دروست سەرچاوەی میتۆدی بێ ئەملا و ئەولای سیاسەتی سەرانی حیزبی کورد بووە کە لە کۆنەوە قەتماخەی بە جەستەی برینداری خەڵکی کوردەوە گرتووە. لە نوێدا بەبێ هەر جۆرە گۆڕانکارییەکی ئەم ناوەڕۆکە، بە ساویلکەیی بەرگی دیبلۆماسی کوردی خەشیمانەی گەوجاندنی خەڵکی کوردی لە بەر کراوە.

ئەو شێوازە نەوەک هەر لە لایەن سەرکردەوە بە رووی دەرەکی پیادە کراوە و دەکرێ. بگرە لەناو خودی کادر و ئەندامان و هەتا خودی خەڵکی کوردی، بەبێ هەڵاوێردکردنی ئەم و ئەو، پاشەگەردانەتر پەرەی پێ دراوە. بە جۆرێک لە جۆرەکان یەکێتی ریزەکانی کۆمەڵی کوردی پێ تەپێنراوە.

نووسەر سەبارەت بە خاڵێکی دیکەی هێجگار گرنگی فاکتەرەکانی فەشەلی کاروانی خەباتی خەڵکی کورد لە رابردوودا، بە جورئەتەوە لە پەراوێزی باسەکانی سەبارەت بە پانۆرامای کۆتایی شۆڕشی ئەیلولەوە، دەستی بۆ لایەنێک درێژ کردووە کە هەتاکو هەنوکەش لەبەرۆکی بەرەنجامی سیاسەتی شپرزاوی حیزبی کوردی، کەس شەنەبای

راستگۆیانەی لەبەر نەکردووە و بگرە هەتا ئەمڕۆکەش خۆ لە قەرەدانی ئەو بابەتە بقەیە... نەوشیروان لەو بارەوە دەڵێ...

(فەسادی مالی و ئیداری لەناو دەزگاکانی حیزب و پیشمەرگەدا پەرەی سەند. واسیتە و خزمایەتی، نەک توانا و لیوەشاوەیی، گرنگترین پیوانەی دامەزراندنبون لە دائیرەکان دا. بازرگانی قاچاخ لەگەل ئیران بو بەسەرچاوەیەکی گرنگی دەولەمەن بونی کاربەدەستەکانی پیشمەرگە (( قونتەرات )) ەکانی وەزارەتی کاروباری سەرو و، قونتەراتەکانی تر کاربەدەستەکانی پارتی و پیشمەرگە ئەیان گرت، پارەکانیان وەرئەگرت پرۆژەکان، کە بۆ ئاوا کردنەوەی کوردستان بو، یا هەر نە ئەکران، یا ئەگەر بکرانایە زۆر خراپ و پر کەموکوری بون. زۆرجار خەلک ئەم گلەییانەیان ئەگەیاندە مەلا مستەفا ئەویش ئەیوت.. (( ئەوانە ماندویون با کەمی ئیستفادە بکەن. ))) ل/١١١ — ١١٢

من خۆم لە زنجیرەی یەکەمی ئەو یادەوەرییانەدا، کەمونزۆر لێرە و لەوێ سەبارەت بە دارایی حیزب و یاساغبوونی باسکردنی بە راشکاوانە قسەم کردووە. لێرەشدا تەنیا بەدوای دەستخۆشی لە نەوشیروان کە بەدوای دەیان ساڵی شۆڕشی ئەیلوول ئەو باسەی هێناوەتە گۆڕێ. بەڵام ئایا ئەوانەی هەنوکە مەسولن لە خودی خۆیەوە لە ناو حیزبە کاربەدەستەکاندا. سەد بەردیان یەوانەی رابردووی خۆیان دانەداوە..! و کەسیشیان مێش میوانییەتی..! تەنیا ئەوەندە نەبێت هەنوکە لە سایەی کۆمپانیای شەخسی و مافیایی بنەماڵە و دەستەگەری ، سەرتاپای باشوور بە ناوی ئاوەدانکردنەوە بە دەیان پرۆژەی پیفۆکاوی مافیاییی و ئاپارتمانی ناوەڕۆک تژی لە پۆخڵەوات تەنراوە. کەس نازانی سەروەت و سامانی بە دەیان ملیار دۆلاری قوتی خەڵک لە قورگی کێ و کێ نقوم بووە..! ئەگەر ئەو دەم کاربەدەستەکانی پێشمەرگە لەگەڵ ئیران بازرگانییان بۆ مەیسەر بوویێت بۆ خۆ دەوڵەمەندکردن، ئەوە هەنوکە بازارگانیی بەشێک لە مەسولەکانی حیزب و پێشمەرگە سنوورەکانی تێپەڕاندوە و مامەڵە بە نەوت و گاز و مۆڵی رەنگاوڕەنگو چی و چیتر مۆدەی داهێنراوی ئەو مافیادەسەڵاتدارانەیە کە بۆ خۆ زەنگینکردن لە هەر جۆرە کاسبییەکی بازاڕی مۆڵ و نەخۆشخانە و بازرگانی داوودەرمانی ئێکسپایەر، جبەخانەی چەک و فرۆکەوانی و زانکۆی ئەهلی رەنگاورەنگیش نەسڵەمینەتەوە. ئاقارێکیش بۆ دەست تیکەڵکردنەکانیان لە چاوچنۆکی خۆ زەنگینکردن نابینرێت..! هەموو ئەو مافیا حیزبییانە، کوڕوکاڵی خۆیان کردوتە قەڵەمگرەوەی دەسەڵاتە گەندەڵەکارییەکانیان، بەبێ

ئەوەی شەرم لە کەس بکەن..!

نەوشیروان لە کۆتاییپێهێنانی باسەکانی شۆڕشی ئەیلوول و سەرکردایەتییەکەیدا، پاش دەیان ساڵی ئەو ئەزموونە، بە یەک دەستەواژەی پڕ لە عیبرەت و داخهەڵکێشان جوامێرانە نووسیویەتی..

(ئیستا کە بە رابوردودا ئەچمەوە پیم وایە، ئەبو ئەوسا ئیمە.. سەرکردایەتی یەکێتی هەلویستیکی ترمان هەبوایە -سەرەرای هەمو دوژمنایەتییەکی لەگەل یەکێتی و، سەرەرای هەمو کارە خراپەکانی، مەلا مستەفا بەگەورەترین سەرکردەی کورد دائەنرا. ئەبو ئیمەش لەو رۆژەدا لە باتی ئەوەی هیرشی بکەینە سەر، پەیامی پرسە و سەرەخوشی مان بۆ بنەمالەی بارزانی و ئەندام و لایەنگرەکانی پارتی بناردایە و، ئەگەرچی بەدەنگمانەوە نە ئەهاتن، بەلام ئیمە ئەوەمان بکردایە بە بۆنەیەک داوایان لێ بکەین لاپەرەیەکی تازە بۆ پەیوەندی یەکیتی و پارتی بکەنەوە، بانگیان بکەین بۆ _ ئاشتبوونەوەی نەتەوەیی _ بەلام ئیمە ئەمەمان نەکرد چونکە هیشتا لەژیر تەئسیری رووداوەکانی هەکاری دا کاس و تاسا بوین، بیرمان لە هیچ نەئەکردەوە _ تۆڵە _ نەبی. لەناو ئیمەدا هەبون ئەم مردنەیان لەو کاتەدا بە _ انتقامی الهی _ دائەنا.) ل/١١٦

لە کاروانی فەشەلەکانی بەر ئەنجامی چەندان جۆگەلەی قوربانی بێهودەی رۆڵەکانی کورد لە هەگبەی سەرانی سەرەکی حیزبی کوردی لە تەنگەیان تەپەی دێت..! بەڵام خۆلەقەرەدان و دەربڕینی هەستونەستی پەشیمانی ئەگەر لە بەردەوامی کاروانەکە بە پراکتیکی هەنوکەییەوە دیاربێت، شایستەی باوەڕپێکردن و دڵخۆشییە و مرۆڤی وڵاتپارێز و نەتەوەپەروەر لە بەرییەوە ئاسوودە دەبێت. ئەو دەربڕینی هەستی بریاوامان بکردایە بە عیبرەت و قەناعەتی یەکجارەکی و بەڵام لێرەدا ئەوەمان نەکردایە_ ی نەوشیروان، خۆی لە خۆیدا چەشنێک لە جورئەتی پێویرانە بەو رەهەندانەی هەر یەکێک لەو سەرکردانەی کە بەشی خۆی لە مەسولیەتی نەگبەتییەکانی بەردەکەوێت.

# بزووتنەوە و فرە لەشکری چەکداری

یەکێک لە خاڵە دزێوە _نێگەتیڤ_ کانی هەر شۆڕش و بزاڤێکی چەکدار لە سەرتاپای مێژوی مرۆڤایەتیدا، هەبوونی فرە هێزی چەکداری جیاوازە. هەر بۆ بەڵگەش شۆڕشی ئەیلوولی شەستەکانی خەڵکی کورد لە باشووردا، کە قورساییەکەی لە ناوەوە و دەرەوەدا لەوە دابوو. خاوەن یەک لەشکری یەکگرتووی چەکداری بەرچاو بوو. بەڵام بزاڤی چەکداری ناوەراستی حەفتاکان لە سێبەری زاڵبوونی کەشوهەوای دەسەڵاتدارێتی فرە حیزبی و سەرکردایەتی هەمەچەشنە، لە پەنای دەسەڵاتگێڕی فرە کێخوایی بچوک بچوکدا. زەمینەی فرە لەشکری چەکداری دەستەگەری وەک بەرگی موقاوەمەت بە قورگی بەناو شۆڕش و تێکۆشانی چەکداری خەڵکەوە کرد. ئەو خاڵە وەک پەتایەک بۆ بەدەست نەهێنان و نە سەلماندنی رەوایەتی بزاڤی چەکداری کورد لەوێ رۆژاندا، بە نەساغی کنەی کردوتە ریزی حیزبی کوردی لە عیراق و کوردستاندا. بە جۆرێک ئەو فرە لەشکرییە لە جیاتی هەر جۆرە دەستکەوتێک بۆ خەڵکی کورد، وەک بارێکی قورس بەسەر شانی خەڵکەوە، لە زۆر حالەتدا مایەی مەینەتی بوونە. هەتاکو هەنوکەش ئەو چەپک چەپکییە چەکدارییە لە بەرگی میلشیای حیزبی بە قەد و باڵای ئەزموونی حوکمڕانی دەسەڵاتی کوردی لە باشووری کوردستان‌ـتەکەتەکیەتی.

لەو بارەوە نەوشیروان نووسیویەتی..(جیابوونەوەی چەکدارەکانی بزوتنەوە، لەشکریکی تری لە کوردستان زیاد کرد و، بیری یەکخستنی چەکداری هەمو حیزبەکان، لە (( یەک لەشکری یەکگرتو)) دا، کە لە سەرەتای دامەزراندنی یەکیتیەوە باس ئەکراو، ئەمانویست هەمو لایەنەکان بەم بیرە قانیع بکەین، بەیەکجاری داروخا. لەوە بەدواوە کوردستان بەرەو _ فرە لەشکری _ رویشت. جگە لە پدک کە هەر لەسەرەتاوە لەشکری خوی هەبو، حیزبەکانی تری.. حسک، پاسۆک، حشع و، دوایی تریش هیزەکانی سەر بە ئیران و، گەل.. هەر یەکەیان میلشیای تایبەتی خۆی دروست کرد. فرە _لەشکری، هۆی سەرەکی شەری ناوخۆ بو. راستە ناکوکیەکان هەمیشە لەسەرچاوەی سیاسیەوە هەلئەقولین، بەلام ئەگەر ئەم حیزبانە لەشکری تایبەتی خۆیانیان نەبوایە، نەیانئەتوانی پەنا بەرنە بەر لەشکری چەکدار بۆ بە لادا خستنی ناکوکیەکانیان، کە زۆر جار سیاسی نە بوون) ل/١٣٦

له تێڕامانی منەوە بۆ ئەو دەستەواژەیە، بە گشتی جێگای دڵخۆشییە کە یەکێکی وەک نەوشیروان بەدوای ساڵانێکی لە گێڕانەوەی یادەوەرییەکانی باسیان لێوە دەکات. بەڵام نەوەک تەنیا لە ژێر چەتری لەشکری چەکداری بزووتنەوەدا، بەڵکو ئەو ئاوە لێخنە لە سەرەتاوە لەلایەن چ هێز و لایەنێکەوە رژێنراوە..! بەداخەوە نووسەر خۆی لە قەرە نادات..! پاشان ناوی حیزبی گەل دەهێنێ، کە دیارە زەحمەتکێشان _ ئیتجاهی دیموکراتی شۆڕشگێڕی _ جیا بووەوە لە حسک و ئاڵای شۆڕش _ ی جیابووەوە لە ینک ناهێنێ کە ژمارەی پێشمەرگە و خەڵکیان، زۆر لە لەشکرەکەی _ گەل _ و ئیسلامییەکان لەوان رۆژان زیاتر بووە.

هەر سەبارەت بە تەرازوی هێزی چەکداری حسک و ینک نووسیویەتی: (دوای جیابونەوەی بزوتنەوە، یەکیتی لە دەشتی هەولیر و خۆشناوەتی لاواز بوبو. سەرانی حسک ئەیانویست هەولیر بۆ خۆیان پاوان بکەن و، کادرو پیشمەرگەکانی یەکیتی لی دەربکەن.) ل/١٣٧

من کە یەکێک لەو هەڵسوڕاوانەی کۆمەڵە و یەکێتی بووم لەناو شاری هەولێر و دواتر کە چوومەتە شاخ، لە بیرمە هەر لە نووکەوە هێزی ینک _ ی دوور لە هێزی چەکداری بزووتنەوە، کە ناوچەکانی هەولێر بە هۆی چەندان فاکتەری پێکهاتەی ینک خۆی و بزووتنەوە و کۆمەڵەوە، لەشانی باڵادەستی مەسولەکانی بزووتنەوە لەناو یەکێتیدا، بەتایبەت لە ناوچەکانی هەولێر و کۆیە و خۆشناوەتی و حەوزی رەواندز، هێزی چەکداری ینک هەر لە سەرتاوە هەر خۆی لەو کادر و پێشمەرگە تاکوتەرایانە دەبیتەوە کە ئەندامی کۆمەڵە بوون. بە هۆی راوەدوونانیان لەلایەن دامودەزگاکانی رژێمی بەعسەوە، پەنایان بۆ شاخ بردبوو. ئیتر هەر بەراستی هەتا بەرپابوونی جەنگی عیراق _ ئیران و دروستبوون کەرتەکانی رێکخستنی کۆمەڵە لە شاخدا، ئەو ناوچانە بە پراکتیک لەلایەن هێزی چەکداری حسک _ ەوە پاوانکراو بوو. کە نەوشیروان خۆی لە ئاست ئەو راستییە نەبان کردووە و لەناو قسەکانیدا سەبارەت بە فاکتەری لاوازی هێزی ینک هەتا سەرەتای ساڵانی ١٩٨٠ _ ١٩٨١ و دواتر پەرەسەندنی هێزی چەکداری یەکێتی لەو ناوچانەدا، بێدەنگی هەڵبژاردوە.

# کیتلەی سیجن و چەند سەرنجێک

یەکەمجارە نەوشیروان بە شێوەیەکی ئاشکرا دەربارەی ناکۆکییەکانی ریزی کۆمەڵە، هەبوونی کیتلە و کیتلەکاری بە ڕاشکاوی سەرنج و رایەکانی بە شێوەیەکی تارادەیەک لایەنگیرانە بۆ یەکێک لەو کیتلانە دەگێڕێتەوە. هەرچەندە لە ناوزەدکردنی ناکۆکییەکانی نێوان ئەو کیتلانەی کۆمەڵە _ ناکۆکیەکانیان زۆرتر شەخسی بوون نەک ئایدیولوجی یا سیاسی _ گرەوی راستی بردوتەوە و لەو هەڵسەنگاندنەی پاش دەیان ساڵ ساغ بوەتەوە و لەو کتێبەدا تۆماری کردووە..

(ئەوانەی کومیتەی هەریمەکانیان پیک هینا بو، حەزیان لە چارەی هاورییانی زیندان نە ئەکرد، دوای گیرانیشیان بلاوکراوەیەکی ناوخویان لەسەر دەر کردبون. ئیستاش کە هاتبونە ناو شورشەوە بە لالوتەوە بەخیرهاتنیان کرد بون.

ئەوانەی لە زیندانیش ئازاد کرا بون، حەزیان لە چارەی ئەندامانی کومیتەی هەریمەکان نەئەکرد، لایان وابو، لەکاتیک دا ئەمان ملیان لەژیر چەقۆی بەعس دا بوە، ئەوان کاریان بۆ شکاندنی ئەمان کردوە.

بە کردەوە ئەم دو تاقمە بون بە دو دەستە..

ئەوانەی کومیتەی هەریمەکان بون، خۆیان بە ((خەتی شەهید ئارام)) دائەنا و، وایان ئیدیعا ئەکرد دریژە بەخەتی ئەو ئەدەن. ئەوانەیش لەسەرکردایەتی پیشوی کومەلە بون، خۆیان بە خەتی (( خەتی شەهید شەهاب )) دائەنا و، وایان ئیدیعا ئەکرد دریژە بەخەتی ئەو ئەدەن.

تا ئەهات ناکوکیەکانیان، کە زۆرتر شەخسی بو نەک ئایدیولوجی یا سیاسی، قولتر ئەبو، بەکردەوە بو بون بە دو دەستەی جیاواز.) ل/١٤١

نەوشیروان بەبێ ئەوەی هەروەک چۆن بە راشکاوی باس لە دووبەرەکی نێوان کیتلەی زیندان و کیتلەی س. هەرێمەکانی دوای شەهید ئارام دەگێڕتەوە. دەبوو ئاواش باسکردنی ناتەبەیایی و ناکۆکییەکانی خۆی لەگەڵ یەکە بە یەکەی ئەندامانی کیتلەی س. هەرێمەکان لە پێش هاتنە شاخی کیتلەی زیندان لە خوێنەر نەشارتەوە.

هەروەها کە پەنجە لەسەر بیانوی کیتلەی زیندان دادەنێ بۆ ناکۆکییەکانیان لەگەڵ کیتلەی س. هەرێمەکان، دیسانەوە دەبوو لە بیانوی ئەوانیش لە ناتەبابیان لەگەڵ کیتلەی زیندان بێدەنگەی لێ نەکات. چونکو یەک رەهەندی تاڵ لەلایەن نەوشیروانەوە

لێفەی بەسەردا دراوە. ئەویش ئەوەیە سەرکردایەتی کۆنی کۆمەڵە لە باروبۆخی ناهەمواری ڕێکخراوەکە بەدوای ساڵی ١٩٧٥_ ەوە، کۆمەڵەیان بۆ قەدەر جێهێڵاوە و زۆرتر لە خەمی دەربازکردنی خۆیان بوون. کە ئەو هەنگاوە بە پەلەپڕۆسکێیە و نابەرپرسیارییەتی لە بەڕێوەنەبردنی ڕێکخستنەکە لە دەمی تەنگەژەدا. هەتا بۆ خودی خۆشیان بە کارەسات کەوتووتەوە. ئەگەر ئارام _ ی جەربەزە و هاوڕێیەکانی، لەوێ ڕۆژاندا نەبوونایە، چارەنووسی کۆمەڵە لە باراشی پۆشێ زیاتری لێ نەدەمایەوە. ئیتر ئەو بڵاوکراوە ناوخۆییەش کە لەو دەمیدا، ئارام نووسیویەتی، نووسەری ئەم کتێبە بە رووکەش ناوی دەهێنێ و مەبەستی لە ڕاپۆرتی شوباتە کە لە سەرتاپای ژیانی کۆمەڵەدا، هەتا هەنوکە یەکەم و دوا هەڵسەنگاندنی ئەزمونی کۆمەڵەیە بۆ ئەوێ ڕۆژێ بە جورئەتەوە نووسرابێت. کە دەرخستنی هەڵوێست و دۆزی بەڕێوەبەرەکانی ڕەسمی کۆمەڵەی لە تەمەنی ڕابردووی هەڵسەنگاندوە. بەڵام چ دەکەی لەوەی مێژوو بە خوار و خێچی حەزی کەسانێکی ویژدان پوت تۆمار بکرێتەوە..!

ئەو لایەنگرییەی نەوشیروان کە لە گەرمەی ناکۆکی ئەو دوو کیتلەیە بە کەس نەشاردراوەتەوە، بۆ کیتلەی زیندان بووە و نەوشیروان زیرەکانە بۆ بە لادا خستنی ناکۆکییەکانی ڕابردووی و ئەوانەی نوێی لەگەڵ بەشێک لە هاوڕێیانی کۆمەڵە، بە کاری هێناون و سوودی لێ وەرگرتوون. هەر بۆ نموونەش نەوشیروان بە یەک وشەش باسی ئیعترافاتی بەشێک لەو برادەرانەی زیندان ناکات..! دەبێ حەقانییەتی ئەو هەڵوێستەی نەوشیروان لە لایەنگیری کیتلەی زیندان، زۆرتر بۆ ئەوە نەگەڕێتەوە کە ئەو برادەرانە، بەدوای بەربوونیان بە لێبوردنی گشتی و هاتنە شاخەوە، بیروباوەڕی مارکسیزم _ لینینزم لە لای زۆربەیان کاڵ ببوەوە و بە دڵی نەوشیروان قەزاوەتیان دەکرد. بەڵام برادەرانی کتلەی س. هەرێمەکان بە پێچەوانەوە، ئەگەر لە رقان و بە رووکەشیش بێت، هەر خۆیان بە هەڵگری ئەو بیروباوەرە و پابەندبوون بە بیروکردەوەکانی کاک ئارام لە کەس نەدەشاردەوە و بە هەر شێوەیەک بووبێت بانگاشەیان بۆ دەکرد. هەر بۆیەش بۆ نەوشیروان کە بیری کۆمونیستی لە لای لەو ڕۆژی گروگەل بووە، مامەلەکردن و لایەنگیری کتلەی زیندان گونجاو و لەبارتر بوو.

# کوێرە رقوقینە بەرانبەر یەکتری

لێرەدا جێی خۆیەتی بەندە بۆ یەک رەهەندی حاشاهەڵنەگر سەر دانەوێنم. لە مەودای بێپسانەوەی هەرەتی تەمەنم لەوە حاڵی بووم. بەشێکی زۆری سەرتاپای چیراوکەی حیزبایەتیکردنم سەپانی پوشێ بوومە. هەنوکە کە لەو کاروانە قیرسزەدا بە یەکجارەکی هەڵوەستەم کردووە. دان بەوەدا دەنێم، ئەگەر رقوقینەیەک لە ناو دڵ و دەروونم، منی بە سەرگەردانی پەشیمانی ساغ کردووتەوە و ئێستاکێ لێی بێبەریم. ئەوە بێگومان لە هەواری ئەوان سەرکردانەی حیزب هەتا بینەقاقام بە رقەقینە دایانگرتوم و مەودایەکی زۆر داغانیان کردووم. دانپێدانانەکەم بۆ ئەوە قوچەک دادەنێ، کە من لەوێ رۆژان لە سەرکردە دەسترۆیشتوەکان نەوەک هەر بە فەرهەنگی قێزەوەنی جنێو و جنێودان ئاشنا بووم. بگرە بە زۆری زۆردارەکی و لەبەر شاڵاوی رقوقینەی ئەوان گومرگم داوە وهەندێ جاران خۆم پێ نەگیراوەتەوە و بە لێواری کەندەلانی حیزب بە خشخشۆکێی رقوقینە خەشیمانە گاگۆڵەم کردووە. بەڵگەش بۆ ئەو قسانەم، تکایە بەوردی لەگەڵ من ئەو خوێندنەوە راشکاوە درەنگ وەختەی نەوشیروان تەتەڵە بکەن و تێدەگەن، سەرانی حیزبی کوردی هەتا لە بەرانبەر رۆژنامەنووسێکی لایەدە، رقوقینەی خۆیان بەرانبەر یەکتری نە شاردوتەوە..! گەلۆ دەبێ لەبەر عەرشی دیداریان لەگەڵ دامودەزگا سیخورییەکانی رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان، بە چ رقوقینەیەک یەکتریان داپلۆسیبێت و چۆن چۆنییەک دوژمنانیان شاگەشکە کردبێت ..!

(ئەوی سەرنجی دەیڤیدی راکیشا بو، ئەوە بو، هەمو ئەم حیزبانە دژی یەکتری دوا بون. سامی دژی یەکیتی و حسک، د. مەحمود دژی یەکیتی و پارتی، منیش دژی پارتی و حسک. پرسیاری سەرەکیی دەربارەی هۆکانی ناکوکیی ناو حیزبە کوردیەکان بو. چەندی هەولم دا بۆی رون بکەمەوە عەقلی نەیبری.) ل/١٤٤

ئەو پەیڤانەی نەوشیروان بە رووی رۆژنامەنووس دەیڤید هیرست _ ی بەریتانییە کە لە ساڵی ١٩٧٩ سەردانی بارەگای سەرکردایەتی حیزبە چەکبەدەستەکانی شاخی کردووە.

لێرەوە دەستخۆشی لە نەوشیروان دەکەم کە بوێرانە قامکی خستوتە سەر سوخەتێکی قوندەی سەرانی حیزبی کوردی لە باشوور و لە دەمی بزاڤی چەکداری شاخەکان پێوەی پەیوەست بوون. ئەو سوخەتەی وەک دۆشاوێک بە سەروگوێلاکی

کۆمەڵی دواکەوتووی کوردی دێتە خوارەوە و بۆ هەموو کونج و کەلەبەرێکی مەدرەسەی حیزبی کنەی کردووە. بە جۆرێک خەڵک هەنوکە باجەکەی دەدا و ئەو جۆرە سەرکردانەش بۆ خۆیان سەرسەلامەت و جارێ هەر فشەی سمێلانیان دێتێ

بێگومان ئاکار و رەفتاری یەکتر شکاندنی خەڵکی حیزبی، بەتایبەت ئەوانەی لە بریتی سەرانی حیزبەوە، خۆیان بە میراتگری بگر و بکوژی خەڵکی کورد دەزانن. بمانەوێ و نەمانەوێ ئەو سوخەتە بە هەر بیانوو و هەنجەتێک بێت، بۆ لاوازی و دەمچەفتی کەسایەتی ئەو مرۆڤانە دەگەڕێتەوە. کە کار و کردەوەکانیان لە رقوقینە بەرانبەر یەکتری خورد دەکەنەوە. هەر وەک ئەو پەندە فۆلکلۆرییەی کوردەواری دەڵێ... تفی سەرەو هەوراز، بە رووی خۆشت دەکەوێتەوە..!

نەوشیروان وەک نەخشی سەر بەرد، هەتا لاوازی کەسایەتی سەرکردەکانی کۆمەڵە و یەکێتی بە نمونە دەهێنێتەوە و جوانمەردانە نووسیویەتی

(ئەندامانی سەرکردایەتی هەر هەمویان لە پاشملە گلەییان لە مامجەلال ئەکرد و، رەخنەیان لی ئەگرت، بەلام زوری گلەییەکانیان لەسەر شتی بچوک و تایبەتی خۆیان بو، وەکو ریزی نەگرتون، لە بەرچاوی خەلک لییان تورە بوە و شکاندونی، حورمەتی رەئی نەگرتون و چۆتەوە بە گژیان دا.. سەرانی کۆمەلە چەند جاری لە کۆبونەوەی تایبەتی خویانُ دَا ئەم باسەیان ئەکردەوە و، داوایان لە من ئەکرد لەگەلی باس بکەم و، چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە............ کەچی هەمو جاری کە باسەکەم ئەکردەوە و لە گەلی ئەبو بە ناخۆشیمان، خاوەنی گلەیی و رەخنە لەباتی ئەوەی پشتیوانی لە من بکەن، ئەبون بە ناوبژیکەر لە بەینی من و مامجەلال دا .) ل١٥٦/١٥٧

ئەوەش سوخەتێکی دیکەیە کادر و بەرپرسەکانی دوای مەسولی یەکەمی حیزبی پێی گۆش کراون. لە پەنتایی هەوڵ و کۆششی حیزبایەتی، بەردەوام ئەو سوخەتە پرۆسەی تێکۆشانی سروشتی پێ جلەو کراوە. بۆ ئەوەی دەنگ و رەنگێکی تر لە دەرەوەی شمڕ و مەقام و قامەتی مەسولی یەکەم لە ناو حیزبدا، خاوەن کەسایەتی و کارێکتێری ئاسایی خۆی نەبێت. نەوشیروان لێرەشدا، بوێرانە ئەو هەڵسوکەوتە سووکوچروکەی سەرکردەکانی حیزبی لە هەمبەر مام جەلال دەردەخات، کە چەند دەمڕەپ لە پاشەملە و ئەوەندەش دەمچەفت و دوو ڕوو لە بەرانبەردا.

من پێشتریش لە چاوپەنای ئەو کاروانەی خۆمدا، باسی ئەوەم کردووە کە بیرۆکەی

حیزب حیزبانێ لەناو کۆمەڵی کوردیدا، لە رەچەڵەکەوە کاڵایەکی هاوردەی بەر دەستی توخمێکی چاولێکەر و مەکرۆی مەیدانی سیاسەتبازی رێچکەی بەستوە. هەر بۆیەش ئەو حیزبایەتییە زۆر بە سەقەتی وەرگیراوە و وەک لوقمەیەکی رەقوتەقی بێ بەرهەم بە قورگی خەڵکی کوردەوە داکراوە. چونکو حیزب لەناو نەتەوە و وڵاتانی گەشەکردووی ئاساییی، خەڵکی فێری خۆ رێکخستن کردووە. داهێنان و گۆڕانکاری کردوتە سەرمایەی مرۆڤ لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا. نمانامەی سەرەکی حیزب لە بوربۆڕێنی سیاسیدا، بە شێوەیەکی سەرەکی جەوهەرەکانی وڵات پارێزی، نەتەوەپەروەری بووە.

## رەوشتی هاوڕێیانی کۆمەڵە

نووسەر سەبارەت بە رەوشتی هاوڕێی کۆمەڵە، دەقی ئەو بڵاوکراوەی پاتە کردووتەوە کەکاتی خۆی بە ناوی کۆمەڵەوە بۆ ریزەکانی رێکخستن شۆڕکراوەتەوە. ناوەڕۆکی بڵاوکراوەکە کە لە نووسینی خودی نەوشیروانە، تا بڵێی شتی دروست و مەبەستداری تێدایە بۆ پەروەردەکردنی ئەندامانی کۆمەڵە. لە کۆتاییدا هاتووە.

(ئەم ئامۆژگارییانە بۆ ئەوەی لە گیرفان دا جیگەی ببیتەوە لە قەوارەی پاکەتی جگەرەدا چاپ کرا بو، هەمو هاوڕییەکی کومەلە دانەیەکی ئەدرایە و، ئەبو جیبەجی ی بکا. ئەگەر جیبەجی ی نەکردایە یا لی ی دەرچوایە بە گویرەی سەرپیچییەکەی سزا ئەدرا. سزادان... چەک کردن، لابردن لەسەر کار، گرتن و دەس بەسەر دانان و، لەهەندی حالەت دا ئیعدام.) ل/١٩٦_١٩٧

دواتر نووسیویەتی...(ئەوانەی موخالەفەیان ئەکرد هەتا پلەیان بەرزتر بوایە سزاکەیان قورستر ئەبو....نمونەیەکی ئیعدام، ئیعدامی ریبوار چاوشین بو.) ل/١٩٧

نەوشیروان لە پەراوێزی ئەو ناوەخنەی سەرەوەدا، سزادانی ئیعدامکردنی مەسول مەفرەزەیەکی _ ئەو دەمی کە مەفرەزە لە دوو سێ پێشمەرگە تێنەدەپەڕی _ پێشمەرگە بە نمونە هێناوەتەوە. بەڵام ئەو نموونەش یەک لایەنە، چونکە لەراستیدا ئەو سزادانە تەنیا ئەو جۆرە پێشمەرگە و کادرانەی گرتوتەوە کە هیچ پشت و پانەیەکیان لە لایەن مەسولە دەستڕۆیشتوەکان شک نەبردوە. بەندە وەک شایەتحاڵێکی مەیدانی لە دوای هاوینی ساڵی ١٩٨٠ کە بۆ پێشمەرگایەتی لە شاخ گیرساومەتەوە. دەتوانم گەواهی ئەوە بدەم کە بە پێچەوانەوەی ناوەڕۆکی ئەو بڵاوکراوە، کاری سزادان و لێپێچینەوە بە

تەنیا هەر ئەندامی سادە و تاکوتوکی پێشمەرگەی ئێرە و ئەوێی بێ پشتیوانی گرتووتەوە. ئەو رێسای ناو گیرفان بۆ سەرجەم پێشمەرگە و کادرەکان وەک یەک نەبووە و لە پراکتیکدا یەکسانی تێدا رەچاو نەکراوە.

راستە لە هەندێ حالەتی مەبەستی سەرانی دەسترۆیشتوی کۆمەڵە و مەسولی پێشمەرگەدا، بۆ خاتری چاکتر بەرمەیدانبوونی کار و کردەوە ناشیرینەکانیان بە تایبەت بەرانبەر بە خەڵکی رەشوڕووتی بێ پشتوپەنای گوندەکان. مەسولەکان هەمیشە لەسەر پێ بوونە، بۆ سزادانی ئەو هاوڕێ بەستەزمانانەی کۆمەڵە، کە تەنیا سەربازێکی نەناسراوی مەیدانی خەبات، مرۆڤێکی سەربەخۆی وڵاتپارێز بوون. بەتایبەت ئەوانەی لە زۆربەی ئەو رۆژە ناخۆشانەدا، پلەوپایەیەکی ئەوتۆی رێکخراوەیی و پێشمەرگەییان پێ رەوا نەبینراوە. بەڵکو ئەو لێپسراوە عەسکەری و بەناو تەنزیمییانەی رۆژانە و بەبێ پەروا، لە کار و کردەوەی دەستدرێژیکردنە سەر کەرامەتی خەڵک، لە شەڕواڵپیسی، پارەوەرگرتنی رەوا و نارەوا، غەدرکردن و دارکاریکردنی جوتیاران، پەیوەندیکردنی ژێربەژێرەکی لەگەڵ دامودەزگا سیخورییەکانی رژێم ــ فایلدارە زۆر و زەبەنەکان ــ نەسڵەمینەتەوە و کەسیش لە گوڵ شیرین تری پێ نەگوتوون و بگرە بۆ چاکتر دانەخۆرەکردنی مسۆگەریان، پلە و دەستکەوتی مشەیان پێبەخشراوە..!

خۆزگە نەوشیروان لەو مەیدانەدا، نموونەیەکیشی بۆ ئەو هاوڕێ و پێشمەرگە ئازایانە دەهێنایەوە کە بە مەرگ و پێشکەشکردنی گیانی خۆیان سەروەرییان تۆمار کردووە، یەکێک لەوانە بۆ بەرچاوی رای گشتی ناوەکی و دەرەکی بە جوامێری و میرخاسی ناودێر کرابێت. من دەڵێم ئەگەر لە چاوپەنای ویژدانێکی زیندوو ئەو فاکتانەی سەبارەت بە زێدەڕۆیی مەسولەکان، کە هەتا نەوشیروان لێرە و لەوێ نکوڵی لێ نەکردوون، ئەگەر مەسولی خاوەن ئەو جۆرە ئاکارە قێزەوەنانە، رۆژێک سزا درابان..! هەرگیز ئەو ئاکارە قێزەوەنە بۆ تێکڕای جەستەی حیزب و بزاڤی چەکداری کنەی نەدەکرد. مەگەر بۆ چاوبەستەکی خەڵک و ئەوجا بە یەکجارەکی بە مەبەستی کەویکردنی ئەو فلان و فیسارە بۆ ماوەیەکی کاتی لە بارەگای مەسولی سەرەکی، گلدراونەتەوە و دواتر بە پلەیەکی بەرزتر بەردراوەتەوە گیانی خەڵک و دەستبڵاوتر کراون.

هەڵدانەوەی ئەو لاپەڕانە بۆ هەڵدێری گەڕەلاوژێی زۆرمان رادەکێشی، خۆزگە لەو بارەوە دیراسەیەک دەبووە مایەی هەڵسەنگاندنی ئەو دیاردەیە.

# کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵە

ڕووداوەکانی کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵە لە بەهاری ١٩٨١ دا، یەک جەوال بینەوبەردەی سەر بە گۆبەندی لە هەگبەدا بوو، کەچی نەوشیروان لێرەش وەک پێویست خۆی لە قەرەیان نەداوە. ئەو کۆنفرانسە، وێستگەیەکی سەرەتایی پرۆسەی زیندەبەڕێکردنی هەنگاوی چەپکی چەپک لێکئالاندنی هەموو سەرەداوە ئالۆزکاوەکان بوو. لەو ڕۆژەوە هەمووان بە پراکتیکی بەشداری کاروانی شەقاو بە شەقاوی مەرگی لەسەرخۆی کۆمەڵە بوون. ڕاستە کۆمەڵە لە فۆڕمدا، لەسەر گۆڕەپانی ڕووداوەکانی دوای ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥دا، ناوێکی گەورە بوو، خەون و خۆزگەی هاوڕێ و هاوادارەکانی لە کۆڵەپشت بوو. وەک بانگاشە داڕسانە جیهانێکی نوێی بەرخۆدان بوو. ئەگەر بە ڕووکەشیش بێت، کۆمەڵە وەک ڕێکخراوێکی تازە بابەتی، لەو بارودۆخەی دەسەڵاتدارێتی دێوەزمەی بەعس لە عیراقدا، واتە لە ئاقاری باشووری کوردستاندا هەڵگری پرێسکەی ئێش و ئازارەکانی خەڵکی کورد بوو. بە تایبەت چینە زەحمەتکێش و ڕەشوڕووتەڵەکانی کۆمەڵگای کوردی. بەڵام لە ناوەڕۆکدا، لەسەر ئەرزی واقیعدا، زرە خەونێکی دەست لە بینەقاقادا، بەسەردەستانەوە بۆ ناو چرەدووکەڵی دیرۆکی کوردەواری بە خشکەیی بۆ لەبیرچوونەوە تووڕ درا.

بەکورت و پوخت، کۆنفرانس لە جیاتی ئەوەی خۆی بۆ پێداچوونەوەیەکی هاوشانی ئەو تاکە هەڵسەنگاندنەی کاتی خۆی ئارام بە ناوی ڕاپۆرتی شوباتەوە نووسیبوی، هەنگاوی هەڵگرتایە..! زۆربەی کاتی دانیشتنەکان بە قسە و قسەڵۆکی شەخسی و لە یەکتری لەڕکڕاچوون بەسەرچوو. ئەندامانی کۆنفرانس لەجیاتی گفتوگۆکردن لەسەر بەرنامەی داهاتووی کۆمەڵە، بە دەمەتەقێی یەکتر نەخوێندنەوە، خۆ بە گەورە زانینێکی بێتام خەریک کردبوو.

کۆمەڵە لەو کۆنفراسەوە بە هەڵبژاردنی سەرکردایەتییەکی دەڵەمەی وابەستە بە ئەجندای بیرکردنەوەی ئەوێ ڕۆژێی نەوشیروان ساغ بووەوە. کە ئیتر هەر جۆرە ململانێیەکی نێوان سەرانی کۆمەڵە نەما و تەنیا و تەنیا قسە و نەخشەریگای خودی نەوشیروان لە سێبەری ئەو دەمی مام جەلال بردییەوە و زمانیحاڵ بوو.

## پەیوەندی دەرەکی و سەرەتاتکێکردن

هەر کەسێکی بواری سیاسەتکردن لەناو حیزبی کوردان، بە تایبەت ئەوانەی سەرەداوێکی ئاگاداربوونی بۆ رەخساوە و بەوە ئاشنایە کە بزافی چەکداری حیزبی کوردی لە شاخ. هەمیشە لە پەیوەندییەکی ژێریەژێرەکی بە دامودەزگا سیخورییەکانی رژێمە داگیرکەرەکانی خاکی لەت لەتی کوردستانەوە مامەلەی کردووە.

لە بیرمە جارێکیان ئارام لە دەمی چاکتر بەرخوردکردنی لەگەڵ بزافی چەکداری، ئەوەی بۆ باس کردم، کە بزافی چەکداری کوردی بە هۆی نەبوونی هەر جۆرە خۆئامادەکردنێکی لە پێشینە بۆ ئەو جۆرە خەباتە بارگران و پڕ سەرێشەیە لە لایەک و نەبوونی پشتگیرییەکی بەرفراوان و بەرمەیدانی کۆمەلانی خەڵک _ کە هەمیشە بە موزایەدەیەکی بازارییانە ناوی شۆڕشی لێنراوە_ تاکە رێگای ناچاری لەپێناوی ئیدامەبوونی ئەو تێکۆشانە، دەبی پەنا بۆ پەیداکردنی کۆمەکی هەمەجۆرەی دەرەکیی بیات. بەڵام چ جۆرە پەنا بردنێک..!

نەوشیروان لێرەشەوە زۆر بە قەبەیی ئاوڕی لەو بوارە داوەتەوە و گفتوگۆکردن هەڵدەگری

گێڕانەوەی رووداوەکان بە نیوەناچڵی، ناوەڕۆکی بەسەرهاتە گێڕدراوەکان کرچوکاڵ دەخاتەوە. بۆ نمونە پەیوەندییەکانی ینک لەگەڵ دامودەزگا جۆربەجۆرەکانی دەسەلاتی کۆماری ئیسلامی ئیران، بەرئەنجامی هیچ رێکەوتنی فەرمی، یاخود لە ئەنجامی مەحزەرێکی نووسراو و مۆرکراو نەبووە، تاکو هەردوولایان پێوەی بەند بن.

(هاوینی سالی ١٩٨١ هەلومەرجی کوردستان ئالوزابو. جەیشی عیراق زورتر خەریکی شەری ئیران بو. دەسەلاتی بەسەر زوری دیهاتەکانی کوردستان دا نەما بو. لاوانی کورد بە کومەل لە دەسی سەربازی هەلئەهاتن و، رویان ئەکردە لادیکان. دەیان هەزار سەربازی هەلاتو لە دیهاتەکان دا کو بوبونەوە و، هەر حیزبە هەولی ئەدا زورترین ژمارەیان بە لای خوی دا رابکیشی و، بیانهینیتە ریزی پیشمەرگەکانیەوە. هەر حیزبە بەشی خۆی گەنجی راکیشابو، هیزی چەکداری لی دروست کردبون. جود و جوقد، هیچکامیان کیشەی یەکخستنی میلیشیای حیزبەکانیان چارەسەر نەکردبو. هەر حیزبە

هەولی ئەدا خوی زورترین ژمارەی چەکداری هەبی و، لەو ریگایەشەوە دەس بگری بەسەر مەیدانی کارو چالاکی دا.) ل/٢٠٦

نەوشیروان لێرەدا راشکاوانە باروبۆخێکمانی بۆ تەتەڵە کردووە، کە لە ئەنجامی شەڕی عیراق _ ئێران دا، بار و بارگەی خۆی خستوتەوە، کە بە شێوەیەکی کاتی لەشکری عیراق لە هەندێ ناوچەی باشووری کوردستان و دووڕەدەست، زەبروزەنگی درندانەی خۆی پاشەکشە پێ کردووە و تارادەیەک ئەو ناوچانە کەوتبوونە کەشوهەوایەکی نیمچە ئازادی بەخش..! بەڵام لەوەش دروستتر ئەوەیە کە هێزەکانی رژێمی عیراقی، بە سوپا و جاشە کوردەکانەوە لەچاو هێزی پێشمەرگەی حیزبە چەکبەدەستەکانی شاخ _ کە لەو دۆخەدا زۆرتر خەریکی ململانێی و راوەدوونان و یەکتر لاوازکردن بوون، هەمیشە باڵادەستتر بوون. لە هەر شوێن و هەر کاتێک گەرەکیان بووایە بە بەشداری هێزی ئاسمانی و تۆپبارانکردنەوە ناوچەکەیان کەوماڵ و هێزی پێشمەرگەیان ناچار بە راکردن و مەیدان چۆلکردن و هەندێ قونەشەڕی ئێرە و ئەوێ کردووە. ئەو هێزە چەکدارەی حیزبەکانی شاخ زیاتر شتێکیان بۆ نەدەمایەوە، تەنیا دەبوو لە ناوچەی پەلاماردان دوورکەونەوە و خۆیان بشارنەوە.

نەوشیروان لە نێوان دێڕەکانی لاپەڕەی ٢٠٦_٢٠٧ دا، بە مەبەست یاخود بێ مەبەست، چەندان جار وشەی (هێزیچەکدار) و (میلیشیا) بە کار دەهێنی، لە جیاتی هێزی پێشمەرگە..! ئەو ناوی پێشمەرگە هەنوکەش دەسەڵاتی حوکمڕانەکانی باشووری کوردستان بۆ هێزە چەکدارەکانی بە ناحەق بە کاری دەهێنن. چونکو ئەو هێزە چەکدارە لە شاخەکانیشەوە بە شێوەیەکی حاشاهەڵنەگر لە ئەرکی رەسەنی خۆی لە رزگارکردنی خاکی کوردستان و پارێزگاریکردن لە خەڵکی ستەمدیدەی کورد، لەچاو ئەوەی ئەوەندەی وەک نەوشیروان گوتەنی(هێزی چەکدار و میلیشیا..) بە شەڕی خۆکوژی بێهودەی ناوخۆوە دانەخۆرە و خەریک کراوە، ئەوەندەی بە موزایەدە و خۆبادان و راوڕووت داوەرلوەتەوە، زیاتر بواری سەرخوراندنی بۆ نە خوڵقێنراوە و وەک هێزی پێشمەرگەی بەرەی خەڵک، لە بەرژەوەندی کورد شەڕ بکات و چەکی شانی بۆ داکۆکی لە میللەت لە شان کردبێت. ئەجندای بەشێکی زۆری سەرانی حیزبە چەکبەدەستەکانی شاخ بە دروستی لەگەڵ داخوازی رەوابوونی ناوی پێشمەرگە لە شاخیش نەهاتووتەوە، چ جای ئێستاکە لە سێبەری بەرژەوەندی و قازانجی تایبەتی ئەم و ئەو لە سەرانی حیزب

بێتەوە..! هەروەها نەوشیروان لەو لاپەڕانەدا، بە جورئەتەوە قامکی لەسەر کارە قێزەوەن و ناشیرینەکانی ئەو هێزە چەکدارانەی حیزبەکان لە شاخدا داناوە. کە بێگومان هێزی چەکداری یەکێتی وەک هێزی سەرەکی مەیدانەکە، ئەگەر بەشی شێری لەو کارە چەپەڵانە بەر نەکەوتوبیت، ئەوە لە هێزی چەکداری حیزبەکانی دیکە کەمتری نەکردووە. هەر بۆ بەڵگەی ئەو قسانەم خودی نەوشیروان نووسیویەتی:

(چەکداری حیزبەکان، بە ئارەزووی خویان و بی هیچ لیپرسینەوەیەک، خەلکیان ئەگرت و ئەکوشت و بەرئەدا، پارەیان ئەسەند و، پارەتییان کۆ ئەکردەوە، سەرانەیان وەرئەگرت. بیگاریان بە دانیشتوانی دیهاتەکان ئەکرد و، زورجار لێیان ئەدان و سووکایەتییان پی ئەکردن. دانیشتوانی دیهات خەریک بو پیشمەرگەیان لە بەرچاو ئەکەوت و، لە شورش ئەبیزران. سەرکردایەتی هیچ لایەکیشیان مشوری چاکردنی ئەم بەرەڵلایی و بی سەروبەرییەی نە ئەخوارد و، چاوپوشی لە خراپەکانی چەکدارەکانی ئەکرد.) ل/ ٢٠٦

بێگومان قسەکان نەخشی سەر بەردن، بەبێ ئەوەی خۆی بکاتە خاوەنی ئەوەی کە ئەو هێزە نارێکە لە بەرگی پێشمەرگەدا، بەرهەمی ئەجندای برۆ بدە بەرێی سەرانی ئەو حیزبانەی شاخ بووە یاخود نا. چونکو ئەوان سەرکردەی ئەو حیزبانەی شاخ نەوەک هەر چاوپۆشییان لە کارێ قێزەوەنی بەشێکی دیاری بە تایبەت بەرپرسە عەسکەرییەکان و کادرە دەستڕۆیشتووەکان کردووە. بگرە بەبێ سێ و دووکردن تا بۆیان مەیسەر بووە، بۆ خاتری ملکەچی ئەو توخمانەی ناو ئە هێزە بۆ سەرانی دیاریکراوی حیزب، دەستیان لە پشت دراوە و بە پلە و پایە و دەستکەوتی ئێرە و ئەوێ، گوژمە چەک و پارە و هەتا پەیوەندی نهێنییان بە دامودەزگا سیخورییەکانی ڕژێم تێر کراون و دەستیان لە پشت دراوە و نەوەک هەر لە هەر جۆرە لێپێچینەوەیەک و بەدواداچوونێک بێمنەت کراون، بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە چەپەڵانەیان خاترجەم کراون، بەڵکو لە شاخەوە ئەو توخمانەی فێری هەموو جۆرە گەندەڵییەک کراون و ئەوەی ئەمڕۆ دەبینرێت، بەزۆری لەلایەن سەرانی حیزبی شاخەوە ئاوەکەی ڕژێنراوە و هەنوکە بە بێزراوی پەرەیان بەو کاسبییە ناشیرینەی سەر قوتی خەڵک داوە.

(بریارمان دا لە ئاواییەکانی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی شۆرش دا خەلک هان بدەین بە هەلبژاردنی ئازاد، چەند کەسی لەخویان بۆ _ ئەنجومەنی ئاوایی_ هەلبژێرن ..) ل/٢٠٦

ئەو دەمە بەندەش لەو شاخانەدا یەکێک بووم لەوانەی دلم خۆش بوو بە ئەزموونی دامەزراندنی ئەنجومەن لە گوندەکان و بە هاوکاری هاوڕێیانی کۆمەڵە لە ناوچەکانی هەولێردا، بە هەوڵ و تێکۆشانی بێوچان، لێرە و لەوێ بە شێوەیەکی یەک لایەنی نیوەچڵ ئەنجومەن پێک هێنراوە. بەلام لەسەر ئەرزی واقیعدا شتێکی ئەوتۆی بەرچاوی لێ نەکەوتەوە و تەمەنی درێژ نەبوو. چونکو ئەو ئەزمونە بۆ تێڕوانین و پراکتیکی مەسولە عەسکەرییەکانی هەتا خودی هێزی یەکێتی، شتێکی ناخوازراو و مایەی پەسندکردن نەبوو. ئەوجا لە مەیدانی بوونی فرە حیزبی چەکداری نەیار بە یەکتری، کە هەر یەکە زۆرتر لە خەمی خۆسەپاندنی بە تۆپزی و کۆنترۆلکردنی مەیدانەکە و پاوانخوازی قازانجە تایبەتییەکانیان بوون. نەوەک لەدایکبوونی ئەزمونێکی بەمانای وشەی ئازاد و دیموکرات لە پێکهاتەی خەلکی گوند دابهێنرێت..!

هەبوونی فرە لەشکری چەکداری ئەو حیزبانە، هەمیشە لەمپەری بنەرەتی و هۆکاری زەقی سەرنەکەوتنی ئەو جۆرە ئەزموونە بووە، چونکو هەر بەنموونە، ئەگەر دەسەلاتی یەکێتی لە گوندێکی بەر شمری خۆیدا، ئەنجومەنێکی خوازراوی مەبەستی خۆی بریار لێ دابێت، ئەوە بۆ شەوەکەی چەکداری حیزبێکی دیکەی شاخ، ئەو ئەنجومەنەیان نەوەک هەر هەلوەشاندوتەوە، بگرە هەر ئەندامێکی ئەنجومەنەکەیان بەردەست کەوتبێت، بە شێوەیەکی دوژمنانە دارکارییان کردووە و سزای قورسیان داوە.

## شەڕی بێهودەی حیزبە چەکبەدەستەکانی شاخ

کتێبی _ پەنجەکان یەکتری دەشکێنن _ و چاپکردنی بۆ دەیان سالان زیتر بەدوای ڕووداوەکانی چیراوکەی شەڕی خۆکوژی بێهودەی ناوخۆی شاخەکان دەگەڕێتەوە. ئەوەی لاپەڕەکانی ٢٠٧ _ ٢٣٢ بە وردی بخوێننەوە، بەبێ هیچ بیانویەک، موچرک پێداهاتنەوەی جەستەی دەیهەژێنی، کە نەوشیروان بە شێوەیەکی ترایبژیاوی ئەو کارەساتانە، بەپێی خەملاندنە یەکلایەنەکانی خۆی شەنوکەو دەکات. بەندەش ئەو دەم

لە شاخ بووم و لە ناو بۆنسۆی سووتانەکانی جەستەی کەسایەتی کورد بە چاک و خراپ تلاومەتەوە.

بێگومان سەرجەمی نووسینەکانی ئەو کتێبە بە گشتی و نووسینەکانی ئەو بوارە بە تایبەتی، لە نزیکەوە خوێندنەوەی کەسایەتی نەوشیروان راڤە دەکات، کە بە هەناسەیەک نووسراوە، هەروەک ئەوەی ناوبراو هەنوکەش لە بەرەکانی ئەو شەڕانەدا بێت. بۆ بەڵگەش لە تاکە یەک دەستەواژەی ئەو لاپەڕانەدا، بۆ یەکجاریش هەست بە دروست نەخوێندنەوە و پەشیوانی لە بە فیڕۆدانی خوێنی رۆڵەکانی خەڵکی کورد هەتا لەناو کەلێنی پەیڤەکان جێی نەبوەتەوە.

لێرەدا بەو سەرەتایە بۆ ناو ئەو باسوخواسە مەرگەساتە شۆڕدەبمەوە. کە ئۆباڵی قەومان و درێژەدانی ئەو خۆخۆرییەی کە دیسانەوە لەسەر جەستەی خەڵکی کورد و لەسەر دەستی سەرانی حیزبە چەکبەدەستەکانی شاخی وێنەی نەوشیروان دەسرازەی بەستووە. بەبێ ئەوەی ئۆباڵەکەی تەنیا بۆ هێزی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بگەڕێتەوە. بەڵکو هەموو ئەو حیزبە چەکدارانەی شاخ لەو گونگەرەیە پشکی خۆیان هەبووە و هەر یەکە و بە پێی هێز و دەسترۆیشتوویی خۆیەوە، بە جیاوازی زەمەنەکانەوە ئەسپی قۆشمەی خۆی تاو داوە و مەسولیەتی لە ئەستۆ بووە. بۆیە نووسینەوەی ئەو کارەساتەی شەڕی کوردکوژی و بەدواداچوونی، لە گۆشەنیگای دیدەنی بەسەرهاتەکان، بۆ بەرچاوی نەوەی نوێ ئەرکێکی مێژوویی گرنگە. چونکو لە ئەنجامدا، گوررزیکی جەرگبڕ بەر رەوتی مەبەستی خولانەوەی بزاڤی چەکداری بۆ خزمەتنەکردن و شۆڕشنەکردن بۆ خەڵکی کورد لێ چۆڕاوەتەوە. بە جۆرێک لەو شاخانەوە ئاوێکی لێخن و شێلو رێچکەی پێ هەڵگیراوە. کە هەنوکەش تارماییەکانی کاڵ نەبوەتەوە. دەڵێم لەبیرنەکردنی ئەو خامۆشییە پڕ کوێرەوەرییە چەند سەرەیە و نووسینەوەیان بە هەر شێوەیەک بێت. دەبێتە تروسکایی بۆ رۆشنکردنەوەی رۆژە تاریکەکانی کاروانەکە لە رابردوودا و دیتنی بەر ئەنجامەکانی لە ئێستادا بە پراکتیکی دەبینرێ. نەوشیروان دەستپێکی باسەکەی بەو رستەیە هاتوتە ناوەوە و وەک نەقشی سەر بەرد نووسیویەتی: (هاوزەمان لەگەل گرژبونی پەیوەندی ئێران _ یەکێتی دا، تا ئەهات گرژی و ئالوزان لە پیوەندی نیوان چەکدارەکانی جود_ یەکێتی دا لە سەرانسەری کوردستان دا زیادی ئەکرد ..) ل/ ٢٠٧

جارێ لە بەرابیدا، ئەو _ یەکەمین شەڕی _ دەستەواژەی نەوشیروان تەنیا بۆ مەبەستی شەڕی نێوان هێزەکانی یەکێتی و بەرەی جود لەسەرپێیان دەوەستێ. دەنا لەراستیدا هەر لەگەڵ یەکەم چەخماخەی یەکەم فیشەکی تەقێنراوی (شۆڕشی نوێ) ی یەکێتی نیشتمانیدا بۆ جاڕدانی بزاڤی چەکداری شاخەکان و شەڕی ناوخۆی کوردکوژی سەرلەنوێ و لەپێشەوە لەنێوان هێزەکانی قیادەی مووەقەتەی پارتی و هێزەکانی یەکێتی لە شاخەکاندا هەڵگیرسێندراوەتەوە. هەتا هەنوکەش بە شێوەی جۆربەجۆری تر لەناو شارەکانیش بەردەوامی هەیە و کۆتایی نەهاتووە. سەیرەکە لێرەدا ئەوەیە کە بەردەوام و بە زۆری رۆڵەکانی خەڵکی کورد سووتەمەنی ئەو خوێن بە فیڕۆدانە بوونە. سەرانی ئەو حیزبە شەڕهەڵگیرسێنەرانە لە بەیەکەوە دانیشتن بەناوی ئاشتییش بە هەزارویەک موزایەدەی هێلکەی رەنگاوڕەنگ بە خەڵکیان فرۆشتوتەوە لەوەی کەی گەرەکیان بووە شەڕی یەکتریان کردووە و کەینێش خواستبێتیان بە شەقی زەمانە ئاشتییان بڕیار لێ داوە و وەک گوتومە خۆیان سەرسەلامەت هاتونەتەوە..

نەوشیروان لە دەستتێوەردانی دەزگا سیخورییەکانی رژێمە داگیرکەرەکانی خاکی کوردان، هەر بەو رستەیەی سەرەوە دەستی هەڵگرتووە و هۆکاری ئەو شەڕانە بەم جۆرە شەنوکەو دەکات..

(لەو ماوەیەدا زیاتر لە ١٠ جار پیکادانی خویناوی بچوک و گەورە لە نیوان لایەنەکانی جود و، هیزەکانی یەکیتی دا روی دابو. زوریشی لەسەر چەک فراندن لە ناو یەکیتییەوە بۆ لای ئەوان و بە پیچەوانەوە، پارە وەرگرتن، رەفتار لەگەل ئەنجومەنی ئاوایی، خەلک گرتن، بە واتایەکی تر حوکمرانی ناوچەکان. لەناو ئەو روداوانە دا هەندیکیان مەترسی داربون..) ل/ ٢٠٧_ ٢٠٨

ئەمانەی سەرەوە وەک بەشیک و تەنیا هۆکاری ناوەکی بەرپابوونی ئەو شەڕە نەخوازراوەی بۆ خەڵکی کورد لە شاخەکان مایەی نیگەرانی بوون. بێگومان هۆکاری سەرەکی ئەو شەڕانە لە بنوبۆتکەوە، ئەجندای سەرانی ئەو حیزبە چەکبەدەستانەی شاخ بووە. کە هەر لە نووکەوە ئەوەندەی لە خەمی شمڕی دەسەڵاتی خۆیان بوون و تەنیا بۆ ترشخۆشکردنی بانگاشەکانیان، باسی بەرژەوەندی کورد و کوردستانیان وەک بنیشتە خۆشە بەسەر زماندا هاتووە. نووسەر کەمونزۆر خۆی لە قەرە نەداوە، چونکو ئەو دارسانە یەکتری و وردە گیروگرفتانەی گیراویتییەوە لە پەراوێزی بزاڤی چەکداری شتێکی

نائاسایی نەبووە و نییە. هەتا لەناو یەک لەشکری چەکداری یەکڕەنگە، ئەوجا ج جای لەناو فرە لەشکری، فرە سەرکردەی هەمەرەنگدا. ئەو دیاردانە بۆ ناوەڕۆکی جۆری ئەو میلشیا حیزبی و دەستەگەرییە چەکدارانە گەراوەتەوە.

لێرەدا جێی خۆیەتی باسەکە بۆ ئەو باکگروندەی کەشوهەوای ئەو پاشەگەردانیەی بزاڤی چەکداری شاخەکانی خەڵکی کورد و بۆ قسەکردن لەسەر دۆزی گشتی زەمینە و گوفەکدانەکەی بگێڕمەوە

کەلەپووری دەسەلات و دەوڵەتداری بەر ئاوێری خەلافەتی ئیسلامی هەر لەسەرهەڵدانییەوە بگرە تا دەگاتە ئەمڕۆ، هەموو کەلتورەکەی بێجگە لە کوشتن و فەرهود و تالان بە ناوی دژایەتی کفر و کافرستانی، ئاورینگ لە غەدر و دەسیسەی زۆرداری بەرنوکی شمشێر و جەهالەت چ جۆرە شارستانییەت و ئاشتی و پێکەوە هەڵکردن، تەبابوونی بۆ جیاوازییەکانی ئایین و بیرکردنەوەی جودای سەرمایەیە..! بە جۆرێک ئەو هەستی رەهایی مەغروری خۆ بە زلزانینە، لەناو دەروونی عەقلی پاوانخوازی مرۆڤی ئیسلامی قەتماخەی گرتووە. ئەگەر ئیسلام لەپاڵ گەشەکردنی دوور لە توندوتیژی، ئازادی بە مانەوە و پێکەوەژیانی ئایینزایەکانی دیکەی لە ناوچەکە لە دید و هزر هەبوایە. هەر جۆرە پردانە سەروەرییەکی ئینسانی لە قاو بدایە و گیانی لێبوردن و خۆشەویستی دوور لە موزایەدەی سوژدەبردنی بکردایە زمانیحاڵ، دینەکە بە گشتی دینی خەڵک بووایە، نەوەکُ بە راشکاوی دینی دەسەلاتدار و زەنگین و زۆردار بە پلەی یەکەم، بێگومان مرۆڤایەتی لەو ناوچەیەش لە شانی ئەوروپا و دنیای شارستانی، ئەگەر قۆشمەشی نەکردایە، ئەوە هیچی لەوان کەمتر نە دەبوو..

ئەوجا لە وڵاتێکی سەرتڕەکەڵەکی وەک عیراقدا..! عیراقێکی دەستکرد هەرکە حیزبی بەعس دەسەلاتی ئەجندای فەرهەنگی غەدر و کوشتنی گرتوتە دەست، و زاڵبوونی رەوتی سەدام حسین لە زۆرانبازییە ئاساییەکەی کەلتوری دەوڵەتداری ئیسلامی عەرەبی. ئەوە ئیتر رێباز و جۆرە سیستەمێکی حوکمڕانی تاکڕەوی، تاک حیزبی، تاک بنەماڵەیی، تاکە سەرکردەی ترۆپکی دەسەلات، بووەتە ناوەخنی بەرێوەبردن لەو وڵاتەدا.

ئەو ئەزموونە تفتوتاڵە، لەگەڵ گاگۆڵەکردنییەوە وەک ئاگر بەربێتە پوش، کاردانەوەیەکی بەرجەستەیی بەرهەمهێنانی داهێنانی سیستەمێکی ئۆرگانیکی

لاساییکەرەوەی دەوڵەتداری خەلافەتی ئیسلامی خوێناوی بووە و بە شێوەیەکی بەرنامەیی مێشکی مرۆڤەکانی پێ پڕکراوە. بە جۆرێک سیستەمی کەڵەگاسالاریی بووەتە مۆدیلێکی نوێی ئەوتۆ، هەموو حیزب و گروپە رێکخراوەییەکانی ئەو خاکە سووتماکە، کوێرانە سەمای لەبەردەکەن و بە درێژایی ئەو مێژووە خوێناوییەی ناوچەکە و عیراق، حیزبی جۆراوجۆر کەواسووری بەر لەشکری بەعس شایی و لۆغانیان بووە.

پاشان دروستکردنی دەستکردانەی حیزب و گروپی سیاسەتچی کوردی، لە بەر ئاوێنەی شکاوی تەوژمی چاولێکەری ئێرە و ئەوێی دەوروبەری عیراق لە لایەک و خۆ هەڵواسین بە فەلسەفەی برایەتی ناوەڕۆک پوچی برایەتی کورد و عەرەب لە لایەکی دیکەوە. زەمینەیەکی رەخساوی بۆ ئەو توخمە مەکرۆیانەی گۆڕەپانی پاشەگەردانی کوردایەتی دەستەبەر کردووە و چیرۆکەی دەسرازەی رەنگاورەنگی حیزبی کوردی، بە نائاسایی و ناسروشتی کنەی کردوتە ناو کەمایەتی کۆمەڵی کوردی و هەمیشە زۆرینەی خەڵک لە دەرەوەی ئەو حیزبانە ماونەتەوە. لەو پێناوەدا کەسانێک سەریان لەو جۆرە راوکە ناسروشتییە دەرهێناوە و بە پێی ئارەزووی کەسییان، بەو زانیاری و خوێندەوارییەی لە بەرۆکیان بووە، سواری کەلەکی رەوتی ئەو رووبارە بوونە و بە هەر جۆرێک لە سەوڵلێدان بەرەو کەناری دەسەڵاتی خوازراوی لەو جۆرە درێخییان نەکردووە.

بە رەنگێک لە ئەزمونی حیزب و سەرانی حیزبی کوردی، ئەوەندەی بەخەنیخۆشی تامەزرۆ و وابەستە بە عیراقی بوونەوە، هەتا دروشمی دیموکراتییان کردوتە کراسەکەی وەسمان و لەبەر داخوازی رەوای خەڵکی کوردییان کردووە. برابچوکی کوردیان بۆ عارەب لەو وڵاتە بە میرات بەخشیوەتەوە و لەو رێگایەوە لە هەزمکردنی هەر کاردانەوەیەکی خراپی رەوشت و ئاکارە درێوە زاڵەکانی دەسەڵات لە بەغداد نەسڵەمینەتەوە. بەردەوام زیندەخەونیان بە پیادەکردنی تشتە ناشیرینەکان دیتوە.

بەڵگە و نیشانەی هەرە زەقیش لە جۆری حوکمڕانی ئەو نزیکەی سی ساڵەی بەشێکی زۆری باشورە، کە لەپاڵ دەوڵەتدارییەکی خراپی لاساییکەرەوە، دیاردەی چاوچنۆکی خۆ بە دەسەڵات و پارە و زەنگینبوونی ناسروشتی وەنوساندوە. وەک ئەوەی بە میرات بۆیان مابێتەوە و مارەیی بوکی مارە براویان بێت.

رواژی قێزەوەنی کوردکوژی ناوخۆی شاخەکان، لە نێوان ئەو حیزب و گروپە چەکبەدەستانەوە، دروست بووەتە پەڵە هەورێکی چڵکنی ئاسمانی سەر کوردستان و خەریکە بە شێوەیەکی لەسەرەخۆ خۆشیانی تێدا دەخنکێ.

بۆیە نەوشیروان کارێکی جوامێرانەی تۆمار کردووە لە نووسینەوەی سەربردەی مەرگەساتی شاخەکان، وێنەگەلێکی ریالیستانەی بۆ نەوەکانی هەنوکە و داهاتوو بەپێی بیرکردنەوەی خۆی پیشانداوە.

## سەودا و سەوداکردن .. و نەکردن

(هێزەکانی ئێمە یەکێک بو لەو هێزانەی ئەبوایە لە هەمو لایەک زیاتر سود لە ناکۆکی ئێران _ عیراق و جەنگەکەی بەینیان وەربگری، بە تایبەتی چونکە لە چاو هێزەکانی تردا، ئەم گەورەترین هێزی شەرکەر بو دژی عیراق لە سەر ئەرزی کوردستان. جگە لەمەش هێزو رێکخراوەکانی ئێمە و جەماوەری خەلک.. لە ماوەی چەن سال شەری نابەرامبەر و خەباتی سەخت و دژواردا ئازارێکی زۆریان لەدەس حکومەتی عیراق و دەزگا دامرکینەرەکانی و هێزە داگیرکەرەکانی چیشت بو، کە لە هی ئەوانیتر زۆرتر بو. ئەمەش هەمو جۆرە هەولدان و هاوکاریەکی حەلال ئەکرد دژی رژیمی عیراق بۆ _ هەق _ لی کردنەوە و _ هەق _ لی سەندنی،. لە مانەش هەموی گرنگتر... ئەو کاتە چەندین بەرژەوەندی و قازانجی گرنگ و کاریگەری لە ناو ئێران و لەبەر دەسەلاتی ئێرانیەکان دا بو، بە تایبەتی وەجبەیەکی گەورەی چەک، لە ولاتیکی دۆستەوە، ینک لەسەر پەیمان و بەلینی ئێرانیەکان، گواستبویەوە ناو ئێران بۆ ئەوەی لەویوە بیگەیەنیتە کوردستانی عیراق.. لە گەل ئەمانەش دا هەمو، ئێمە ئامادە نەبوین لەو هەلومەرجەدا بە پیچەوانەی هەلسەنگاندن و بۆچونەکانی خۆمانەوە هەلپەرستانە بجولیینەوە، یان هیچ مەرجیکی ئێرانیەکان قوبول بکەین کە لە گەل سەرەتاکانی خۆمان یا قازانج و دەستکەوتە بنچینەییەکانی نەتەوەی کوردا نەگونجێ.

هەر لەم روانگەیەوە هەم _ عەرزی _ ی ئێرانی و مەرجەکانی ئەوانمان دایەوە دواوە و پشتیوانیمان لە حکومەتی ئێران نەکرد، بەو جۆرەی ئەوان ئەیانویست، لەو شەرەدا دژی عیراق. هەم _ عەرزی _ عیراقی و مەرجەکانی ئەوانیشمان رەت کردەوە و

پشتیوانیمان لە حکومەتی عیراق نەکرد، بەو جۆرەی ئەوان ئەیانویست لەو شەڕەدا دژی ئیران. بەلکو لامان وابو کە ئەبی ئەو هەلە میژووییە بقۆزرێتەوە و شەڕ توند بکری، نەک لە گیژاوی مساومەی سووک و پروپوچ و کاتی دا لە گەل دەولەتی ئیران یان لەگەل دەولەتی عیراق دا بزر بکری و لە دەس بدری و، گەلی کورد بهاویژریتە داوی فروفیلی تاکتیکی یەکیکیانەوە و لە ئەنجام دا ببیتە قوربانیەکی سەربڕاوی ریکەوتنەکەی ئەوان. وە ئەگەر مساومەش هەر پیویست بی، ئەوا ئەبی لەگەل هیزە ناکۆک و جیاوازەکانی کوردا بکری نەک لەگەل داگیرکەرانی کوردستان.) ل/٢٥٠

سەرلەبەری ئەو قسانە بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرن لەوەی ئەو هێزە (گەورە) یەی ینک، بۆ سوودی زیاتری لە شەڕی هەشت ساڵەی عیراق _ ئیران وەرنەگرتووە! دەبوو راشکاوانە تیشکی بخستایەتە سەر و بۆ مەزەندە بەدارێی وەنەکردایە.

بەکورت و کرمانجی سەرانی ئەو حیزب و گروپە چەکبەدەستانەی شاخ، چونکێکە هەموو پلان و بەرنامەیەکیان بە زۆری هەڵگرتەی رۆژ و دەموسەعاتی مزێجی سەرگەڤانی دەسترۆیشتو بووە. ئەوەش بە ناوی سیاسەتی ستراتیژ و تاکتیک لە بەرنامە و پرۆگرامی کۆنفرانس و کۆنگرەیاندا بە چەپڵەڕێزان، هەر بۆ رشتنی مەرەکەبی سەرکاغەز نووسراوەتەوە.

هەر بۆ بەڵگەش ئەوشیروان بە پێچەوانەی ئەو رستەیەی کە لەو پەرەگرافەی سەرەوە نووسیویەتی: (ئەگەر مساومەش هەر پیویست بی، ئەوا ئەبی لەگەل هیزە ناکۆک و جیاوازەکانی کوردا بکری نەک لەگەل داگیرکەرانی کوردستان.) ل/٢٥٠

ئەوەی من لە شاخ دیتم، یەک بە یەکی ئەو هێز و حیزبانە، هەر یەکەیان بەپێی قورسایی خۆیەوە لە سەوداکردن لەگەڵ رژێمەکانی داگیرکەری کوردستان بەردەوام لەسەر پێ بوونە. بەڵام هەتا لە موساوەمە کە ئەوشیروان بە هەڵە لە شانی ئەوەی لەگەڵ دوژمنان وەک یەک بۆ هێزە کوردییەکانیشی بە کار هێناوە. چونکو لەگەڵ هێزە کوردییەکان نەوەک هەر سەوداکردن نییە، بگرە قوچەکی راست و دروستی هەموو هێزێکی کوردی خۆی لە هاوکاری و گونجان و پێکەوەهەڵکردنی نێوانیان و لە هەموو ئان و ساتێک بەردی بناغەیە.. ئەوجا دروست بە دژی قسەکانی خۆی ئەوشیروان بەو قورساییەی هێزەکانی ینک لە شاخ، دەبوو لەگەڵ داگیرکەران سەودای نەکردایە و کردی. گەرەک بوو لەگەڵ هێزە کوردییەکان موساوەمەی بکردایە و نەیکرد. لەوەش خراپتر لە

دەمی سەوداکردن لەگەڵ داگیرکەران لێرە و لەوێ، بە ئاگر و ئاسن لە تەفروتوناکردنی هێزە کوردییە نەیارەکانی خۆیان درێخییان لە شەڕی خۆکوژی نەکردووە.

دواتر نەوشیروان قامک لەسەر خامۆشییەکی دیکەی بەر شمڕی سەرانی حیزبە چەکبەدەستەکانی شاخ دەگێڕتەوە و نووسیویەتی..

(خۆپەرستی لە ناو سەرانی ڕێکخراوە کوردییەکان دا زۆر قول بو. زۆریان ئەوەیان پی گەورەتر و خۆشتر بو، کە سەرکردەی حیزبیکی ١٠ کەسی بی، نەک ئەندامی سەرکردایەتی یەکگرتوی جولانەوەیەکی ١٠ هەزار کەسی. بۆ پاساودانی ئەمەش زۆرجار (( تەنگ و چەلەمەی باوەر )) یان ئەکرد بە بیانوی یەک نەگرتن و یەک نەخستنی داوودەزگاکانی جولانەوەکە. تەنگ و چەلەمەی بی باوەرییان ئەوەندە قول کردبو.. ل/٢٥٥

بەڵام لە باسکردنی هۆکاری ئەو بارودۆخە خۆی دەدزتەوە و دێتە سەر باسوخواسێکی دیکەی پەراوێزی ڕووداوەکان و دەڵێ..

(حەمەی حەمە باقی کە هاتبوە شاخ، هەولی ئەدا بەهاوکاری لەگەل نوسەرانی کە دابەش بوبوون بەسەر لایەنەکانی جودا، یەکیتی نوسەرانی گەشە پی بدا..) ل/٢٥٢

دواتر نووسیویەتی..(کە هاتەوە بیری دامەزراندنی یەکیتی نوسەرانی لە لا گەلالە بوبو بەتایبەت بەعس بریاری هەلوەشاندنەوەی یەکیتی نوسەرانی کوردی دابو) ل/٢٥١

پاشان دەڵێ: (هەندی لە نوسەرەکان چەند کۆبونەوەکیان کرد و، بە هاو دەنگی لەگەل ژمارەیەکی زۆر لە نوسەرانی شار، یەکیتی نوسەرانی کوردستان یان پیک هیناو گۆڤاری نوسەری کوردستان _ یان بلاوکردەوە.) ل/٢٥٢

نیشانەیەکی دیاری چەوتی ئەو گێڕانەوانە بریتییە لەوەی کە یەکەم گۆڤاری بڵاوکراوەی یەکێتی نووسەرانی کوردستان لە شاخ، بەر لە گۆڤاری نووسەری کوردستان، گۆڤاری _ پێڕو_ بوو، بەکر خۆشناو سەرنووسەری بوو. یەکەم ژمارەشی لێ بڵاو کرایەوە و بەدوای وازهێنانی بەکر خۆشناو، ناوی گۆڤارەکە لەلایەن دەستەی نوێی بەڕێوەبەری گۆڤارەکە بۆ نووسەری کوردستان گۆڕا و بۆ زانیاری هەموو لایەک لە ژمارەی یەکەمی گۆڤاری پێڕو _ش، بەرهەمی ناوشاری کەسانی وەک شێرکۆ بێکەسی تێدا بڵاو کرابوەوە.

لەو دوو پەرەگرافەش لە باسکردنی حەمەی حەمەباقی دا، جارێک دەڵێ: حەمە هەوڵی دا، یەکێتی نووسەران لە شاخ گەشە پێ بکات، لە لایەکی دیکەوە دەنووسێ: دواتر کە حەمە لە جەولەکەی گەڕاوەتەوە، بیری دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی لە لا گەڵاڵە ببوو... ! دیارە بە تێپەڕبوونی ئەو هەموو ساڵە و بە سەرەوەچوونی تەمەن، نەوشیروان شتەکانی بە تێکەڵکردن گێڕاوەتەوە و بە بیر هەموو لایەنەکی دەهێنمەوە کە یەکێتی نووسەرانی کوردستانی شاخ، بەر لە هاتنە دەرەوەی حەمەی حەمە باقی دروست ببوو. حەمە هیچ سەروسەکوتێکی لەگەڵ لەدایکبوونی نووسەرانی شاخ نەبوو.

بۆ بەڵگەش ئەو بەیانییەم لە بیر نەچووەتەوە کە نەوشیروان بەدوایدا ناردم لە هاوینی ساڵی ١٩٨١ دا. کە من ئەو دەمی بۆ هاوکاری برادەرانی ئێزگە و ئیعلامی یەکێتی شوێنی حەوانەوەم لەناو خێمەیەکی ئەو دەوروبەری بوو. بەدواداناردنەکەی نەوشیروان بەو ناوە بوو، کە برادەرێکی نووسەر لە شار هاتووە و من بچم بۆ لای خۆمانی بهێنم. ئەوەبوو کە چوومە ئەوێ، ئەو برادەرە حەمەی حەمە باقی بوو. نەوشیروان جیای کردمەوە و رایسپاردم کە لەگەڵ خۆم بۆ بنکەکانی ئیعلام و ئێزگەی ببەم. تاکو لە لامان نیشتەجێ بێت. ئەوە بوو خۆم لەسەر چوونە ناوچەکانی خوارەوە بووم. هەموو ئەو کەلوپەلانەی هەمبوو لەگەڵ خێمەکە لە قەبەری کرد.

## خەڵک و راپەرین و گوێپێدانی حیزبە شەڕکەرەکان

(لایەنەکانی جود، بە تایبەت حشع، لە رادیوکەیان دا داوایان لە خەلک ئەکرد، تا روخاندنی رژیم بەردەوام بن. بەلام خەلک بایەخیکیان بە قسەکانی ئەوان نەئەدا

لەو کاتەدا بارودۆخی عیراق لە مەیدانی جەنگ دا باش نەبو. تەرازوی شەر بەقازانجی ئیران داشکابو. عیراق بۆ دامرکاندنەوەی ئەم نارەزاییە هەندی لەو داوایانەی جی بەجی کرد.

ئیتر ئیمەش هەم ئامۆژگاری ریکخراوە نهینییەکانمان کرد بە شینەیی کۆتایی پی بهینن و ، لە رادیوکەشمان زمانی هاندانمان گۆری ..) ل/ ٢٥٧_ ٢٥٨

ئەو دەمەی نەوشیروان مەبەستییەتی، موفاوەزاتەکەی ینک لەگەڵ رژێمی بەعس لە ئان و ساتدا بوو. رۆژانێک پڕ جۆش و خرۆشی جموجۆڵی جەماوەرییانەی توخمی بە تایبەت خوێندکاران بوو. ئەو رۆژانە بەندە یەکێک لەو کەسە هەرە سەرەکییانەی

نووسینی ئەو بەرنامانەی ئێزگەکەی یەکێتی بووم لە ماندان و برەوپێدانی خۆپیشاندان و رووبەڕووبوونەوەی دەسەڵاتی بەعسییەکان لە شارەکانی کوردستاندا هەواڵی گەرم و گوڕ بوو. بەتایبەت ڕۆژانێک بوو، راستە دەنگۆی وێران و خاپورکردنی شاری قەڵادزێ، هەڵکردنی مومی چەخماخەی رووداوەکان بوو. بەڵام فشاری دامودەزگا زۆر و زەبەندە چەوسێنەرەکانی رژێم، بێزاری و وەڕسبوونی خەڵکێکی بێشومار، مایەی تەقینەوەیەکی خۆڕسکانەیان خولقاند بوو. بێگومان رێکخراوە نهێنییەکانی ناو شاری کۆمەڵە، لە شانی رێکخراوی نهێنی حیزبەکانی دیکەی شاخ، لەناو شارەکاندا کەموزۆر تێکەڵی ئەو رووداوانە ببوون و دنەیان دەدا، بۆ ئەوەی خەڵک لێرە و لەوێ لە دەوریان گردبێتەوە.

لەو ئان و ساتەی پەرەسەندنی نارەزایەتییەکانی خەڵک، کە نەوشیروان بەبێ خۆلێدزینەوەی نووسیویەتی ئەوان، سەرانی کۆمەڵە و یەکێتی رێکخراوەکانی خۆیان لەناو شارەکان ئاگادار کردووتەوە کە دەست لەو کارە هەڵگرن و دۆخەکە هێمن بکەنەوە. _ بەبێ ئەوەی نەوشیروان ناوی بهێنی _لەپێناوی ئەوەی یەکێتی بتوانی بەعس بۆ موفاوەزاتکردن رازی بکات. چونکو هەمیشە حیزبە کوردییەکانی شاخ بەبێ رەچاوکردنی هەر بارودۆخێک و هەردەم بۆ چوونە شایی موفاوەزات لەسەر پێ بوونە، ئەگەر رژێم سووکە تیچاوەکی بۆیان داگرتبی، ئەوە حیزبەکانی کوردۆلۆژی بە قوشمە وەریانگرتوتەوە و بۆی شاگەشکە بوون.

## کۆنفراسی دووەمی کۆمەڵە

ئەگەر خوێنەر جارێکی تر لاپەڕەی ٢٦٣ بخوێنێتەوە، دەبینی نەوشیروان لە شەش رستە و دوو نیوە رستەدا، سەبارەت بەو رووداوە گرنگە زێتری نەنووسیوە..!

من لە جێگای دیکەی زنجیرەی دووەم لە هەواری یادەوەرییەکانمدا، سەبارەت بەو کۆنفراسەی کۆمەڵە هەندێ قسەم کردووە و هەر ئەوە ماوە بڵێم

بەکورتی کۆنفرانسی دوومی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، لە رووی ساغبوونەوەی بە یەکجارەکی بۆ بەرشمڕی جلیتکردنی بەرەو حیزبی سەرتاسەری، ئەجنداکانی بیرکردنەوەی بەرمەیدانی بۆ ئەو مەبەستە، قۆناغی دووەم و پێشکۆتایی خۆی بڕی و توخمە خۆ بە مارکسی زان و هەوادارانی بیرکردنەوەکانی ئارام،

سەرەتاتکێکردن بۆ ململانێی فیکری و بەشیکی بەرچاوی کادرە سیاسییەکان پەراوێزکران. لەو کۆنفراسەدا کۆمەڵە لە هەر جۆرە ئایدیالۆژیایەکی فیکری داماڵەخاس کرا، توخمە سەریازییەکانی ناو هێزی پێشمەرگەی یەکێتی بوونە دەنگی بڕیاردەر و دەستڕۆیشتوی یەکجارەکی مەیدان

## دیاردەی جەبهە و شەڕی خۆکوژی..

(سوریا ولیبیا هەولیکی زۆریان دا بۆ کۆ کردنەوەی موعارەزەی عیراقی. جەنگی عیراق _ ئیران هیوای لای هەموان دروست کرد بو کە ئەم شەرە سەری سەدام بخوات...

رۆژی ٦ شوباتی ٨٣ لە تەرابلوسی لیبیا ١٩ ریکخراوی عیراقی لەوانە یەکیتی، پارتی، حسک، حشع، ریککەوتنیکی کورت و پوختیان ئیمزاکرد.) ل/٢٧٩

(بیگومان منیش وەکو هەمو کوردیکی تر لە ناخی دلەوە ئەم شەرەم پی ناخوش بو. رەنگە بۆ من، کە لە پلەیەکی بەرزی لیپسراوی دا بوم و، هەمو ژیانی خۆمم بۆ مەسەلەی گەلەکەم تەرخان کردبو، ناخوشتر بوبی.) ل/ ٢٨٩

ئەو هەست دەربڕینەی نەوشیروان، بەدوای دەیان ساڵیشەوەیە جێگای دڵخۆشی و کەیف پێهاتنە، بەڵام خۆزگە لەجێی خۆی بووایە. ئەوە بۆ جاری چەندەمە لەو کتێبانەدا دەیلێتەوە..! بە درێژایی تەمەنی شەڕوشۆری ناوخۆی بێهودەی یەکێتی لەدژی هێزە نەیارەکانی دیکەی شاخ و شار، نەوشیروان پشکێکی زۆری سەرپەرشتیکردنی ئەو چیراوکە ناخۆشەی بەر کەوتووە. خۆزگە بەو هەموو توانا و سەلیقە کوردەوارییە پڕ لە زانیارییەی، بەو بارە تاڵ و تفتەی لە کۆڵی بوو، لە جیاتی خۆخەریککردنی بەو جەولانەی شەڕی کوردنۆلۆژی یەکتر رەشکردنەوە، جارێکیش لەو بەسەرهاتانەی دەگێڕایەوە، کە چۆن بەو لەشکرەی دەوروبەری، هێزی دوژمنانی کوردی تارومار کردووە..!

من لەو شاخە سەرم لەبەردی رەقی ئەو رووداوە تفتانە داو تا رادەیەکی زۆر، رێچکەیەکی میانڕەوانەم گرت. بەڵام ئەو کات لەوە نەگەیشتم، کەسێکی زمانزان لە فەرهەنگی ئێرە و ئەوێ، ئاوقات لە شرۆڤەکردنی بارودۆخی دنیا و ناوچەکە و

کوردستان، شارەزای کونجوکەلەبەرەکانی شارستانییەتی دەڤەرە جیاجیاکانی جیهان، ئاشنا لە چۆنیەتی پێشکەوتنی پرۆسەی ژیان. خاوەن قوربانییەکی بە دەگمەن بە ژیان و دوارۆژ و چارەنووسی خۆیان. ئەگەر خەمخۆری بزاڤی رەوای خەڵکن و بۆ خەڵک گوایە کەوتوونەتە تەلاش. ئەگەر ئەوانە باوەڕیان بە شەڕێک نەبێت، کە بەرۆژی ئاشکرا قازانج سەری مایە دەخوات. چونچۆنییەک بەشێکی زۆری شاخەکانی کوردستانی بە پێ کوتاوەتەوە و بەدەم رۆیشتنەوە ئارەقەی شین و مۆری کردووە. برسێتی و سەرماوسۆلی هەڵمژیوە، ماندووبوون فرچکی لێ بڕیوە..! بەچ هێز و چاو و لە خۆرادیتنەک لە بەرانبەر ئەو هەموو شتانەی پێشەوە، هێزە چەکدارەکانی دەورویەری لە سلێمانی و کەرکوک و هەولێر خڕ دەکاتەوە و شەڕی کورد کوژی پێ دەکات و دوایی دەنووسی، لە ناخی دڵەوە، ئەو شەڕەم پێ ناخۆش بوو..!

راستییەکەی ئەگەر یەکێک هەموو ژیانی بۆ گەل و خاکەکەی تەرخان کردبێت، هەرگیز و بە هەر بیانویەک بێت دەستی ناچێتە کوشتنی پێشمەرگەی لایەنی دیکەوە، بەرد و شاخی کوردستانی پێ رەنگ ناکات و تابلۆی تراژیدی وێنا ناکات..! هۆکارەکانی ئەو دۆخە ناهەموارەی ناوخۆی بزاڤ و حیزبی بنەماڵەیی و میلشیایی کوردی زۆرن. بە داخەوە نەوشیروان لە یەک شوێن نەکەوتووتە تەتەڵەکردنیان و لەقاودانیان، بۆ بەرگرتن لە هەڵکردنی جۆگەلەی خوێناوی خەڵکی کورد بەدەستی ناسنامەی کوردبوون..!

مرۆڤی شۆڕشگێڕی راستگۆ هەمیشە لە ئاست گوتنی راستییەکانیش بێمنەتە. هەتا ئەگەر سەروگوێلاکی خۆیشی بگرێتەوە. چونکو قوربانیدان، بەرپرسیارێتی، ئەو دەمە سەنگی دەبێت و جێگای قایمی خۆی دەگرێ، کە کەسایەتییەکانی خۆ بەمەسولزانی خەڵک، خاوەنی ویژدانێکی زیندوو بن. بێگومان کە ویژدانیان زیندوو بوو، بیریشیان گەش خۆی پێدەگەیەنێ و بەوپەڕی جورئەتەوە بە چاک دەڵێ چاک و بە خراپیش دەبێژی خراپ

## ئاژاوەی ناو ئەدیبان..!

نەوشیروان بەو ئەدرێسەی سەرەوە، یەک دوو لاپەڕەی پڕ لە رستەی پتک و پلاراوی کردوتە هەڵگرتە و بە دەموچاوی کۆمەڵێ خەڵکی دادەدا. کە بە فەرموودەکانی ئەو، گوایە ئەوانەی شاخ، ئەدیب و نووسەری بیست و چوار عەیاری بەر تێڕوانینی نەبوونە. لێرەشەوە بە هەمان رەنگی زۆری شوێنی دیکەی ئەو کتێبە، سەری مەوزوعێکی کردووتەوە، بەڵام لە ئەنجامەی خۆی بێخەبەر دەکات

نەوشیروان لە پەنتایی فەرمایشتەکانی سەبارەت بە ناکۆکی و ناتەباییەکانی گروپە چەکبەدەستەکانی شاخ و حیزبە گچکە و گەورەکانی ئەو دەڤەرە، زۆری لەسەر نووسیوە. بەڵام لە تاکە یەک شوێندا ململانێی نا ئاسایی ئەو حیزبانە بە ئاژاوە گێڕی ناوزەد ناکات..! کەچی لە ئاست ناتەباییەکانی ناو نووسەران کە لە بنوبۆتکەوە، رەنگدانەوەی ئاژاوەگێڕی سیاسی حێزبەکانە بەپلەی یەکەم. زۆر بێمنەتانە ئەو نووسەر و ئەدیبە بێچەکانە بە ئاژاوەگێڕ تاوانبار دەکات..! بەبێ ئەوەی خۆی لە قەرەی نمونەیەکی ئەو ئاژاوەگێڕییەیان بدات و سەرقەڵامانەی ببەخشێتەوە..!

(بەلام لە روی سیاسیەوە دوای ئاشبەتالیش خوی نەدوراندو، نەچوە ژیر باری زور و گوشاری بەعسەوە) ل/٣٠٩

نەوشیروان لێرەوەش بەبێ هیچ سەرچاوەیەک و تەنیا بە گوێرەی قسەی ئەو ئەدیبانەی خۆی مەبەستی بووە. لە راستی چارەنووسی ئەو یەکێتی نووسەرانەی کورد، نەوەک هەر راستییەکان لە بیر خۆی دەباتەوە، بگرە دەبێتە مایەی پەرێزپاکی هەوادارنی خۆی لە بەشێکی ئەو ئەدیبانەی شاری سلێمانی..! ئەوە چەندی بە چەندی لەگەڵ ئەدرێسەکەی سەرەوەی _ ئاژاوەی ناو ئەدیبان _ کە کەس تێنەگەیشتوە مەبەستی لە ئاژاوەکەی ناو ئەدیبان چییە و ئایا بە تەنیا حەمە سەعید حەسەنی مەبەست بووە، کە هەروەک ئەدیب و نووسەرەکانی دیکە، بە تایبەت ئەوانەی تا دواسەمون لەگەڵ بەعس بوون، رای خۆی نووسیوە و لەوێ رۆژان ئازایانە بڵاوی کردووتەوە. نەوشیروان لاری بێ و نەبێ، مەگەر چەند دەنگێکی تاکوتەرای ئەو نووسەر و ئەدیبانەی لێ دەرچێت، کە لە ماڵی خۆیان دانیشتبوون، لە هەر جۆرە چالاکییەکی ئەدەبی پاشەکشەیان کردبوو. لە بەرچاوی هەموو لایەک کاسب و بەخێوکەری ماڵ و منداڵی خۆیان بوون. دەنا زۆربەی زۆری ئەدیب و نووسەران، بە هەر شێوەیەک بێت، بە رەسمی کۆچکوچەی دەهۆڵی

بەعس بوون لە هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی نووسەرانی کورد و دوایی بەشداریکردنیان لە یەکێتی نووسەرانی عیراق و کردنەوەی لقەکانی لە سلێمانی و هەولێر و دهۆک و بەشێکیان بێشەرمانە چوونە ناو دەستەی بەڕێوەبەراتییەکەیەوە و دواییش بە موبارەکەی نەوشیروان و حیزبەکەی کرانە ئەندام پەرلەمانی کوردستان و هەتا ئەندامی ئیعلامی مەرکەزی یەکێتی.

## یەکێتی نووسەرانی کوردستان

لێرەشەوە نەوشیروان یەک لایەنە و بە پێی مەزەندە و حەزەکانی باس لە سەربردەی یەکێتی نووسەرانی کوردستان لە شاخ دەگێڕێتەوە..

(حەمە هاتە دەرەوە قسە و باسی سیاسی و ئەدەبی زورمان کرد. بە لایەوە چاک بو لەگەل ئەدیبەکانی کورد لە ناو شارەکان دا پەیوەندی دۆستانە دابمەزرینین... کە هاتەوە بیری دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی لە لا گەلالە بوبو...)

(تاقمی ئەدیب و نوسەر رویان کرد بوە شاخ، بەلام بەسەر حیزبەکان دا دابەش بوبون. لەمانەش هەندێکیان خۆیان خۆیانیان بە ئەدیب و نووسەر ئەزانی، ئەگینا بە پیوانەی ئەدەبی (( کولکە ئەدیب)) یا بە (( کۆلکە نوسەر )) یش دانەئەنران.) ل/ ٢٥١

جارێ بۆ مێژوو و بۆ پێ ئاگاداربوونی خوێنەران، یەکێتی نووسەرانی کوردستان لە شاخ زیتر لە نزیکەی ساڵێک بەر لە هاتنە شاخی حەمەی حەمە باقی دروست ببوو. ئەو کەسەش کە لەسەر راسپاردەی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی نووسەرانی شاخ، شەهاب عوسمانی جەریەزە و پرسکردن بە نەوشیروان وەک مەسولی یەکەمی کۆمەڵە، کە نازانم بۆ لەناوهێنانی ئەو سەربازی نەناسراوە قورقەپی کردووە. کە شەهاب عوسمان سەردانی شاری سلێمانی کرد و هەندێک لەو نووسەرانەی برادەری خۆی دیتبوو. لەناویان شێرکۆ بێکەس، حەمەی حەمەباقی و کێ و کێی تری تێدابووە، هیوادارم شەهاب کە خۆی هێشتا لە ژیانە و راستییەکان بگێرتەوە

ئیتر هاتنەدەرەوەی حەمەی حەمەباقی بۆ شاخ و میوان بوون لە لای نەوشیروان بەسەردا هاتووە. دەپرسم بۆ دەبێ نەوشیروان لەجیاتی ئەو _ کۆلکە _ ئەدیب و نووسەرانەی شاخ، سەبارەت بەو بوارەش قەزاوەتی پڕ کەموکوڕی بکات ..! بۆ

ڕوونکردنەوەش ئەوە پاداشتی نەوشیروانە بۆ دەیان تێکۆشەری گەورەی بوێری ڕۆژە تەنگەکانی بزاڤی چەکداری شاخ، کەسانی گیانفیدای وەک هەڤاڵ کوێستانی، ئەبوبکر خۆشناو، ناسر حەفید، حسێن بەفرین، جەمیل ڕەنجبەر، ڕەفیق سابر، ئەحمەد دڵزاری حشع و کێ و کێی تر کە ئەندامی ئەو یەکێتی نووسەرانەی ناوشارەکان بوون، و بەوپەڕی ڕەزامەندی خۆیانەوە، پەیوەندییان بە شاخەوە کردبوو. بەبێ ئەوەی عەسکەری فیراری بەرەکانی جەنگی قادسیەی جەلاد بن، یاخود لەلایەن دامودەزگای بەعسییەکان ڕاونرابن و بە ناچاری وەک ئەدیب و نووسەرە بیستوچار عەیارییەکانی پێوەری ئەدەبی نەوشیروان، بە ناچاری پەنایان بۆ شاخ هێنابێت ..!

## دەست بەسەرداگرتنی بێتواتە

(ئەنوەر بەگ بە هۆی ئەم دەسەلاتەوە ترس و لەرزیکی زۆری خستبوە ناو دلی دانیشتوانی ناوچەکەوە، هەرکەس گویرایەلیی نەکردایە و، دلسوزی نەنواندایە، ئازاری ئەدا.) ل/ ٣٣٢_ ٣٣٣

(لەناو بیتواتە کۆمەلە ریکخستنیکی باش و بەهیزی هەبو..) ل/ ٣٣٣

بۆ چوار ساڵ زێتر لەو ناوچانەی خۆشناوەتی بووم. بە پێویستی دەزانم ئەو پێزانینەی خۆم لێرەدا شرۆڤە بکەم. دانیشتوانی خۆشناوەتی وەک عەشیرەتیش بێت، لەچاو عەشیرەتە زۆر و زەبەندە جاشەکانی کوردەواری، زۆرتر ناوچەیەکی ئەمینی داڵدەدانی پێشمەرگە و کادری حیزبە جۆربەجۆرەکان بووە. بە درێژایی ئەو سەد ساڵەی دوایی خەڵکەکەی لەسەر بژێو و ماڵ و حاڵی هەژارانەی خۆیانەوە، لە بەخێوکردنی ئەو هێزانە نەسڵەمینەتەوە. هەر نانێکیان هەبووبێت، لەگەڵ پێشمەرگە بەشیان کردووە. دیارە وەک ماکێک و خەوشە هەمەچەشنەکانی کۆمەڵی شلەپەپەی کوردی، لەناو عەشیرەتی خۆشناوانیش بەگی جاش و ڕەوە جاش هەبووە. هەروەک چۆن لەناو هەموو حیزبە چەکبەدەستەکانیش پێشمەرگەی قارەمان و کادری لێهاتووی خۆشناویشی لێ هەڵکەوتووە. ئەوە بۆ نمونە هەڵسوراوە بوێرەکانی سەرەتای دەستبەکاربوونی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە کە سەرەداوی شیرازەی ڕێکخستنی گەیاندە یەک بەیەکی گوندەکان و لەناویاندا، بێتواتە و گوندەکانی دەوروبەری. نەوەک ئەو شانەی کۆمەڵە لە بێتواتە بە

قودرەتی قادیر لە ئاسمانەوە دابەزی بێت...! راستە خەڵکێکی تارادەیەک بەرچاوی دۆڵی بالیسان و هەتا ناوچەکەش، بۆ پاراستنیان بە شێوەیەکی سەرەکی لە پەلاماری هێزەکانی رژێم هەوادار و ئەڵقەلەگوێی ئەنوەر بەگ بوون. کە راستەوخۆ بۆ جۆری پێکهاتەی گەرەلاوژێی هێزی ئەو حیزبە چەکبەدەستانەی شاخ و شێواز و رەفتاری ئازاردانی لە خۆرایی و شەرفرۆتن بە دانیشتوانەکە و ئیهانەکردنیان، کە بێ شەرمانە بەناوی پیرۆزی ئەو دەمی پێشمەرگەوە، پردانە سەروەرییەکانیان مایەی رووکردنە هێزی جاشایەتی ئەنوەربەگی بێتواتە بووە. کە نەوشیروان لێرەدا بە تیلک لێدانیش خۆی لە قەرە نەداوە..!

ئیتر ئەنوەر بەگ بە پێی ئەزموونی کۆن و نوێیەوە، لە هەبوونی فرە هێزی حیزبی هەمەچەشنە بەناوی پێشمەرگەوە. کەلەبەری گەورەی قۆستوتەوە و سوودی لێ وەرگرتووە. ئەو بێزاری و وەرسبوونەی خەڵکی بەکارهێناوە و لە سێبەری جاشایەتی رژێم، قوتبێکی دەسەڵاتی قیت کردووتەوە و بۆ سەرۆک عەشیرەتی قۆشمەی کردووە.

(بۆ رۆژی دوایی هەمو دۆلی بالیسان و بیتواتەش کەوتە دەس پیشمەرگەی یەکیتی و، هەمو هیزەکانی لە بیتواتە یەکیان گرتەوە ..) ل/٣٣٤

نەوشیروان بەخشکەیی بەبێ ئەوەی ناوی شەڕ بهێنی لە گرتنی بێتواتە. زۆر بە سووکی ئازادبوونی تەنیا یەک دوو رۆژی بێتواتەی هۆنیوەتەوە و توخونی ئەو راستییە نەکەوتووە.. کە نە خەڵکە چەکدارەکەی گوندەکانی دەوروبەری بێتواتە و نە هێزەکەی خودی ئەنوەربەگ شەڕێکی ئەوتۆیان نەکرد و بە بەرەنگاریوونەوەیەکی رووکەش، لە گوند و ناوچەکەیان کشانەوە و چۆلیان کرد. بەبێ ئەوەی لەو هێرشەی هێزی پێشمەرگەدا، رژێم بە پیر لێقەومانی ئەنوەر بەگەوە بێت، زۆربەی ماڵ و حاڵ و سەروەت و سامانیان بۆ بەردەستی هێزی ینک جێهێلا...! مەگەر هەر بەشیتاڵکردنەوەی حەزورە بزانرێ، رژێم بۆ چاوپۆشی لەو گۆڕانکارییە بەپەلە کرد..! کە هەر وەک چۆن لە چاوتروکانێک روویدا و هەرواش بە بلەزی تەواو بوو، ئەنوەر بەگیش خێرا بۆ بێتواتە گەڕایەوە..!

(سەرکەوتنیکی گەورە بو بۆ پیشمەرگە و بۆ دانیشتوانی ناوچەکە، ورەی خەلکی زۆر بەرزکردەوە، بەلام تالان و راورووت بەتایبەتی لە بیتواتە، رەونەقی ئەم سەرکەوتنەی کەم کردەوە.) ل/٣٣٤

کامە سەرکەوتنی گەورە، مەگەر راوڕووتی لەشکری تالانکردنی گاڕانە چێل و مەڕومالاتی خەڵکی رەشوڕووتی هەتا گوندەکانی وەک هەرتەل کە هەمیشە مەکۆی پێشمەرگە و هاوڕێیانی کۆمەڵە بووە! یاخود دزینی کەرەستەی مالان و دەست بەسەراگرتنی مووەلیدەی کارەبایی خەستەخانە و قوتابخانە، ثلاجە و مجمیدەی بە پشتی ولاخ گواسترانەوە، لۆرییە رایەخ و مافوری هەمە جۆرە و چی و چی تر نەبێ. نازانم سەرانی ئەو حیزبانە بۆ ئاوا خەڵک بە گێژ و گەوج دەخوێننەوە..! بەڵێ هێزی چەکداری هەرەمەکی ئەو حیزبانە هەمیشە و بە زۆری ئەوە ناوەڕۆکەکەی بووە. چونکو ئەو پاشەگەردانییە مۆرکی قێزەوەنی بزافی چەکداری بووە و هەر لە دێرزەمانەوە بۆ نەگبەتی بووەتە ترادیشۆن. بزاف بەدوای بزافیش سەرانی ئەو حیزبانەی سەر کەڵەکی دەسەلات، زێتر و زیاتر بۆ مەبەستی گوێڕایەڵی ئەو لەشکرە بۆ شمڕی دەسەلاتەکەیان برەویان بەو میتۆدە داوە و لە گوڵ شیرینتریان بە توخمە سەرەکییەکانی شرەخۆری نەگوتوە. هەر بۆ نمونەش کە نەوشیروان بە سەرەتیلک لێدان باسی دەکات، پێمان نالێ کامە لەو دز و جەردە فەرهودچییانە سزا دراوە و بگرە بەدوای نیشتنەوەی قرەقرِی هەندێک لە کادر و کۆمەلانی خەڵک لە دژی ئەو پاشەگەردانییە. خودی ئەو توخمە دیارانەی تالانچییەکانی بێتواتە و دەورووبەری، لەجیاتی هەر جۆرە موحاسەبەیەک، پلەی زیاتر و بگرە کراونەتە ئەندام سەرکردایەتی سەرسەکۆی عەرشی ئێرە و ئەوێی حیزب هەر بەندە لەم بەشەی دووەمی _ لە هەواری یادەوەرییەکانم دا _ دوو یادگاری دەمی ئەو کارەساتەی تالانچییەکانم لە سەروبەندی بێتواتە گێڕاوەتەوە.

یەکێک لە نەگبەتییەکانی مێژوی دوور و نزیکی دەواری شرِوشۆڵی کوردان. زۆرتر بە یەکلایەنی خەونە ناخۆشە ناوەرۆک پوچەکان بە دارێوە وەکراون. کەس لەگەڵ رووبەڕووبوونەوەی ریالیستییانەی جەوهەری ئەو بەسەرهاتانەوە مەلۆی هەڵنەگرتوتەوە

# موفاوەزە لەگەڵ بەعس

(ئەرکەکانی کونفرانس چەند شتی بو

١_ هەلسەنگاندنی هەلومەرجی ریکخراوەیی، پیشمەرگەیی،دارایی

٢_ هەلبژاردنەوەی ئەندامانی کەرت

٣_ هەلبژاردنی نوینەرانی کەرت بۆ کۆنفرانسی سێیەم

٤_ وەرگرتنی بیرورای ئەندامان لەسەر گفتوگۆ لەگەل بەعس، ئاخۆ زۆرایەتی لەگەل گفتوگۆیە یان دژی گفتوگۆیە !

دەستەی سەرپەرشتی هەرسێکیان وتیان (( هیچ کەس پی ی وانیە بەعس خواستەکانی کورد ئەسەلمینی، بەلام هەموو ئەندامان _ جگە لە ژمارەیەکی زۆر کەم کە بە پەنجە ئەژمیردرین _ گفتوگۆیان پی باشە. هیچ نەبی بۆ راگرتنی شەر و پشودان و خۆریکخستنەوە.)) من خۆیشم لەم رەئیە دا بوم.) ل/ ٣٣٤ _ ٣٣٥

(مامجەلال، خۆی موافیق نەبو لەسەر گفتوگۆ، لەسەر داوای ئیمە کۆبونەوەی بە ئەندامانی سەرکردایەتی و، بە کادرە پیشکەوتوەکانی و، ئەنجومەنەکانی ئاواییەکانی خۆشناوەتی کردبو، پرسیاری لەهەر کەسی کردبو دەنگی بۆ گفتوگۆ دا بو، بۆ حورمەت گرتنی رەئی زۆرایەتی ئەویش موافەقەتی کرد بو. بە بیتەل ئاگاداری کردم سەردانی حدکا بکەم و، ئاگاداریان بکەم کە ئامادەین بۆ گفتوگۆ .) ل/ ٣٣٥

من کە لەو رۆژانەدا نەوشیروان ئەو تشتانە دەگێرتەوە، ئامادەی یەکێک لەو کۆنفرانسە ناوخۆییانەی کۆمەڵە بووم. بۆ ئەوانەی دیکەی ناوچەکانی خۆشناوەتیش لە نزیکەوە پێی ئاگادار بووم. چەند جارێکیش لەگەڵ خودی ئازاد هەورامی قسەوباسی زۆرمان کردووە. هەنوکەش کە ئەوەی نەوشیروان دەخوێنمەوە، تێکەڵوپێکەڵەیەکی سیخناخ بە مەبەستی دیکەی نەبینراو دەبێنم. جارێ ئەو کۆنفرانسە ناوخۆییانە بە تەنیا لە ناوچەکانی خۆشناوەتی ئەنجام نەدراون. لەسەرجەمی ناوچەکانی بەر دەسەڵاتی شمری یەکێتی لە شاخ یەک بەدوای یەک ئەنجام دران. راستە خۆشناوەتی و ناوچەکانی هەولێر بە گشتی پێشقاولی ئەو هەنگاونانە بووە. ئەوەی من ئەو دەمی دەمزانی و بەسەر زاری هاورێ و کادرەکانی کۆمەڵەوە بوو. کۆمەڵە کەوتووتە دەمی وەرچەرخانێکی چەندایەتی بەرچاو. ئەو دامەزراندن و دابەشکردنی پلەوپایەکانی مەسولیەت، تێری ئەو بارە قورسەی نەدەکرد. کۆمەڵێ کەسی نەشارەزا لە کاروباری رێکخراوەیی، دەمچەفت لە

ئیدارەدانی گەشەکردنی ڕێکخستنەکان، بێنمودی کەسایەتی ڕێکخراوەیی لە بەرانبەر قەڵەمڕەوی توخمە عەسکەرییە توند و خۆ بەخێوکەرەکانی سەرجەستەی ماندوبوونی پێشمەرگە و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە. هەموویان مایەی زووەتی بەستنی ئەو کۆنفرانسانە بوون. بەڵام دیارە کە نەوشیروان تازە و بە درەنگ لەو کتێبی یادەوەرییانەدا لەبنی کودی داوە. ئەوەی تری بەرچاوان هەر بۆ چاوبەستەکی بووە و بەڵکو مەبەستی راشکاوانەی وەک خۆی بەوپەڕی بێمنەتی ڕاڤە کردووە. تێگەیشتنە لە جۆر و چۆنیەتی ئەو دەنگۆیەی بەناو ریزەکانی کۆمەڵەوە پەنگی دابوەوە لە دژایەتیکردنی دەنگۆی موفاوەزات لەگەڵ بەعس بوو. هەر لەبەر ئەوەش لەو ناوچەی خۆشناوەتی دەستییان پێکرد کە سەرچاوەی ئەو دەنگۆیە بوو. ڕاستە گرێدانی ئەو کۆنفراسانە، مایەی کردنەوەی گرێی دڵی دوو لە خاوەن دەسەڵات و بڕیاربەدەست (مام جەلال و نەوشیروان) بوو.

هەنگاونانی سەرانی دەسەڵاتداری کۆمەڵە لەو بارەوە، چەندان چۆلەکەیان بە بەردێک پێکا. لەوە دڵنیا بوون و لەبەر ڕۆشنایی خەرمانی ئەزموونی دێرینەیان، بەتەواوی لەبەرانبەر هەژموونی ئەو دەنگۆیە ساغ بوونەوە و لەوێ ڕۆژانەوە بەرنامەی کاری لەباربردنی ئەو جۆرە هەوڵ و توخمانەیان بۆ خۆ دارشت و سەرکەوتووانە بە ئەنجامیان گەیاند.

ڕاستە و لە بیرمە ئازاد هەورامی وەک مرۆڤێکی خاوەن بەلانس و تێگەیشتوو لە هێماکانی مام جەلال و نەوشیروان، ئاشنابوون لە مەبەستی سەرەکیی سەرانی یەکێتی و کۆمەڵە. خۆی ئازاد هەورامی بە پارەسوان و پرسەخەسوانێ و زۆر بە کورتی باسی موفاوەزاتی لە دەمی دەستپێکردنی کۆنفراسەکان دەهێنا گۆڕێ و بلەز بەڕەکەی دەپێچایەوە و لە هیچ لەو کۆنفراسانەدا، ڕای ئەندامان وەرنەگیراوە بۆ ڕازیبوون و ڕازینەبوون لەسەر موفاوەزاتکردن..!

نەوشیروان وەک سوخەتێکی هەمیشەیی سەرانی حیزبی کوردی، زوو دەستی خۆی دەوەشێنی و لێرەوەش دەستکاری بڕیاردان لەسەر موفاوەزات بۆ ئەو سیناریۆیە ورد دەکاتەوە. کە خوێنەر وا تێبگات لەسەر ڕازیبوونی زۆربەی کۆمەڵە و هەتا خەڵک ئەو بڕیارە دراوە. دەنا لەراستیدا ئەو موفاوەزەتە ساڵێک زێتر بوو دەستی پێ کردبوو. قەتیش کەس لە خەمی ڕاوەرگرتنی خوار خۆیانەوە نەبووە..! خۆزگە بۆ یەکجار لە

مێژووی حیزبی کوردی، له بڕیاردانی چارەنووساز بۆ خەڵک دەگەڕانەوە و سەرەتاکانی دیموکراتیەتییان پیادە دەکرد، کە هەنوکە شاییمان لەبەردا بکردایە.

نەوشیروان پاش دەیان ساڵ، راستی ژمارەی ناڕازییەکان بۆ موفاوەزات بە _ جگە لە ژمارەیەکی زۆر کەم کە بەپەنجە دەژمێدران _ بە دەستکاری دەخاتە روو. جگە لەوەش کە باس لە راگرتنی شەڕ و پشوودان و خۆڕێکخستنەوە دەکات. ناوەخنی مەبەستی خۆیان دیزەبەدەرخۆنە دەکات. دەنا ئەوە پێشمەرگە نەبوو لە شەڕی بەعس _ ئەو رۆژە _ ماندوو ببوو، ئەوە پێشمەرگە نەبوو پێویستی بە پشوودانی ناو شار و سەیرانگاو و بەغداد و مووسڵ بێت. ئەوە هیچ دەزگایەکی رێکخستن و پێشمەرگایەتی و ئابووری و کۆمەڵایەتی، خوازیاری سەرلەنوێ خۆ رێکخستنەوەی ناچاری دەمی موفاوەزات بێت. بگرە ئەوە سەرانی ماندووی وەرسی دۆزی پێشمەرگایەتی ئەو حیزبانەی شاخ بوون. کە بە درێژایی ئەو کاروانەی خەباتی کوردان دەقییان بە موفاوەزات گرتبوو، غەریبییان دەکرد. ئەوە مەسولەکان بوون بە بیانوی پشوودان، تامەزرۆی موفاوەزات، سەرانی یەکێتی و کۆمەڵە بوون. تاکو لە سایەی موفاوەزات، بەرنامەی کاریان لە بنبڕکردنی هەر دەنگێکی ناڕازی ناوەکی نەهێڵن و لە هەر بۆڕبۆڕێنێک خاترجەم بن.

من تەنیا ئەو نمونەیە بە بەڵگە دەهێنمەوە. لە کۆڕێکی ئەو پرسە خەسوانێکردنەی بە ئەنجومەنی گوندەکان _ کە نەوشیروان بانگاشەی بۆ دەکات_ لە گوندی بالیسان بە تەنیا و بەدوای قسەکانی مام جەلال بۆ موفاوەزات، ئەندامێکی کۆمەڵە، تەنیا هەر ئەوەندی گوتبوو.. مادام هەر بڕیاری موفاوەزاتتان داوە، حەق وایە لە پێشەوە لەگەڵ حیزبە چەکبەدەستەکانی دیکەی شاخ تێکەولێکەیەکی لەیەک نزیکبوونەوە بکەن، ئەوجا بە دەستە جەمعی لەگەڵ رژێمی بەعس بچنە موفاوەزاتەوە. ئەو کەسە نەوەک لەو کۆڕە دەرکراوە و بگرە لە پێش چاوی ئەو خەڵکە بەشداربووەوە، زۆر بە توندی مامەلە کراوە و هەڕەشەی دەرپەڕاندنی لە ناوچەکەی لێ کراوە. ئەوە لوتکەی دروستی و نادروستی موافەقەت و نا موافەقەتی خەڵک و مام جەلال بووە..!

# دوا بەشی یادەوەرییەکانم لەو زنجیرەیەدا

یەکەم

## ئارام ئەو چرایەی لە قەرەداغ هەڵبوو

هاوڕێیان    خوێنەرانی هێژا

دەستەکانتان دەگوشم، ئەمڕۆ لە غەریبی قەڵەندەرخانەکەم، لەناو شاری هەولێرەوە، لەبەر تروسکایی ٣٩ موومی گەشەوە، یادی مەرگی ئارام دەکەمەوە. بە هاوکاری ڕۆڵەی سەربڵند، کوچەری شەهید ڕەشادی مام موراد. لەناو غەریبی ڕوحمدا، لە باوەشی زێد و شارەکەم، بەو پارچە پەخشانە بە دەنگ و ڕەنگی نووسینەوە، لە خزمەت گیانی نەمری شاسوارجەلال و ئێوەدا دەبم و فەرموون

چەند بەرەبەیانێکە کە بێدار دەبمەوە، لەبەر خۆم دەیڵێم و دەیرێمەوە
چی دەڵێم و هیچتان لێ ناشارمەوە
دیسان باری دەوارە شرەم دەکوڵمەوە
ساڵانە لەو دەمڕۆژەدا، کوڵەپشتی یادەوەرییەکانم دەکوڵمەوە
ئارام ئارام، ئارام لە بیر و هزرم دێ و دەجولێتەوە
دڵم، هۆشم بۆ دوا دیمەنی ئارام دەکرووزێتەوە

گەرەکم نییە ئەمساڵ و لێرەشەوە، تەنیا بە سەروسیمای شاسوار جەلال دا هەڵبڵێم. یاخود کەتاگوریای ژیانی کەسی ئەو باس بکەم. ئەوانە و چەند بابەتگەلێکی دیکەن، سەبارەت بە جیهانی (ئارام) بۆ باوەشی نووسینی یادەوەرییەکانم دەق کردووە و ناوەناوە بڵاویان دەکەمەوە.

هاوڕێ بەکر (ناوی سەرەتای چوونە شاخی ئارام) چنگێک لە تیشکی خۆر بوو، لەو دیو کەلێکی تاریکەوە، بە سووتاندنی گیانی وەبەرخۆدانی خۆی و ژمارە هاوڕێیەکی دیکەوە، تروسکایی مومێکی بۆ سەر سەروگوێلاکی کەلاوەی کۆمەڵە_ یەکی هەتیو بەجێماوی بەر دەستی دەستەیەک پاساری هەڵفڕیویی دەمی لێقەومان پەخش کرد

ئەوە (ئارام) و هاوڕێیەکانی بوون، بە پێچەوانەی ئەوان پاسارییانەی بۆ دەربازبوون، لە هۆز و کۆزی خۆیان لە شەقەی باڵیان دا. کەچی ئەو ئارام ـــ ـا نە وەک مرۆڤێکی بێووچان، پەڕ و باڵەکانی خۆیان خەنجەر ئاسا، بە ڕووی ئایدیۆلۆژیای بەعس هەڵکێشا.

ئەوە ئارام ـــ ەکان بوون بوێرانە و بەبێ چۆکدادانی باوەشی دڵەڕاوکێی، بە پێچەوانەی بە جێ هێشتنی کۆمەڵە و هاوڕێیە بەلەنگازەکانیان لەدەمی تەنگەژەدا. ئەوەک هەر شانیان دایە بەر هەوڵی ڕاستکردنەوەی باری لاریوەوەی کۆمەڵە، بگرە چاونەترسانە و سەرلەنوێ چەخماخەی موقاوەمەتییان هەڵگیرساند

ئەوان ڕۆژان، تژی لە تەنگەژەی جەنجاڵ، کەسانێک بە دەگمەن مابوون لە مەیدان. شەرمەزاری، سەردانەواندن و تەسلیم بوون بە دەسەڵاتی ڕژێمە داگیرکەرەکەی ماڵ و حاڵمان، هەڵکردنی ئاڵای سپی بۆ بەعس دەشەکایەوە

لە بیرمە شاسوار جەلال لەو ڕۆژانەدا، دەنگێکی دلێر بوو. لە دژی بەیاننامە ڕووزەردەکەی بانگدانی خۆگونجاندنی سەرانی ئەو دەمی کۆمەڵە، بە بیانوی پاساوی سێبەری ڕەشماڵی سەر سەریان، کە بەعس ناکۆکی لاوەکی خەڵکی کوردە و زەقکردنەوەی ناکۆکی ئیمپریالیزم و ریڤیژینیزم و پاشماوەی دەرەبەگی بە ناکۆکی سەرەکی بۆ ئەو ڕۆژێ دەخوێندەوە.

ئای تاڵاسیمای گەندەڵی سیاسەتبازی، چ دەستاڕێکت خستەگەڕ، بە گەردەلوولی بانگاشەی پوچ و پوت، کوڕ و کچانی خەڵکت بۆ کوتانی خەرمانی گەندەڵکاران دەستە دەستە هاڕی.

بەڵێ دەستوبردی هەنگاوەکانمان، لەوەوە خۆی خواردەوە، بە هەوڵ و تەقەلای دوور لە کۆڵدان، بە جەنجەڕی شەقوپەقی کۆمەڵە، بە جەستەی ماندووی کەسانی بەرتەوژمی هەژموونی ئاشبەتاڵ لە وێ ڕۆژاندا. خەلەوخەرمانی قرشەی بێ دەنک و دانمان پێ کوترا.

ڕاستە شاسوار جەلال ـ ئارام ـ وەک دەرکەوتێکی نوێ، سەرکردەیەکی کتوپڕ بوو. بێ سڵەمینەوە، دوور لە دڵەڕاوکێ و بە ئیستقامە بوو. بە بڕوای لە بن نەهاتوو ملی لە بەرملی نەهامەتییەکانی کەرەستەی خەباتی خەڵکی ستەمدیدەی کورد نابوو. ئارام پێش زەمەنی خۆی کەوتبوو. لە هەر جۆرە ئەجندایەکی بۆڕبۆڕینی سیاسەتچییەکان

دەریازی ببوو. بەڵام تاک و تەنیا بوو، زۆربەی شاگردەکان چاوپان بوون، بە تاقی تەنێ گۆرانی بۆ گەرمکردنی هەڵپەڕکێی چەوساوەکان چڕی.

## ٢

یادەوەرییەکان وەک قڵپە قڵپی هەڵڕژانی ئازارەکان، شلومل دەڕواو تەواو نابن. بەکوێرایی رقوقینەی هەندێ کەسی تاریکستان، زۆرتر و زیاتر لە دڵ و دەروونمان، بۆ یادکردنەوەی ئارام شین دەبنەوە، خوێناوی دەمارەکانمان زەوی بە یاری ژیانمان نوێ دەکەنەوە.

دەزانم رەوە داڵە گۆشتخۆرەکان بەسەرمانەوە راوکەیان داناوە، جوجکەی سەیر و سەمەرەتر هەڵدەهێنن. چ ئاسمانێکی چڵکن و قێزەوەن دەبینم، تەمومژی دووکەڵی بۆگەنی گوفەکێک تەنگەنەفەسی کردووم، لە زگە داروبەردی سووتاو خۆی لەبەر نەگرن. ئا لێرەدا

کڵۆ کڵۆ بەفری ئومێد، لە کەژاوەی مەرگی ئارامەوە، بە هێمنی جەستەی گەرممان فێنک دەکاتەوە. هێشتا دید و بۆچوونەکان بۆ سەرگڵکۆی شاسوار گاگۆڵە دەکەن. ئەگەر هەنوکە، هەنوکە لێم بپرسن..! مردنی ناو هەمێزی خاک و خۆڵی زێدی خۆت پێ خۆشە، یاخود مەرگی ئامێزی ئەرمونیانی ژنێکی بێدەرەتان..!

دووکەڵ قەف قەف، بۆ داپۆشینی رووی شەرمەزاری. گەوزینی شەوارەی بەناو شۆڕشگێرەکانی دوێنێ و خانەخوێیەکانی ناو زنجیرە کۆشک و تەلاری ئەمڕۆ رادەگێڕێ.

قسەیەک هەیە سەرەتاتکێم لەگەڵ دەکات و دەڵێ ..(ئاگر لە کێندەرێ بکرێتەوە، من بۆی دەستە چیلەم، برین چۆن خەنجەر لە بیر دەکات.)

من ئەمڕۆ لە ساڵرۆژی مەرگی ئارام دا، لە سەرتیلەی شۆخە ژنێک دەنۆڕم، گروازە گروازەی کەزییەکانی لەبەر رووناکی خۆری ئازادی، بەریانگی ئارام دەکاتەوە.

پەنجەکانی ناسکتر لە سووتانی مووم، بەژن و باڵای بڵندتر لە تراویلکەی دیواری مزگەوتەکان بە سامترە. بەڵام چی بکەم ئاگری ویژدانی غەدارانە، لەسەر سنگی بەفراوی دادەمرکێتەوە، گەندەڵکاران دەستە دەستە تینووی دڵەکوتەیان بە ئاوی زمزم دەشکێنن، جامبازەکانی بیروباوەڕ بەزمی خۆیان لەنێو گوڵ و گوڵزاری سیسی سەقەتکردنی خەڵکی دەلەوەڕێنن.

بروسکه بروسک، قامچی دەستی گرم و هۆڕی گەواڵەی هەوری تورەیە. بە تایبەت ئەو دەمەی هەورەکان دەغەزرن، لە رکرادەچن، بروسکە ئاگریان لەسەر پشت دەکاتەوە و پریشکی ئەو ئاگریارانە، بریسک و هۆڕ دەخولقێنی، هەورەکان بە ناچاری بە شریقە شریق دەگرمێنن، فرمێسکی چاوەکانی ئاسمان بۆ مەرگی ئارام هەڵدەرێژن

دەستەیەک لە هاورێیەکانی بیری ئارام، ئەو کاتەی دەگەیشتنە سەر دۆندی شاخە داپۆشراوەکانی ژێر بەفر، زریان و کرێوە لوولی دەدان

ئەو دەمەش لەسەر زاری کانی ئاوی سازگاری قەدپاڵان، پرپاسکەی وەڵامی پرسیارەکانی هزر و بیرمان، بەژێر تیشکی مانگەشەو بۆ جریوە جریوی ئەستێرەکان بەرێ دەکرد. هاورێ نوێیەکانمان دەیانپرسی. ئەرێ کاک ئارام کێ یە..!

دەنگێک.. ئەگەر کەسێکی هەژاری رووتەڵەی چاویلکە لەچاوتان بینی.. شوان و گاوان، دارکەر و کرێکاری بیر و کردارتان بینی.. ئەوە ئارامە و ئارام لەوێندەرێیە.. ئەگەر لە دەمی حەسانەوەی هەر پەنا تاشە بەردێکەوە، ساقۆ پینەکراوێکتان بە قەد داریکەوە بینی.. دڵنیا بن ئارام __ تان بینیوە و نەتان ناسیوە.. نەتانناسیوە..! تکایە هەنوکە سوێند بە مەرگی ئەو مەخۆن

شەو درەنگ بوو، دوو پێشمەرگەی هاورێگا، لە بەردەمی دەرگە، لە سەرما ئەو قاپوتەی ئارام __ یانُ بە خۆدادا، وەلێ خش و هۆڕی کاغەزەکانی گیرفانی پاڵتۆکە، نەیانهێشت خەو بچێتە چاویانەوە.. سەیری کەن ئەوە لاپەڕەکانی ژمارەیەکی نوێی چاپنەکراوی __ئاڵای شۆڕش __ە، بە بزرکراوی یەک یەک دەقکراون، ئارام لە هەر لاپەڕەیەکیان پەیامێکی لێ نووسیون.

لێم مەگرن، ئیستاکێش کە لە خەونما دەیبینم، کورە ئارام هێشتا زیندووە! بە دوو کزە چاوی درەوشاوەی بن عەینەکێکی شوشە ئەستور، لە رووخساریدا دوو ئەستێرەی گەش گەش دەردەکەوتن و دەدرەوشانەوە. بەڵێ ئەمرۆ یاخود سبەی هەڵدەبی و بیری ئارام دەدرەوشێتەوە.

ئەو چەند سبەینانە، مەیلی نووسینی ئازاری فرمێسکەکانم بۆ ئارام، کەوتە سەرپێیان و فەنتازیای هزرەکانم بۆ رابردوو، چێژی بە دیدار گەیشتنەوەی کارێکتێری شاسواری لە لا زیندوو کردمەوە. هاتەوە بەر دید و کەلکەلەی مێشکم(تەنیا نووسینە مەرگ دەترسێنی..) چونکو نزیکبوونەوەی یادی مەرگی کت و پڕی هاوڕێ (ئارام) م لە لا زیندی بوەوە.

لێتان ناشارمەوە و دەبینم، زۆربەی ئینسانی کورد وەک قاسپە قاسپی کەوان، بە ئاسانی دەکەوێتە ناو قەفەسی خەیاڵەوە، خەیاڵپڵاو بەدوای هیچەوە پەل دەکوتی.

بەشی هەرە زۆری مرۆڤی کورد لە جۆری هێشوە ترێی قەرتالەی بەرەوبازار، لەسەر پشتی وڵاغەوە سەر کز دەکات و خەو دەیباتەوە

٤

لەپاڵ داروبەردی لالا ، لە ژێر تەوژمی کزەبایەکی سارد و سرِی ئێوارەیەکی تاریکی زستانی بەر لە سی و نۆ ساڵی رەبەقا، کاروانی ئەستێرەکان هەر زوو بە زوو باروبارگەیان پێچایەوە. هەڵنەهاتن روو لە هەواری خۆیان گەرانەوە. جەستەی ئارام _ی پێکراویان بە تەنیا رادەستی جاشی تاریکی کرد.

من دەزانم شاسوار لە مردن نەدەترسا، بەڵام هەموو تاوێک لەوێ رۆژان، چاوەڕوانی شەوارەی مەرگ بوو، چرکە بە چرکە لە مردنی تەنیایی نزیکتر دەبوەوە، چونکە لە بەدینەهاتنی خۆزگەکانی دڵتەنگ ببوو، نائومێدی بە دووروبەرییەوە لە سەماکردندا بوو.

راستە ئارام گەرەکی بوو، لەبەر رۆشنایی تروسکایی چرای ماڵی پیرەژنێکی کوردەواری، ئەگەر مەرگ مەودای بدایە، ئەو جارەش لاپەڕە نووسراوەکان تاووتوێ بکاتەوە، لە دەسرازەی ئەوان نووسینەوە، شەوەزەنگی قەدەری پێ راو بنێ. بۆ دواجار لاپەڕە بە لاپەڕەی ئالای شۆڕش_ رۆژنامە_، بە چەپکە ووشە و دەستەواژەی شۆڕشگێڕی برەنگێنی. ژمارەیەکی دیکەی نوێ بۆ هاوڕێیەکانی بە چاپ بگەیەنی. بەڵام زستانی تووشی گوندی تەنگیسەر بە گەلارێزانی مەرگ داپۆشی. نەخشە رێگای بەهارێکی دیکەی پێ نەبەخشی.

جاشەکان مۆن مۆن بۆ شەهیدکردنی ئارام بە دەستی خۆیان، سامگرتوو ببوون و تەرمەکەیان لەگەڵ خۆ نەبرد، تاکو بە پارەی خەڵات بیگۆڕنەوە. کەچی برادەری فرسەتتەلەب لە ژێر ناویی (کوژرانی ئارام ..) دا، بەسیمای خەندەی ناو دڵی، گوژمە پارەی بیانی بۆ گۆڕینەوە ناردەوە شاری..

هەموویان وێڵی پارە و پول داغانی کردوون. هەمیشە هەڵپەی شەو و ڕۆژیان لەپێناوی کۆکردنەوەی دراوە، چ بوو هەر تەواو نەبوو. چاوچنۆکی سواری ملیان بووە، پرێسکەی تژی لە پارە، پێڵاوە کڵاوی سەر تۆقەرەی سەریانە

وای وای چ شەوێکی نگریسە، سووتانی شەوی ۳۱ یکی مانگی یەکی ئەو ساڵە، لە ئەزموونی ئارام _ەکان هەرگیز دانامرکێتەوە..! جەستەی شەلالی خوێناوی کراوی ئارام، چرای دەستمان، تروسکایی بیر و هزرمانی بە فوویەکی خاوی سەرەمەرگی خۆیەوە کوژاندەوە. ڕووناکییەک لە قەرەداخەوە خامۆش بوەوە کە بەکەس هەڵنەکرایەوە. گریان و واوەیلا بێداد بوو، دەردی خەباتی چەوساوە و ڕەنجدەران، چەندان قات گران بوو. سەری زیندۆوی ئارام نەما، لە تاوی لێقەومان ڕانەکا، تەگبیری دەمڕۆژی تەنگانە بکا..

## بۆ هاوڕێ مەناف زراری

دەبێ لە پێشەوە ئەوە بێژم، لە هەمان ڕۆژی شەهیدکردنی ئارام دا و لە ساڵی ۱۹۸٦دا، دیسانەوە هاوبیرێکی پاک و دڵسۆزی بیروباوەڕە شۆڕشگێڕانەکەی ئارام، مەناف تاهیر تۆفیق لە شەڕێکی دەستەویەخە لەگەڵ ڕەوە جاشێکی تۆکەر، وەک کادر و پێشمەرگەی جەربەزەی ڕێکخستنەکانی ئاڵای شۆڕش لە ناوچەکانی هەولێر شەهید کراوە.

مەناف ڕۆڵەیەکی چاوگەشی، بیر ڕۆشن بوو. هۆگری بیر و کردارەکانی ئارام بوو. هەر بۆیەش لەگەڵ یەکەم هەنگاونانی ئەڵقە ڕۆشنبیرییە سەرەتاییەکانی دروستبوونی ئاڵای شۆڕش بە گیانی هاوڕێیەتیەکی جەسور لە شانی هاوڕێیان.. وەرزێر و گۆران، وریا، ڕێبازی مام باپیر، م. فرهاد و مەهدی کاوانی، سۆران دیان، یەکەم مەفرەزەی پێشمەرگەکانی ئاڵای شۆڕش بوون لە ناوچەکانی هەولێر

مەناف بە قوربانی و هوشیاری گەنجێتی خۆیەوە، قوچەکێکی بڵند بوو لە دانانی بەردی بناغەی ڕێکخراوی ئاڵای شۆڕش و بەدڵنیاییەوە ئەگەر وا زوو بە شەهید بوون ئەو کاروانەی بە جێ نەهێشتایە، کادر و سەرکردەیەکی هەڵکەوتووی لێ دەردەچوو. مرۆڤێکی بە حەوسەلەی دەم بە پێکەنین، هێمن و بەکاوەخۆی باوەڕ بە خۆ بوو، لەگەڵ ناخۆشی و تەنگەژە فیکری و کەسانی دەم دەمی ریزەکانی ڕێکخراوەکەی خۆڕاگر و پشوودرێژ بوو. بە تەواوی شەنگ و تاقەتی خۆی لە خەمی گەشەکردن و هەنگاونان بەرەوپێشەوە چوون دەدیتەوە..

شەهید بوونی لە ڕۆژانێکی زوودا، تێکڕای ئاڵای شۆڕشی لە ناوچەکە شپرزە کرد و هەموو هاوڕێ دڵسۆزەکانی تاساند.. هەنوکە دیمەنە ئەو گەنجە خوێن شیرینە بەرچاو روونە بە بەردیدەی ئومێدم ڕەشنەبوەتەوە...

سێیەم

## شەهید وریای حاجی قادری ئەمر

بۆ گیانی هاوڕێ وریا... لە پەنا هەر دوو گیشەی قەرەباڵغی یادەوەرییەکانم، هەنوکەش لەگەڵ پاکی و دڵسۆزییە پڕە لە وەفادارییەکەت دەژیم. لە بیرم نەکردووی و لە بیرت ناکەم هەتاکو لەسەر عەردی دەمێنم.

ڕاستە ئێستاکێ کەلاکەوتووی ناو حیزب و سیاسەتم، بەڵام لە پەنا گیشەی یەکەم کە هەر دوێنێ بوو لە یادی ساڵرۆژی ئارام ی پەرجوودا، تاووتوێی هەواری ئەوێ ڕۆژانی بەر لە نزیکەی چل ساڵانم بۆ هەژمونی ئەو پیاوە مەزنە هێنابووەوە گۆڕێ

لە پەنا گیشەی دیکەم، یادی ئەو کۆمەڵە هاوڕێیانەی ئاڵای شۆڕش لە ناوچەکانی هەولێردا لە بیر و هزرم دێن و دەچن، لەناو مەلۆکانی کۆمەر کۆمەری گیشەکان، دەستوقامەتی بچکۆلانەی تۆ دەبینم، کە چەند سەپانێکی بە کوڵ و بە بڕوای ئەو گیشەیەی ئاڵای شۆڕش بووی.

لە بیرمە لەبن گوێسەبانەی ئەو ژوورەی نیوە شەوێکی بەرانی زستانی ساڵی ١٩٨٦ ی گوندی زێبارۆکی نزیکی شەقڵاوەی خۆشناوان، بە جووتە وەک کۆترە کیویلکەی بەریاران، دڵۆپ دڵۆپی ناو تاریکە شەو هەراسان بوونمانی دەکردە میوان و تۆ بێزار نەدەبووی. بە منگەمنگ چرپەکانمان بۆ گوێچکەی یەکدی ڕێبواری

ناوەختبوون. لە تروسکایی پەنجەرەکەوە سەرەدیقانێمان لەگەڵ ئەو ژن و مێردە دەکرد، کە بە بەر نێڵەنێڵی زۆبای ناو ماڵیان، لنگیان لەیەک ئاڵاندبوو. زۆر بە ئۆقرە بووی و گوێت لەو سەربردەیە گرتبوو، کە بەسەرهاتێکی ئارامم بۆ دەگێڕایەوە. لەو مرۆڤە رابەرەی چەوساوەکان لەو دەمانەدا، چەند بە حەوسەلە و پشوودرێژ بووە. هەرگیز نەبووەتە مایەی نیگەرانکردنی خەڵکی ستەمدیدەی ئەو گوندانەی تێیدا سوڕاوەتەوە. دەبێ ئێمەش لەبەر ئەو دڵۆپانە ئێشک بگرین، تاکو ئەو ژن و پیاوە خۆیان هەستمان پێدەکەن.

ئای وریای بەلەنگازی ناو سیاسەت و شۆڕشگێڕی، چ ئینسانێکی بە ئیستقامەی لەبننەهاتوو بووی. چەند وێردی ئەزبەرکردن و پیادەکاری بیر و ئاکارەکانی ئارام بووی

لە شانی شەهیدان مەناف زراری و دڵشاد شێمحمد و رێبازی مام باپیر چ کۆڵەگەیەکی پتەوی پشت پێبەستنی هاوڕێیەکانتان بوون. یەک بەدوای یەک زنجیرە ئەستێرەی ژیانتان پساو ماڵئاوایی چۆلکردنی هەواری قەلەندەرمانتان کرد.

سڵاو لە گیانت وریای حاجی قادری کە لە دوا مەنزڵگای ژیانت، بە دەستی تیرۆریستان لە یەکی شوبات لە شانی دەیان رۆڵەی دیکەی هەولێر تیرۆر کران.

٤

## هاوڕێی نەمرمان سدیق حاجی یونسی بەحرکەیی

زەمەن وەک شێرە بەفرینەی دەمی دەستپێکی بەهار و سەردەرهێنانی گەرما. بلەز تەمەنمان دەتوێنتەوە و دەستباری هاوڕێتی کاڵ و کاڵتر دەکاتەوە. بە تایبەت ئەو هاوڕێیانەی ساڵانێکە لە بەرچاومان نەماون و بۆ یەکجارەکی ماڵئاواییان لێمان کردووە.

پێتان سەیر نەبێت، ئەگەر بە خۆم بنازم، من یەکێکم لەو بابایانەی لە کۆمەڵگای سەر گوفەکدانی کوردەواری، وێرانەی شلبوونەوەی هەموو هەست و نەستێکی شۆڕشگێڕانەی دەمەکانی بەسەرچوو، بەتاڵ نەبوومەتەوە و هاوڕێ گەلێکی خۆم لە بیر نەکردووە و لە بیریان ناکەم

زۆرن ئەو هاوڕێیانەی لە دەمی خەباتی رۆژە دژوارەکانی بەسەرچووی شار و شاخ ناسیومن، رۆژانێکی زۆر هاوڕێی گیانی بە گیانی، لەگەڵ رەوتی ژیان قۆشمەی دڵسۆزی و

وەفاداریمان لە شانی یەکتری کردووە. هەرگیز بۆ یەک چرکەش لەو بوارەدا دواکەوتن دەستی لێمان نەسەندووە.

سەفەری نووسینی ئەو جارەم روو لە گیانی بەرزەفڕی هاوڕێ سدیق بەحرەکەیی نازدار و شۆڕەسواری سەربڵندییە. من لە بیرم نەماوە لە کوێ و چ ڕۆژ و ساڵێک بە تەواوی لەگەڵ بەژن و باڵای کەتە مرۆیەکی چاوگەشی وەک سدیق، لەو کاروانە سەر بە گۆبەندە، ئاوخواردنەوەی هاوڕێتیمان نۆش کردووە و هەتاکو مەرگی لە ناکاو، بە جەستە هاوڕێ سدیقی لێمان سەندەوە..

لە دەمی ڕۆژانی کەوتنە سەرپێیانی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوەی کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٨١دا، لە ڕێگای هاوڕێیان وەرزێر، وریای حاجی قادر، دڵشاد شێمحەمەد، شێرکۆی مام مورادی و چەندانی دیکە، بە ناوی سدیق بەحرکەیی ئاشنا بووم. ئەو دەمە ناوبراو وەک ئەندامێک و سەرشانەیەکی چالاکی ڕێکخراوەیی کۆمەڵە دەستبەکار بوو.

سدیقی حاجی یونس وەک ڕۆڵەیەکی زەحمەتکێشی شارەگوندی بەحرکە، بە جۆرێک هۆگری بیروباوەڕەکانی ئارام ببوو، بەو ئاستە خوێندەوارییە سەرەتاییەی هەیبوو، تامەزرۆی خوێندنەوەی ئەو بیروباوەڕە شۆڕشگێڕییەی کردبوو. بە حەق سدیق مرۆڤێکی خۆنەویست لە ڕێگای کاروکاسبی بۆ گوزەرانی ژیانی ڕۆژانە، لە پاڵ کەسوکارەکەی، بێوچان تێکەڵی تێکۆشانی ڕێکخراوەیی ببوو.

لە ڕۆژانی برینداربوونەکەم لە کۆتایی ١٩٨٣دا، لە ژیانی نیختفای ئێرە و ئەوێی ساڵی ١٩٨٥دا، هەر لە ڕێگای هاوڕێیان وریا و دڵشادەوە، بە پەنادزە هاتوچۆی ماڵی سدیق بۆمان ڕێچکەی بەستوە و ئەو هاوڕێیە بە خۆی و ژنە لاچەکبەسەرەکەی، پشتوپەنای چالاکیمان بووە و هەنگاو بە هەنگاو وەک مرۆڤێکی بوێر بۆ لەدایکبوونی ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی ئاڵای شۆڕش لەسەر پێیان بووە و درێخی نەکردووە.

هاوڕێ سدیق بەحرکەیی یەکێک لەو کرێکارە هێمن و پشوودرێژانە بوو، لە ریزەکانی ئاڵای شۆڕشدا، بێپەروا باوەڕی بە خەباتی شۆڕشگێڕانەی چینایەتی هەبوو. لەگەڵ خەڵکی زەحمەتکێش و کرێکاردا دۆست و هاودەم بوو. سەرچاوەیەکی لەبننەهاتووی گەشەکردنی ڕێکخراوەیی ڕێکخستنی ئاڵای شۆڕش بوو. سدیق ئینسانێک بوو، بە سەلیقەی وردی، وزەی لەبننەهاتوی، باوەڕبەخۆبوونی، ڕاستگۆیی و وەفاداری، بەتەنگەوەهاتن و ئامادەیی بۆ قوربانیدان لەپێناوی بیروباوەڕەکەی بێسڵەمینەوە بوو. کە

ئەوێ ڕۆژانم بیر دەکەوێتەوە، ئەو شەو و تاریکە شەوانەی دەگەیشتینە ماڵیان، لە شارەگوندی بەحرەکەدا، سەرباری هەر جۆرە مەترسییەکی دژوار و هێز و جەبەروتی دامودەزگا دڕندەکانی ڕژێمی بەعس، چاونەترسانە و بەوپەڕی جوامێری و دەم بەخەندەوە پێشوازی لێ دەکردین. یەکە بە یەکەی بنەماڵە چاونەترسەکەی، هەر لە مام حاجی یونسی باوک و دایکە کڵۆڵە نەمرەکەی، ژنە خاتونەکەی، هاوڕێ نزیکەکانی لە نموونەی مام کەمال و کەمالە درێژ و کێ و کێی تر کە ناوی هەموویانم لە بیر نەماوە. بەبێ گوێدانە هەر جۆرە مەترسییەکی ئەوێ ڕۆژگاری خزمەتییان کردین، لە هەمێز و باوەشی خۆیان دەگرتین. بە چەشنێک لەوێ ڕۆژانی سەختی ساڵی ١٩٨٥_ ١٩٨٨ ماڵی هاوڕێ سدیق بەحرەکەیی وەکرێکی نهێنیی ئاڵای شۆڕش بوو. مەنزڵگای هێنان و بردنی پۆستەی نێوان شاخ و شاربوو. قوناغگردانی خۆگەرمکردنەوەی هاتوچۆی بەردەوامی پێشمەرگە و کادرەکان بوو. بەڵێ سدیق بۆ خۆی جۆگەلەیەک لە هیواو ئومێدی بە یەکەیەکەمان دەبەخشی و بەردەوام مایەی هاندان و دەستگرتنمان بوو. لەوەی لەسەر کۆشش و نەسرەوتنمان بەردەوام بین. کە ئەو بۆ خۆی کێوێک لە وره و خۆراگری بوو. دڵەڕاوکێ و گومانێک لە ئاسۆی هەنگاونانی نەبوو. من چەند بنووسم و لە لاوچاکی ئەو جۆرە شاسوارانە بگێڕمەوە، هەر نەکارم پڕ بەپێستی قوربانییەکانیان، وشە و دەربڕینەکانم بەرتەقای هەڵوێستەکانیان لە دەمی تەنگانە بێتەوە. یادت بە خێر هۆ هاوڕێیە سەربڵندەی کاروانی ماندوبوونەکانمان. سەرت بەرزە و گیانت زیندووە، بەدوای خۆتەوە لە سێبەری ژنە کۆڵنەدەرەکەت، کوڕ و کیژەکانت باڵایان کردووە و بەدەم ژیانێکی ناو کەژاوەی گوزەرانیکی سەربەرزانە، لەسەرپێی خۆیانن و ئاسوودە و وەک خۆت بێمنەت دەژین. ئەو مرۆڤە لە ١٢- ٥- ١٩٩٩ بە هۆی جەڵتەی دڵەوە، بۆ یەکجارەکی کەوتووتە هەمیزی مەرگی ئەبەدی و ماڵئاوایی لێمان کردووە. هەرگیز ئەو شەوانەم لە بیر ناچێتەوە، لە تاریکە شەوی ئەنگوست لە چاودا، لە شانی هاوڕێی نەمر، وریای حاجی قادردا، لە گوندەکانی پێدەشتی بەڕانەتییەوە، بەپێ و پەنادیواران خۆمان دەگەیاندە ماڵەکەی سدیق و خێزانەکەی، دایک و باوکە نەترسەکانی، لە شیرین خەوی نیوەشەودا، دەرگەی ماڵی خۆیان بۆ دەخستینە سەرپشت، ئێمەی چەکبەدەستیان وەردەگرتەوە. بەدوای حەسانەوەی ڕۆژی دواتر، بە یارمەتی هاوڕێ مام کەمال و لە جێبە شڕەکەیدا، لەنێوان هاوژین و دایکە بوێرەکەم، هەردووکمانیان، ئەز و وریا قادریان

دەگەیاندە ناو جەرگەی شاری هەولێر و پاش بەجێگەیاندنی ئەرکەکانمان و بە هەمان چەشن دەگەڕاینەوە ماڵەکەی مام حاجی یونس. هەنوکەش لە بیرم نەچووە، حاجی یونسی سەرکەش ناوناوە خۆی پاسەوانی لێ دەگرتین و جارجارەش رووی تێ دەکردم و پێی دەگوتم، کە بە چ ئەفسونەک ترس و دڵەڕاوکێ و پۆڵابوونی خۆمان و سدیقی کوڕیمان ئاوداوە. کە ئەوەندە نەترسین لەبەر دەسەڵاتی حکومەت نالەرزین..! کە لە ناوەڕاستی شەویش نزیک دەبووینەوە، سدیق لە پێشەوە بە خۆی و مام کەمالی، دەورووبەری ماڵەکەی خۆیان کە ئەو دەم چۆڵەوانی بوو، سەعی دەکردەوە و مەودایەکیش دەڤەرەکەیان دەپشکنی. نەوەک کەمینی جاش و پیاوەکانی رژێم لە دەورووبەرەکە لە بۆسەدا بن. ئەوجا بەدوای دڵنیابوونی بۆ دەرچوونی بە سەلامەتی ئێمەوە، هەر خۆی هاوڕێ سدیق تفەنگەکەی منی بەدەستەوە دەگرت و هەتا مەودایەکی دوور لە پێشمانەوە رێی دەکرد و بەڕێی دەکردین. رێگا و بانەکانی بۆ دیاری دەکردین. ئای سدیق چ پیاوێکی مەرد بوو. قوچەکی خۆڕاگری و بەردەوامیمان بوو.

سڵاو لە گیانی

درود بۆ هەڵوێستەکانی

سڵاو لە ژن و کیژ و کوڕە چاوگەشەکانی

سڵاو بۆ گیانی باوک و دایکە نەمرەکەی

سڵاو بۆ کاکە زرار و یەکە یەکەی هاوڕێیەکانی مام کەمال و کەمالە درێژ و ئەوانی دیکە

پێنجەم

## بۆ رەهبەر جەلال _ ی هونەرمەند

دەسرازەی ساڵانی تەمەن، لەگەڵ بارتەقای خەون و خۆزگەکان، خەریکە دەرەقەتی ژمارەی هاورێ لەدەستچووەکانم نایەت و بە تەواوی بۆم مەستار ناکرێن کە تەمەن لە بەرانبەری قامەتی هەر یەکەیان دەستەوەستانە..!

ئەوەندەم هاورێی بوێر و لێهاتوو، سەربڵند و خۆڕاگر لەو کاروانە سەر بە گۆبەندەی ژیانم لەدەست داوە. هەنوکە بۆ تاکە تاکە و کۆمەڵێکی زۆریان بە چەپکێک وشەوە هێشتا لەسەر پێیانم. هەر ئەوەندەم بۆ کراوە، لەبن ساباتی یادەوەرییەکانی نێوانمان کە ئەوانیش لە ژیاندا بوون، تامەزرۆیی روحیم لە خزمەت ناوەکانیان بشکێنم.

رەهبەر جەلال مامەش، وەک ئەدرێسێکی رۆشنی بەرچاوگەشی مرۆڤبوون. هونەرمەندێکی دەم بە خەندەی بەرەی خەڵکی ستەمدیدەی کورد و کوردستان. چالاکوانێکی بواری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەدەبی و رۆژنامەنووسی کوردناسی و چی و چیتر لەبەر چاوم دێن و دەچن. رەهبەر هەمیشە بڵندگۆیەکی تژی لە پاکی، چاونەترس لە هەڵوێست دەربڕین بە رووی ستەم و زۆرداری. دەستڕەنگینی داهێنانی تابلۆی وێنەکێشانی هونەری تایبەت بە رێبازی خۆی. خاوەن بیروباوەڕێکی شۆڕشگێڕانەی نمانامەی هۆشیاری نەتەوەیی نوێی دیار بوو.

رەهبەر رۆڵەی بنەماڵە و باوکێکی کوردپەروەری بێسڵەمینەوە بوو. دایک و باوکێکی مرۆڤدۆستی ئازادیخوازی هەبوو. لەگەڵ تاووتوێکردنی وانەکانی باوکە نەمرەکەی، مامۆستا جەلال ی سەرکەش. دایکە میهرەبانە لچەکبەسەرەکەی بە ئومێد و هیوا تژی بوون، بە وانەی فێرکردن و پەروەردەیی نوێی وڵاتپارێزی و خاک و زێد خۆشەویستی گەورە ببوو. بۆیەش کۆشش و هەوڵدانی بێپسانەوەی تا چاولەیەکنانی ئەبەدی، وێردی سەرزمانی رەهبەر. بۆ ئازادی و هەڵهێنانی ئاسۆی دیموکراتی و ژیانی سەربڵندانە دەشەکایەوە..

رەهبەر لەشانی فلچەی دەستی بۆ رەسمکردن، قەڵەمی نووسینی بە دەستەکەی ترەوە بوو. سەرەتای حەفتاکان بە خۆی و بن بارێک لە لاپەڕەی سپی و کەرەستەکانی ناوەخنی ئەو کۆڵەپشتە بوون، بەردەوام بە کۆڵییەوە بوو. رۆژانە بەدوای دەوامی لە پەیمانگای هونەرەجوانەکانی ئەوێ رۆژێی بەغداد. میوانی چایخانەکانی مەیدان،

بەرلەمان، کەندی پایتەختی عیراق بوو. بەدەم وێنەکێشانەوە، خەیاڵی بۆ دەستلەملانێی دیمەنە دڵڕفێنەکانی سروشتی کوردستان، ژیانی بەلەنگازی خەڵکەکەی هەڵدەفڕی و وێنەی دەکێشان.

رەهبەر لە هەمێزی هونەرەکەی بێتۆقرە بوو، تامەزرۆی خەباتی رێکخراوەیی بەرخۆدانی خەڵکی بوو، بێپەروا شاگرد و خوێنەرێکی بەردەوامی فەلسەفەی مارکسیزم بوو، لەگەڵ رێکخستنی نوێی نەتەوەیی شۆڕشگێڕانە لەسەرپێ بوو.

رەهبەر هەتا لەناو شار بوو، هاوکار و هاودەمی هاوڕێ تێکۆشەرەکانی بواری خەباتی نهێنی ژێرزەمینی بوو. کە هاتە شاخیش بەدوای ماوەیەکی کورت، عاقڵانە کۆچ و کۆچباری خۆی بەرەو هەندەران لە کۆڵ بوو. لەپێناوی ئەوەی درێژە بە کاروانی هونەری و سیاسی خۆی وەک دەیەوێ بدات. وێستگەکانی شەمەندەفەر لەنێوان شارەکانی ئەورووپا لە میواندارێدا بوون. تاوەکو لە کۆتایی هەشتاکان، لە پایتەختی وڵاتی فنلەندا _ هلسنکی _ بەستەلەک گیرسایەوە.

خەمەی رەهبەر رەنگین و زۆر بوون. ژیانی پڕ ماندووبوون، بەتەنگەوەچوونی گەورە و بچوکی خەڵکی کوردەوە نەدەسڵەمییەوە. بەدەم گوزەرانی سادە و ساکاری هاوژین و کوڕیە نەشمیلەکانی، باوەڕ ناکەم یەک ژەمە نانخواردنیان بە تەنیا و بەبێ هاوڕێی ناسراو و نەناسراوەوە بووبێت.

داخی گرانم، ئەو مرۆڤە ماندوونەناسە، پڕ قوربانییە کەموێنەیە. لە پەراوێزی ئەرکە زۆر و زەبەندەکانییەوە، بەو تەمەنە گەنجێتییەی خۆیەوە، تووشی بە تووشی نەخۆشییەکی کوشندەی گەدە هات. ئەنجامەکەی تروسکایی ژیانی لێسەند و لە بەرەبەیانێکی زوودا، لە باوەشی هاوڕێی سەربڵند، عەبدوڵڵا پەشێو و ئاوارەیی گیانی بەخشیوە و هەموومانی بە جێ هێشت.

سڵاو لە گیانی رەهبەر جەلال _ی مامەش

درود بۆ هیمەت و مرۆڤ بوونی

جارێ تەواو

حاجی مەمۆ     زەمان و شوێنی نووسینەکان     شاخ، هەولێر، سلێمانی، ئالانیای سەردەریای سپی لە وڵاتی تورکیا و بە زۆریش چەند شارێکی سوید کە ستۆکهۆلمی پایتەخت سەرپەری هەمووان بووە.

لە ساڵی١٩٩١ هەتا ١_١١_  ٢٠١٧ ناوە ناوە پێیەوە سەرقاڵ بووم.

لە قوڵایی دڵمەوە سوپاسی ئەو هاوڕێ و دۆستانە دەکەم کە لەسەرنج و کۆمێنتاری سەرڵاپەڕەکانی فەیسبوک بەسەریان کردومەتەوە و کەموزۆر فێری شتی زیاتریان کردوم و بە رەخنەو تێبینییەکانیان دەستیان گرتوم .. هەر سەرفرازبن.

لەو سەکۆیەوە قەدرووپێزانینم بۆ برای هێژا رزگار شێخانی بە تایبەت دووبارە دەکەمەوە لە بەرانبەر راو سەرنجەکانی، دیزاین و ئامادەکردنی فۆرمی بەچاپگەیاندنی ئەو زنجیرەیەش، ماندوبوون و وەختی خۆی پێبەخشیوم.. هەر سەرکەوتوو بیت.

دیسان نابی سەرنج و رایەکانی براو هاوڕێی شاخ و بەردەوامی ژیانم پشکۆ نەجمەدین لە بیر بکەم کە سودی زۆری پێگەیاندوم و هەر بێمزەرەت بێت..

## فەرهەنگۆک

ئـ

ئەزی منی

ئەتو تۆ

ئەوەلباب یەکەم، نایاب، فاخیر

ئەوەندەی ئاومان لە دوو بێرێ هات

چەندی بۆمان کرا

ب

بگرخێنی خۆ دواخستن، ئیهمالی

بۆنسۆ بۆنی سووتاوی زیڵ

بوز سەهۆڵ

باڵەکانم قۆڵەکانم

بەسەرزارەکی رووکەش

بە بتونی بە تەواوی، هەموو

بەلەنگاز دەست کورت، نەبوو لە رووی

گوزەران

بەکزی مەلوولی، خەمۆکی

بەرزەفت توندگرتن، زەبتکردن

بەلوعە بۆری

بەبرشت بە بەرهەم، بە هەرمێن

بەرانپیل وەک تێرکەیە و لە مل دەکرێ

بەنگو ئێوە، بە ئەنگو

بەرام لێ نەما چاکبوومەوە

بەتۆبزی بەزۆر

بزیزۆک تیژرەو، زۆر خێرا

بەرۆک یەخە

بەتایف بەزیاد

بەقەرەپەستانێ بە پاڵەپەستۆ

بە رەونەق درەوشاوە

بنی ژێری

بنەگەکردنی بنەوانی کردنی

پ

پەلەپروسکێ زۆر عەجەلە، پەلە پەل

پەرگە ئەوەی سەری ئەو سەر، ئەوبەر

پەرپوت رووت وقووت، شرپوشۆل

پێککردن جێگاکردنەوە، وەرگرتنی یەکێک

پراڤین چێشتی نیوەڕۆ

پرستۆ دژ، موعارەزە

پراوساوار پڵاو ساوار

ت

تامەزرۆ زۆر حەزلێچوون

تاندان هاندان

تەنکێش لێوار، لە ریزی

تەقەتیکردبوو شاردبویەوە

تخونکەوتن خۆ لێنزیک کردنەوە،

خۆلەقەرەدان

تەقەتکردن هەڵگرتنی پەنهانی، نەبینراو،

شاراوە

تەتەلە دەكەم  هەڵدەبژێرم، لە بێژینگدان
تەرەتولە  تەڕەتیزە
تشت  شت
تومەز  دیارە
تۆبزی  بەزۆر
تۆمبز  مستەكۆلە
تۆقەرە  دۆند، سەری لووتكە
تێكقرژاو  ئاڵۆزكاو، قەرەبالغ

ج
جلیتكردن  ریزكردن، دەسرازەیی
جەلەحانێ  بۆرپۆرێن
جۆخین  خەرمان
جفز  بەرگ، رووخسار
جرناوفرنا  نابەجێ
جرۆجامشت  دەستوپێوەندی دەوروبەری
مەسول

چ
چار  چوار
چەمبەری چلێس، بێبار،
لەوبەرلەوبەریاریكردن، ناتیزە
چێشتەنگاوێ  دانی بەیانی، سەرلەبەیانی
چوغلمان كرد سكاڵامان كرد، شكاتمان لێ
كرد، زمانمان لێدا
چێشتەنگاوێ  دەمە دەمی رۆژگەرمبوون

ح
حەشامات خەڵك گردبوونەوە
حەولەپوچ سەرەمەرگ

خ
خۆگورگە كردن  خۆدەرخستن

د
دەپەستاند  پڕكردنە ناودەم
دەمقەپێنن  دەمفڕێنن
دەمەقاڵێ دەمەدەمكردن، شەڕەدەم
دەقگرتن  راهاتن، گونجان
دەڤەر  ناوچە
دەسكەلا  پێر، قوڕخكار، مۆنۆپۆل
دەرەقەت نەهاتنم  پێنەوێرانم، لەعۆدە
نەهاتنم
داوەرانەوە  خۆ بەسەرداهینان، كونجی
قەناعەتگرتن
دەقەتێنم.. بەسەردەبەم
دەمچەفت  هیچ لەبارانەبوو
درهەم  پەنجا فلوسی
دربۆنگ  لالووت، زوێر
دۆند  پۆپەی لووتكە چیا

ڕ
ردێن تەوشولە  ریشی جۆری تەوشی

ز
زەنگین  دەولەمەند
زەندەقیان بیات  بیانترسێنی، هەترەشیان
بیات

زەنگەسۆرە  زەردەواڵە

نۆرلنێ  نۆرانبازی

زرتە زەلام پیاوی گەورەوگران. بەکەڵەش

ژ

ژێرو ژوور  خوارووو و سەروو

س

سەین و بەین  تێکەولێکە

سەرجەلە چیراوکە، تێکڕای بەسەرهات

ستیل  شێواز

ستارە  دیواری نزمی پەرژینی سەربان

سەرشۆرک  شوێنی خۆ شوشتن

سەر تۆقەرە  لووتکە

سەری نەهینا بەرێ  رازی نەبوو

ش

شاراوهێنان  پردانە یەکێک

شیرەی نێرەکەر  زەرەی کەری نێر، بەیانی

زوو، تاریکوپوون

شپرێو  نارێک

شفتی  شوتی

شتاق  هیچ کام

شمڕ  دەسەلات، دەستڕۆشتویی

ع

عەنتیکە  سەیر

عاسێ بوون  گیرخواردن، یاخیبوون،

دامەزران

غ

غاردان  راکردن

غەرەتی کرد  هەڵەی کرد

ف

فرکە فرکمان بوو  دادە دادکردن

فرکەم کرد  رامکرد

فشقیات  گاڵتەوگەپ

فشەپێکردن  پێراپواردن

فراق بوون  کەوتنە سەرپێیان

ق

قەپاغی  سەرقاپەی

قاقۆل  قژیدرێژی سەرنیوچەوان

قەشمەر  گاڵتەجاڕ

قەپاندن  فراندن

قەلۆش  موفلیس، گیرفان بەتاڵ

قەیاسێک  برێک، هەندێک

قەرسیل لەتە زەوی بەرمالانی بەردەست

قسەی لەوجڕ  قسەی بێمانا، بێتام

قسەی بێدەرپێ  بێ بەڵگە

قشتیلە  جوان و رێک، نایاب

قیرسز  منجڕ، ناچار

قرقرابوو  تەنگاوبوو

قروش  فلوس، پارە

قۆپەن  کۆی دار، دەغل

قۆمەت قۆمەت  کۆمەڵ کۆمەڵ

قوچاندی  رایکرد

قۆشمه  موسابەقە، راکردنی کێبڕکێ
قۆشمەبوون تۆکمە، بەدەست وبرد
قونەخشکە  لەسەرقنگ ڕۆیشتن
قوونە شەڕ  دووره تەتەقە
قوچاندبووی  رایکردبوو
قوتەی مامەندە  ترۆپکی شاخی مامەندەی
نێوان ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان

ک
کەلەگەت  بڵند
کەرپوچ  خشت
کەرخی  نزیکی، لە لای، کەناری
کەری مولەوەن  کەری ڕەنگاوڕەنگ
کەشوکوش  مامەلەیەک، سەودایەک
کیژ  کچ
کێندەرێ  کوێ
کوزر  دەنکە گەنم لەناو توێکلەکەی
کۆرکردن  جلشوشتن
کونکان  یاری کاغەز
کزەم لە جەرگەوە هات  جەرگم داغان بوو
کوزر  ئەو دەنکە گەنمەی لە توێکلەوە
پاک نەبوەتەوە
کۆر، کۆرکردن  جلشوشتن و خۆ
پاککردنەوە.

گ
گەجەرو  گوجەر  دەستوپێوەندی
ماستاوچی
گیاوگۆر تەڕەتوولە، کەرەوز، کەوەر، پونگە

گەمە  یاری، وازی، کایە
گەنگەشە  موناقەشە
گەعدە  دانیشتنی خواردنەوە
گاشەبەرد  بەردی زڵ، کەرتەشاخ
گوزەران  مەعیشەت
گوزەراندن  پێدا تێپەڕین
گومەز  بەزم
گێلەوێژە  پرۆیلم، تەنگەژە
گێچەل  شەڕفرۆشتن
گەنگەشە  موناقەشە
گوفەک  سەرەنوێلک

ل
لابەلا  ناراستەوخۆ
لایدە  غەریب، غەیرە
لە خۆم قرقرام  کەوتمە دڵەڕاوکێ، گومان
لەخۆکردن
لەقاودان  ڕەتکردنەوە، بەلاوەنان
لەحەژمەتی  لەداخی
لەورجڕانە  وەرسانە
لەو گۆڕە  لەخت وخۆرایی
لە عەلەیی  لە نەیاری، لەدژی
لۆقلتە  چێشتخانە
لە عەردی  لە زەوی
لەتەشکی خۆیاندا  پاشەوپاش گەڕانەوە،
بەفەشەلی کشانەوە
لەگەڵ شیرەی نێرەکەرێ  بەیانی زوو
لە خۆم قرقرام  لە خۆم ترسام، تووشی
دڵەڕاوکێ بووم

لە عەلەیی  لە دژی، نەیاری
لالووت  زوێر، توڕە
لاچەکبەسەر  خان ومان، خاتون
لگاو  چەشنە قومارێکە
لێمشت  پڕاوپڕ
لێوکرۆشتن  گازگرتنی لێو بەددان

م

محتە  وێستگە، ناوی گەرەکی وێستگەی
شەمەندەفەر
میرمحێ.. دەسەڵاتداری بگرویکوژ
مجێز  میجاز، زەوق و سەلیقە
ملەمان نەبوو  بێ کێشە
مشەوەش  شپرزەبوون
میرمحێ  دەسەڵاتدار
مێنگین  چێلی مێینە
منداری سەرکەو بنکە  منداڵی وردیلە

ن

ناکەسبەچە  هیچ و پوچ
ناورانەوە  تکاو لالانەوە
ناگوزوری  نوقسانی ، بەلەنگازی

و

وڕەوڕ  مینگە مینگ

هـ

هەبیێم لێ کرد  خێرا و یەکسەر
هەڵەپاس  بزێو
هەنوکە  ئێستا
هەراش  گەورە، بڵند، زەلام
هەنجەت  بیانوو
هۆپێکم لە خۆم زانی  حەپەسام
هیشک  وشک
هەر هۆپێکی لە خۆی زانی  سەری سوڕما،
لەناکاوی ناکاو
هێڕ  گێژ

ی

یەکپێ  راستەوخۆ